ئاراس ٢









# سەرو

د. عەزیز گەردی

# سەروا

## لێکۆڵینەوەیەکی شیکاریی بەراوردە
## لە شیعری کوردیدا

عەزیز گەردی

هەولێر

دەزگای **ئاراس**
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

**زنجیرەی ڕۆشنبیری**
خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین
سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب
* * *

کتێب: سەروا
نووسەر: عەزیز گەردی
دەرهێنانی هونەری: قاسم قادر
بەرگ: شکار نەقشبەندی و عەبدولقادر عەلی مەردان
چاپخانەی: وەزارەتی ڕۆشنبیری
ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی نیشتمانی: ٧٧ / ١٩٩٨
چاپی یەکەم: هەولێر ـ ١٩٩٩

ئەم نامەیە پێشکەشە بە:

- هەر مامۆستایەکی یەک دەرزی پێگوتووم.
- هەرقوتابییەکی یەک دەرزم پێ گوتبێ.

# پێشەکی

## بابەتی نامەکە :

ئەم نامەیە لێکۆڵینەوەیەکی وەسفی شیکاری بەراوردە لەسەرەوای شیعری کوردی بە هەموو جۆرو هونەرەکانییەوە ، هەر لەسەرەتاوە (باباتاهیری هەمەدانی (٩٣٥-١٠١٠) تا ئەم سەدەی بیستەمینە . هەوڵێکە بۆ هەڵسەنگاندنی شوێن و دەوری سەروا لە شیعری کوردی و دیارکردنی سنوور و چۆنیەتی دابەشبوونی لە هۆنراوەدا بەپێی شێوەی ڕیز بوونی لە هونەرە شیعرییەکانی وەکو قیتعە و غەزەل و قەسیدە و تاك و چوارینە و پێنجینە و شەشینە ... و موستەزاد و موەششەح و سۆنێتە و .... هتد ، دەوری لە ڕۆنانی هۆنراوە و جیاکردنەوە و بەیەکەوە بەستنەوەی پارچەکانی هۆنراوەی پارچەدار و بەشداری کردنی لەگەڵ ڕەگەزە شیعرییەکانی دی ، بەتایبەتی ڕەگەزەکانی سەر بە مۆسیقاو ئاواز ، لە دروست کردنی کەش و هەوایەکی لەبار کە ڕێگا بۆ گەیاندن و گواستنەوەی بیرو سۆزو تاقیکردنەوەی شیعری و شعوری خۆش بکات ، ئینجا دەرخستنی ئەرکی سەروا لە خەست کردنەوەو قووڵ کردنەوەی مۆسیقای شیعرو گرێدانی جەمسەرەکانی ئاوازی وشەو دێرو بەستنەوەی بە تریەی ڕەوتی گشتی هۆنراوەکە .. ڕوون کردنەوەی دەوری سەروا لە پەیوەندییەکانییەوە بەکێش و مۆسیقا و بابەتی شیعرو باری دەروونی شاعیر و خەسیەتی تایبەتی فۆنۆلۆجی زمان ، ئینجا دەوری دەنگ ، دەنگی زمان لە چوونە ناو سیستەمی سەرواو چالاکیی لە هەڵسوڕاندنی ئەرکی سەروا و جیاوازی دەنگەکانی زمان ، هەر زمانێك بە گشتی و کوردی بەتایبەتی لە ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەروا ، جگە لە شیکردنەوەو ڕوون کردنەوەی دەوری جوانناسی (ئیستاتیکی) سەروا ، کە سەرەڕای دەوری سەرەکی خۆی کە دەستە بەرکردنی ئیقاعێکی تایبەتییە لە دێرە شیعرو هۆنراوەدا ، جوانییەکی تایبەتی بە شیعر دەدا ولە زۆر زەمانا دەبێ بەیەکێ لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی جیاکردنەوەی شیعر لە پەخشان ، لەهەمان کاتدا لەزەت و خۆشییەکی دەروونی دابین دەکات و زیاتر خوێنەر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ. ئەم لایەنە ، زیاتر سەروا بەرەو هونەرە جوانکارییەکانی ڕەوانبێژی دەبا . شاعیرانی کورد لەم بوارەدا زۆر وردەکاری وەستایانەی نایابیان نواندوە و دەکرێ لە دەرگای سەرواوە بچینە ناویانەوە و بەهای ئەدەبییان دەربخەین . بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی دەوری سەروا لە شیعری کوردیدا و دیارکردنی شوێن و پایەی لە ڕەوتی فراوانی سەروای شیعری جیهانیدا ، لەهەر کوێ پێویست بووبێ لایەنی جیاوازی زەق و پێکچوونی سەروای شیعری کوردی و زمانەکانی ترمان خستۆتە بەر بەراوردو لێکۆڵینەوە ، بۆ ئەوەی شوێنی شیعری کوردی ، لە رووی سەروا ، لەناو سیستەمی شیعری جیهانیدا ڕوونتر دەربکەوێ .

## ناونیشانی نامەکە :

بۆ ناونیشانی نامەکە ، وشەیەکی گشتی ( سەروا ) و ڕون کردنەوەیەکی فراوان (لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری بەراوردە لە شیعری کوردی) مان داناوە ، چونکە باسەکە هەمووی لەبارەی سەروایە ، جگە لەوەی کە بەشێکی تەواوی ( بەشی یەکەم ) بۆ زانیاری و موناقەشەی لایەنی تیۆری و بۆچوونی گشتیی سەروای شیعر تەرخان کراوە، لەبەشەکانی تریشدا ، لەهەر کوێ دەرفەت هاتبێ سەروای شیعری کوردی لەڕێی بەراوردەوە بە شیعری جیهانییەوە گرێدراوە و جارێکی تر لەپاڵ ڕوخسارە تایبەتییە کوردییەکەوە چۆتە ناو چوار چێوەی گشتی سەروای جیهانییەوە ، یان هەندێ دیاردەی دەگمەنی سەر بە سەروای شیعری جیهانی لەناو شیعری شاعیرانی کورد دەرهێنراوە . واتە بابەتەکە ، لەم بارەیەوە ، زیاتر چوارچێوەیەکی گشتی بەخۆیەوە گرتوە و بە دەوری سەروادا دەسوڕێتەوە ، ئەمە هەمووی وای کرد کە وشەی ( سەروا ) وەکو سەرباسێکی گشتی و سەرەکی بۆ بابەتەکە دابنێین ... لەپاڵ ئەم بۆچوونە گشتییەدا ، جەختمان لەسەر شیعری کوردی کردوە ، هەوڵمان داوە ، لەبارەی سەرواوە ، لەزۆر گۆشە نیگاوە شی بکەینەوە و دەستوورەکانی کارکردنی لێك بدەینەوە و لایەنە جۆراو جۆرەکانی دەست نیشان بکەین و لەپاڵ ئەم شی کردنەوە وەسفییەشدا ، بۆ باشتر دیار کردنی شوێنی سەروای شیعری کوردی لەناو سیستەمی سەروای شیعری جیهانی ، هەمیشە جەختمان لەسەر بەراوردکردنی دیاردە و قالب و لایەنە جوانناسییەکانی کردوە لەگەڵ سەروای شیعری نەتەوەکانی دی : ئەم جۆرە ڕێبازە سەرکەوتوانە لەلایەن ژرمونسکی ڕووس [٢٧٢ : ل٢٠٩] وهنری لانزی بەریتانی [٤٧٥] و د.محەمەد عەونی عەبدورەئوفی عەرەبی [٣٥٠] بەکارهاتوە . پشت ئەستوور بە ڕێبازی شیکاری وەسفی بەراوردی ئەوان بۆ لێکۆڵینەوەی سەروای شیعری کوردی ، ناونیشانەکەمان بەم جۆرە داڕشت کە لەگەڵ ناوەرۆك و ڕێبازی لێکۆڵینەوەکەدا بگونجێ .

## هۆی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە :

هەڵبژاردنی هیچ بابەتێك بۆ لێکۆڵینەوە بەبێ هۆ نابێ . دەبێ هۆیەك یا چەند هۆیەکی گشتی و تایبەتی ، دەرەکی و ناوەکی هەبێ وابکا توێژەرەوە بابەتێکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوەکەی هەڵبژێرێ .

دەست نیشان کردنی سەروا لە شیعری کوردیدا بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ئەنجامی چەند هۆیەکی پێویست بوە ، گرنگترینیان ئەمانەن :

– سەروا دیاردەیەکی زەقی شیعری جیهانییە بەگشتی و شیعری کوردییە بەتایبەتی ، شیعری کوردی هەر لە سەرەتاوە تا بیستەکانی سەدەی بیستەم ، بە هەردوو جۆرییەوە ( نووسراو و زارگۆتن ) ، بەهەموو زارەکانییەوە ، زۆر پابەندی سەروا بوە : دەستبەرداری کێشی یەك ڕەنگیش

بوویێ (وەکو هەندێ بەیتی فۆلکلۆری) دەستبەرداری سەروا نەبوە. پاش ئەم مێژوەیش (بیستەکانی سەدەی بیستەم) کە شیعری کوردی وردە وردە قالبی تەقلیدی و مەیەی کێش و سەروای شکاند و جۆرە ئازادییەك بە شاعیر درا لە پەیڕەو کردنی کێش و سەروا ، سەروا دەوری هەرمایەوە بەلام بەجۆرێکی جیا لەوەی پێشوو . جا ئەم دیاردە باوە دەبێ بخرێتە بەر لێکۆڵینەوە و بەشێوەیەکی تەختێ ورد و بابەتییانە شی بکرێتەوە و یاساکانی دیار بکرێ و دەوری لەکردەوەی گەیاندن و کارتێکردندا دیار بکرێ و جیاوازی لەگەڵ شیعری نەتەوەکانی دی دەست نیشان بکرێ لە ڕادەو چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ ڕەگەزی سەروادا .

- تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی فراوان لەبارەی سەروای شیعری کوردی ن... اوە. ئەم لایەنەش وەکو زۆربەی لایەنەکانی تری شیعرو ئەدەبی کوردی مەیلە و بەیارە و پێویستی بە هەڵسەنگاندن هەیە تا سنوور و خەسیەتەکانی دیار بکات و دیاردەو حاڵەتەکانی ڕون بکاتەوە . واتە بۆشاییەکی گەورە لە دیراساتی شیعرو ئەدەبی کوردی ، چمکی سەروادا ، هەیە هەر دەبێ پڕ بکرێتەوە، جا بۆ پڕکردنەوەی لایەنێکی ئەم بۆشاییە بوو ئێمە ئەم بابەتەمان هەڵبژارد .

- پەیدا کردنی شارەزایی لەبارەی سەروای شیعری کوردی ، بەتایبەتی شیعری ستوونی کە یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەو کراوە دەبێ بەیاریدەرێك بۆ ساغ کردنەوەی زانستانەی شیعری بڵاونەکراوەی کوردی کە هێشتا زۆری هەر بە دەستنووسی ماوە و بڵاونەکراوەتەوە ، ئەگەر چی بەلای هەندێکەوە (وەکو حەسیب قەرەداغی) یەکێتی سەروا دەبێ بە هۆی تێکەڵ بوونی شیعرەکان و وای لێ دێ خاوەنەکەی نەیناسێتەوە چونکە سەروای شیعرەکانی کلاسیکیی لەیەکەوە نزیکن و زۆر جار زۆربەی وشەکانی سەروای دوو هۆنراوە یەك شت دەبێ ( قافیەی دیاریکراو ، یاخود مەسەلەی سەروا ، خۆی یەکێکە لەو کولێرە ڕێبانەی کە تووشی شیعر ئەبێ و خاوەن شیعر جار جار سەری لێ تێك ئەچێ و شیعرەکە ناناسێتەوە ) [٧٠ : ٣٢٦] . بەلام لەگەڵ ئەوەشدا شارەزایی زانستانەی تەواوی جۆری سەروا و بابەشبوونی لەباتی ئەو تێکەڵییە دروست بکا کە ئەو دەڵێ ، ڕێگای لێك جیا کردنەوەی هۆنراوەکان خۆش دەکا .

- زۆربەی ئەو شیعرە کلاسیکییە کوردییانەی تا ئێستا بڵاوکراونەتەوە ، لەکەم و کوڕتی بەدەرنین ، زۆربەیان ئەوەندە بەبێ سەروبەری کراون چارەیان هەر ئەوەیە دووبارە ساغ بکرێنەوە و بە پوختەیی بڵاو بکرێنەوە : هۆیەکەشی ئەوەیە زۆربەی ئەو تۆژەرەوانەی کارەکانیان ڕاپەڕاندوە شارەزاییەکی ئەوتۆیان لە ڕۆشنبیری کلاسیکیی و خوێندەواریی ئیسلامی و کەرەستەکانی شیعری ڕۆژهەلات نەبوە کە سەروایش لایەنێکی دیاری ئەو ڕۆشنبیرییە شیعرییەیە . ناسینی سەروا و ئاگادار بوونی چۆنیەتی کارکردنی لە هونەرەکانی شیعردا ، ڕێگا بەرەو دۆزینەوەی ئەو هەلانە ئەخت دەکات کە لە بواری بڵاوکرانەوەی شیعری کلاسیکیی کراون . بۆ نموونە نەشارەزایی

لەدابەشبوونی سەروا لە هونەرێکی شیعری وەکو تەرجیع بەند بۆی هەیە بێ بەهۆی ئەوە کە تۆژەرەوە خانەوبەندەکانی تەرجیعەکە هەریەکە بەقەسیدەیەکی سەربەخۆ بزانێ ولێکیان بپچڕێنێ و هەر خانەیەك لە شوێنێکی دیوانەکە دابنێ ، وەکو ئەوەی بەسەر تەرجیعەکەی سالم هاتوە ، کەچی شارەزایی سەرواو هونەری تەرجیع وا لە تۆژەرەوەیەکی تری وەکو عەزیز ئالی دەکا کە هەست بەم پچڕانەی خانەکانی تەرجیعەکە بکات و هەوڵ بدا بیانخاتەوە پاڵ یەك و تەرجیعەکە دروست بکاتەوە . خۆی باس دەکا کە سەروا سەرنجی بۆ ئەم ڕاست کردنەوەیە ڕاکێشاوە ( خەریك بوو دیوانی "سالم"م دەخوێندەوە - ئەوەی گیوی موکریانی چاپی کردوە - تووشی پارچەیەك هاتم بەغەزەل لەقەڵەم درا بوو بەلاَم بەیتەکانی لەبارەی ناوەرۆك و فەڕای شاعیرانەوە زۆر لێك نزیك بوون - شتێکی کەلە غەزەلدا کەم دەبینرێ - جگە لەوە تەماشام کرد بەپێی ئاخیری ئەم بەڕواڵەت غەزەلە لە قافیەدا سەربەخۆیە و ئەمە پێچەوانەی قالبی باوی غەزەلە ... بەم بۆنەیەوە هێنام دیوانەکەم تەواو پشکنی و لەئەنجامدا سێ بەندی دیکەم دۆزییەوە و بۆچوونەکەم وە ڕاست گەڕا . دیارە مامۆستا گیوی ڕەحمەتی نەیزانیوە ئەم شیعرە ئامال درێژە تەرجیع بەندە ، هاتوە هەر بەندەی وەك غەزەلێك بە گوێرەی پیتی قافیە هەڵداشتۆتە سووچێکی دیوانەکەوە ) [٢٢٩ : ٣٦] .

- لایەنێکی لێکۆڵینەوەی سەروای شیعری کوردی دەست نیشان کردنی بەهێزیی و بێهێزیی سەروایە ، ئەم ئەرکە دوو مەبەست دەپێکێ : یەکەم : دەرخستنی جیاوازیی نێوان شاعیرانی پێشوومان لەبارەی زاڵبوون و زاڵ نەبوونیان بەسەر سەرواوە و دەسەلاُت شکانیان بەسەر بەکارهێنانی هونەرمەندانەی سەروا بۆ قووڵ کردنەوەی ئاواز و مۆسیقای شیعر و بەهێزکردنی کردەوەی گەیاندنی تاقیکردنەوەی شیعری . دووەم : دیارکردنی کەم و کورتییەکانی مامەڵە کردنی شاعیرانی پێشوو ڕێگا خۆش دەکا بۆشاعیرانی دواتر بۆ ئەوەی خۆیان لەم کەم و کورتییانە لابدەن و سەرکەوتوانە سەروا بەکاربێنن و هەقی خۆی پێ بدەن ، لەهەمان کاتیشدا ڕێ ڕۆشنکردنە بۆ هاندانی شاعیرانی تازە تا لە چوارچێوەیەکی لەبار و ڕەسەندا داهێنان لە دابەشکردنی سەروادا بکەن .

- لێکۆڵینەوەی سەروا وەك لایەنێکی تیوری شیعری ، دەوڵەمەندکردنی تیوری لێکۆڵینەوەی شیعری کوردییە کە ئەمەش بەشداری کردنە لە بەرەوپێش بردنی ئەم تیورە ، بەرەو داڕشتنی تیورێکی گشتی و فراوانی هەمەلایەنی شیعری کوردی .

## پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکە :

بڕگەکانی هەر لێکۆڵینەوەیەك پەیوەندی بە جۆری بابەتەکە ، خۆیەوە ، هەیە و لەوەوە وەردەگیرێ و گەلاڵە دەکرێ ، بۆیە داڕشتنی هەر بەرنامەیەك دەبێ لەبەر ڕۆشنایی لایەنە جیاوازەکانی

بابەتەکە و بۆچوونی نووسەرەکەو ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە ئەنجام بدرێ. بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە کە سەروای کوردییە ، زۆر لایەنی جۆراو جۆر دەگرێتەوە ، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکە زۆربەی لایەنەکان بگرێتەوە، کردوومانە بە پێشەکییەك و دەروازەیەك و شەش بەش و ئەنجام .

**پێشەکییەکە :**
ئەمە پێناسەی بابەتەکە و هۆی هەڵبژاردن و پرۆگرامی لێکۆڵینەوە و گیرو گرفتەکان و هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکانی پێشوو دەگرێتەوە .

**دەروازەکە :**
بۆ موناقەشەکردنی زاراوە و چەمکی سەروا تەرخان کراوە ، وەك سەرەتاو ڕێ خۆش کردنێك بۆ چوونە ناو بەشی یەکەم .

**بەشی یەکەم :**
ئەم بەشە زیاتر گشتی و تیورییە ، وەکو بناغەیەکە بۆ ڕۆنانی بەشەکانی تر. ئەم بەشە بەسەر سێ (باس)دا ، دابەش بوە . باسی یەکەم بۆ پێناسەی گشتی و بنەماو ئەرکی سەروا و پەیوەندی بە ترپە (ریتم) و ئاواز و بابەتی شیعر و سیستەمی دەنگی زمان (فۆنۆلۆجی) تەرخان کراوە . باسی دووەم لێکۆڵینەوەیەکی گشتی بنەمای سەروای شیعری جیهانییە ، پەیدا بوون و سیستەمی سەروای هەندێ نەتەوەی کۆن و نوێی ڕۆژاوا و ڕۆژهەلاتی وەکو یۆنانی و لاتینی و فەرەنسی و ئیتالی و ئینگلیزی و عەرەبی و فارسی و هندی. باسی سێیەم لە جۆرەکانی سەروا دەکۆڵێتەوەو لە ڕوانگەی جیا جیا دابەشی دەکا ،لە ڕووی ژمارە و ئاواز و ئاراستە و چۆنیەتی دووبارە بوونەوە ... لێکیان جیا دەکاتەوە کە هەریەکە خاوەنی تایبەتێتی خۆیەتی و لە شوێنی تایبەتی دێت .

**بەشی دووەم :**
لەبارەی سنوورو ڕەگەزەکانی سەروای شیعری کوردی دەدوێ. هەوڵێکە بۆ دیار کردنی سنووری سەروا (کەمترین دەنگو زۆرترین دەنگو وشە کە سەروا پێك دێنن)، ئەمیش لە ڕێگای شیکردنەوەی وەسفی شیعری کوردییەوە دەستەبەر دەکرێ. ئەم بەشە سێ باسە.

- باسی یەکەم : بۆ ناسنی دەنگی سەروا تەرخان کراوە . سنووری سەروا لەکۆتایی وشەی سەروادا دیار دەکات و زاراوەی دەنگە جیاوازەکان لێك جیا دەکاتەوە . جەختی هەرە قورسی ئەم باسە دەکەوێتە سەر دەنگی (ڕەوی) چونکە (ڕەوی) چەقی چڕبوونەوەی هەموو قورسایی ئاواز و زایەلەی دەنگو وشەکانی سەروایە . لەم باسەدا هەوڵ دراوە چالاکی دەنگەکانی کوردی لە بینینی دەوری ڕەویدا ڕون بکرێتەوە ولە ڕێی جەردی کۆمەڵێ دیوانی شیعری کلاسیکییەوە دەنگەکان بەگوێرەی کەم و زۆرییان لەبوونە ڕەویدا پۆلین بکرێ. جیاوازی نێوان ڕەوی و دوا دەنگی دێریش

ڕون کراوەتەوە کە هەندێ جار یەك دەگرن و هەندێ جار لەیەك دا دەبڕێن . لەم باسەدا جگە لەڕەوی ، پێش ڕەوی و پاش ڕەوی دیارکراون و جۆر و سنووریان لێك جیا کراوەتەوە .

- باسی دووەم : لە ئاستی وشەکانی سەروا دەدوێ . وشەی سەروا چییە ؟ پەیوەندی وشەکانی سەروا لە ڕووی ڕۆنان و کێش و ئاواز و مانا و بەشەکانی ئاخاوتنەوە، دیار کردنی سنوور و شیکردنەوەی ئەرك و جۆرەکانی پاش سەروا ( ڕەدیف ) . چونکە شیعری کلاسیکیی کوردی یەکێکە لەو جۆرە شیعرانەی زۆر چالاکانە ڕەدیف بۆ پتەوکردنی ئاواز و خەست کردنەوەی مانای شیعر بەکار دێنێ ئینجا پێش سەروا ( حاجیب ) و دەوری لە ڕێگا خۆش کردن بۆ سەروا و پەیوەندی بەوشەی سەروا و ڕەدیفەوە ڕون کراوەتەوە کە جاری وا هەیە هەرسێکیان ( حاجیب ، وشەی سەروا ، ڕەدیف ) هەموو درێژایی دێر و شیعر پڕ دەکەنەوە و دێرەکە دەبێ بە یەك پارچە ئاوازی دووبارەوە بووی چڕ و تێکچڕژاوی پتەو .

- باسی سێیەم : لە تێکەڵبوونی کۆتاییەکان دەدوێ. تێکەڵبوونی ڕەوی و پاش ڕەوی یان ڕەدیف و وشەی سەروا.

## بەشی سێیەم :

بریتییە لە لێکۆڵینەوەی چۆنیەتی دابەشبوونی سەروا لە دێر و پارچە و هونەرە شیعرییەکانی وەکو: قیتعەو غەزەل و قەسیدە و تاك و مەسنەوی و سێینە و چوارینە و پێنجینە و.... تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و موستەزاد و موەششەح و سۆنێتە و.... ئینجا بەراورد کردنی ئەم هونەر و پارچانە لەگەڵ پارچە هۆنراوە ( stanza - stroph )ی نەتەوەکانی تر لە ڕووی ژمارەی دێر و دابەشبوونی سەرواوە . ئەم بەشە سێ باسە. باسی یەکەم بۆ چەمك و جۆر و پێکهاتنی پارچە هۆنراوە تەرخان کراوە. باسی دوەم لە پارچە گشتییەکان و باسی سێیەم لە پارچە تایبەتییەکان دەدوێ.

## بەشی چوارەم :

دوو باسە. باسی یەکەم هەوڵێکە بۆ لێك نزیك خستنەوەی دوو زانستی سەر بە لێکۆڵینەوەی شیعر ( سەرواناسی و ڕەوانبێژی ) . پەیوەندی نێوانیان دەردەخا و باسی یەك گرتنیان دەکا لە هەندێ هونەری جوانکاری شیعریدا وەکو : ئیعنات و جووت سەروا ( ذوقافیتین ) و سەروای دووبارە و سەروای ئەڵقەبەند ... . باسی دوەم بەدوای کەم و کورتییەکانی سەروای شیعری کوردیدا دەگەڕێ و هۆی ڕوودان و ڕادەی کەم کردنەوەکەیان لە نرخی ئاوازەیی شیعردا ڕوون دەکاتەوە .

## ئەنجام :

لێرەدا پوختەی بیر و بۆچوونەکانی هەر شەش بەش چڕکراوەتەوە و بە کورتی و چڕی خراوەتە ڕوو.

## گیروگرفتەکان :

جگە لەوەی (بابەتی نووسین) ، خۆی لە خۆیەوە ، گرفتێکە تۆژەرەوە دەست نیشانی دەکا و هەوڵ دەدا زانستیانە چارەسەری بکا ، لەکاتی چارەسەرکردنی ئەم گرفتە سەرەکییەدا کە ڕایی کردنی کردەوەی تۆژینەوەیە ، زۆر جار هەر لەسەرەتاوە گیروگرفتی گەورە یان بچووك سەر هەڵدەدا. ئەرکی تۆژەرەوەیە بەسەریاندا زاڵ بێ بۆ ئەوەی ڕێگای لێکۆڵینەوەی لەبەردەم تەخت بێ . ئێمەش لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەندێ گیروگرفتمان هاتە پێش کە گرنگترینیان ئەمانە بوون :

- گرفتێکی گەورە نەبوونی زاراوەی تایبەتە بە سەروا . ئەمەیش زادەی نەبوونی لێکۆڵینەوەی زانستی پێشوە لەم بوارەدا . تا لێکۆڵینەوەی زانستی لە بوارێکدا پەرە نەسێنێ زاراوەی زانستی تێدا گەڵاڵە نابێ . لە کوردیدا ، زانستێکی وەکو سەرواناسی بابەتێکی لێکۆڵینەوەی نوێیە ، ڕەگی قووڵ و فراوانی نییە ، بۆیە زاراوەکانی نەچەسپاون . لەبەرەو ڕوو بوونەوەی ئەم گرفتەدا ، دوو ڕێچکەمان لە پێشە :

١- بەکارهێنانی ئەو چەند زاراوە کەمەی سەرواناسی کە تا ئێستا کەم و زۆر لە لێکۆڵینەوەی شیعریدا بەکار هاتوون وەکو: سەروا ، تاك، چوارینە ، پێنجینە...

٢- بەکارهێنانی زاراوەی عەرەبی و فارسی و ئەورویی کە وەرگێڕانیان درێوە و تا ئێستا وشەی پڕ بە پێستی خۆیان لە کوردیدا نەدۆزراوەتەوە .

هەڵبەت دەکرێ هەندێ یان هەر هەموو ئەم زاراوانەی سەر بە سەرواناسین بکەین بە کوردی بەڵام خۆ لە زاراوە سازیدان و بەم فراوانییەش کارێکی پڕ مەترسی و لێپرسینەوەیە. ئەمەمان بۆ پسپۆرانی زاراوە سازی و ئەکادیمیای زانستی دواڕۆژ جێ هێشت .

- کەمی سەرچاوەی تیوری و زانستی لەبارەی سەرواوە . ڕاستە زۆر سەرچاوەی عەرەبی لەبەردەستدان ، هەر لە زەمانی خەلیل و ئەخفەشەوە [٢٥٩] تا ئێستا بەڵام هەموویان لە یەك بازنەدا دەخولێنەوە ، جیاوازیی نێوان زاناکانی سەرواناسییان زۆر کەمە ، بۆیە شتی نوێ و تازە بابەتیان دەگمەنە . لە فارسیدا بەرهەمی سەرواناسی دوو جۆرە : جۆرێکیان لەژێر کاریگەری سەرواناسی عەرەبیدا نووسراوەتەوە و هەمان زاراوە و دابەش کردنی بەکارهێناوە ، هەر لە قەیسی ڕازییەوە [٤٠٦] تا ئێستا جگە لەزیادکردنی چەند زاراوەیەکی کەمی وەکو قەید و حاجیب و ڕەدیف و مەزید و نایرە [٤١٠ : ١٤٥-١٥٤] . جۆری دوەمیان لەسەر بنچینەی دەنگسازی لەسەر سەروا نووسراوە ، وەك لاساکردنەوەی لێکۆڵینەوە دەنگییەکانی زمانە ئەورووپییەکان کە زیاتر دەنگو بڕگە کراون بە پێوەری شیکردنەوەی سەروا [٤٠٥ : ٩٥-١٠٠] .

کەچی لە زمانە ئەورووپییەکان ، لەبەر ئەوەی لێکۆڵینەوەی بڕگە و فۆنۆلۆجی زۆر دیراسە کراوە ، سەروا زیاتر لەم ڕوانگەوە شیکراوەتەوە . دەنگو بڕگە لەباتی تیپ و حەرەکەی عەرەبی و فارسی

کۆن بەکاردێ، بەکورتی سەروایش خەریکە دەخزێتە ناو فۆنۆلۆجییەوە. لەم بارەیەوە بۆچوونەکانی لیچ [٤٦٦] و لانز [٤٧٥] و فرێزەر [٤٦٣] و مۆریس گرامۆن [٤٨٤] و ئەنتۆنیۆ کیلیس [٤٨٩] وەی تریش جێگای سوود لێ وەرگرتن بوون.

- نەبوونی یان زۆر کەمیی لێکۆڵینەوەی سەروا لە کوردیدا، چ لە رووی تیۆرییەوە و چ لەبارەی پەیرەوکارییەوە. هەبوونی لێکۆڵینەوەی وا زەمینە بۆ تۆژەرەوە خۆش دەکات و بەردەمی رۆشن دەکاتەوە، بەمەوە زووتر و ئاسانتر رێگای خۆی پێ دەدۆزرێتەوە. بە پێچەوانەوە، بێ سەرچاوەیی ئەرکی تۆژەرەوە سەختتر دەکات، چونکە کارەکەی زیاتر لەرچەشکاندن نزیک دەبێتەوە. ئەمەش کارێکی ئاسان نییە. وەك چارەسەرێکی ئەم بێ سەرچاوەییەی کوردی سوودمان لەسەرچاوە بیانییە رۆژاوا و رۆژهەلاتییەکان وەرگرتوە، بۆیە سەرچاوەی سەرەکیمان لە کوردیدا کەرەستەکانە کە بە زۆری شیعری کلاسیکی دەگرێتەوە. لە پشکنین و شیکردنەوەی سەروای ئەو شیعرانەوە بەرەو داڕشتنی یاساو پۆلین کردن و ئەنجام دەرخستن رۆیشتووین.

## چی لەبارەی سەروای کوردییەوە نووسراوە :

لە کوردیدا، کەم لەسەر سەروا نووسراوە، لە لێکۆڵینەوەی گشتیی شیعریشدا کەم لای لێ کراوەتەوە. کۆنترین شت، بە پێی ئاگاداری ئێمە، کە لەبارەی سەرواوە نووسرابێ، ئەو چەند دێرەیە کە ساڵی ۹۲۰ ئەمین فەیزی لە (ئەنجوومەنی ئەدیبان)دا لەبارەی شیعرێکی مەولەوی نووسیویە کە لە مەسنەوییەوە چۆتە سەر سەروای موتەناویب و دەڵێ : (مەولەوی بە موقتەزای ئەو مەوقیعە کە تێدابووە هیچ چاوی بە شیعری فەرەنگنەکەوتوە، لەگەڵ ئەوەش، لەسەر ئوسلوویی ئەوان شیعری نەزم کردوە. لە قیتعەیێکدا مەسرەعی ئەووەلی تەقفییە کردوە لەگەڵ مەسرەعی سالیس و قافیەی مەسرەعی سانی رێك خستوە لەگەڵ مەسرەعی رابیع ... ئەم ئوسوولە خیلافی ئوسوولی شوعەرای ئێرانە و مەولەوی لە کەسی نەدیوە، مەحزەن بە حوسنی تەبیعەتی خۆی موناسیبی زانیوە و ئیستیعمالی کردوە) [١٩ : ٣١]. بەلای منەوە، ئەمە نەلاساکردنەوەی فەرەنگەو نە بە حوسنی تەبیعەتی بەشتێکی لەباری زانیوە و بەکاری هێناوە، بەڵکو قافیە تەنگیی ناچاری کردوە لەسەر مەسنەوی لابدا و بچێتە سەر ئەم سەروا موتەناوبە چونکە پێش ئەم وەرچەرخانە دەڵێ :

مەنعم مە کەرێ گرانەن دەردم
ئەر شێویا بۆ قافیەی فەردم [١٨٦ : ٦٩].

ساڵی ١٩٢٦، شێخ نووری شێخ سالح، لە رۆژنامەی (ژیان)دا چەند دێرێکی لەبارەی سەرواوە لەژێر ناوی (قافیە)دا بڵاوکردۆتەوە. لە پێناسە و ئەرکی سەروادا دەڵێ : (قافیە لە نیهایەتی هەموو مەسرەعێکدا لەبەینی هیجای ئاخیردا بە ئیعتباری تەسەوت عیبارەتە لە موتابەقەت -

مەقسەد لە قافیە بۆ ئیفادەی تەئمینی ئاهەنگێکی مۆسیقییە ... لە نیهایەتی مەسرەعەکاندا هیجاکانی ئاخیری مالیکی عەینی تەرزی تەسەوت بوون ئەو تەنازورەی کە لە بەینی ئەسواتا حاسیل ئەبێ سامیعە تەواز ئەبێ ... ) [٢٢٨ : ل٢] .

لەم بۆچوونەی شێخ نووریدا دوو خاڵی گرنگسەرنج ڕادەکێشێ :

١ - لەپێناسەی سەروادا تیپ و حەرەکەی نەکردوە بە پێوانە ، دەنگو بڕگەی کردوە بە پێوانە کە ئەمە وردتر و زانستی ترە .

٢ - دوو ئەرکی گرنگی سەروای دەست نیشان کردوە :

أ - مسۆگەر کردنی ئاوازێکی مۆسیقی لە کۆتایی لەتە دێرەکان .

ب - ئەو خۆشی و لەگوێ زرنگانەوەی لە ئەنجامی بەیەکچوونی دەنگەکان پەیدا دەبێ .

ساڵی ١٩٣٩ ، جەمال عیرفان لە ژمارە (٥٠٦)ی ڕۆژنامەی (ژین) شتێکی لەسەر سەروا نووسیوە بەڵام خۆی لەوردەکاری سەروا نەداوە [٤٩٣ : ٢٧٨] دیسان لە ژمارە (٨٠٧)ی گەلاوێژی (٩٤٧)دا لە (٢٧) خاڵی پەندو فەلسەفەدا ، خاڵێکی بۆ سەروا داناوە (شیعر موتلەقەن قافیەی پێویست بوایە ، ئەبوایە هەر بەقەدەر قافیە شیعر ببێژرایە ) [٢٢٥ : ٨٠] هەوڵێکە بۆ دەرخستنی پێوەندی نێوان سەروا و شیعر، کە شیعر لە سەروا گەورەترو فراوانترە .

بێکەس لە گەلاوێژی ١٩٤٣ دا ، ڕەخنەی لە شیعرێکی : م. کاردۆخی گرتوە کە پاش سەروای تێدایە بەڵام پەیڕەوی سەروای تێدا نەکراوە و دەڵێ (ئەم شیعرە مەوزونە بەڵام وا دیارە کە : م. کاردۆخی لە ئوسوولی شیعرا نەشارەزایە چونکە دوای وشەی هەردوو مەسرەعەکە کە "جێگە" یە ، ئەبێ کەلیمەی پێش "جێگە" لەسەر یەك وەزن بێ ) [٢٢٤ : ٥٥] . کاردۆخی لە وەڵامدا دەڵێ : (قافیەی شیعرێکیان چەوت بوو هەرچەندە مەوزون بوو ، چونکە نەمئەزانی دوا وشەی دوو مەسرەع . ئەگەر هاتوو یەك کەلیمە بوو پێویستە وشەی پێش ئەو دوو کەلیمەیە لەسەر یەك وەزن بێ ، ئەمەم نەزانی بوو ، بەڵام ئەمزانی زۆر لەشاعیرەکانی فارس و ئەدیبەکانی سەدەی بیستەم فەرموویانە شاعیر پێویست نییە زۆر خۆی ماندوو بکا بۆ دۆزینەوەی قافیە ، شیعر هەر مەوزون بێ بەسە ، مەبەست لە شیعر دەرخستنی ئامانجە نەك ڕیزکردنی وشەو قافیە ) [٢٣٧ : ٦٣] .

جگە لەوەی هەردووکیان (بێکەس و کاردۆخی) لە حاڵەتی هێنانی پاش سەروادا ، باسی (مەوزوونی)ی وشەی پێشتر دەکەن نەك سەروادا ڕێی ، کاردۆخی بۆ بەرگری لە ڕەچاو نەکردنی سەروا بەهۆی پاش سەرواوە ، ڕای شاعیرانی فارسی دەکاتە پاڵپشت کە شاعیر پێویست ناکا خۆی بە دۆزینەوەی وشەی سەروا ماندوو بکا ، چونکە کێش بە پلەی یەکەم دێ کە بۆ شیعر پێویستە ،

ئەم رایە لەگەڵ رای ئەرەستۆ[٢٦٢ : ١٣] و پەیڕەوکەرانی شیعری ڕەها (المرسل) یەك دەگرێتەوە.

محەمەد سدیق عارف (حسێن عارف) ساڵی ١٩٥٨ کتێبی (کامەران و هۆنراوەی نوێ)ی بڵاوکردەوە. پێش چوونە سەر شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی شیعرەکانی کامەران لەباسێکی هۆنراوەی نوێدا کە لە هۆنراوەو شێوەو ناوەڕۆك و ئیقاعەوە دەدوێ دەچێتە سەر کێش و سەرواو پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە دەبێ سەروا بەپێی ئاوازی هۆنراوەکە بگۆڕێ و دەڵێ: ((ئەگەر هەر ناچاری بوو، ئەو قافیەیە بکرێ بەقوربانی ماناکەو وازی لێ بهێنرێ، یانی هیچ پێویست ناکا شاعیر لایەکی بیرکردنەوەی تەرخان بکا بۆ هێنانەوەی قافیە))[١٩٢ : ١٨]. واتە حسێن عارف قافیە هیچ بەپێویست نازانێ و لابردنیشی بەلاوە کارێکی ئاساییە.

ئیحسان، ساڵی ١٩٥٨ لە رۆژنامەی (ژین)، لە وتارێکدا بە ناوی ((بەراوردێکی ئەدەبی کوردی)) باسی حاجی قادر دەکا: (بەڵام هەر لەم سەدەیەدا حاجی قادری کۆیی شێوەو جۆری هەڵبەستەکانی تا رادەیەکی زۆر گۆڕی، وە لە قافیەی یەك شێوە هەتا رادەیەك خۆی رزگار کرد)[٢٢٢]. شیعرەکانی حاجی لەبارەی سەرواوە دوو جۆرن: جۆرێکیان غەزەل و قەسیدەیە و، یەکێتی سەروایان تێدا پەیڕەو کراوە، جۆرەکەی تریان هەمووی مەسنەوین بەتایبەتی شیعرە سیاسی و نیشتمانییەکانی کە لەگەڵ مەسنەویەتێدا، بە کێشی کورت داڕێژراون.

رەفیق حیلمی لە بەرگی دووەمی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)دا، لەکاتی هەڵسەنگاندنی شیعرەکاندا زۆر جار سەروایش دەخاتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە. لەباسێکی گشتی شاعیرە کلاسیکییەکان لەدەوری سەروا دەدوێ: (ئاسۆی تەفکیری شاعیرەکان زۆر سنووردار و ماوەی قافیەبازییان ئێجگار تەنگبوو و بەهۆی ئەم قافیە تەنگی و سنووردارییەوە ماوەی شیعریان کورت بوو و هەندێ جار لە پێنج بەیت تێپەڕی نەکردوە)[٩٥ : ١٢٧]، کە دێتە سەر شیکردنەوەی شیعری حەمدی و بێخود و ڕەمزی مەلا مارف و سەلام و گۆران ... باسی سەروایش دەکات و کەم و کورتی سەروای هەندێ شیعری ئەم شاعیرانە پیشان دەدا. لەبارەی حەمدییەوە دەڵێ: (گەلێك لە شیعرەکانی لەبەر سەنعەتی لەفزو قافیە تەنگیی لە رەوانی و سەلاسەت مەحروومە)[٩٥ : ١١]. لە هەڵسەنگاندنی شیعری (دڵ بە دووی ئەفسانە کەوت)ی بێخوددا، دەڵێ (قافیەکانی زۆر جوان و شاعیرانەیە، ئەوەندە هەیە قافیەی - وائەبێ - لەسەدری (١)ی بەیتی یەکەمدا هاتوە و لە عەجزی بەیتی پێنجەمدا دوبارەکراوەتەوە)[٩٥ : ١٣]. ئەوەی رەفیق حیلمی بەناتەواوی دەزانێ، ناتەواوی نییە چونکە زۆربەی شاعیرە کلاسیکییەکان کە پەیڕەوی یەکێتی سەروایان کردوە، سوودیان لە تەقفیەی دوو لەتی دێری یەکەم وەرگرتوە، وشەی سەروای لەتی یەکەمیان لە کۆتایی دێری دوەم یان دێری کۆتایی یان پێش کۆتایی دووبارەکردۆتەوە. لە باسی شیعرێکی ڕەمزی مەلا مارفدا کە لەباتی (رزگاریم) وشەی (رزگارم)ی کردوە بەسەروا دەڵێ (ئەمە زەرووڕەتی مەقبوولە)،

لە راستیدا ئەمە یەکێکە لە کەم و کورتییەکانی سەروای تەقلیدی. دووبارە کردنەوەی وشەی سەروا لە مەدایەکی کورتدا تەنگێکی یەکێتی سەروایە ، ڕەفیق حیلمی ڕەخنەیەکی لەم بارەوە ئاراستەی سەلام کردوە (وشەی - ئاو - دووجار کراوە بە قافیە کە ئەمە ڕەغنەی لێ ئەگیرێ ) [٩٥ : ٩٢] . لە هەڵسەنگاندنی سەروای شیعرەکانی گۆراندا زۆر بە چاکی نرخیان بۆ دادەنێ (لە کاتێکا کە زۆر کەس مل کەچی قافیە ئەبن ، گۆران قافیەی مل کەچی خۆی کردوە . بۆ قافیەیەکی نایەتی ڕەوانی و سەلاسەتی بیری خۆی نەئاڵۆزاندوە و تێك نەداوە و ڕشتەی خەیاڵی قافیە وەکو ( مێروورووین )ە بە دەسییەوە ، بەمەیلی خۆی یاری پێ ئەکا ... زۆر جاریش ڕەنگە هەر بیری لەقافیە نەکردبێتەوە لەگەڵ ئەمەشا شیعرەکانی سەراپا قافیە دارە ، چونکە چەشکەیێکی بەرزی تەبیعی وشەکانی لە وێنەی (سەجع و قافیە )دا هاتیوە بەسەر زمانیا ) [٩٥ : ١٧٤] .

گۆران لە موحازەرەکانیدا ، کە ساڵی ٩٦٠ و بەدواوە لە بەشی کوردی زانکۆی بەغدا لەبارەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی داویە و کاکەی فەللاح بە زنجیرە لە ژینی ساڵی ٩٧٠ دا بلاوی کردۆتەوە ، هەروەها لە وتاری (کۆن و تازەیی لە هەڵبەستا) کە ساڵی ٩٦١ لە گۆڤاری (هیوا)دا بلاوی کردۆتەوە ، لای لەسەروا کردۆتەوە . لەمەی دواییاندا باسی هەڵبەستی کۆن دەکا کە هەمووی لەسەر یەك سەروا دەڕوا : ( هەڵبەستی کۆن دوایی هەموو بەیتەکانی بە درێژایی کشانی قەسیدە یا غەزەل لەسەر یەك قافیە ئەڕوا ، بەلام لە هەڵبەستی تازەدا دێرەکان - زۆرتر - دوو دوو ئەبەستێ پێکەوە ، لای ئەو پەڕی لەقافیە بەندی دێرەکانی یەك بەند زیاتر تێنابەڕێ ) [٢٣٤ : ٧] . واتە سەروا و چۆنیەتی دابەشبوونی دەکا بە ڕەگەزێکی جیا کردنەوەی هەڵبەستی کۆن و تازە . لە خاڵێکی تری هەمان وتاردا ، ترنجانی یەکێتی بابەت لەناو تاکە دێردا ، بۆ تەنگیی یەکێتی سەروا دەباتەوە : ( ئەو ماوە تەسکییەی یەکێتی قافیە دروستی ئەکا ، هەڵبەستی کۆنی ناچار کردوە یەکێتی بابەت - وحدە الموضوع - بترنجێنێتە ماوەی بەیت ) [٢٣٤ : ٧] .

یەکەم هەوڵی فراوان و لەمانە پێشکەوتووتر بۆ توێژینەوەی سەروا کارەکەی ( دکتۆر ) مارف خەزنەدارە لە کتێبی (کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا ) ، کە (٩) لاپەڕەی بۆ لێکۆڵینەوەی (قافیەی شیعری کوردی ) تەرخان کردوە [١٨٤ : ٥٦-٦٤]. پێناسەی سەروا دەکات و بەمەرجێکی گرنگو پێویستی دادەنێ بۆ شیعری کوردی . باس دەکا کە قافیە لە زمانەکانی هیند و ئێرانی و ئینگلیزی و شیعری روسی ( فۆلکلۆری ) کۆندا نەبوە . سەروا دابەش دوو جۆری سەرەکی دەکا : یەکێتی سەروا و سەروای ڕەنگاوڕەنگ. لە باسی یەکێتی سەروادا ، هەوڵێکی ناڕاستەوخۆ هەیە بۆ دیارکردنی سنووری سەروا بە نموونەی سەروای یەك بزوێن و یەك نەبزوێن بەلام یەك نەبزوێن بەتەنێ سەروای پێ دروست ناکرێ هەر دەبێ یەکێتی بزوێنی پێشەوەی ڕەچاوبکرێ جا چ کورت بێ (تا دەگاتە بزۆکە ) و چ درێژ بێ . ئینجا بۆ یەکەم جار لە کوردیدا باسی (پاش قافیە ) دەکا . پێناسەی دەکاو دابەش دوو جۆری دەکا ، ١- یەك وشەیی . ٢- رستە و شوبە رستە . لە کۆتاییدا

باسێکی (مەسنەوی) و سەروای خۆماڵی و سەروای لاوك و حەیران و دەقی ئایینی یەزیدییەکان دەکات.

عەلائەدین سەجادی ساڵی ١٩٦٧ کتێبی (ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی) بڵاوکردەوە. لەچەند جێگایەکدا پێناسەی سەروا دەکات و لەجیاکردنەوەی هۆنراوەو پەخشاندا سەروا بەنیشانەیەکی هۆنراوە دادەنێ. لە هەڵسەنگاندنی شیعرێکی شێخ نووریدا کە یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەوکراوە هەوڵ دەدا وردەکاری شێخ نووری لەم بارەیەوە ڕوون بکاتەوە و لە کۆتاییدا دەڵێ مەگەر تۆفیق فیکرەت ئەم ڕچەیەی شکاندبێ [١٣٧ : ٣١٨]. ئەم ڕایە بیربەرەو کاریگەری شاعیرە نوێخوازەکانی تورکیا دەبا لەسەر شاعیرانی پێشەنگی بزووتنەوەی نوێخوازی شیعری کوردیی سەرەتای سەدەی بیستەم. بۆ ساڵی (١٩٧٠)یش عەلائەدین سەجادی (نرخ شناسی) بڵاوکردەوە. لەوێش لەچەند جێگایەك باسی سەروا دەکا. سەروا بە دیمەنێکی ڕواڵەتی تەواو و یەکێ لەپایە هەرە گرنگەکانی هۆنراوە دادەنێ [١٢٨ : ١٠٢]. ئینجا باسی سەروای دوو تاکی و قەسیدە و غەزەل دەکات و لەبارەی سەروای شیعریی نەتەوەکانی ترەوە دەڵێ سەروا لە یۆنانی کۆن و ئەڤێستادا نەبوە.

فەرەیدون عەلی ئەمین لە (چەند سەرنجێك لە پیرەمێردی شاعیر)دا باسێکی بۆ (پیرەمێرد و قافیەی شیعر) تەرخان کردووە. پێناسەی سەروا دەکات و بۆ دەرخستنی وەستاکاری پیرەمێرد لەسەروا سازیدا، پێشەکی پێنج دێری شاعیرانی تر دێنێ کە بەلای خۆیەوە سەروایان بێ هێزە، بۆ ئەوەی بەهۆی بێ هێزیی سەروای ئەو شعرانەوە بەهێزیی سەروای شیعری پیرەمێرد دەربخات، بەڵام تەنیا دوو دێری پیرەمێردی بەنموونە هێناوەو بەس [أ١٥٢ : ٢٧-٣٠].

نووسەری ئەم کتێبەش ساڵی ١٩٧١ لەهەڵسەنگاندنی (خەندەکەی بابی)ی بێلاردا دوو وتاری بڵاوکردەوە. یەکەمیان بەناوی (هۆنراوەی کوردی و عەروزی عەرەبی) [٢٣٠] و ئەوەی تر بەناوی (خەندەکەی بابی) [أ٢٣٠]، بەدەم باسەکەوە هەندێ لە دابەش بوونی سەروای شیعر دواوە بەڵام لە موەششەحدا چونکە (خەندەکەی بابی) بە موەششەح نووسراوە.

محەمەد فەریق حەسەن ساڵی ١٩٧٥ وتارێکی لەگۆڤاری (بەیان)دا بڵاوکردەوە بەناوی (ئاخۆ هۆنراوەی کۆن هەتا کەی بر ئەکات). بۆ بەرگری کردن لەشیعری کلاسیکی پێ لەسەر گرنگی ئەو جۆرە شعرە دادەگرێ کە سەروادارەو لەم بارەیەوە دەڵێ: (مەسئەلەی سەروا شتێکی کاتی و کەم نییە تاکو بەئاسانی بتوانین پشت گوێی بخەین) [أ٢٢٧ : ٦].

ئازاد عەبدولواحید لە ژمارە (٥٩)ی (بەیان)دا وتارێکی لەسەر سەروای دیوانی (برچی ئەو کچە..)ی لەتیف هەڵمەت نووسیوە. هەوڵی داوە لەبارەی سەرواوە شیعرەکان هەڵسەنگێنێ. وتارەکە هەندێ سەرنجی ورد و چاکی تێدایە بەڵام زۆر جار لەباسە سەرەکییەکە دەردەچێ بۆ کێش

و ڕەوانبێژی و هەندێ جاریش سۆزی هەڵچووی هەڵمەتی نازانستی پێ دەباتە سەر هەڵمەت و دیوانەکەی، بێ ئەوەی هیچ بنەمای بابەتی و زانستی لە بۆچوونەکانیدا هەبێ [٢٢١ : ١٤-١٨].

کەمال غەمبار لە ژمارە (٦٣)ی (بەیان)دا وەڵامی ئازاد عەبدولواحیدی داوەتەوەو بەرگری لەهەڵمەت دەکات و راو بۆچوونەکانی ئازاد رەت دەکاتەوە. ئەگەرچی هەندێ بۆچوونی لەبارەی سەروای شیعری هەڵمەت ڕاستە، بەڵام ئەوەندە هەیە بەرگری لە کەم و کورتیەکانیشی دەکات.

کەریم شارەزا لەبەرگی یازدەمینی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد باسێکی بەناوی (ساغ کردنەوەی هەندێ گیروگرفتی شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی) [٢٢٣] بڵاو کردۆتەوە و چەند لاپەڕەیەکی (٢٤٢-٢٦١) بۆ دۆزینەوە و پیشاندانی کەم و کورتییەکانی سەروای شیعری حاجی تەرخان کردوە. (١٩) تێبینی وردی تۆمار کردوە. هەر هەموویان لاوازی و ناتەواویی دێرەکان دەردەخەن و لە هەندێ شوێندا شارەزایی لەسەرواناسیدا دەبێ بەهۆیەك بۆ دۆزینەوە و چەسپاندنی شێوەی دروستی دێرە شیعرێ کە بەشێوەی جیا جیا بڵاوکراوەتەوە [٢٢٣ : ٢٤٨].

یەکێکی تر کە باسی سەروای کردوە محەمەد سەعیدی ئیبراهیمی محەمەدییە لە کتێبی (گەشتێ لە عیلمی بەلاغە)، کە لاپەڕەکانی (١٠٩-١٣٣)ی بۆ لێکۆڵینەوەی سەروای شیعری کوردی داناوە. جگە لە پێناسەی سەروا و بەشەکانی، هونەرە شیعرییەکانی وەکو مەسنەوی و چوارینە و پێنجینە و غەزەل...ی باس کردوە و نموونەی بۆ هێناون، لەزۆر شوێندا شیعری کوردی و فارسی لە ڕوانگەی سەرواوە بەراورد کردوە و نموونەی بە هەردوو زمان هێناوە [١٩٣ : ١٠٩-١٣٣].

لە کۆتایی هەشتاکان و لەنەوەدەکان کۆمەڵێ نامەی ئەکادیمی بۆ سەندنی بڕوانامەی ماجستێر و دکتۆرا لەبارەی شیعر و شاعیرانی کوردەوە پێشکەش زانکۆکانی هەندەران و زانکۆی سەلاحەدین و بەغدا کراوە. هەندێکیان چەند لاپەڕەیەکیان بۆ سەروا تەرخان کردوە، بەڵام زۆریەیان مەبەستی سەرەکییان شیکردنەوەی سەروای شیعرەکان نەبوە، هەر تەنیا بۆ پڕکردنەوەی بەرنامەی نووسین ئەم بەشەی سەروایان تێ خستوە، بۆیە زۆری تێدا قووڵ نەبوونەتەوە هەر تەنیا بە وەرگرتن و لێکدانەوەی چەند زاراوەیەکی سەرواناسی عەرەبی و پەیڕەوکردنی بەسەر شیعری کوردیدا وازیان هێناوە، وەکو نامەکانی ژمارە [٤٩١]، [٤٩٦]. لەو نامانە دلشاد عەلی لەهەریەکە لە نامەکانیدا (ماجستێر و دکتۆرا) چەند لاپەڕەیەکی بۆ شیکردنەوەی سەروا تەرخان کردوە. لە نامەی ماجستێرەکەیدا (بنیاتی هەڵبەست لەهۆنراوەی کوردیدا) [٤٩٢]، (٣٦) لاپەڕەی بۆ سەروا داناوە. لەسەرەتادا ڕای چەند نووسەرێکی بیانی و کوردی لەبارەی سەرواوە هێناوە و موناقەشەی کردوون. پاشان ڕۆڵی سەروای لەبنیاتی هەڵبەستدا ڕوون کردۆتەوە. لەنامەی دکتۆراییشیدا (دیلانی مرۆڤ و شاعیر، باسێکی بۆ سەروای شیعری دیلان

تەرخان کردوە و لە ڕوانگەی یەکێتی سەرواو سەروای ڕەنگاو ڕەنگەوە شیعرەکانی هەڵسەنگاندوە. ئەوەی لەم دوو نامەیەدا لە دڵشاد دەگیرێ ئەوەیە ، لەنامەی ماجستێرەکەیدا شێخ نووری بە یەکەم نووسەری کورد دادەنێ کە ساڵی ۹۲٦ لە (ژیان)دا باسی سەروای کردوە و بیرو ڕاکانی لەم ڕووەوە شی کردۆتەوە [٤۹۲ : ۱۰۲] ، کەچی لەنامەی دکتۆراکەیدا لەدیار کردنی سەرەتای باس کردنی سەروا لە کوردیدا دەڵێ : (ئەوەندەی من ئاگادارم یەکەم کەس باسی قافیەی کردبێ لە کوردیدا جەمال عیرفانە ، لە سییەکان لە ڕۆژنامەی (ژین) شتێکی نووسیوە) [٤۹۳ : ۲۷۸]. دڵشاد نەدەبوو لە بیری بچێ کە لەنامەی ماجستێرەکەیدا ئاگادارە شێخ نووری لە (۹۲٦) باسی سەروای کردوە ، بۆیە نەدەبوو لەنامەی دکتۆراکەیدا جەمال عیرفان بەیەکەم کەس دابنێ کە باسی سەروای کردوە ، جگە لەمانەش وەك پێشتر باسمان کرد یەکەم کەس ئەمین فەیزییە لە کوردیدا باسی سەروای شیعرێکی تایبەتی مەولەوی کردوە ، بۆی هەیە پێش ئەمین فەیزیش نووسەر هەبێ لەسەروای کۆڵیبێتەوە بەڵام ئێمە نەماندیبێ .

جگە لە دڵشاد ، عەبدوللا خدر مەولوودیش لەنامەی ماجستێرەکەیدا (لێکۆڵینەوەیەك لە شیعری حەمدی) چەند لاپەڕەیەکی بۆ سەروا تەرخان کردوە [٤۹٥ : ۱۰۲-۱۱۲] . لەم باسەدا ، پێناسەی سەروای کردوە و لەپاش سەروا دواوە وباسی هەندێ لایەنی دابەشبوونی سەروای کردوە، سەروای شیعری لای حەمدی ڕوون کردۆتەوە ، چەند خاڵێکی جوانکاری سەروای حەمدی دەرخستوە و هەندێ کەم و کورتیشی پێشان داوە و نموونەی بۆ هێناون .

کەمال مەعرووف ساڵی ۱۹۹۲ ، کتێبی (بزووتنەوەی نوێخوازی لە شیعری تازەی کوردیدا ۹۱٤-۹٦٥)ی بەعەرەبی لە ستۆکهۆلم بڵاوکردەوە [۳۲٤ : ۲٦۲-۲٦۷] . پێناسەی سەروای لەچەند سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووە و باسی ڕەوی و ڕەدیفی کردوە بەڵام ڕیدف و ڕەدیفی لێ تێکەڵ بوە ، چونکە ئەمانە یەك شت نین . ڕیدف لەسەرواناسی عەرەبیدا شتێکە و ڕەدیف لەسەرواناسی فارسیدا شتێکی ترە . کەمال مەعرووف زاراوەی ڕەدیفی داوە بەڵام پێناسەی ریدفی بۆ نووسیوە. لەبەر ئەوەی سنووری ڕەوی و پاش ڕەوی لەلا ڕوون نەبوە ، لەشوێنێکدا ئەم دوەی تێکەڵ کردوە ، پاش ڕەوی بەڕەوی داناوە بۆیە نموونەیەکی بۆ زاراوەی (تأسیس) هێناوە کە تەئسیسی تێدا نییە. لەباسی کەم و کورتییەکانی سەروادا لە (ایطاء) دواوە و نموونەیەکی بۆ هێناوە ، بەڵام نە پێناسەکەی وردەو نە نموونەکەیشی دروستە . لەبارەی (التضمین)یش هەمان شتە . تەزمین لە ڕەوانبێژی مانایەکی هەیە و لەسەرواناسی مانایەکی تری هەیە . کەمال مەعرووف باسی تەزمینی سەرواناسی دەکا کەچی پێناسەی تەزمینی ڕەوانبێژی هێناوە ، ئەو نموونەی کە هێناویشیە هەر بۆ مانا ڕەوانبێژییەکەی تەزمین دەچێتەوە نەك بۆ سەرواناسی .

## چەند تێبینییەک :

لەکاتی نووسینەوەی ئەم نامەیەدا چەند خاڵێکمان پەیڕەو کردووە واچاکە لێرەدا ئاماژەیان بۆ بکەین :- لەکاتی بەراوردکردنی هەندێ دیاردەی سەرروای کوردی لەگەڵ سەرروای نەتەوەکانی تر کەمتر بایەخمان بەهێنانەوەی نموونەی بێگانە داوە، چونکە ئەم هەموو نموونە هێنانەوە شوێنێکی زۆر دادەگرێ ، بۆیە تەنیا ئیشارەتمان بۆ سەرچاوەکە کردووە بۆ ئەوەی خوێنەر ئەگەر مەبەستی بێ ، بەئاسانی بتوانێ بگەڕێتەوە سەری .

- لەهەندێ شوێندا ، پێویستمان بە ئەژمار و جەرد بووە ، لەهەر حاڵەتێکدا چەند دیوانێکمان بە نموونە وەرگرتووە و ئەژمارەکەمان لەسەر بنیات ناوە ، چونکە ئەستەمە بۆ هەموو دیاردەیەك بچینەوە سەر سەراپای شیعری کوردی .

- قورسایی هەرە بنچینەیی لێکۆڵینەوەکە کەوتۆتە سەر شیعری کلاسیکی ، لەگەڵ ئەوەشدا جاروبار ئاوڕ لەشیعری فۆلکلۆری دراوەتەوە و باسێکیش بۆ سەرروای شیعری نوێ (ئەوەی بە ئازاد ناسراوە ) داندراوە .

- لەبەکارهێنانی پەراوێز و سەرچاوە ، ڕێبازی ( داکردن - خزن - کۆد )مان بەکار هێناوە . لە کۆتاییدا هەموو سەرچاوەکان نووسراون و ژمارەیان بۆ داندراوە ، لەهەر کوێ شتێ لەسەرچاوەیەك وەرگیرابێ یان ئیشارەتی پێ درابێ ژمارەی سەرچاوەکە و لاپەڕەکە لەناو دووکەوانەی گەورە نووسراوە وەکو بۆ نموونە [ ١٠٠ : ٥١ ] واتە سەرچاوەی ژمارە ( ١٠٠ ) کە ( دیوانی سافییە ) ، لاپەڕە( ٥١ ) . ئەگەر لاپەڕە نەنووسرا بوو ، تەنیا ژمارەیەك هەبوو ، ئەوە تەنیا ئیشارەتە بە سەرچاوەکە و بەس ، هیچی لێ وەرنەگیراوە .

- لەسەرچاوەکان ، یەك سەرچاوەی ئاسوورییە ، خۆم کە ئاسووری نازانم مامۆستا حەننا عەبدولئەحەد ڕۆفۆ بۆی خوێندمەوە و چی بەکەڵك ئێرە دەهات بۆی کردم بە کوردی ، بۆ سەرچاوەی تورکی کە کۆمەڵێ شیعری شاعیرە نوێخوازەکانی تورکە وەکو توفیق فیکرەت و جەناب شەهابەدین و ئەحمەد کەمال و ئیسماعیل سەفا و حسین دانش و سیرەت و محەمەد ڕوشدی ... یە ، هەموویم لە دوو بەرگی ڕۆژنامەی ( ثروت فنون ) وەرگرتووە کەلە کتێبخانەی د. مارف خەزنەدار هەن . ئەگەر چی تورکی نازانم بەڵام سەرروای شیعرەکان بەجۆری ڕەوی و چۆنیەتی دابەشبوونییەوە ئاشکرا دیارە . یەك سەرچاوەی ئینالیشم بەدەستەوە بوە کە بەهەشتی دانتییە ، ئەویش جگە لەوەی وەرگێڕانە ئینگلیزیەکەشی لەبەر دەستە ، لە ئەسپانییەوە نزیکە ، خۆ سیستەمی سەرواکەیش ، کە مەبەستی سەرەکی ئێمە ئەوەیانە ، ئاشکرا دیارە . لەمانە بەولاوە سەرچاوەکانی تر بەو زمانەن کە ڕاستەوخۆ سوودمان لێ وەرگرتوون .

## دەروازەیەک

# سەروا

## زاراوە و چەمک

### زاراوەی سەروا :

بەرلە شیکردنەوە ولێکدانەوەی زاراوەی (سەروا) ، دەبێ بزانین زاراوە (وشەیەکە یان تەعبیرێکە، لە هەندێ بەکارهێناندا مانایەکی تایبەتی هەیە ، یان تایبەتە بە زانستێ یان هونەرێ یان پیشەیێ ، یان بابەتێ ...) [٥٠٨ : ١٢٠٣] . ئەو وشەیەی دەکرێ بە زاراوە یان تۆژەرەوانی مەیدانی بابەتەکە لە رەوتی لێکۆڵینەوەکانیاندا دایدەنێن و لەئەنجامی بەکارهێنانی زۆرەوە مانا زاراوەییەکەی دەچەسپێ یان ئەوەتە وشەکە لە بوارێکی ترەوە بۆ بواری ئەو زانستە دەگوازرێتەوە و دەکرێ بە زاراوە ، ئەو بوارانەی وشەیان لێ وەردەگیرێ بۆ زاراوە ئەمانەن : زمانی بێگانە ، زاراوەی زانستەکانی تر [٣٨٠ : ٧٤-٨١] . واتە زاراوە یان لە زمانی نەتەوایەتییەوە وەردەگیرێ یان لەزمانێکی بیانی دەخوازرێتەوە ، بەلام لای هەموو کارکەرەکانی بواری ئەو زانستەی زاراوەکەی تێدا بەکاردێ یەك چەمك و هەمان چەمکی هەیە . یەکێتی چەمکی زاراوە یەکێتی بیری نەتەوایەتی لە بواری زانستدا دەستە بەر دەکات (یەکێتی فیکری و سیاسی نەتەوە لە یەکێتی زاراوەکانی لە بواری زانستی مرۆڤایەتی و زانستی ڕووت و تەکنۆلۆژیادا خۆی دەنوێنێ) [٢٢٧ : ٩٤] . هەربۆیەشە هەر بوارێکی هونەری و زانستی پێویستی بە زاراوەی تایبەتی خۆی هەیە. یەکێتی زاراوە هۆیەکی سەرەکی ڕێکخستن و پێشخستنی زانستە بە زمانی نەتەوایەتی و بیر کردنەوە لە ئاژاوە و تێکەڵ و پێکەڵی بەرە و ڕێك و پێکی و وردی و خانە بەندی دەبات . ڕێبازی بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی لەگەڵ زاراوەسازیدا لەپەیوەندی و کارلێکی دیالیکتیکی دان. وشەی فەرهەنگی نەتەوایەتی کە وەکو زاراوە لە بوارێکی زانستیدا دەخرێتە گەڕ پەیوەندی بەمانا فەرهەنگییەکەوە دوور بێ یان نزیك گرنگ نییە . لەلایەکی تریشەوە خواستنەوەی زاراوەی جیهانی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی بە زمانی نەتەوایەتی جیهانێتی زانست و چەمکەکان پتەوتر دەکات. لەهەردوو باردا ئەوەی زاراوەکە دەچەسپێنێ دوو هۆکاری سەرەکییە : ١- لە ڕووی کاتەوە ماوەیەکی زۆر بەکاربێ . ٢- لە ڕووی شوێنەوە بە فراوانی لای هەموو ئەو کەسانەی خەریکی ئەو زانستە دەبن بەکاربێ .

ئەو زاراوەی بۆ زانستی سەروا (سەرواناسی) داندراوە ، لای هەر نەتەوەیەك مێژوویەکی

تایبەتی هەیە و بۆ سەرچاوەیەکی تایبەتی دەگەڕێنەوە .

ئەو زاراوەی لە هەندێ زمانی ئەورووپیدا بۆ ئەم زانستە داندراوە ، لە ئینگلیزیدا (- Rime Rhyme) [٥٠٩ : ٩٩٥] و لە فەرەنسیدا (Rime) [٥٠٧ : ٨٨٣] و لە ئەسپانیدا (Rima) [٥٠٢ : ٤٠٥] و لە ئەلمانیدا (Reim) [٣٥٠ : ٢] و لە ئیتالیدا (Rima) [٥٠٣ : ٦٩٠] و لە رووسیدا (puфma) [٥٠١ : ٦٤٨] . هەموو ئەم وشانە لەوشەی (Rhythmos)ی گریکییەوە هاتوون کە لە لاتینی یەکەم جار بوە بە (Rhythmus) و پاشان وردە وردە گۆڕاوە و بوە بە (rithmi) کە بەمانای هاتنی ڕووبارو هەڵچوونی ئاو دێ .

وشەی (arithmos) کە لە هەمان چاوگەوە هاتوە بە مانای ژمارە دێ ، لەم وشەیشەوە (rim) ژمارە و (dorima) بژمێرە داتاشراون . لەهەمان سەرچاوەوە وشەیەکی تری وەکو (ritus) و (rite) وەرگیراوە کە ویردو تەقسی ئایینی دەگەیەنێ . لە لاتینیدا (rithmo) بۆ شیعری هێزدار و چەندی بەکار هاتوە و لەئەلمانی کۆندا (rim) بە کۆمەڵە کەسێ وتراوە کە بە شێوەی بازنەیی بوەستن ، لە ڕۆمانیدا فەرمانی (remore) مانای ڕێکخستن دەدا بە شێوەی زنجیرە ، لە فەرەنسی کۆنیشدا (rimer) بە مانای زنجیرە هاتوە [٣٥٠ : ٢،١] . ئەو زاراوەی ئێستا لەو زمانانە بۆ سەروا بەکار دێ ، لەگەڵ ئەو زاراوەی بۆ تریە - ئیقاع - ڕیتم - بەکاردێ لەسەرەتادا یەک وشە بوو ، (rhythm). پاشان کە زمانە ئەورووپییەکان پێک هاتن و وشە و زاراوەی لاتینی بەناو نەتەوەکان و زانستی باوی ئەوسا بڵاویوەوە، وردە وردە جیاوازی کەوتە نێوان ئەو زاراوانەی بۆ سەرواو ڕیتم بەکار دەهاتن بە تایبەتی لەسەدەی حەڤدەمدا ، (rhyme) و (rhythm) بەتەواوی لەیەک جیا بوونەوە و هەریەکە چەمکی خۆی وەرگرت [٥٠٢ : ٣٧١] . کەواتە وشەکە لە بنچینەدا و بەدەم گۆڕانەوە بەمانای هەڵچوونی ڕووبار (هەڵچوونی سۆز) و ژمارە و زنجیرە و بازنە و ویرد هاتوە کە هەموویان لە مانای شیعرو سەرواوە نزیک دەبنەوە .

لە عەرەبی و ئەو زمانانەی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری عەرەبی - ئیسلامی وەکو فارس و کورد و تورك ... وشەی (القافیە)ی عەرەبی بۆ دیاردەی سەروا بەکار هاتوە. وشەکە لە (قفا-یقفو) هاتوە کە لەزماندا بەسێ مانای جیاواز هاتوە : ١- پشتە مل ، (قفا الجبل) پشتی چیا ، ٢- بژاردن و ڕیزنواندن ، القفوە واتا دەستەی هەڵبژاردە ، ٣- نەنگی ، وشەی القفو واتای بوختان کردن [٢٨٢ : ١٧-٢٠] . قافیە بەچەمکە زاراوەکەی لە مانای یەکەم نزیک دەبێتەوە کە بە دوای یەکتریا هاتنە . ئەخفەش دەڵێ بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە شوێن ئەوانەی پێش خۆی دەکەوێ [٢٥٩ : ٥١] . دورەید دەڵێ : (بۆیە پێی دەگوترێ -قافیە- چونکە دوای یەکتر دەکەون) [٢٨٢ : ٢٣] . ئیبن ڕەشیق دەڵێ : (قافیە بۆیە وای پێ گوتراوە چونکە شوێنی هەموو دێڕێك هەڵدەگرێ ، هەندێ دەڵێن چونکە شوێنی هاوڕێکانی دەکەوێ ، من یەکەمیانم بەلاوە پەسندترە) [٢٤٦ : ١٥٤] . بەکورتی وشەکە بۆ لە

شوێن یەك هاتنی دەنگە وەك یەكەكانی كۆتایی دێڕەكان هاتوە. ئەم وشەیە (القافیە) لە عەرەبی و لە بواری زانستی خۆیدا زۆر جار بۆ چەمكی لە خۆی فراوانتر (نیوە دێر یان سەرپای قەسیدە) بەكار هاتوە و زۆر جاریش بۆ چەمكی لە خۆی تەسكتر (تەنیا ڕەوی) بەكار هاتوە [٢٨٢ : ٢٢-٢٣]. لەفارسیشدا هەمان وشە (قافیە) یان لە عەرەبی خواستۆتەوەو وەك زاراوە بۆ هەمان چەمك بەكاری دێنن. كۆنترین عەرووز نووسی فارسی، قەیسی ڕازی دەڵێ: (قافیە بۆیە وای پێ دەگوترێ چونكە لە پشتی (دوای) بەشەكانی دێرە شیعر دەردەكەوێ و دێر بەوەوە تەواو دەبێ و ئەسڵەكەی لە -قفوت فلانا- هاتوە) [٤٠٢ : ١٩٢-١٩٣].

لە كوردیدا، زۆر وشەی جۆراوجۆر بۆ ئەم دیاردەیە بەكارهاتوە. ئەم ڕێك نەكەوتنەش دەبێ بەهۆی شێوانی بیرو لێك پچڕانی بیرو بۆچوون و باش لەیەك نەگەیشتن، بۆیە یەكخستنی زاراوەیەكی وا سەرەكی كە هەموو زانستەكەی لە ژێردا كۆدەبێتەوە كارێكی زۆر پێویستە. هەر لەسەرەتاوە تا شەستەكان و دەرچوونی كتێبی (ئەدەبی كوردی و لێكۆڵینەوە لە ئەدەبی كوردی) هەر وشەی قافیە بەكارهاتوە. زۆر شاعیری وەكو مەولەوی [١٨٦ : ٦٩] و حاجی [٦٠ : ٩٩] و پیرەمێرد [٤٣ : ٢٤٣] و ... لە شیعرەكانیاندا بەكاریان هێناوە. لە توێژەرەوەكانیش ئەمین فەیزی [٩٩ : ٣١] و شێخ نووری [٢٣٨] و جەمال عیرفان [٢٢٥] و ڕەفیق حیلمی [٩٥] و گۆران [٢٣٤] و د.مارف [١٨٤] و ... هەر وشەی قافیەیان بەكار هێناوە. زاراوەی تریش لەم لاو لەولا بەكارهاتوە وەكو محەمەد سەعیدی ئیبراهیمی محەمەدی لە (گەشتێ لە عیلمی بەلاغەدا) زاراوەی (دواخشت)ی بەكارهێناوە [١٩٣ : ١٠٩]. پیریاڵ مەحموود لە دێرە شیعرێكدا (كێش و لەنگەر)ی بۆ وەزن و قافیە داناوە و لە پەراوێزدا مانای ڕوون كردوونەتەوە:

خامە ناتوانێ وێنەی بكێشێ    بەگشت ئەندێشە و كێش و لەنگەرێ [٤٦ : ١٦٤].

بەڵام گۆران [٢٣٤ : ٧] و عەبدوڕەزاق بیمار [١٢٨ : ١٢-١٣] وشەی لەنگەریان وەكو زاراوەیەكی كێشناسی بۆ نەبرو هێز (stress) بەكارهێناوە كە بە فارسی (تكیە)ی بۆ داندراوە [٣٩٠ : ١٤٨].

ئەوەندەی من ئاگاداربم، یەكەم كەس لە كوردیدا عەلائەدین سەجادی ساڵی ٩٦٧ لە (ئەدەبی كوردی ..) وشەی (سەروا)ی وەكو زاراوە بەرامبەر بە قافیەی عەرەبی بەكارهێناوە. لەوساوە زۆر نووسەر و توێژەرەوەی كورد لەوتار و كتێبەكانیاندا سەروایان بەكارهێناوە و زۆریش تا ئێستایش هەر قافیە بەكار دێنن و دان بە سەروادا نانێن وەكو زاراوەی قافیە.

وشەی (سەروا) دەشێ بنچینەیەكی ئێرانی هەبێ و دەشێ وشەیەكی كوردی ڕەسەن بێ، لە هەردوو باردا شیاوی بوونە زاراوەی تێدا هەیە كە دەشێ وشەیەكی ڕەسەنی خۆماڵی بكرێ بە زاراوە و دەشێ وشەیەكی بیانی بۆ بخوازرێتەوە وەك باس كرا.

وشەی (سروا) لە فەرهەنگی (قاطع)ی فارسیدا بەم جۆرە مانای لێ دراوەتەوە: (لەسەر کێشی پەروا، بەمانای قسە و ئاخاوتن دێ، بەمانای ئەفسانەی درۆ و شیعریش گوتراوە) [٤٩٧ : ٧٢٢]. وشەی (سرواد)یش کە لە سەروا نزیکە بەم جۆرە لێکدراوەتەوە: (لەسەر کێشی فەرهاد، بەقسەی هۆنراوە و شیعر دەڵێن، بەمانای ئەفسانە و جادو و سروودیش هاتوە) [٤٩٧ : ٧٢٢]، وشەی (سروادە)ش کە لەوانەوە نزیکە بەم مانایە هاتوە (بە فەتحی یەکەم، لەسەر کێشی شەهزادە، بە قافیەی شیعر دەڵێن، وەکو بەهار و نیگار و هەزار، وە زەمین و کەمین و ئەمین) [٤٩٧ : ٧٢٢]. کەچی ئەم سێ وشەیەی سەرەوە لە فەرهەنگی (جامع)دا بەم جۆرە مانایان لێ دراوەتەوە، یەك لەدوای یەك: (چیرۆکی گیانداراني خەیاڵی، درۆ، ڕابوردنی ساختە، سا:کۆت، ساختمانی بەردەم واڵا، وشە)، (شیعر، سرود، گۆرانی، بێهوودە، قسەی پووچ)، (دوانە بزوێنی دێرە شیعر کە هەموو دێرەکانی تری لەگەڵ هاوسەروان) [٥٠٨ : ٦٧٩]. وەك دیارە وشەی سێیەم (سەروادە) لەهەردوو فەرهەنگدا بەرامبەر بە قافیە دێ، وشەکانی تریش (سەروا)، (سەرواد)، مانای شیعریان تێدایە و دەشێ لە رووی پەیوەندی و ناونانی پاژوگشتەوە بۆ قافیە بەکار بێن. ئەمە گریمانەیەکە کە سەجادی وشەی سەروای لەم ئەسلە فارسیانەوە وەرگرتبێ، بەڵام لە هەمان کتێب و لە نووسینی تریشدا هەوڵی داوە وشەی ئێرانی بۆ زاراوەی جیا جیا لە کوردیدا بەکار بێنێ وەکو: ترۆم، چامە، چکامە، جگە لە وشەی فارسی تری وەکو گوزارشت و گوبازە و گەوارا و... هتد.

بۆیشی هەیە وشەکە بنچینەیەکی کوردی ڕەسەنی هەبێ و لەمانای گشتی و فەرهەنگییەوە بۆ زاراوەی قافیە بەکار هاتبێ. وشەی سەرهۆ و سەروا لەناوچەی گەرمیان وەکو زاراوەی جوتیاریی و زەوی کێلان بۆ کۆتایی دێرە جووت بەکار دێ کە لە ناوچەی هەولێردا بە (سەرسەدە) هاتوە. بەو مانایە، سەروا کۆتایی دێرە و جوتیار لەوێوە هۆ دەداتەوە بۆ دێرێکی نوێ، دیاردەی دووبارە بوونەوەی دەنگیش لە کۆتایی دێرە شیعر دێ، بۆیە لێکچوونێك لە نێوان مانای زمانەوانی و مانای زاراوەیی وشەکەدا هەیە. بێجگە لەوەی وشەی (دێر)یش کە بۆ (بیت - line) بەکاربراوە زاراوەیەکی جوتیاریی و زەوی کێلانە، لەزماندا بۆ خەتی جووت بەکاردێ و لە شیعردا بۆ بەیتە شیعر کە یەك خەتە. وەك ئەوەی لاپەڕە پارچە زەوی بێت و خەتە شیعرەکان دێرە جووت بن و سەرواکان سەر سەدە و کۆتایی دێرە جووت بن. هەردوو وشەیش سەروا و سەرهۆ لەیەکەوە نزیکن. بۆی هەیە (سەروا) سووك کراوەی (سەرهۆ) بێ (سەرۆ، سەروا)، کە (سەرهۆ)یش لە دوو پارچە پێك هاتوە (سەر+هۆ). (سەر) لێرەدا بەمانای سەرەتایە و (هۆ)یش بادانەوەیە، واتە سەرەتای بادانەوە، لەوێوە بادانەوە دەست پێ دەکا بۆ دێری نوێ، (هۆدانەوە = بادانەوە)، جوتیار لەسەر سەدە هۆ دەداتەوە. بۆیشی هەیە (سەروا) وشەیەکی سەربەخۆ بێت لە (سەر+وا) دروست بووبێ، لەسەر شێوەی (پێشەوا، دەستەوا، نانەوا)، لە هەردوو باردا زاراوەکە لەو

چەمکەی بۆی بەکاردێ نزیکە ، چ سەروا خۆی وشەیەکی ڕەسەن بێ و چ سواوی سەرهۆبێ و چ لە (سروادە)ی فارسییەوە سووك كرابێ بۆ سەروا ، گرنگئەوەیە بۆ یەکەم جار سەجادی بەکاری هێناوە و پاش ئەویش نووسەرانی تر بەکاریان هێناوە بەلاّم وەك وشەیەکی فەرهەنگی ، پێشترلە فەرهەنگی (خال ٩٦٤) و دواترلە فەرهەنگی (هەمبانە بۆرینەدا ١٣٦٩ خورشیدی) نووسراوە . بۆیە ئێمە بە پەسندمان زانی (سەروا) بچەسپێنین و پشت لە قافیەی عەرەبی بکەین .

## چەمکی سەروا :

لەبارەی چەمکی سەرواوە ، لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانیدا هاتوە : (ئەم دیاردەیە - سەروا - ئەو کاتە دەردەکەوێ کە دوو وشە یان زیاتر دەنگی بڕگەکانی کۆتاییان یەك بێ و بە جۆرێ دابندرێن هەریەکە زایەڵە و دەنگدانەوەی ئەوەی تر بێ . سەروا لەلایەن شاعیرانەوە بەکاردێ بەلاّم هەندێ جار پەخشاننووسیش بەکاری دێنن بۆ بەرهەمهێنانی دەنگی وا کە سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشن و پارچە (ستانزا) کانی شیعر یەك دەخەن ) [٥٠٦ : ٥٥٨] . دەنگی کۆتایی وشەکانی وەکو یەك دانەناوە ، بەڵکو بە زایەڵە و دەنگدانەوەی یەکتری داناون ، چونکە مەرج نییە لە هەموو زمانەکاندا دەنگی کۆتایی وشەکان کت و مت یەك شت بن ، دەشێ - هەرهیچ نەبێ لە زمانێکی وەکو ئینگلیزیدا - وشەکان تەنیا دوا بزوێنی هێزداریان -stressed- یەك بێ و نەبزوێنەکانیان جیا بێ . فرێزەر لە پێناسەی سەروادا نەبزوێنی دوای بزوێنی هێزداری کۆتاییش دەچەسپێنێ (C+v-.) (دوو وشە ئەو کاتە دەبن بە سەروادار کە بزوێنی سەرەکییان هێزدار بێ و هەر نەبزوێنێکی دوای بزوێنەکە بێ لە هەردوو وشەدا یەك شت بێ بەلاّم نەبزوێنی پێش بزوێنە هێزدارەکە جیا بێ) [٤٦٣ : ٦٠-٦١] . لین و لیزلی /ش پێناسەکەیان لەمانە نزیك دەبێتەوە (دێرەکانی شیعر ئەو حاڵە هاوسەروا دەبن کە دوا وشەیان بە دەنگی لەیەکچوو کۆتایی هاتبێ . مەبەست لە کۆتایی وشە بزوێنی دوا بڕگەی هێزدار و هەموو دەنگەکانی دواوەیەتی) [٤٧٦ : ٤٠] ئەوەی لەم پێناسەیە سەرنج ڕادەکێشێ شوێنی سەروا دیارکراوەکە کۆتایی شیعرە ، بەلاّم مەرج نییە سەروا هەمیشە هەر لە کۆتایی دێر بێ (سەروای کۆتایی لە کۆتایی دێر دێ تا زایەڵەی کۆتایی دێرێکی تر بداتەوە ، ئەمەیە سەروای هەرەبا و بەلاّم سەروای ناوەوەیش هەیە -lionine- کە بە زۆری وەکو دیاردەیەکی وەختی بەکاردێ) [٥٠٦ : ٥٥٨] . لێرەدا لە ئاستی وشەدا باسی سەروا کراوە و بە دێرە شیعرو هۆنراوە نەبەستراوەتەوە ، جگە لەوەی جۆری دەنگیا دەنگە دوبارەبووەکانی دیار نەکردوە بە بزوێن و نەبزوێن کە ئەمە لایەنێکی سەرەکیی پێکهاتنی سەروایە . لە کێشناسی ئەسپانیدا بەم جۆرە چەمکی سەروا ڕون کراوەتەوە (سەروا بریتییە لە بەیەکچوونی سەمعی ، گشتی یان بەشی ، نێوان دوو دێرە شیعر یان زیاترلە دوا بزوێنی هێزی کۆتایی بەدواوە. گرنگ لەسەروادا یەکسانی ئاوازەکەیەتی ، بۆیە سەروا دیاردەیەکی سەمعییە نەك نووسراو) [٤٨٦ : ٢١] . لەم بۆچوونە ئیسپانییەدا سێ شت جەختی لەسەر کراوە : ١- لێکچوونەکە بۆی هەیە گشتی بێ و بەشی هەیە

پاژەیی بێ . ٢- دیاردەی سەروا بەهۆنراوە بەستراوەتەوە ( دوو دێر یان زیاتر ) نەک تەنیا وشەیان تاکە دێر . ٣- جەخت لەسەر لایەنی بیستن ( سەمعی ) کراوە کە پێداگرتنە لەسەر دەنگنەک نووسین چونکە لەزۆر زماندا ، لەگەڵ حاڵەتدا دەنگو نووسین وەکو یەک نین . ئەمەیش ئەوە دەچەسپێنێ کە سەروا دیاردەیەکە پەیوەندی بە ئاوازەوە هەیە . بەستنەوەی سەروا بە هۆنراوە نەک دێرە شیعرو تاکە وشە لە عەرەبیدا لای جاحیز هاتوە کە دەڵێ ( قافیە بریتییە لە کۆتاییەکانی دێرەکانی هۆنراوە ) [٢٧٤ : ١٧٩] ئەگەرچی سنووری کۆتاییەکانی دیار نەکردوە . ئەم بیرە لە تۆژەرەوە نوێیەکانیشیان هاتوە ( سەروا لای ئێمە دیاردەیەک نییە لە دیاردەکانی دێرە شیعر، بەڵکو یەکێکە لە دیاردەکانی هۆنراوە . تەنیا لە دێری زۆرو پارچەو قەسیدەدا دەردەکەوێ ) [٣٠٦ : ٩٧] .

لە عەرەبیدا ئیبن کیسان بۆ ڕوون کردنەوەی چەمک و سنووری سەروا ڕایەکی خەلیلی فەراهیدی هێناوە ( قافیە ئەو تیپەیە کە شاعیر تا هۆنراوەکەی تەواو دەکا لە کۆتایی هەموو دێرەکاندا دەیهێنێ ) [٢٧٢ : ١٥] ، بەڵام زاناکانی سەرواناسی عەرەبی ئەم قسەیەی ئیبن کیسان بەپەسند نازانن و دەیدەنە دواوە. ئەو ڕایەی خەلیل پەسند دەکەن کە لەسەر بنچینەیەکی تیپسازی و ئەژمێری دایڕشتوە و دەڵێ ( قافیە بریتییە لە دوا تیپی دێرەوە تا یەکەم تیپی وەستاوی پێش خۆی و تیپی پێش ئەویش ، واتە سەرجەمی تیپە بزاوەکانی نێوان دوو تیپی وەستاوی کۆتایی دێر و تیپی پێش وەستاوی یەکەمیش ) [٢٤٦ : ١٥١] . وەک دیارە خەلیل لەسەر بنچینەی تیپ نەک دەنگ لەسەروا دواوە . بەم پێیە سەروا بۆی هەیە بەشێکی وشەی کۆتایی یان وشەی کۆتایی بێ یان لە دوو وشەی کۆتاییدا دابێ [٢٠٢ : ٧٦]. کەچی لای ئەخفەش ( قافیە بریتییە لە دوا وشە و بەڵگە بەوە دێنێتەوە ئەگەر یەکێ پێت بڵێ هەندێ سەروام بۆ بێنە لەگەڵ -کتاب- بگونجێ ، تۆ -شباب- و -رباب-ی بۆ دێنی ) [٢٥٩ : ١٧] . کەچی قوترووب سەروا دەترنجێنێتە ناو دوا تیپ ( سەروا بریتییە لە تیپی ڕەوی ... چونکە دەگوترێ سەروای ئەم هۆنراوەیە دالە، یان میمە ) [٢٧٣ : ٣٦] . فیرائیش ( سەروا هەر بە تیپی ڕەوی دادەنێ چونکە ئەو تیپەیە کە هۆنراوەی پێ دەناسرێتەوە ) [٢٩١ : ٢٨٤]. هەشە دەڵێ سەروا لە ژێر باری سەرنجی ناونانی گشت بە ناوی پاژەوە ، ( بە هەموو هۆنراوەکە دەگوترێ ) [٢٧٣ : ٣٢] . موسای حافیز دەڵێ ( سەروا ئەو تیپ و حەرەکانەیە کە شاعیر لە هەموو دێرێکدا دووبارەیان دەکاتەوە ) [٢٧٣ : ٣٩] . ئیبن سینایش هەر بیری لە بەیەکچوونی تیپی کۆتایی دێرەکان کردۆتەوە [٢٤٧ : ١٢٢] . لەم بۆچوونانەو ئەوانەی دواتریش هەر ئەوانە لە ڕاستێتی نزیک دەبنەوە کە جەخت لەسەر دووبارە بوونەوەی دەنگێ یان چەند دەنگێکی کۆتایی دەکەن ، ئەگەرچی عەرەبەکان وەک دیارە زیاتر بە تیپ و حەرەکە وەسفی سەروایان کردوە، چونکە لێکۆڵینەوەکانی کۆن هەر بە دەوری تیپدا دەسووڕێنەوە ، کەچی لێکۆڵینەوە نوێکان بە لێکدانەوەی دەنگییانە سەروا ڕوون دەکەنەوە کە ( بریتییە لە پێوەندی نێوان دێرەکان یان پارچەکانی هۆنراوە ... ئەوەی دەبێ دووبارەبێتەوە پەیوەندە نەگۆڕەکانی کۆتایی دێرەکانە ) [٣٠٩ : ٩٨] .

لە فارسیدا ، قەیسی ڕازی کە کۆنترین عەروزنووسی فارسە بەم جۆرە چەمکی سەروای ڕوون کردۆتەوە (سەروا بەشێکە لە دوا وشەی دێر بەو مەرجەی وشەکە وەکو خۆی بەهەمان مانا لە کۆتایی دێرەکانی تری هەمان هۆنراوەدا دووبارە نەبێتەوە . ئەگەر دووبارە بێتەوە دەبێ بە ڕەدیف و سەروا دەکەوێتە وشەی پێش ئەوەوە ) [٤٠٢ : ١٩٢] . وەك دیارە ڕازی خۆی لە تیپ و دەنگنەداوە بۆ وەسفی سنووری سەروا ، تەنیا بە بەشێکی وشەی کۆتایی داناوە . دکتۆرە ئیسعاد بەم جۆرە چەمکی سەروای فارسی لێك دەداتەوە (سەروا ئەو وشانەن کە لە کۆتایی دێرەکان دێن و تیپی ڕەسەنی کۆتاییان لە هەموو دێرەکاندا وەکو یەکە ) [٢٦٦ : ٣٤٢] . د. ئیسعاد بەلای وشەی کۆتاییدا دەچێ ، بەڵام تیپە لێکچووەکانی کۆتایی دێرەکان بە تیپە ڕەسەنەکان دیار دەکا ، بۆ ئەوەی پەری و پاش ڕەوی لێك جیابکاتەوە ، ئەمەش هەنگاوێکی ترە بۆ ڕوون کردنەوەی چەمکی زاراوەکە .

لە کوردیدا ، شێخ نووری سەروا بە موتابەقەتی دوا بڕگەی لەتە دێر دەزانێ لە بزوێنەکەوە بۆ مسۆگەر کردنی ئاوازێکی مۆسیقی. هەر چەندە شێخ نووری زۆر ڕای لە ڕەخنەی کۆنی عەرەبی وەرگرتوە بەڵام لێرەدا لە دیارکردنی چەمکی سەروادا کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەورووپی (هەڵبەت لە ڕێگای تورکییەوە ) لە ڕووی بەستنەوەی سەروا بە لەتە دێر (میسراع) و دیارکردنی بە (بڕگە) و پێشاندانی ئەرکی بە (ئاواز و مۆسیقا) . د. مارف خەزنەدار قافیە بە وشە دەزانێ ، ئەو وشانەی لای کەم دوا تیپیان یەك بێ (ئەم وشانە قافیەیان پێ ئەڵێن ) [١٨٤ : ٥٦].

ئەم ڕایە لەگەڵ ڕای ئەخفەش یەك دەگرێتەوە وەك پێشتر هاتە پێشمان ، بەڵام جەختیشی لەسەر دەنگە لێکچووەکانی کۆتایی دێرەکان کردوە . عەلائەدین سجادی چەمکی سەروا بەم جۆرە ڕوون دەکاتەوە (سەروا ئەوەیە کە دوایی هۆنراوەکان لە چەند پێتێکدا وەکو یەك بن ، ئەم وەکو یەك بوونە لە ڕستەی پەخشانیشدا ئەبێت ئەوەندە هەیە وە نەبێ شتێکی پێویست -لازم- بێت ، بە پێچەوانەی هۆنراوە بوونی لەودا پێویستە ) [١٣٧ : ١٣٤] . سجادی چەمکی سەروا فراوانتر دیار دەکا بە جۆرێ پەخشانیش دەگرێتەوە. بۆ سنووری سەروایش لێرە بەکراوەیی داینـاوە (چەند پیتێك ) کەچی پاشان لە نرخ شناسیدا بەلانی کەم دوو پیتی بەمەرج داناوە ئەگەر ناسەروا نابێ [١٣٨ : ١٠٢-١٠٤]. کەچی لە کوردیدا یەك دەنگی بزوێنی درێژ بەتەنێ ئەرکی سەروای پێ ڕایی دەکرێ ، لەهەمان کاتدا پێناسەکەی بەجۆرێکی وا داوە ، بای ئەوە فراوانی تێدا بێ کە هەموو هونەرە شیعرییەکان بگرێتەوە .

لەم هەموو بۆچوونە جۆراو جۆرانەی نەتەوە جیا جیاکانەوە دەگەینە ئەو ڕاستییە کە سەروا بریتییە لەو دەنگە یا کۆمەڵە دەنگەی (کە هەندێ جار بە بڕگە و لای هەندێ بە تیپ ئاماژەی بۆ کراوە ) لە کۆتایی وشە سەرواداڕەکان دوبارە دەبنەوە ، ئەمە بە تایبەتی لە کۆتایی لەت یا دێرە شیعر و هەندێ جار لە ناوەوەش دێ ، هەروەکو دەشێ لە پەخشانیشدا هەبێ. بەتایبەتی لەکۆتایی

فاسیلەکان، بەمەرجێ وشەکان بەهەمان مانا لەکۆتایی دووبارە نەبووبنەوە. چەمکی سەروا لەم خالانەدا ڕوونتر دەردەکەوێت :

١- دووبارەبوونەوەی یەك دەنگی بزوێنی درێژ یان چەند دەنگێك-بڕگەی کۆتایی یان لەناوکی بڕگەکەوە بەدواوە- .

٢- دەنگە دوبارەبوەکان دەکەونە کۆتایی وشە سەروادارەکانەوە . لە مێژووی نەتەوەکانی تردا بوە دەنگەکان بکەونە سەرەتای وشە نزیکەکان ( هاو نەبزوێنی سەرەتا alliteration ) یا چەقی بڕگە ( assonance ) .

٣- وشە هاو سەرواکان بە زۆری لە کۆتایی لەت یا دێری شیعردا دێن ، جاری وایش هەیە لەناو دێر و بگرە لەسەرەتاش دێن .

٤- وشە هاوسەرواکان دەبێ مانایان جیابێ ، ئەگەرنا دەبێ بە پاش سەروا ( ڕەدیف ) و وشەی پێش ئەو ، دەنگەکانی سەروا هەڵدەگرێ .

٥- سەروا ئەرکی مۆسیقی و دەلالیشی هەیە ، جگە لە گرێدان و لێك دابڕاندنی پارچەکانی هۆنراوە .

بەشی یەکەم

# بنچینەو پەیوەندی و جۆرەکانی سەروای شیعر

**باسی یەکەم** : بنەماو ئەرك و پەیوەندییەکانی سەروای شیعر

١- پەیدابوونی سەروا

٢- ئەرکی سەروا لە شیعردا

٣- سەروا وەکو کۆت

٤- سەروا لە نێوان بوون و نەبووندا

٥- سەروا و هەندێ لە پێوەندییەکانی

٦- سەرواو هەندێ دیاردەی دووبارە بوونەوەی دەنگ

**باسی دووەم** : بنەمای سەروای شیعری جیهانی

١ - گریکی و لاتینی

٢ - ئینگلیزی

٣ - فەرەنسی

٤ - زمانە هیند و ئیرانییەکان

٥ - عەرەبی

٦ - عیبری

٧ - سریانی

**باسی سێیەم** : جۆرەکانی سەروا :

یەکەم - دابەشبوونی سەروا لە ڕوانگەی ئاسۆییەوە :

یەك : لایەنی وشەیی لە ئاراستەی ئاسۆیی سەروادا.

دوو : لایەنی دەنگلە ئاراستەی ئاسۆیی سەروادا.

دووەم - دابەشبوونی سەروا لە ڕوانگەی ستوونییەوە :

یەك : لایەنی وشەیی لە ئاراستەی ستوونی سەروادا.

دوو : سیستەمی دووبارە بوونەوەی سەروا.

## ١- پەیدا بوونی سەروا :

سەروا وەکو دووبارە بوونەوەی دەنگێو دەستە بەر کردنی ڕیتم و ئاوازێکی تایبەتی کە کەشێکی لەبار بۆ هەڵوێستی شیعری بخوڵقێنێ و ماناکەی قووڵ و فراوان بکات و بارێکی دەروونی گونجاو بڕەخسێنێ بۆ بەیەك گەیشتنی نووسەرو خوێنەرلەو تاقی کردنەوە شیعری و شعورییەی بەرهەمەکە دەری دەبڕێ ، دروست بوونی بۆ دوو تیوری جیاواز دەچێتەوە کە هەریەکە بۆ بنەمای ڕێبازێکی فەلسەفی جیاواز دەگەڕێتەوە :

- یەکەمیان سەروا بە بەردەوام بوون و گەشەسەندنی سەجعی (سەروا داری) کاهینەکان دەزانێ . ئەمە تیورێکی میتافیزیقییە. سیحرو شیعرلە پەیوەندییەکی میتۆلۆجیدا بەیەکەوە دەبەستێتەوە . لەم ڕووەوە ، کەسێتی شاعیر بەردەوامیی کەسێتی کاهینە ، شیعری شاعیر و ویردی کاهین لە کەشی لە دایکبوون و شێوازی قالب گرتن و ئاراستەی کاریگەرییدا لەیەك نزیك دەبنەوە. برۆکلمان لای وایە (سەجع ئەو بۆتەیە بوو کە کاهین و پێشبینەکان قسەو وتەکانی خۆیان تێ دادەڕشت) [٣٣٢ : ٥١] ، جاحیزیش سەجع بە کردەوەی کاهینەکان دەزانێ و ئەمەیش دەکا بە هۆی بێزاریی خەڵك بەرامبەر بە سەجع (ئەوەی سەجعی بێزەوەر کردبوو ، هەرچەندە بەقەد شیعر ماندوو بوونی نەدەویست - ئەوە بوو کاهینە عەرەبەکان کە زۆربەی خەڵکی سەردەمی جاهیلی دادیان دەبردە بەر ئەوان، دادوەرییان بە سەجع دەکرد)[٢٧٤ : ١٥٤] [(١)] . ئیتر لە زامڵی (رەحم) ئەو سەجعانەوە شیعرو سەروای شیعر گرواون[٣٠٦ : ٧٥] .

- دووەمیان پەیدا بوونی سەروا بۆ ڕیتمی کارکردن دەباتەوە . ئەمە بنەمای ئەو بیرە فەلسەفییەیە کە شیعر بەکار دەبەستێتەوە [٣٠٦ : ٧٥] . چونکە کار مرۆڤی لە ئاژەڵ جیاکردۆتەوە و ڕایکێشاوەتەوە ناو پەیوەندی کۆمەلأیەتی هوشیارانەوە و شیعریش یەکێکە لە چالاکییەکانی هوشیاری کۆمەلأیەتی .

لەم دوو بۆچوونە بنەڕەتییەدا دیارە، کە یەکەم پەیوەندی بە پەرستگاکان و کاهین و ساحیرانەوە هەیە و لە ڕوانگەی میتافیزیقییانەوە بۆ سەر هەڵدانی سەروا دەڕوانێ ، کەچی دوەمیان بە واقیعی

---

(1) جاحیز دەڵێ ئەو کاهینانە یەکەم خێویان بە دواوە هەبوو بۆ ڕایی کردنی سەجع کاری هەروەکو پێشان وایان دەزانی کە هەر شاعیرەو شەیتانێکی هەیە شیعری پێ دەڵێ ، جاحیز ئەم نموونەیەی بۆ ÍÚÏÉÓ کاهینەکان هێناوە : (الارض و السماء ، و العقاب و الصقعاء ، واقعة بقعاء ، لقد نفر المجد بنی العشراء ، للمجد و السناء) [٢٧٤ : ١٥٤] .

ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵی مرۆڤی دەبەستێتەوە. دوور نییە لە قۆناغی هەرە سەرەتایی ژیانی مرۆڤ هەر دوو بنەما بەیەکەوە کاریان کردبێ بۆ پەیدا بوونی سەجع و سەروا و شیعر. سەروا کە بە سەجع دەبەسرێتەوە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە سەروا پێش کێش پەیڕەو کراوە لە شیعردا . ئەو سەروایەی پاشان بوو بە ڕەگەزێکی شیعری لە زۆر زەماندا، پێشتر لە سەجعدا پەیڕەو کراوە (دوا وشەی ڕستە و فاسیلەکانی سەجع بە دەنگێکی وەکو یەوی سەروای دێڕە شیعر کۆتایی دێ) [۲۲۰: ۱۹] . پاشان سەجعەکە خەست بۆتەوە و ئیقاعی کێشی وەرگرتوە و بەرە و شیعری کێشدار و سەروادار وەرچەرخاوە. بۆ نموونە لە عەرەبیدا ئەم وەرچەرخانە بەناو هونەری -تەسمیت- یا تێپەڕیوە کەهەر لەکۆنەوە بۆ جۆرە نزمەکانی شیعر بەکار دەهات کە تەنیا بۆ ئاواز و سەما دەگوتران ، تەسمیت پێش سەروای یەکگرتوو هاتوە وەك یاسای پێشکەوتن دەیسەپێنێ ، بەلاّم بۆ شیعری میللی بەکار دەهات و وەکو شیعری ڕەسەن ڕووی چوونە کۆڕو بازاڕەکانی ئەوسای نەبوو) [۳۱٤ : ۱۰] . بەش بە حاڵی ئەورووپایش (شیعری پرۆڤانسی کە دوا ئەلقەی گەشە سەندنی شیعری لاتینی کۆنە بەرەو شیعری سەدەکانی ناوەڕاست، جۆرە وەرچەرخانێکی تێدا دیارە لە سەجعەوە بۆ سەروا) [۲۸۳ : ۸٤] .

## لێکدانەوەی تر بۆ بوونی سەروا

جگە لەو دوو بنەما فەلسەفییەی هەریەکە لە روانگەی خۆیەوە چەکەرە کردنی سەروا ڕاڤە دەکا، لێکدانەوەی تریش هەن کە گرنگترینیان ئەمانەن :

### أ- دووبارەکردنەوە :

سەروا لەسەر بنەڕەتی یەکبوونی یەك یا چەند دەنگێك ، واتە دووبارەبوونەوەی دەنگە لێکچووەکان لە مەدای زەمەنی تایبەتیدا ، دروست بوە . ئەم دووبارە بوونەوەیە لەگەڵ ڕەگەزی جۆراو جۆریی -التنوع- ، بەیەکەوە تەبایی -الانسجام- و تریە -الایقاع- دروست دەکەن . لەو کاتەدا (قسە وەکو ئاوی ڕەوان دەڕوا و بە ڕشتنی سانا وشەی ناسکی وا کە ڕستە و دێرەکانی هۆنراوەکە کارێکی وا لە دڵ بکەن بەشتی تر نەکرێ) [۲۳۸ : ۲۲٤] . دووبارەکردنەوە، وەك ڕەگەزێکی شیعری و ئاواز و مۆسیقا ، چەند جۆرێکە :

- دووبارەکردنەوە بۆ پتەوکردنی ئاوازی شیعرەکە .
- دووبارەکردنەوە بۆ پتەوکردن و بە پیزکردنی مانا وێنەییەکانی ناو شیعرەکە .
- دووبارەکردنەوە بۆ بەهێزکردنی مانای ڕاڤەیی ولێکدانەوەی هەست و بیری شیعرەکە .

ئەم سێ جۆرە لەوانەیە دوویان یان هەرسێکیان بەیەکەوە بێن ، بۆیشی هەیە دووبارەکە تەنیا یەکێ لەمەبەستەکان ببێکێ، بەلاّم (هەموو دووبارە بوونەوەکان ، هەر جۆرێك بن ، سوودیان بۆ جۆشدانی ئاواز و قووڵ کردنەوەی زەنگی شیعرەکە هەیە) [۳۱٥ : ۱۲٦] . ئەوەی مەبەستی

سەرەکی ئێمە بێ لێرەدا دووبارەکردنەوەیە بۆ بەهێزکردنی ئاواز و مۆسیقای دێرە شیعر.

- دووبارەکردنەوەی یەك دێر یا بەشێکی دێرێك یان زیاتر لە دێرێك دوای هەر پارچەیەك ، ئەمە لە ئەدەبی ئەورووپی بە -refrain- ناسراوە کە ( بریتییە لە دێرێك یان چەند دێرێك لە ڕەوتی هۆنراوەکەدا دووبارە دەبێتەوە ، هەندێ جار بە گۆڕانێکی کەمەوە دێ و بە زۆریش لە کۆتایی پارچەکان دووبارە دەبێتەوە . ئەم دووبارە بوونەوەیە لە زۆر بالادو هۆنراوەی کارکردندا دێ ، هەروەکو لە گۆرانی ئەلیزابیدا ڕەگەزێکی باوە، زۆر جار ئەوەی کە دووبارە دەبێتەوە هیچ مانای ڕوونی تێدا نییە تەنیا میلۆدی بەهۆنراوەکە دەدا و بەس )[٥٠٠ : ١٤٣] . ئەمە لە کوردی جگە لە سروودی قوتابخانە و گۆرانی جۆرا و جۆر لە تەرجیع بەندا خۆی دەنوێنێ . ئەم لازیمەیە ڕەگەزێکی قووڵی هەیە بۆ گێڕانەوەی کۆرسی ویردی ئایینی ناو پەرستگاکان و گۆرانییەکانی کارکردنی سەرەتایی دەگەڕێتەوە . ئەم جۆرە دووبارە بوونەوەیە ( نموونەی لە دەقی شیعری لاتینی سەدەکانی ناوەڕاست و پێشتریش هەیە تا دەگاتە سێ‌سەد ساڵ پێش میلاد . هەروەکو لە ویردە ئایینییەکانی گریك و گۆرانی لاتینی میللی و ڕۆمانسیدا هەیە .. ئەمە تەقلیدێکی هونەری کۆنە ، دەتوانین بێ پەروا بڵێین نموونەی لە زۆربەی هونەرە شیعرییە میللییەکانی جیهاندا هەیە، لە -کتێبی مردوان- ی میسری کۆن و سرووودە عیبرییەکان و گۆرانی شوانکارەیی یۆنانی نووسینی تیوکرتیس بیبۆن و هۆنراوەکانی زەماوەندی لاتینی نووسینی کاتوللوسدا هەیە )[٣١٦ : ٥٠] . مەیدراشەکانی ئەفریم لازیمەیان تێدایە ، ( یەکێ دێرە شیعرەکان دەخوێنێتەوە و کۆرسیش دوای هەر دێرێك ( عونیا عوانیا ) دووبارە دەکەنەوە )[٣٥٠ : ٤٤] . ئەوە لە قورئانی پیرۆزدا زۆر ئاشکرا لە سورەتی ( ڕەحمان )دا خۆی دەنوێنێ کە دوای هەر ئایەتێك یان دوو ئایەت ( فبأي آلاء ربكما تكذبان ) دووبارە دەبێتەوە . ئەگەر خانەو لازیمەکان لە باری ستوونییەوە بەرە و باری ئاسۆیی وەربسوڕێنن هەر خانەیەك لە شێوەی لەتە دێرێك و لازیمەکانیش لە شێوەی سەروای لەتەکان خۆی دەنوێنێ .

- دووبارەکردنەوەی لەتێك یان نیولەت لەسەرەتای هۆنراوەدا بۆ دامەزراندنی ئاواز و کێشی هۆنراوەکە . ئەم دیاردەیە لە شیعری کوردی زاری گۆرانیدا زۆر سەرنجکێشە. هەروەکو لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین . ئەمە لە شیعری فۆلکلۆریشدا هاتوە. وەکو دووبارە بوونەوەی ( ئامینێ گیان تۆ گوڵەکەمی ) لە شیعری فۆلکلۆری ( ئامین گیان )دا [١٤٦ : ٢٦٤] ، یان وا دەبێ لەگەڵ دووبارە بوونەوەی لەتی یەکەم تەنیا یەك وشە بگۆڕێ . لەشیعری فۆلکلۆری ( کیژ هەر کیژێ ) [١٩٥ : ٥٥] ، لەسەرەتای هەموو پارچە سێ لەتییەکان ئەم دێرە دووبارە دەبێتەوە و تەنیا ناوی شوێنەکە دەگۆڕێ و دوو دێرەکەی تر لەسەر ئەو وشە گۆڕاوە دادەمەزرێن لە ڕووی مانا و سەرواوە ، کەچی هەموو سێینەکان لە دێری یەکەمدا لەیەك خاڵەوە دەست پێ دەکەن کە ئەم دەستەواژەیەی سەرەوەیە . لە شیعری ( یادم بکەن )دا ، هێمن لەسەرەتای ( ٢٠ ) لەتە دێردا دەستەواژەی ( لەو دەمەی‌دا ) دووبارە دەکاتەوە [٢١٨ : ٢٠٦] . ئەم جۆرە دووبارە کردنەوەیە لە شیعرەکانی ( هێمن )دا

وەکو خاسیەتێکی هونەری زۆر دێ. لە چوارینێکدا ( دەستی تەزیو ) سێ لەتی پێشەوە بە (حەیفە) دەست پێ دەکا [٢١٩ : ٤٤]. لە چوارینەیەکی تردا (کوانێ) هەموو لەتەکان بەم ناونیشانە دەست پێ دەکەن [٢١٩ : ٤٥]. لە (دەسکەوتی خەبات)دا ، (١٦) لەتی سەرەتا بە (نە) دەکاتەوە [٢١٨ : ٢١١][٢].

- وا دەبێ لە یەك دێرە شیعردا یەك وشە یان دەستەواژە چەند جارێك دووبارە دەکرێتەوە ، وەکو مەلا محەمەدی کۆیی نارەزایی بەرامبەر ژیانی پڕ چەرمەسەری دەردەبڕێ و نەفرەتی لێ دەکا :

ژیانی وا بە ئازارو بەمیحنەت بەلەعنەت بێ بەلەعنەت بێ بەلەعنەت [١٢٦ : ١٤٠]

یان وەکو شیعرەکەی نالی کە لە دێرێکدا (نەدەمت بوو) سێ جار لە لەتی دووەمدا دووبارە دەکاتەوە [٢٠٩ : ٨٧].

هەروەها لە شیعرێکی تردا ، هەموو عەجزەکانی لە سێ پات کردنەوەی دەستەواژەیەك دروست بوە :

بەبێ مەی مەستە بێ مەی مەستە بێ مەی [٢٠٩ : ١٢٦].

یان وا دەبێ لە کۆتایی لەتە دێر (بۆ مەسنەوی و سێینە و چوارین ..) و لە کۆتایی دێر (غەزەل و قەسیدە) ، وشەیەك یان دەستەواژەیەك یان ڕستەیەك وەکو خۆی دووبارە بکرێتەوە. ئەمە ڕەدیفە و پاشان لێی دەکۆڵینەوە.

دوای ئەمانە دووبارەبوونەوەی بڕگە و دەنگدێ وەکو ڕەگەزێکی مۆسیقی و بگرە دەلالیش لەسەرەتا یان ناوەڕاست یان کۆتایی وشە. هەر ئەمیشە لە کۆتایی وشە خەست بۆتەوە و کۆتایی لەت و دێری گرتوە و بوە بە سەروا. واتە سەروا گەلآلە بوونێکی تایبەتی شوێن و چۆنیەتی دەنگە لە گرتەوەی دووبارەکردنەوەی دێر و لەت و ڕستە و دەستەواژە و دەنگەوە کەوتۆتەوە. ئەم هاتنی سەروایە ، وەك دیاردەی دووبارەبوونەوەی دەنگ لە کۆتاییدا ڕەسەنایەتی خۆی لەوە دایین دەکاکە لە قسەو گۆتەی ژیانی ڕۆژانەی خەڵك زۆر چالاکە وەکو :

- لە پەندی پێشینان کە ڕەگێکی قووڵی هەیە و بۆ تاقی کردنەوەی ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووری مرۆڤ دەگەڕێتەوە. دەشێ دوو پارچە (فاصلە) یان زیاتر هاوسەروابن : (ماڵی ئەمخۆری بۆ چەکمە سۆری) [١٨٣ : ٧٥] ، یان (ئەگەر بە دوعا ئەبوو ، پشقل بە خورما ئەبوو)[١٩٠ : ٢٠]. ئەم پەندەی دوایی نەك هەر سەروا پاش سەروایشی تێدایە (ئەبوو).

(2) هێمن شاعیرێکە زۆر حەز لە دووبارەکردنەوەی وشە و دەستەواژە دەکا لە شیعرەکانیدا بۆ ئەوەی خوێنەر لەگەڵ خۆی ڕاکێشێتە ناو بازنەی تاقیکردنەوەی ژیان و شیعر و شعووری خۆیەوە. ئەم دیاردەیە جێگای لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆیە لای هێمن.

- لە مەیل و مەتەلی گوێ ئاگریان ، وەکو ( کڵاوی هەمزە پاڵەوان ، نەتیکی هەیە و نەدوڕمان )، یان ( مەیلەکم هەیە مەیلانی ، لەناو باخچەی سوڵتانی ، خوا نەبی کەس نایزانی )[١٩٥ : ١٢].

- لە ڕاگرتنی حیسابی ئاوو هەوای دوازدە مانگە ، وەکو ئەنوای جەوی ( ئادار ئاڕوا بەبێ دۆ، نیسان ئاڕوا بەبێ جۆ ) ، یان ( لەمانگی ئادارێ ، بەفر بباری هەتا گوێی دارێ ، ئامێنێ هەتا هێوارێ ) . لەیەکەمدا جگە لەسەروا ( ۆ ) ، پێش سەروایش ( بەبێ ) ڕەچاو کراوە.

- لە ویردی سەرەتایی و پەیڕەوکردنی هەندێ کاری سیحری بۆ کارکردنە سەر مرۆڤ و دیارەکانی سروشت ، وەکو کۆسەبەبە کە لە زۆربەی ناوچەکانی دونیادا هەیە و بە سیحری تەشابوهی دەیەوێ کار لە سروشت بکا و باران ببارێنێ . لە کوردیدا ئەم وتانەی لەگەڵ دووبارە دەکرێتەوە ( هەیاران و مەیاران ، یاخوا داکاتە باران ، گەنمی حەسەن و حوسێنان ، هەمووی قڕبەو لە تێنان ).

- جگە لەناوی منداڵ ، کە بە زۆری لەسەر جۆرە سەروایەك دەڕوا ، چ بیانی بێ و چ ڕەسەن ، وەکو ( سانا و هانا ) ، ( ئاشنا و ڕۆشنا ) ، ( ئازاد و نەوزاد ) ، یان وا دەبێ ناوەکان دەنگی سەرەتایان یەك بێ ( هاو دەنگی نەبزوێنی سەرەتا ) وەکو : ( ئاسك و ئازدار و ئازەنین ) ، ( خاوەر و خونچە و خەرمان ).

- جگە لە یاری منداڵان و چیرۆکی فۆلکلۆری و ئیش و کاری هەرەوەزی و شین و شایی و ... هەمووی بەدەم ئاوازو دووبارەکردنەوەی وشەو دەنگەوە لەگەڵ جۆشانی هەستی ناوەوە ڕێك دەکەوێ.

ئەم دیاردەی دووبارەبوونەوەیە کە قووڵاییەکی مێژوویی دوور و درێژی هەیە و لەگەڵ زمانی ڕۆژانەی هەموو ڕۆڵەکانی نەتەوە تێهەڵکێش بوە ، بنەمایەکی پتەوە بۆ گەڵاڵە بوونی سەروا لە بەیت و شیعری فۆلکلۆری و گۆرانی بەهەموو جۆرەکانییەوە کە بەرهەمی میللەتە و ئینجا لە شیعری نووسراوی شاعیراندا.

ب - <u>سروشتی زمان</u> :

زمانی مرۆڤ ( Language ) بەوە لە هۆی لەیەك گەیشتنی گیاندارانی تر جیا دەبێتەوە کە دەنگو وشە بۆ لەیەك گەیشتن بەکاردێنێ . ژمارەی ئەو دەنگانەی لە هەر زمانێك بۆ دروست کردنی وشە بەکاردێ دیارە . زمان هەیە دەنگی کەم بەکاردێنێ و هەیە زۆر . لەهەردوو باردا سنوورەکە دیارە و لە چاو ژمارەی وشەو دەستەواژەی زمانەکەدا زۆر کەمە ، هەروەکو وشە و دەستەواژەش لەچاو هەست و بیری مرۆڤ زۆر کەمە و تەواو دەرەقەتی هەمووی نایە . جا لە دووبارەبوونەوەی تایبەتی ئەو چەند دەنگە کەمە بەسەدان هەزار وشە دروست دەبێ کە بە سیستەمی تایبەتی کار دەکەن و

لە دووبارەکردنەوەی دەنگەکانەوە سوودی سەرەکی وەردەگرن.

دووبارەبوونەوەی دەنگیش چ بزوێن بێ و چ نەبزوێن ، لەهەر شوێنێکی وشەدا بێ کاریگەری خۆی هەیە ، دووبارەبوونەوەی بزوێن ئاوازی سەرەکی بە وشە دەدا و دەوری سەرەکی لە برگەولە وشەدا هەیە . هەروەکو بە دوای یەکدا هاتنی دەنگەکان و کارلەیەک کردنیان بۆ سروشتی زمانەکە دەگەڕێتەوە ، هەر ئەوەیشە وای کردوە هەموو زمانێك بەسروشت ئاواز و مۆسیقای تێدابێ بەلام جۆری ئاوازەکە لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕێ . دابەشبوونی بزوێن و نەبزوێن لە هەموو زمانێکدا هەیە بەلام هەر زمانێك تایبەتێتی خۆی لەو دابەش کردنەدا وەرگرتوە . بۆ نموونە لە زمانێکی وەکو ئینگلیزیدا دەشێ لە کۆتاییدا هێشووی نەبزوێنی چوار دەنگی بێ، کەچی لە کوردیدا لە هێشووی دوو دەنگی زیاتر نایە . ئەم جۆرە جیاوازییە ، جیاوازی دەخاتە نێویانەوە لە چالاکی سەروا هێنانەوەدا . لە زۆر زماندا بە تایبەتی لە هیند و ئەوروپییەکاندا چاوگەکان کۆتاییان بە دەنگی تایبەتی دێ و سنوور و جۆری چاوگەکان لە ڕووی پۆلێن کردنی دەنگی کۆتاییەوە دیارە. کوردی و فارسی پێنج پۆلە چاوگیان هەیە . فەرەنسی و ئیسپانی یەکەو سێ پۆلیان هەیە . وشەکانی ژێر هەر پۆلێك لە خۆیانەوە هاوسەروان و گەردان کردنیشیان بە پێی بکەر و کاتەوە هەر هاوسەروا دەبێ . لەئاستی فۆنۆلۆجیدا ئەو زمانانەی (لکێن-لصق)ن ژمارەی پاشگرەکانیان دیارە و سەروای زمانەکە دەوڵەمەندتر دەکا وەکو لە کوردیدا پاشگری (یار) لە (جوتیار و کڕیار و فرۆشیار و بڕیار و گوتیار و ناسیار ...)دا دەردەکەوێ و مەدای سەروا فراوانتر دەکا . لەو جۆرە زمانە لکێنانەدا پێشگریش دەوری زۆر لە قووڵ کردنەوەی دیاردەی (alliteration)دا هەیە کە ئەویش مۆسیقای خۆی هەیە لە وشەدا وەکو (بخۆر و بگرو بکوژ و بنووس...) بەکورتی لەبەر ئەوەی دەنگی زمان کەمەو بەسیستەمی دووبارەبوونەوە کار دەکات لە وشە ڕۆناندا ، تا دەنگەکان کەمتر بن شیمانەی دووبارەبوونەوەیان زیاترە ، تا زیاتر بن دووبارەبوونەوەیان کەمتر دەبێ ، تا دووبارەبوونەوەشیان زیاتر بێ شیمانەی لەیەکچوونی دەنگی کۆتایی وشەکان زیاتر دەبێ و وشەی سەروادار زۆرتر و بەردەست تر دەبێ ، بە پێچەوانەوەش.

ج - <u>خدووی گۆرانی (غریزة الغناء)</u> :

مرۆڤ هەر بە سروشت حەزلە گۆرانی دەکا ، چونکە گۆرانی وەلامدانەوەیەکی ڕێکە بۆ گونجاندنی جۆشی ناوەوە لەگەڵ بزوێنەرەکانی دەرەوە و بەتاڵ کردنی بارگە دەروونییە هەڵچووەکانی ناوەوە بەجۆرێ کە کردەوەی بەتاڵ کردنەکە بە شێوەی شەپۆل و لوێچ هەڵدانێکی وابێ لەگەڵ خرۆشان و هەستانی جۆشی خاتر یەك بگرنەوە . منداڵ هەر لە بچووکییەوە ، هەوڵ دەدا جۆرە ئاوازێك بەقسەکانی بدا لە یاری و هەڵبەزین و تەنانەت گریانیشدا . ئەو ئاوازە بنەمای گۆرانییە و ئەگەر گۆرانی وەستانی لەسەر هەمان دەنگبێ (سەروا) ، نیشتنەوەی شەپۆلەکانی لەیەك نزیك دەبێتەوە و داکوتانەوەی کۆتایی لەیەك لەنگەردا دەگیرسێتەوە کە (قەرار) گرتنی ئاوازەکەیە . لای

منداڵ و مرۆڤی سەرەتاییش ، لەکاتی دەربڕینی هەستی ناوەوە، جوولە ( سەما ) و ئاواز ( گۆرانی ) و دەنگ ( شیعر ) بەیەکەوە دێن، پاشان لەگەڵ گەشەسەندن و پێشکەوتندا وردە وردە هەریەکە ڕێچکەی خۆی دەگرێ. گۆرانی و شیعر زۆر تێکچڕژاون ، وایە مۆسیقا زمانی ئاوازە و پێویستی بە وشە نییە ، بەڵام گۆرانی وشەی ئاوازداری دەوێ بۆ ڕاگرتنی ڕیتم و جوولانەکەی. شیعریش پێویستی بەهەندێ ڕەگەزی گۆرانی هەیە تا کاریگەری خۆی تەواو بکا ، وەکو کێش و ڕیتم و ( سەروا ) . شوێنی وەستانی گۆرانی لە شیعردا بە ( سەروا ) دیار دەکرێ ( لای ئەو نەتەوانەی شاعیر بە تەنیا سروود دەچڕێ، سەروا لە شیعردا دەردەکەوێ چونکە گوێگران پێویستیان بەوە هەیە هەست بە شوێنی وەستان بکەن ، بەڵام ئەگەر چڕینی سروود بە کۆمەڵ بێ ( کۆرس ) ، پێویست بەم وریاکردنەوە ناکا چونکە هەموویان گۆرانییەکەیان لەبەرە و بە فاسیلە و لازمە و سەنگو دووبارەکردنەوەی وشەکان لەگەڵ ڕیتمی گۆرانییەکە دەڕۆن بێ ئەوەی پێویستیان بەسەروا بێ کۆتاییەکان دیار بکا . پێویستی سەروا یان وەستانی سەر سەروا لە ئەنجامی جیاوازی هەست و نابەشبوونی نێوان سروود چڕ و گوێگرەوە دروست بوە ) [٢١٧ : ٢٣٦] . ئەمە ئاماژەیە بۆ لێک دابڕانی گۆرانی و شیعر و دروست بوونی ئەرکی سەروا.

د - <u>سەرەتایەتی سەروا (بداية القافية)</u> :

مرۆڤی سەرەتایی کە مێشکی ئەوەندە گەشەی نەکردبوو ، زیاتر بایەخی بە ئەدگاری دەرەوە دەدا ، بەبیر کردنەوە لە ڕووکاری شتەکان ڕوونە دەچوە خوارەوە . زەوقی لەگەڵ دیاردە زەقەکانی سروشت دەڕۆیشت وەکو ڕەنگی تۆخ وزرقی وهات و هاوار و قیژەی بەهێز و جولەی توندوتیژ. هێشتا چەشەی نەرم و ناسک نەبوو ، شارستانێتی و پێشکەوتن هەستیان مشت و ماڵ نەکردبوو ، بۆیە لە ئاخاوتنیشدا ، سەرەتا بایەخی بە وشەی قەبە و ڕازاندنەوەی دەرەکی و بەرزکردنەوەی دەنگ دەدا لەسەر حیسابی ناوەڕۆکی قووڵ و هەستی بەرز. دکتۆر مارف ڕاستی بۆچوە ( هۆزی دواکەوتوو لە خوێندەواریدا بیرو باوەڕی تەسک و ساکار ئەبێ ، جا بۆ ئەوەی هونەرێك بدا بە شیعر وەزن و قافیەیەکی ڕێك و پێکی بۆ دائەنێ ، بۆ ئەوەی ئەو ساکارییەی لەبیرو خەیاڵەکەدا هەیە ، بەم وەزن و قافیەیە ، دابپۆشێ . ئەمەش ڕاستە کە زۆر جار وەزن و قافیە چەشنە هونەرو خەیاڵێکی تر بەشیعر ئەدەن ) [١٠٩ : ٢٥] . سەرەتایەتی و ڕەنگی زەق و قیژە ، یەکێکە لەو دیاردانەی بۆتە زادەی پەیدا بوونی یەکێ لە تیۆرەکانی دروست بوونی زمان کە تیۆری پەسپرسنی دانیمارکییە ( تیۆری نۆویـژۆ ) ، ئەم تیۆرە ( مێژووی زمان بەرەو دواوە دەباتەوە بۆ ئەوەی بزانێ ڕێڕەوە درێژەکانی کامانەن ، ئینجا گریمانەی ئەوە دەکا ئەو ڕێڕەوانە هەر لەسەرەتای زمانەکەوە هەبوون . ئیتر بەم کردەوەیە گەیشتە ئەو ڕایە کە زمانی سەرەتایی لەوشەی زۆر درێژو پڕ دەنگی سەختی کارپێژشکێن پێك هاتوە ، تۆن و ( Pitch )ی لە زمانەکانی دواتر زیاتر بەکارهێناوە و فاسیلەی مۆسیقی فراوانتری داوەتێ . زمانەکە عاتیفیتر و مۆسیقیتر بوە لە زمانی پاشتر ) [٤٥٧ : ٢٨] . چۆن زمانی

سەرەتایی سەخت و گران و بەبریق و باق بوە ، داڕشتنی ساکاری هونەریش ئەو بریق و باقەی بوەو لەباتی فاسیلەی مۆسیقی شاعیر هەوڵی سەروا هێنانی داوە بۆ زیاتر بایەخ دان بە ئەگاری دەرەوە . میلتۆن لە پێشەکی (بەهەشتی ونبوودا) سەروا بە بەربەریەت دەبەستێتەوە (سەروا پاشکۆیەکی نابێویستە ، ... داهێنانێکی سەردەمی بەربەرییە و هیچی تر) [٣٤١ : ٦٦١] . سەروا رەگەزێکی مۆسیقی شیعرە و مۆسیقیەتیش هونەری گوێچکەیە و بە قۆناغی نەخوێندەواری و سەرەتاییەوە دەبەسرێتەوە (دیاردەی مۆسیقیەت بۆ باوسەندنی نەخوێندەواری - الامیە - دەگەڕێتەوە کەئەدەب ئەدەبی گوێچکە بوە نەك چاو . لە مەڵبەندی دواکەوتوودا ، خەڵك پشت بە گوێ دەبەستێ بۆ هەڵسەنگاندنی ئەدەب، بەمەوەش گوێ لە دەرك کردنی جیاوازی وردی دەنگ رادێ و زمانیش دەکەوێتە بەر مەشق و رەها بوون . ئیدی زمان و گوێ یەك دەگرن بۆ پەسندکردنی رەگەزی مۆسیقی ، بۆیە لای زۆریەی نەتەوەکان شیعر سەرەتایە نەك پەخشان)[٢٤٢ : ١٩٥-١٩٦].

بەم بۆچوونە ، سەروا بەرهەمی سەردەمی سەرەتاییە کە قورسایی بایەخ لەزماندا لەسەر وشەو قەبەیی داڕشتن بوو . جا چۆن زمان لە ڕەوتی بەرەو پێش چووندا لە قەبەیی خۆی دابەزی و بەرەو نەرمی و هێمنی و ڕەوانی و ئاسانی چوو ، سەروایش بەدەم ئەم ڕەوتەوە وردە وردە نرخی بەرەو کزی چوو ، تا وای لێ هات لە سەدەی ڕابردووەوە جاڕی فڕێدانی کۆتی سەروا و کێشی تەقلیدی هانە ناوەوە، چونکە پێویستی جارانی نەماوە (کە کۆمەڵ پێش ئەکەوێ لە ڕووی خوێندەوارییەوە ، پایەی بیرو خەیاڵ بەرز ئەبێتەوە . شاعیری هونەروەر ئەتوانێ وێنەی بڵندی هونەراوی وا دروست بکا کە هەرگیز پێویستی بە یەکێتی وەزن و قافیە نەبێ ، بەڵکو ئەمجارە بە بیری بەهێزو خەیاڵی هونەراوی وەزن و قافیە دائەپۆشێ)[١٨٤ : ٢٥] . زاڵبوونی بیرو خەیاڵ لای مرۆڤی پێشکەوتوو، پێویستی سەروا بەلاوە دەنێ.

ﻫ - <u>پێویستی سەروا بۆ پاراستنی دەق</u> :

بەرهەمی سەروادار ، هەرچی هەبێ : پەند ، مەتەڵ ، شیعر ، ... زووتر لەبەر دەکرێ، چونکە وشە سەرواداڕەکان لەبەر ئەوەی دەنگی دواوەیان یەکە ، لە مێشکدا باشتر بەرەو یەکتر دەچن و لەیەك خانەدا گیر دەخۆن و زووتر دێنەوە بیر. ئەمە وای لە مرۆڤی سەرەتایی کردوە سەروا بکا بەرەگەزێکی ئاسان کردنی لەبەرکردن و پاراستنی دەقە پیرۆز و ئایینەکان و دواتریش دەقە میللییەکان. چونکە نووسین نەبوە یا ئەوەندە پێشکەوتوو نەبوە بە فراوانی بۆ هەڵگرتن و پاراستنی دەقەکان بەکاربێ . ئەو دەقانەی کە پێش باوسەندنی خوێندەواری ماونەتەوە ئەوانەن کە پوخت و کورت و تۆکمەن ، ڕیتمێکی هەمە لایە و سەروایان تێدایە ، ئەو ڕیتم و سەروایە یارمەتی لەبەر مێشکی بچەسپێ و لە شیعردا پەیرەوي بکات کە خەسیەتی خەستیی و ئیقاع و زمانی خوازەیی (کە زمانی سەرەتاییە) تێدا زاڵە (یەکێتی وەزن و قافیەی شیعر یارمەتی هەموو کەسێك ئەدا کە

شیعرەکە زوو لەبەر بکرێ بەتایبەتی لە کۆمەڵێکی دواکەوتوودا کە خوێندەواری تیایدا دوا کەوتبێ یا هەر نەبێ ) [۱۰۹ : ۲۵] . هەر بۆیەش لە کۆمەڵی نەخوێندەواردا بەرهەمی زار گوتن زۆرترە و بایەخدان بەلایەنی شکلی زیاترە.

۲- ئەرکی سەروا لەشیعردا :

هەر لەکۆنەوە ، سەروا بەیەکێ لە ڕەگەزەکانی شیعر داندراوە . قدامەی کوری جەعفەر دەڵێ ( شیعر گوتەیەکی کێشدار و سەروادارە ، مانایەك دەگەیەنێ ) [۲۳۱: ۱۵] . ئیبن ڕەشیق لەبارەی شوێن و پایەی سەروا لە شیعردا دەڵێ ( سەروا لەوەی کە تایبەتە بە شیعر هاوبەشکی کێشە ، شیعر تا کێش و سەروای نەبێ نابێ بە شیعر) [۲٤٦ : ۱٥۱] . کێش و سەروا بەتەنیا ناتوانن شیعر بێننە کایەوە ، چونکە مانا و خەیاڵ پلەی یەکەم لە شیعردا وەردەگرن.

سەروا لەچوار چێوەی پەیامی شیعریدا ، چەند ئەرکێکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ بەجێ دێنێ کە گرنگترینیان ئەمانەن :

- سەرواو پێناسەی شیعر : هەر لەکۆنەوە لە زۆر ڕوانگەی جیاوازەوە پێناسەی شیعر کراوە: ڕوانگەی کێش بەتەنیا ، سەروا بەتەنیا ، کێش و سەروا ، بێ کێش و سەروا. لە زوربەی پێناسەکانی شیعردا ( نەك هەمووی ) ، سەروا وەك ڕەگەزێکی سەرەکی هاتوە . ئیبن سیرین لە پێناسەی شیعردا بەلای کێش و خەیاڵدا ناچێ تەنیا ( گۆتە و سەروا ) دەکا بە پێوانە ( شیعر گوتەیەکە بەسەروا بەسراوەتەوە . ئەوەی لە گوتن جوان بێ لە شیعریش جوان دەبێ ، هەروەها ئەوەی ناشیرینیش بێ ) [۲٤٦ : ۳۰] بەلام قدامە و ئیبن ڕەشیق کێش و سەروا هەردووکیان دەکەن بە پێوانەی پێناسەی شیعر. کەچی لە شیعری نوێی جیهانیدا کە لە کۆتی کێش و سەروا ڕەهابوە ئەم ئەرکە لەسەروا وەرگیراوەتەوە . چونکە وترا شیعر کێش و سەروای هەیە ، ئەمە دابڕاندنی شیعرە لە پەخشان کە ئەم دوو ڕەگەزەی بە حوکمی پێویست تێدا نییە.

- سەروا ترپە و ئاوازی شیعر زیاد دەکات و لەنگەری شەپۆلی دەنگەکانی دێرە شیعر ڕادەگرێ و دەبێ بە ڕایەڵەو دەنگدانەوەی دەنگە هاوجنسەکانی تری ناو هەمان دێرو دەنگە هاوبەشەکانی دێرەکانی تر ( سەروا ) . دووبارە بوونەوەی دەستە دەنگێك جۆرە ڕیتمێکی ئاوازەیی دروست دەکات و هەست و سۆزی هەڵچووی ناوەوە ڕێك دەخات و بەرەو ئامانجی خۆی ئاراستەی دەکات ، بەتایبەتی لەخوێندنەوەی بەدەنگدا کە پێداگرتنی تێدایە لەسەر هەڵکشان و داکشانی ئاوازەکەو نیشتنەوەی لەسەر دەنگە هاوبەشەکانی دواوە . لەم جۆرە خوێندنەوەیەدا ، سەروا هێڵێکی وەهمی و ئەندێشەیی دروست دەکا ، خرۆشانی دەروونیی هەردوولا ( شاعیر و خوێنەر ) لەسەر ئەو هێڵە وەهمیەدا یەك دەگرنەوە . سەروا دەوری پردێکی ئاوازەیی وەهمی دەبینێ لە نێو هەر دوو جەمسەری کاری شیعریدا.

- سەروا وەکو سنوورێك وایە کۆتایی دێر یان لەنە دێر دیار دەکات وگوێگر هوشیار دەکاتەوە وەکو میشیل بۆتۆر گۆتەنی (سەروا کە کۆتایی دێرە شیعر ڕادەگەیەنێ وەکو زرنگەی چاپ وایە کە لێیدا نیشانەی کۆتایی هاتنی دێرەکەیە) [٣٦٤ : ٥]. سانت بیڤی ڕەخنەگری ڕۆمانتیکی فەرەنسیش سەروا بەزەنگی وریا کردنەوە دادەنێ (ئەرکی سەروا ڕاگەیاندنی تەواو بوونی دێرە شیعرە) [٢٧٢ : ٦٩].

هەندێکی تر سەروا و پێدا کۆتانی کورسی مۆسیقا بەیەك کردەوە دەزانن (سەروا وەکو پێ داکوتان (دقه الرجل) وایە لە کۆڕسی مۆسیقادا، بۆ زەبتی ڕیتم و وروژاندن و وریاکردنەوەی گوێگر لە کۆتایی هاتنی ئیقاعێك و دەست پێ کردنەوەی ئیقاعێکی تر بەکاردێ) [٣٢٨ : ٧٧].

- سەروا دەوری ڕۆنانی دێر و پارچە و هۆنراوەی هەیە. حازمی قرتاجنی دەڵێ (یان ئەوەتە شاعیر دێری یەکەم لەسەر سەروا ڕۆ دەنێ، یان سەروا لەسەر دێری یەکەم) [٢٧٨ : ٢٧٨]. ئینجا پەیوەندی دێرەکان بەیەکەوە دیار دەکا (دیارکردن و جیاکردنەوەی دێرە شیعر و بەیەکەوە بەستنەوەی چەند دێرێك ئەرکی سەروایە) [٤٦٣ : ٨٧]. سەروا دەوری دیاری لە ڕۆنانی پارچە شیعردا (ستانزا) هەیە: (یەکێ لەئەرکە گرنگەکانی سەروا ئەوەیە دێرە تاکەکان لەگەڵ شێوەی ستانزادا بەیەکەوە گرێ دەدا) [٥٠٠ : ١٥٣]. بەم جۆرە (سەروا پارچەکانی هۆنراوە (ستانزا) یەك دەخا و جیایان دەکاتەوە. چونکە هەر ستانزایەك لەتەکانی جۆرە دابەشبوونێکی تایبەتی سەروای هەیە، لە ستانزاکانی تر شێوازی سەرواکە دەپارێزرێ بەڵام جۆری سەرواکە دەگۆڕێ) [٤٧٠ : ٣٨٢]. واتە لە هۆنراوەی پارچەداردا، سەروا جگە لە پێکەوە بەستنەوەی لەتەکانی هەر پارچەیەك، پارچەکانیش بەیەکەوە دەبەستێتەوە بەمەوەش لەپەرت بوون و لێك پچڕان دەیپارێزێ. ئەم بەستنەوەیە زۆر ورد و وەستایانە دێتە دی. نەسەروا بەسەر دێردا دەسەپێ و نەدێر بەسەر سەروادا، بەڵکو سەرواکە، لەخۆیەوە، بەپێی پێویستی شوێنەکە دێت (باشترین سەروا ئەوەیە لەگەڵ وشەکانی دێرە شیعردا بگونجێ، وەکو بیانی و غەوارە دەرنەکەوێ) [٣١٤ : ٧٣].

- لەغەزەل و قەسیدەدا، سەروا کە لە کۆتایی دێرەکان دووبارە دەبێتەوە (یەکێتی سەروا)، وەکو داوێك وایە کۆتایی هەموو دێرەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و یەکێتی هۆنراوەکە لەم سووچەوە دەستە بەر دەکات. وەك دەزانین، لەم جۆرە هۆنراوەیەدا یەکێتی بابەت دەکشێتەوە و دەترنجێتە ناو تاکە دێر و پەیوەندی عوزوی و دەلالی لە نێوان دێرەکاندا نامێنێ. ئەگەر پەیوەندی هەبێ لە بۆچوونی کۆندا بە عەیب دادەنرێ. جا سەروا دەوری دابین کردنی یەکێتی هۆنراوە دەبینێ. هەر دێرێك کە دەگاتە کۆتایی لە ڕێی دەنگە هاویەشەکانی کۆتاییەوە (سەروا) لەگەڵ کۆتایی دێرەکانی تر تێکەڵ دەبێتەوە. ئەم ئەرکەی سەروا لەمانای وشەی (ڕەوی - دوا تیپی ڕەسەنی کۆتایی دێر) زیاتر خۆی دەنوێنێ. ڕەوی یەکێ لەماناکانی ئەو پەتەیە کە باری پێ لەولاغ شەتەك دەدرێ، بۆیەش کراوە بە زاراوە بۆ دوا تیپی ڕەسەنی دێرە شیعر چونکە وەکو پەت دێرەکانی شیعر بەیەکەوە شەتەك دەدات.

- سەروا یارمەتی بیرکەوتنەوەی وشە هاوسەرواکان دەدا . کە وشەیەکی سەروات بەرگوێ دەکەوێ یەکسەر کۆمەڵێ وشەی هاوسەروا لە مێشکتدا دەجووڵێ چونکە هەموویان لەخانەی هاوسەروایەتی مێشکدا یەك دەگرنەوە . ئەمەش وای کردوە شتی سەروادار لەبەرکردنی ئاسان بێ. هەربۆیەشە سەروا جگە لەئەدەبی میللی، لەشتی منداڵانیش بەکاردێ (سەروا لەبەرکردن ئاسان دەکا بۆیە شتی فۆلکلۆری و بابەتی منداڵانە بەسەروا دادەڕێژن تا لەبەرکردنیان بۆ خەڵکی سادەو بۆ منداڵ ئاسان بێ) [٤٧٠ : ٣٨٢] . لەم بارەیەوە جاحیز شیعرو پەخشان بەراورد دەکا (لە عەبدوسەمەدی کوڕی فەزلی کوڕی عیسای ڕەقاشییان پرسی : بۆچی (شیعر)ی سەروادار لە پەخشان پەسندتر دەکەی و خۆت بەسەرواو داڕشتنی کێشەوە ماندوو دەکەی ؟ گوتی : چونکە لەبەرکردنی خێراترە و گوێ بۆ گرتنی چالاکانەترە ... لەپەخشاندا دەیێکی لەبەر نەکراوە و لە کێش و سەروادارا دەیێکی بزر نەبوە ) [٢٧٤ : ١٥٣].

- سەروا خۆشی و لەزەتێکی دەروونی لای خوێنەر (گوێگر) پەیدا دەکا کە لە تێرکردنی تاسەی ڕەچاوکردنی دووبارەبوونەوەی سەروا دێتە دی . سەروا دەوری هەیە لە دروست کردنی جۆرە شێوەیەك لەدابەشبوونی دێرەکان و لەمەدای زەمەنی تایبەتیدا بەیاسای بەدوای یەکدا هاتن (تتابع) یان هاوشوێنی (تناظر) دووبارە دەبێتەوە . دوای خوێندنەوەی یەکەم تەشکیلەی دابەشبوونەکە ، خوێنەر چاوەڕێ دەکا لەهەمان شوێندا دووبارە بێتەوە . ئەم چاوەڕێ دەروونییە بێتە دی خۆشیی دەروونی دەچەسپێنێ و نەیەتەدی نائومێدی دەروونی دروست دەکا ، جا هاتنەوەی سەروا لەکات و شوێنی ڕەچاوکراودا ئەم بارە دەروونییە دەخوڵقێنێ.

- شیعر یەکێ لەڕەگەزە سەرەکییەکانی مۆسیقییەتە ، ئەم مۆسیقییەتە لە دووبارە بوونەوەی ڕێك و تایبەتی دەنگدروست دەبێ . دووبارە بوونەوەی دەنگ(بزوێن و نەبزوێن) لە وشەو دێرەکان جۆرە مۆسیقایەکی کاریگەر دەخوڵقێنێ . سەروا کە بەسیستەمێکی ڕێك دووبارە دەبێتەوە ، جۆرە مۆسیقایەکی تایبەتی لەسەراپای هۆنراوەکە دروست دەکات . جگە لەوەی کە هەر ئەو سەروایە لەگەڵ دەنگەکانی ناوەوەی دێرە شیعردا ، چ لەسەروای ناوەوە دابێ و چ لە دووبارەبوونەوەی هەندێ دەنگی جیاجیا ، مۆسیقای دێرەکە تەواو دەکا و لەدەنگەر بۆ کێش و ڕیتمی دەرەوە و ناوەوەی هۆنراوەکە ڕادەگرێ . بەم جۆرە وەکو پێنتی کۆکردنەوەی مۆسیقای ئاسۆیی و ستوونی هۆنراوەکەی لێ دێ . لەوێوە (جووڵەی مۆسیقای دێرو جووڵەی مۆسیقای هۆنراوە یەك دەگرنەوە) [٢٩٢ : ٩٢].

- سەروا ئەرکی دەلالیشی هەیە . وشەکانی سەروا بەدەنگە هاوبەشەکانیان بیر بۆ مانای وشەکان دەبەن . ئەمە جۆرە چالاکییەك بە هەست و هۆشی گوێگر دەدا ، چونکە لەناو ئەو یەکێتی دەنگییەدا جۆرە پەیوەندییەکی دەلالی سەرهەڵدەدا لەنێو وشەکانی سەروادا . سەروا هەر تەنیا دیاردەیەکی دەنگی ڕووت نییە ، بەڵکو دەکەوێتە ناو کۆمەڵێ پەیوەندی دەلالی هۆنراوەوە و بەشداری لە دروست کردنی ئەو پەیوەندیانە و دەلالەتیان دەکات . هەندێ وشەی سەروا مانایان

زۆر لەبەک نزیکە و پێکەوە دەگونجێ وەکو (برا، چرا) یان (داو، ڕاو) یان (داک، کاک) یان (شەو، خەو) هەندێکی تر لە ڕووی دەلالییەوە پێچەوانەن یان ناکۆکن وەکو (سەرما، گەرما) یان (ساش، جاش)، یان (جۆش، بۆش). ئەم پێکچوون یان ناکۆکییە جوولەی سەروا لە دەستەبەرکردنی چالاکیی زەینی بەهێز دەکات و پەیوەندی نهێنی ئەو دیو دەنگە ڕووتەکان ئاشکرا دەکا. جگە لەوەی شوێنی سەروا کە وەستانی دێرە، جۆرە هێزێك بەوشەکەو ماناکەی دەدات، یان هاتن و دووبارە بوونەوەی سەروا لەو شوێنە تایبەتیەدا نرخی دەلالی و مۆسیقی شوێنەکە بەرز دەکاتەوە. لەهەردوو باردا گرنگی شوێن و سەروا دارییەکە وادەکا کە شاعیر لووزەوی سۆزومانا بەرەو وشەی دواوە هەڵسووڕێنێ. بەمەوە زۆربەی مانا و هەست و سۆزی دێرەکان لە وشەکانی سەروا خەست دەبێتەوە. هەربۆیە ئەگەر لە هۆنراوەیەکی ستوونیدا تەنیا وشەکانی سەروا بخەیتە بەرتیشکی سەرنج تا ڕادەیەکی زۆر مانای گشتی و کەشی ناقی کردنەوەی شعرەکەت بۆ دەردەکەوێ. جگە لەمانە دابەشبوونی سەروا خۆی لە خۆیەوە ئیحای دەلالەتێکی تایبەتی تێدایە. قالبی غەزەل و قەسیدە، چوارچێوەی ناوەرۆکەکەی تا ڕادەیەك دیارە، مەسنەوی بۆ جۆرێکی تر بەکاردێ، هەروەها چوارین و... چونکە سەروا لەم ڕووەوە (ڕێگای جیاواز و هەمە جۆر دەستەبەر دەکا بۆ شاعیر تا هەست و بیری خۆی پێ دەربڕێ) [٤٧٤ : ٤٧]. تایبەتێتی قالبەکە تا ڕادەیەك خزمەتی گەیاندنی مەبەست دەکات.

- سەروا ئەرکی ئیستاتیکیش (جوانکاری) دەبینێ، شاعیر زۆرجار هونەر لە داڕشتنی سەروادا دەنوێنێ و جۆرە جوانییەکی زیادەکی بۆ شیعرەکە مسۆگەر دەکا کە لەگەڵ ڕەگەزەکانی تردا بەهای ئەدەبی بەرزدەکاتەوە. وەکو (ئیعنات) و (جووت سەروا) و...

- سەروا بەدیارکردنی سنووری دێرو دابەشبوونی لەتەکان، لەگەڵ جۆری کێشە بەکارهاتووەکە (کورت و درێژ)، نەخشەی هەندەسی شیعرەکە لەسەر لاپەڕەدا دیار دەکات. واتە چوارچێوەی گشتی (outline) تۆپۆگرافی نووسینی شیعرەکە دەکێشێ. پەیوەندی کورت و درێژی دێرەکان و چۆنیەتی دابەشبوونی لەتەکان و شوێنی دووبارەبوونەوەی سەروا و ڕووی سپی بەجێماوی لاپەڕە، ئەمانە هەموو، لەگەڵ یەکەم سەرنجدا، شتێ لای خوێنەر دروست دەکەن کە ئەمە شیعرە و بەخشان نییە، جۆری شیعرەکەیشت پێ دەڵێ ستوونییە، مەسنەوییە، پارچەدارە، ئازادە ... ئەمە وەکو پێشەکی و ڕێ خۆش کردنە بۆ ئامادەکردنێکی دەروونی خوێنەر بەرامبەر بە شیعرەکە.

٣- سەروا وەکو کۆت :

هەرچەندە سەروا مێژوو و پەیوەندییەکی دوور و بنەوی لەگەڵ شیعردا هەیە و ئەرکی مۆسیقی و ئیستاتیکی و سیمانتیکی تێدا دەبینێ، لەگەڵ ئەمەشدا لە کۆن و نوێدا لای هەندێ نەتەوە بایەخی پێ نەدراوە و لەناو ئەو نەتەوانەی بایەخیشیان پێداوە بەم دواییە ئارەزووی ڕەت کردنەوەی هاتۆتە

ئاراوە چونکە بە ڕەگەزێکی زیادە و بگرە ناپەسەندی دادەنێن، بەو بیانوەی زیان بەکردەوەی لەدایکبوونی شیعر دەگەیەنێ . وابۆ دوو سەدە دەچێ لەسەرپای شیعری جیهانیدا هەوڵ دەدرێ لەنەخشەی شیعر بکرێتە دەرەوە چونکە بە لەمپەرو کۆتی دەزانن لە ڕێگای دەربڕینی سەربەستانەی هەست و سۆز و بیرو ڕای شاعیر. لەسەدەی ڕابردوودا (کۆمەڵێ ئەدیب و نووسەری فەرەنسی شۆڕشێکیان لە بواری شیعردا بەرپاکرد . مەبەست ڕەفزکردنەوەی کێش و سەروا بوو . کێش و سەروایان بە کۆت دەزانی. بەڵگەیان ئەوە بوو ئەو کۆتە ڕێگا لە گەیاندنی مەبەست دەگرێ و شاعیر ناچار دەکا قوربانی بەلایەنێکی بیرەکانی بدا لە پێناوی کێش و سەروادا .. مەسەلەی مل نەدان بۆ کێش و سەروا لای هەندێکیان گەیشتە ڕادەیەك وەکو دیلی و زۆرانبازی هۆڤییانەی دووکەسیان دادەنا لای باپیرە گەورەکانی پێشوویان ) [٣٩٠ : ٩] ئەم جولانەوە زیاتر لای ڕەمزییەکان پەرەی سەند کە لە نرخی سەروایان کەم کردەوە. داوایان دەکرد سەروا گوێی پێ نەدرێ چونکە شتێکی زیادە و بارگرانییە[٢٥١ : ٤٧٩]. لەعەرەبیدا (رزق الله حسون) یەکەم کەس بوە ، لەسەدەی رابردوودا هەوڵی نوێ کردنەوەی شیعری داوە و سەروای بەزیادە زانیوە . لەبارەی سەرواوە ڕای وایە (پێناسەی شیعر بە کێش دەردەکەوێ . سەروا مەرج نییە . ئەگەر هەبێ تەنیا بۆ جوانییە . پێش پەیدا بوونی سەروا شیعر هەر هەبوە وەکو لای نەتەوەکانی تر... ) [٣٦٢ : ٢٠] . ئەم بە کۆت و زیادە زانینی سەروایە خۆی لەم بۆچوونانەدا دەدۆزێتەوە :

- هەندێ لەوانەی سەروا بە ڕێگرو لەمپەر دادەنێن دەڵێن : (سەروا کارەساتە . لافیتەیەکی سوورە . بەسەر شاعیردا دەنەڕێنێ و دەڵێ : نەڕۆی ! لەوکاتەدا کە شاعیر لەپۆیەی هەڵچوون و خرۆشانی سۆزدایە لە پڕ هەناسەی دەپچڕێ و بەفر بەسەر ئاگری داگیرساوی ناوەوەی دادەکرێ ، ناچار دەبێ پاش سارد بونەوە دووبارە تێ هەڵبچێتەوە ) [٢٢٨ : ٧٧] . ئەمانە بۆیە سەروا ڕەت دەکەنەوە چونکە بەربینگی شاعیر دەگرێ و زنجیرەی هەست و بیری دەپچڕێنێ و ناچاری دەکا بێتەوە سەر دێڕ و دووبارە دەست پێ بکاتەوە . (کە هۆنراوە دەتەقێتەوە و دەردەبێ، وەکو ئاوی ڕەوان هەڵدەڕژێ بۆی هەیە سەروا دەوری تێکدەری تێدا بگێڕێ ، چونکە شاعیر کە کەوتە گەڕان بە دوای سەرواو خەریکی وشە دۆزینەوە بوو ، هەست و سۆزی دەپەنگێتەوە و ناتوانێ بە ئازادی گوزارشت لەو هەستە تەقاوە و لەوگڕە داگیرساوە بکات )[٢٠٦ : ١٢٩].

- داڕشتن و سنووربەند کردنی دێرە شیعر بە کێش (ژمارەی تایبەتی پێ ) و کۆتایی هێنانی بەسەروا ، شاعیر ناچار دەکات ئەو مەودایەی قالبی دێرەکە کێشاویە پڕی بکاتەوە . جا ئەگەر هەست و سۆزی لەوە زیاتر بوو لەو مەودا کورتە جێی ببێتەوە دەبێ بیبچڕێ و لەو سنوورەی سەروا لەسەری وەستاوە بیبڕێتەوە . خۆ ئەگەر هەست و بیری کەمتر بوو ، دەبێ بەشتی زیادەکی و

ناپێویست پڕی بکاتەوە فێنولۆن ڕەخنە لە شیعری فەرەنسی دەگرێ لە دوولاوە هێرش دەکاتە سەر سەروا : یەکێ ئەوەیە لە شیعری درامای کلاسیکیدا کە سەروای مەسنەوییە وەڕسی پەیدا دەبێ و دووەم ئەوەیە شاعیر ناچار دەبێ حەشوو بەکار بێنێ، وشەی ناپێویستی وەکو ئاوەڵناوی تێپناخنێ و وشەی بێ سوود و نابەجێ بۆ سەروا بێنێ و بەدرێژ دادڕی ناپێویست بۆشایی دیارکراوی دێڕ پڕ بکاتەوە [٢٢٠ : ٨٤-٨٥]. ئەمە وەکو ئەفسانە گریکییەکە وایە کە خانەخوێکە میوانەکانی بە پێی چوار پاکەی لە قالب دەدا و بەمەوەش کەم کەس بە سەلامەتی دەردەچوو. یان قاچی دەبڕینەوە یان لێکی دەکێشانەوە تا لەگەڵ چوار پاکە (قالبەکە) دەربچن (٢). سەروا بە دیارکردنی سنووری کۆتایی دێر دەبێ بەمایەی شێواندن و بێ بایەخ بوونی ئەو جەستە شیعرییەی بۆ شایەکەی پڕ دەکردەوە.

- پەیرەو کردنی یەکێتی سەروا لە قەسیدەی ڕۆژهەڵاتیدا ڕێگا لە درێژبوونەوەی شیعر دەگرێ (ئەو شاعیرەی بیەوێ هۆنراوەیەکی هەشتا دێری زیاتر بنووسێ هەردەبێ سەروایەکی ئاسان هەڵبژێرێ. لەگەڵ ئەوەشدا بەرلەوەی بگا بە هەشتا دێرەکە ناچار دەبێ ناوەرۆکی دێرە شیعرەکانی لەگەڵ سەروادا بگونجێنێ. بەمەوە شیعرەکە دەبێ بە پاشکۆی سەروا ، نەك سەروا ببێ بە پاشکۆی شیعرەکە) [٢٠٤ : ١٤٨]. شاعیر لە کاتی هۆنینەوەدا سەربەستی نامێنێ هەر هێندە بکەوێتە تەنگژەی سەرواوە ئیدی هەست دەکا شیعرەکەی ڕەسەن و ڕاستگۆ نییە. بەڵکو شتێکی خورتی و زیادەکییە.

- یەکێتی سەروا ، لەگەڵ هۆی تری کۆمەڵایەتی و مێژوویی و جوگرافی ، دەبێ بە لەمپەر لەبەردەم دروستبوونی داستانی (ملحمە) دوورو درێژی وەکو ئەلیازەو ئۆدیسە و ئەنیادە و شانامەو مهابهارتا و ڕامایانا و بەهەشتی ونبوو لە زمانێکی وەکو عەرەبی، چونکە ئەو دەیان و سەدان هەزار وشەیەی سەروا لە زمانەکەدا دەست ناکەوێ ، یا ناو بەناویش ڕێگای دووبارەکردنەوەی وشەی سەروای مەسنەوییان تێدا پەیڕەو کراوە . نازك مەلائیکە نەبوونی داستانی درێژ لە عەرەبیدا بەتاوانی یەکێتی سەروا دادەنێ [٣٠٥ : ١٩٥] تەنانەت شیعری مەسنەویش لە هەموو بارێکدا

---

(2) ئەفسانەکە دەڵێ : (پرۆکرۆستیس)ی کوڕی (پوسیدون) لە ئەندەهۆرێکی زەبەلاح بوو ، بە (میداد) ناوبانگی دەرکردبوو. ئەم لەندەهۆرە خۆی بە میوانپەروەرو غەریبە دۆست پیشان دەدا . ئەوەی بەلای ماڵیدا تێپەڕیوایە زۆر خولقی دەکرد بۆ ئەوەی لابدا ، ئەگەر کابرا لای بدایە ، ئەو ڕۆژە زۆر خزمەتی دەکردو باشترین خواردنی لەبەر دادەنا. کە وەختی نووستن دادەهات، چوارپایەکی ئاسنی هەبوو فەرمووی لە میوانەکەی دەکرد بۆ ئەوەی لەسەر ئەو چوارپایە ڕابکشێ و بخەوێ. ئەگەر کابرا بەژنی لە چوارپاکە درێژتر بوایە ، قاچەکانی بەقەدەر چوارپاکە دەبڕییەوە. خۆ ئەگەر لە چوارپاکە کورتتر بوایە ، ئەوا لێکی دەکێشایەوە تا بەژنی بەقەد درێژی چوارپاکە لێ دەهات. ئەولەندەهۆرە زۆر مرۆڤی بێ تاوانی بەم جۆرە شێواندو لەناوی بردن تا (تیسیوس) بەفریا دەرمانێك کوشتی و هەموو دونیاو ڕێبوارەکانی لە دەست ڕزگار کرد [٣٨٧ : ١٠٤].

دەرەقەتی داستان دایە . لەبارەی شیعری گۆڕستان (مەقبەر)[٣]ی عەبدولحەق حامیدی تورك ، ڕەزا تۆفیق کە ماوەیەك لەگەڵ عەبدولحەقدا ژیاوە ، دەڵێ (شێوە سەروایەکی تایبەتی بەکارهێناوە کە زۆر یارمەتی داوە بۆ لووزەو بەستنی بیر (تداعی الافکار) . ئەگەر داستانی گۆڕستانی بە شێوەی مەسنەوی بنووسیبایە وەکو داستانەکانی تر ، بێگومان لەو کارە ئەدەبییە فەشەلی دەهێنا) [٣٤٦ : ٢١١].

- زۆر دووبارە بوونەوەی سەروا ، بەتایبەتی لە یەکێتی سەروادا ، دەبێ بەمایەی وەڕسی گوێگر ، چونکە ئەو یەکنەواییەی (مۆنۆتۆن) لە دووبارەبوونەوەی هەمان دەنگیا دەستە دەنگدروست دەبێ ، چالاکیی زەینی و دەروونی تەپ دەکات و گوێگر تووشی بێزاری دەکات.

- ئەگەرچی سەروا ، لە ڕووی ئاوازەوە لەگەڵ کێش، هەموو دێرەکانی قەسیدە بەیەکەوە دەبەستێتەوە ، بەلام لەهەمان کاتدا هۆیەکە لە هۆیەکانی ترنجانی یەکێتی عوزوی لەناو تاکە دێردا و دێرەکان لە ڕووی داڕشتن و ماناوە لێك دادەبڕێنێ . س.مۆرێ دەڵێ (یەکێتی سەروا شاعیر ناچار دەکا لە هەردێرێکدا ، بەهۆی بەکارهێنانی سەرواوە ، بیرێکی تەواو دەربڕێ - واتە ڕستەیەکی سنتاکسی تەواو-، ئیتر هۆنراوەکە دەبێ بە کۆمەڵە یەکەیەکی لەیەك پچڕاو)[٢٦٢ : ٥٠]. ئەم گواستنەوەی یەکێتی عوزوییە لە سەراپای هۆنراوەوە بۆ تاکە دێر ، تاقی کردنەوەی شیعریی شاعیر پەرت دەکاو دێرەکان پەیوەندییان بەیەکەوە نامێنێ تەنیا لە ڕووی ئاوازو دەنگی کۆتاییەوە نەبێ.

- سەروا وەکو کۆت وایە ، شاعیر لە (انطلاق) کردن دەگێڕێتەوە، چونکە دەبێ هەست و بیری خۆی لەقالبی وشە سەرواداڕەکانەوە بەند بکات و لایەکی بیرکردنەوەی مێشکی بەدۆزینەوەی وشەی سەرواداڕەوە خەریك بێ و هەست و بیری بەو وشانەوە قالب بەند بکات. ئەمە وای لێ دەکا قوربانی بەزۆر وێنەی هونەری و دەربڕینی شاعیرانە بدات . زەهاوی کە یەکێکە لە ڕەفزکەرانی سەروا دەڵێ : (سەروا هەرچەندە لەیەك هۆنراوەدا جیاوازیش بێ ، هەر شاعیر دەبەستێتەوە و لێ ناگەڕێ بە ئازادی هەستی خۆی دەربڕێ) [٣٤١ : ٦٧٨] ، بەلای ئەوەوە سەروا گەورەترین هۆی دواکەوتنی شیعری عەرەبییە لەچاو شیعری ڕۆژاوا . لای وایە (سەروا شاعیر دەبەستێتەوە ، لێ ناگەڕێ لە دەربڕینا سەربەست بێ ... سەروا عوزوێکی ئەسەرییە ، پاشماوەی سەردەمی کۆنە هەر دەبێ لابدرێ و شیعری لێ ڕزگار بکرێ) [٣٠٦ : ٩٤] . لە شوێنێکی تردا هەموو سوود و ئەرکێك لەسەروا دادەڕنێ (ئەم کۆتە هەر دەبێ هەڵبگیرێ چونکە بێ مفایە) [٣٤١ : ١٧٨].

- یەکێتی سەروا و زۆر دووبارە بوونەوەی لەلایەن شاعیرانەوە ، دەبێ بەهۆی لاسا کردنەوەیان

---

[١] شێخ نووری شێخ سالح هەندێکی لەم داستانەی عەبدولحەق حامید (١٨٥٣-١٩٣٧) لەعەرەبییەوە بەشیعر کردوە بەکوردی [٢١٢ : ٤٥-٦٠].

لە بەکارهێنانی جۆری سەروا و دوپات کردنەوەی هەمان وشەی سەروا لەلای زۆر شاعیرەوە. ئەمەیش بواری داهێنان کەمتر دەکاتەوە. یەکێتی (سەروا پاشخانێکی مێژوویی بۆ شاعیر دابین دەکا. هەر هێندە شاعیر سەرەتای شیعرێکی دامەزراند و کێش و سەرواکەی چەسپاند، یەکسەر بەبێ دەستی خۆی هەست دەکا لەدوای ریزێکی دوور و درێژی شاعیرانەوە وەستاوە کەبەرلەم ئەم کێش و سەروایەیان بەکارهێناوە و لەو بارەیەوە خۆی بەهاویەش دەزانێ لەگەڵ ئەوان و ناتوانێ خۆی لەکاریگەری لاساکردنەوەیان دەرباز بکا)[٢٠٦ : ١٣١].

- سەروا زۆر جار دەبێ بە بارگرانی بەسەر شاعیرانەوە. شاعیر ناچار دەکا یان بەبێ دەستی خۆی لەسنووری گشتی لابدا، یان دەستووری سەروا تێک بشکێنێ بۆ ئەوەی رێگا لەبەردەم دەربڕینی هەست و سۆزی خۆی بکاتەوە. شاعیرانی هەموو دونیا لەدەست قورسایی و سەختی سەروا بە داد دادن، زەهاوی کە هەم شاعیرە و هەم تۆژەرەوە باسی ناڵەو چەقینی شاعیران دەکا بەدەست سەرواوە (شاعیر بەدەستییەوە دەناڵێنێ و رۆیشتنی تەپ و سست و گران دەبێ وەکو یەکێ کە لەناو قوڕێکی خەست بڕوا)[٣٦٢ : ١٢]. هوباردی لامت، هۆنراوەیەکی هەیە گلەیی لە سەروا دەکا کە لێ ناگەڕێ بە وردی و ئازادی و رون و ئاشکرایی بیرو سۆزی خۆی دەربڕێ:

ئەی سەروا،
ئەی کۆتی زۆردار و نا رەسەن،
تاکەی حوکم بەسەر بیرمدا دەکەیت و مێشکم داگیر دەکەی؟
کە تۆ فەرمانی پەیڕەو کردنی کێش و ژمارەیێ دەردەکەی،
ئێمە دەبێ قوربانی بەڕونی و وردی و دروستی بدەین[٢٠٦ : ١٢٩].

ئەحمەدی شاملو دەڵێ:

بەشان بەرد دەکێشم،
بەردی وشە،
بەردی سەروا [٢٨٨ : ٢٧].

یان:

من بەردی قورسی سەروا دەخەمە سەرشان،
خۆم لەناو زیندانی شیعر بەند دەکەم [٢٨٨ : ٤٠].

یان:

خۆشویستنی کێی و زەمزەمە و فریاد،
خۆشویستنی زینداني شیعر،
بەزنجیری گرانییەوە:
زنجیری وشە،
زنجیری سەروا [٢٨٨ : ٥٢].

لە کوردیدا ، وەکو لە شوێنێکی تر باس کرا ، مەولەوی لەبەر گرانی دەردیبی ، ( قافیەی فەرد )ی شێواوە . حاجی قادریش داخی قافیەی لە دڵایە :

قەڵەم شکاوو مورەککەب ڕژاوو نامە نەما
لەداغی قافیە ، تا خۆی گەیاندە ئاهو ئەنین [٦٠ : ١٦٢].

هێدی دەڵێ :

قافیە گەرچی تەڵەسمە و تووشی شیعری من دەبێ
بێ تەڵەسمی قافیەش هەڵبەستی من شەرمن دەبێ [٢٣٩].

حەمدی تەنگیی سەروای بۆ لێکچواندن بەکارهێناوە :

دەمت وەك قافیەی ئەم شیعرە تەنگە
کەلامێکی نییە بۆ من بەسەد ناز [٦ : ٢٣٦].

٤- <u>سەروا لە نێوان بوون و نەبووندا</u> :

ئایا سەروا پێویستییەکی شیعرییە و هەر دەبێ هەبێ تا مەرجی بوونە شیعری تەواو بێ ؟ یا دەشێ شاعیر دەستبەرداری بێ ؟ هەبێ باشترە یان نەبێ ؟ پێویستی و ناپێویستی سەروا لە شیعردا بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە : سەردەم ، زمان ، شاعیر ، شیعرەکە خۆی . سەردەم کاردەکاتە سەر جۆری سەروا . لەهەر سەردەمێکدا ئەندازەیەکی تایبەتی هەیە لە بایەخدان بەسەروا ، جۆرە سەروایەك باوە . زەهاوی ، لەژێر کاریگەری تیوری داروین ڕای وایە کە ( شیعر لە ڕەوتی مێژوودا وەکو گیانداران دەکەوێتە گۆڕان و گەشەکردن ) [٣٠٥ : ٢٩]. ئەم ڕایە دەکا بە پاڵپشت بۆ ( گۆڕینی سەروا لەچەند بەیتێکدا پاش گواستنەوەی لەبابەتێك بۆ بابەتێکی تر) [٣٠٥ : ٢٩] . لە ئینگلیزیدا سەرەتا سەروا بەو جۆرەی ئێستا نەبوە ، هاودەنگیی دەوری هەبوە . پاشان سەروای کۆتایی تێدا گەڵاڵە بوە (لەسەردەمی ڕێنسانسدا مەسەلەیەکی باوی ناو نووسەران و شاعیرانی قبووڵ کردن و ڕەت کردنەوەی سەروا بوو . یەکێکی وەکو سەمۆییل دانیال لەنامەی - بەرگری لەسەروادا - سەروا بە پێویست دەزانێ بۆ شیعر ، کەچی یەکێکی تری وەکو کامپیۆن سەروا بە دیاردەیەکی بێ سوودو پێچەوانەی سروشتی زمانی ئینگلیزی دەزانێ ) [٤٠١ : ٢٩٢]. گۆڕانی پێویستی سەروا بە پێی سەردەم لەقسەکەی شاملۆدا ئاشکراتر دەردەکەوێ ( بەلای ئەوانەوە - پێشینانەوە - هەر تەرو وشکێ کێش و سەروای هەبایە شیعر بوو ، هەر گۆتەیێ کێش و سەروای نەبایە پەخشان بوو، کەچی ئەمڕۆ خوێنەری شیعر دەزانێ لایەنی بەرزیی شیعر لەئەدەبدا تەنیا و تەنیا مەتنیقی شاعیرانەیە ، نەك کێش و هونەرە قسەییەکان ) [٣٨٨ : ٩٧].

جگە لەسەردەم ، سروشتی هەر زمانێك ( جۆری دەنگو بڕگەکان ) دەوری لە بوون و نەبوونی سەروادا هەیە . زۆر شیعری جیهانی وەکو گریکی و سانسکریتی ( کۆن ) و یابانی ( نوێ ) کێشیان

هەیە بەڵام سەروایان بە مانای سەروای تقلیدی نییە. ئەگەرچی ئەوانیش دووبارە بوونەوەی دەنگیان تێدا دەکەوێتە ناو کردەوەی خولقاندنی شیعر بەڵام هەریەکە بە پێی سروشتی خۆی ئەو زمانانەی هێز (stress) و کورت و درێژی بڕگە یان تێدا چالاك بێ کێشەکەیان بەهێز دەبێ و بەسەر سەروادا زاڵ دەبێ. ئیدی دەشێ دەسبەرداری سەروا ببن[٤٦١ : ٣٠]. کەچی ئەو زمانانەی کێشیان ژمارەییە و ئیقاعی کێشیان ئەوەندە توند نییە سەروایان تێدا زاڵە. شیعری فەرەنسی کە کێشەکەی ژمارەییە، ڤانسان سەروای تێدا بە پێویست دەزانێ (سەروا بۆ شیعری فەرەنسی پێویستە. سەروا ئەو رەگەزە بنچینەییەیە کە شیعری لێ دروست دەبێ. سەروا نەبێ پێوەرە شیعرییەکان خاو دەبنەوە و شیعرەکە لە پەخشان نزیك دەبێتەوە) [٢٣٠ : ٨٧]. لە پێکهاتنی فۆنۆلۆجی وشەی هەر زمانێك کە سیستەمی تایبەتی خۆی هەیە، کۆتاییەکان دەوریان لە سەپاندن و نەسەپاندن یان زۆر و کەمی سەروادا هەیە. ئەو زمانانەی کۆتاییان بە هێشوە نەبزوێنی گەورە دێ کەمتر بۆ هۆنینەوەی شیعری سەروادار دەگونجێن، وەکو زمانی ئینگلیزی، کەچی ئەو زمانانەی زۆر لە وشەکان کۆتاییان بە بزوێن دێ وەکو زمانی ئیتالی و خوارووی سکۆتلەندە و یابانی زیاتر بۆ سەروا هێنانەوە لەبارن [٤٦٢ : ٨٨]. جگە لەوەی هەندێ وشە بەجۆرێ هەڵکەوتوون وشەی تری هاوسەروا و هاو ئاوازیان بە ئاسانی چنگ دەکەوێ. کەچی لە هەندێ زماندا وانییە، بۆ نموونە لە ئینگلیزیدا (وشەی -love- بۆ سەروای تەواو تەنیا لەگەڵ وشەیەکی بێزەوەری وەکو -shove- یان وشەیەکی سواوی وەکو glove دێ) [٤٦٢ : ٦١]. زۆر و کەمی وشەی هاوسەروا هەتا رادەیەك پەیوەندی بە جۆری زمانەکەوە هەیە لە رووی چەقین یان گەریان نەبوونەوە (العازلە) (چینی و سامی و بورمانی و تبتی ...)، لکێنی (اللصقیە) (تورکی و مەنگولی و مەنشووری و یابانی و زمانەکانی باسك ...) و گەریان کراویان شیکاری (المتصرفە او التحلیلیە) (فارسی و هیندی و لاتینی و گریکی و جەرمانی و عەرەبی... هەروەکو شلیگل باسی کردوە [٣٢٦ : ١٩٥]. یان جۆری زمانەکە لە رووی خزمایەتی نێوان زمانەکان کە لە بنچینە و دەستووری رۆنانی وشەو بنیاتی رستەدا لەیەك دەچن وەکو خێزانی هیند و ئەورووپی و خێزانی سامی و حامی و خێزانی تورانی وەك ماکس مولەر پێشانی داوە [٣٥٦ : ١٩٦]. زمان هەیە هەر بەسروشت کۆتایی وشەکانی (بەتایبەتی کە بزوێن بێ) ئەوەندە زۆر لەیەك دەچێ بەکارهێنانی لەشیعردا هیچ دەورێکی نابێ وەکو شیعری یابانی کە شیعری بێ سەروایە (زمانی یابانی بڕگەکانی کورت و کراوەن، ناکرێ سەروا یا هاونەبزوێنی سەرەتای بۆ دیارکردنی دێرە شیعر تێدا بەکار ببرێ، نەك لەبەر ئەوەی ئەمانە لە زمانی یابانیدا نین، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەقسەی ساکاری رۆژانەدا ئەوەندە زۆرن هیچ نرخی ئیستاتیکیان نەماوە) [٤٦٣ : ٤٨].

لەیەك سەردەم و یەك زمان خۆبەستنەوەیان سوود بینن لەسەروا وەك رەگەزێکی شیعری لە شاعیرێکەوە بۆ شاعیرێکی تر دەگۆڕێ. دەسەڵاتی شاعیرێك بەسەر زمان و داڕشتن و هونەری

شیعرییەوە تا شاعیرێکی تر دەگۆڕێ . جگە لەوەی بەهرە لەم بوارەدا دەوری هەیە ، توانای زمانی و دەولەمەندیی فەرهەنگو ڕاهێنان و ڕامانی شاعیرەکەش دەوری خۆی هەیە . لەعەرەبیدا کێ توانیویەتی وەکو ئەبو عەلا لە دیوانێکی شیعری قەبەدا خۆی بە (لـزوم مـالا یـلزم) [4] بەستێتەوە و تێیدا سەرکەوێ . هەڵبەت ئەمە بۆ دەسەلاتی شاعیر دەچێتەوە . لەیەك زمان و سەردەمدا ، شاعیر هەیە بە ماندووبوونێکی زۆر ئینجا وشەی سەروادار دەدۆزێتەوە و بە خورتی دەیانئاخنێتە کۆتایی دێڕەوە ، ئەم خورتی لە خۆکردنە زەق دیارە و سەرواکە شلۆقە ، بەئاسانی دەتوانی لایدەیت و وشەیەکی تری بیخەیتە شوێن . کەچی شاعیر هەیە زۆر بەسەر زمان و ئیقاعی شیعری و وشەدا زاڵە . سەروا لە شوێنی خۆی دێنێ . ناتوانی وشەی سەروا لابدەی و هیچ وشەی لەبارتری بخەیتە جێ لە ڕووی مانا و ئیقاع و داڕشتن . کوومبز جیاوازی ئەم دوو جۆرە شاعیرە بەم شێوەیە پێشان دەدا : (هەر خوێندەوارێك ، بێ ئەوەی بەهرەی هەبێ ، دەتوانێ بەیارمەتی فەرهەنگ هۆنراوەیەك ڕێك بخا کە سەروای تەواو بێ ، بەلام بەکارهێنانی سەروا وەکو هۆیەك بۆ پتەوکردنی خەستبی و ناسکیی مانا و بۆ بزواندنی هەست و سۆزی خوێنەر ، بەهەموو کەس ناکرێ) [٤٥٨ : ٣٢] .

خودی شیعریش بە کێش و تەواو تریەی ناوەوە و بابەت و دامەزراندنی تۆڕیی پەیوەند بە وشەیی و سیمانتیکییەکان ، ڕادەی پێویستیی بە بوون و نەبوونی سەروا دەگۆڕێ . (سەروا بەهایەکی مۆسیقی لە دێرە شیعردا هەیە ، دووبارەبوونەوەی یەکنەوایی زیاد دەکات . نابێ سەروا بۆ تەواو کردنی دێر بێ ، بگرە دەبێ مانای دێرەکە لەسەر ئەوەوە دروست بێ و نەکرێ لە دێرە شیعردا دەستبەرداری بین) [٣٥١ : ٤٧٤] .

ئەرستۆ لەشی کردنەوەی شیعردا هەر باسی کێش دەکات و سەروا ناکا بەمەرجی بوونی هۆنراوە [٢٦٣ : ٥-١٦] . لە لاتینیدا سەروا دەبینرێ بەلام نەك وەك ڕەگەزی بنجی شیعر [٣١٦ : ٧١] . لە شیعری عەرەبیدا ، ڕەخنەگرە کۆنەکان بە زۆری کێش و سەروا دەکەن بە پێوانەی شیعر بەلام زۆربەیان کێش بە بنجی تر دەزانن [٢٤٦] ، [٢٤٧] ، [٢٣١] ، [٢٤٨] . کەچی عەبدولقاهری گورگانی خاوەنی تیوری (النظم - ڕێکخستن) دەلێ شیعر نە بە کێشە و نە بە سەروا ، بەڵکو بە چۆنیەتی ڕێکخستنی وشەکانە [٣٠٥ : ٨٢] . لە کوردیدا شێخ نووری شێخ سالح کێش و سەروا بە ڕەگەزی شیعر دەزانێ (نەزم بە ئەو تەرزەی بەیانە دەلێن کە موزەیین بێ بە وەزن و قافیە ،

[4] أ- بەبرەوکردنی ژمارەیەکی دەنگی کۆتایی (تیپی بزواو وەستاو) زیاد لە سنووری خۆی.
ب- بەکارهێنانی هەموو تیپەکانی ئەلف و بێ وەك ڕەوی.
ج- هۆنینەوەی چوار قەسیدە لەسەر هەر ڕەوییەك : یەك بەوەستاو ، یەك بە زەمە یەك بەکەسرە یەك بە فەتحە کۆتایی بێ.
د- بەکارهێنانی کلێشەکان بەتێرە لە هۆنراوەکاندا.
بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە [٢٥١].

ئەسریش بە ئەو ئەسەرانە ئەڵێن کە موقەییەد ئەبن بە قیودی وەزن و قافیە )[١٦٣ : ٢١-٢٢]. گوران کێش و سەروا بە پێویست دەزانێ لە پاڵ ڕەگەزی شیعریی تر ، بەلام کێش پەسندترەکی ( مەرجی هەڵبەست تەنیا -کێش و قافیە- نییە بەلام هەبوونی مۆسیقایەکی ڕەوان - جۆرە کێش و قافیەیەك بەتایبەتی کێش مەرجی هەرە گرنگیی پێویستیەکانی هەڵبەستە ) [٥١٣]. عەلائەددین سجادی لەجیاکردنەوەی هۆنراوە و پەخشان دەڵێ ( کێش و پێوانە - وزن - لە هۆنراوەدا گەورەتر شتێکە کە لەگەڵ پەخشاندا جیای ئەکاتەوە )[١٣٧ : ١٢٨] ، سەروایش بە نیشانەیەکی هۆنراوە دەزانێ ( بوونی لەودا پێویستە ) [١٣٧ : ١٣٤] بەلام ئەو جەختەی کێشی لەسەر ناکا . بەلای د.مارف خەزنەدارەوە ( قافیە مەرجێکی گرنگو پێویستە بۆ شیعری کوردی ) [١٨٤ : ٥٦].

بەکورتی ئەگەر شاعیر بەهرەوەر بێ و دەسەڵاتی بەسەر زمان و شیعردا بڕوا و بتوانێ بەپێی پێویست و لە شوێنی شیاوی خۆیدا ، بۆ خزمەتی دەلالی و جوانکاری هەر جۆرێکی سەروا بەکاربێنێ ئەمە بەرزکردنەوەیە لە نرخی شیعر و شاعیریەتی ، خۆ ئەگەر سەروا زادەی زۆر لە خۆکردن بێ و هیچ دەوری دەلالی و ئیستاتیکی نەبێ، نەبوونی باشترە.

٥- <u>سەرواو هەندێ لە پێوەندییەکانی</u> :

أ- سەروا و ڕیتم :

ڕیتم ئەو تریە ولێدانەیە کە لە مەودای زەمەنی دیارکراودا دووبارە دەبێتەوە ، زانستی ڕیتم (ئەو زانستەیە لە باری زەمەنی نێوان ئاوازەکان دەکۆڵێتەوە ) [٢٤٧ : ٩] . ڕیتم لەبنەڕەتدا لەسەر بنەمای دووبارەبوونەوە هاتووە (وەکو لێدانی دڵ و جوڵاندنی دەست و پێ لەکاتی ڕۆیشتن و بەدوای یەکدا هاتنی شەو و ڕۆژ و وەرزەکان و سووڕانی مانگ بەدەوری زەوی و زەوی بەدەوری خۆردا . ئەم دووبارەبوونەوە کەم و زۆر ، ڕێکەی ئەرك و چالاکی مرۆڤ و سروشت و گەردوون بوو بە بناغە بۆ ڕیتمی هونەری) [٤٥٨ : ١٧] . ئەم ڕیتمە لە جووڵە و سووڕانەوەی گەورەترین گەلاکسی و سیستەمی خۆر و لە ڕەگەزەکانی بچووکترین ئەتۆمدا هەیە. هەموو شتێ و هەموو دیاردەیەك لەم گەوندا لە ئیقاعێکی بەردەوامدایە.

د.رەمزی مفتاح لەوتاری (شیعری رەهاو فەلسەفەی ئیقاعدا ) لە (ئیقاعی زگماك - فطری دەدوێ کە پێوەندی بە یەکێتی ئاوازەوە هەیە - (بەپێی بۆچوونی باقلۆف - باس لە پێکهاتنی شانە و ئەو ئاوەندە سروشتیە دەکا کە گیانداری تاکشانە تێیدا دەژی)[٢٤١ : ٦٨٢]. ڕیتم دیاردەیەکی فراوانە هەر لە زمان و ئەدەبدا نییە بگرە (سروشت ڕیتمی هەیە ، کار ، ئیشارەتی ڕوناکی ، مۆسیقا ، هونەری تەشکیلی هەموو ڕیتمیان هەیە ) [٤٧٨ : ١٦٣] . کەواتە ڕیتم لە جیاوازی و یەکێتیدایە ، دوو دیاردە جیاوازن و بەیەکەوەش دێن . هاتنەکەشیان بە نۆرەیە چا کورت و درێژی هەریەکەیان چەندە گرنگنییە، گرنگئەوەیە هەست بە بوون و دووبارەبوونەوەیان بکرێ (وەکو شێوازی بەرزی و نزمی دەنگ(لەقسەدا )، ڕوناکی و تاریکی (لەو چرایانەی بەنۆرە پێ دەبن و دەکوژێنەوە)، خاوبوونەوە و گرژبوونەوەی (لێدانی دڵ)، ...)[٤٧٧ : ٩٢].

ئەمەیش هەندێ جۆری ڕیتم وەکو مارتن مۆنتگومری و هی تر داویانە :




[٩٣ : ٤٧٧]

لەم جۆرە ڕیتمانەی سەرەوە ، ئەوەی مەبەستی ئێمەبێ ڕیتمی قسەیە . ئەویش لە شیعردا. ڕیتمی شیعرلە زۆر ڕەگەزی جۆراو جۆردا خۆی دەنوێنێ . هەمووشیان لە ڕەوتی دروستبوونی شیعرەکە بە تێکچڕاوی کار دەکەن و لەنگەر بۆ یەکتر ڕادەگرن . لەم کردەوە ئالۆز و چڕەیشدا سەروا بە حوکمی شوێنەکەی دەکەوێتە کارلێکی دەنگی و دەلالی و هونەرییەوە لەگەڵ هەموو جۆرە ڕیتمەکان و دەبێ بە پێتی نیشتنەوە و دەست پێ کردنەوەی جوولەی ئیقاعی دێر و هۆنراوە . یاکوبسن ڕای وایە کە (سەروا جۆرە ڕیتمێکە لەسەر دوو لەنگەری سەرەکی چەق دەگرێ، یەکێ دەکەوێتە سەر سەرواکە خۆی و ئەوەی تر دەکەوێتە سەر شوێنەکەی)[٢٧٩ : ٥٥] گرنگترین ڕەگەزەکانی ڕیتمی شیعر ئەمانەن :




دەکرێ جگە لەمانە لایەنی تریش لە ڕیتمی شیعردا جیا بکرێتەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ ، ئێمە لێرەدا باسی ڕیتمێ ئەم دیاردانە دەکەین.

- ڕیتمی دەنگ، ئەمە لە هەموو جۆرەکانی دی سادەتر و ڕاستەوخۆتر و زەقترە . جۆری دەنگەکان و چەندێتی و چۆنێتی دووبارەبوونەوەیان جۆرە ئیقاعێکی تایبەتی بە دێرە شیعر و هۆنراوە دەدا .

- ڕیتمی ئاواز : ئاوازی وشە (بوون یان نەبوونی هێز -stress- ) لەگەڵ ئاوازی ڕستەدا (بەرز و

نزم ) دەوری زۆریان هەیە لە ئیقاعی دێرە شیعر ، بەتایبەتی ئاوازی ڕستە کە بە درێژایی ڕستە هەر جۆنی دەست پێ بکات و بگۆڕێ لە کۆتاییدا دەگیرسێتەوە کە سەروایە . بەمەوە سەروا دەبێ بە بنتی گیرسانەوەی ئاواز ، لەوێ دەنیشێتەوە یان بەرز دەبێتەوە . ئەم ئاوازە جیاوازانە پەیوەندییان بە ئەرك و دەلالەتی ڕستە و وشەکانەوە هەیە : خەبەر ، پرسیار (بەهەموو جۆرەکانییەوە) ، سەرسامی ، مەرج و وەلامی ، ناکردن ، فەرمان (بەهەموو جۆرەکانییەوە) . پاڕانەوە ، هەڕەشە ، ... گۆڕانی ئاوازەکە ، لەبەرزی و نزمی لەگەڵ شێوازی دووبارەبوونەوەی سەروا و دروست کردنی پێوەندییەکی ئیقاعی لەگەڵ ئاراستەی ئاوازەکەدا ئەرکی سەروا قووڵتر دەکات لە هەڵگرتنی بارگەیەکی تری خولقاندن و بەردەوامیی کردەوەی هونەرمەندانەی شیعر.

- ڕیتمی گێڕانەوەو گفتوگۆ : گێڕانەوە ڕیتم و ئاوازێکی نەرم و هێمنی هەیە ، بەڕەوانی و بێ هەڵبەزین و دابەزینی زەق دەکشێ و بەشێنەیی دەڕژێتەوە ناو سەروا و چەق دەگرێ . بەشوێن یەکدا هاتنی شێوازی گێڕانەوە وەکو شەپۆلدانێکی ورد بەسەرانسەری باسەکەدا بڵاو دەبێتەوە. دەوری سەروا ڕێك خستنی ئەوبەرزی و نزمییەیە چونکە شوێنی وەستان و تێ هەڵچوونەوەیە. کەچی لە گفتوگۆدا ڕیتمێ پەیدا دەبێ خۆی لە دەنگو دەنگدانەوە (الصوت و الصدى) دەنوێنێ. (وتم) (وتی) نووسرابێ یان دوو دەنگەکە ڕاستەوخۆ بەرەو یەکتر کرابن، هەژان و گرژی و خاوییەك لە دوو جەمسەری گفتوگۆکە دەخولقێ و شوێنی گواستنەوەی چالاکیی لە نێوان دووکەسەکەدا لەسەرواوە دەبێ ، بۆیە لە گۆڕینەوەی ئیقاعی وەرگرتن و ڕەت کردنەوە ، لێدان و چاوەڕێی دەنگدانەوە ، سەروا دەوری چەقی چالاکییەکە و خاڵی سەرەکی نیشتنەوە و هەستانەوەی دەبینێ . ڕیتمی گێڕانەوە مەیل بەلای شێنەییدا دەکات (ڕیتمی گێڕانەوە و وەسفی شوێن زیاتر بەلای هێمنی و شێنەییدا دەشکێتەوە تا ڕیتمی شێوازی گفتوگۆکە لادەکا بەلای خێراییدا چونکە لەسەر پرسیار و وەلام ڕۆنراوە ... ڕیتمی گێڕانەوە لە خودی نووسەرەوە هەڵدەقوڵێ کە بەپێی ئارەزووی خۆی دەدوێ و وەسفی شت دەکا ، کەچی ڕیتمی گفتوگۆ لە بەشداری کردنی نووسەر و یەکێکی تر (دووەم کەس) دروست دەبێ ، واتە شتێکی خودی و چەسپاو و نەگۆڕ نییە بەڵکو لە گۆڕاندایە چونکە لە خودی یەك کەسەوە نایە ) [۳٤۰ : ۳۲۱] . بەگشتی ئەم دوو شێوازە ئەگەر لە یەك پلەی باری دەروونیدابن ، گفتوگۆ لە گێڕانەوە خێراترە . واتە لە ڕووی مەودای زەمەنییەوە . (کە بنەمای سەرەکی ئیقاعە) ، گفتوگۆ زووتر بەسەروا دەگا ، یان سەروا زووتر دووبارە دەبێتەوە ، کە ئەمەیش جۆرە ئیقاعێکی تر بە کۆتایی دێرەکان دەدا ، لە جوولەی زەمەنی وشەکانی سەروادا خۆی دەنوێنێ.

- ڕیتمی کێش : ئەمە ڕیتمی وشەو ڕیتمی دەرەوەی هۆنراوە (کێش و بەحر) دەگرێتەوە . کێشی وشە ، چۆنیەتی داڕژان و دروست بوونی دەگرێتەوە لە ڕووی کورتی و درێژی و بەدوای یەکدا هاتنی جۆری بزوێن و نەبزوێنەکان . بێگومان وشە هاوکێشەکان وەکو (دەکرێتەوە ، دەکزێتەوە) یان (حەسەنە ، عەلەنە ، یەمەنە ، دەوەنە ...) ئیقاعێکی تایبەتی کۆیان دەکاتەوە . ئەگەر دەنگی

کۆتاییشیان یەك نەبێ ، ئاوازەکە هەر دەمێنێ بەلام قورسایی سەر سەروا دەکشێنەوە بۆ سەر بزوێن وەکو ( کەچ ، دەر ، کەی ، جەم ) . سەروا جگە لە یەك گرتنەوەی ستوونی لەگەڵ دێرەکانی تردا بەشێوەیەکی ئاسۆییش تێکەڵ وشەکانی هەمان دێر دەبێ ، یەکنەوایی پێوەندی مۆسیقی پتەوتر دەکات . یەکباری زیاتر خۆی لە نهێنی ئاوازەی دارشتنی مۆرفۆلۆجی وشەدا دەدۆزێتەوە . وشە هاوکێشەکان زیاتر بۆ یەکدی دەکشێن و دەبن بە پێتی لەیەکچوون و لەگەڵ جیاوازی وشەی تر ، هێڵی ئیقاعی دێر بەرەو سەروا دەبەنەوە بەتایبەتی کە سەروا لەگەڵ هەندێ لە وشەکانی دێر پێوەندی یەکباری هەبێ ، سەیرکە سەروای ئەم دێرە چۆن لەگەڵ وشەکانی تردا یەك دەگرێتەوە :

سەوزەی خاك پاك یاران هام فەرد

فرەمان وە فەرش بەزم وێمان کەرد

( کەرد ) لەگەڵ ( فەرش ) و ( فەرد )دا ڕیتمی یەکبارییان دروست کردوە ، بزوێن لە هەموویان یەکەو برگە کە بەم جۆرە دارژاوە ( CCVC ).

- ڕیتمی دەلالی : ئەوەیە کە لە وشەی هاوتا و دژیەك و لێکدانەوە و دووبارەبوونەوە دروست دەبێ کە وشەکانی ناو دێرە شیعرەکە دژیەك دەبن ، یەکێتییەك لە دژەکانیان دروست دەبێ ( وحدة الاضداد ) ، وەکو شەو و ڕۆژ ، گەورە و بچووك ، بەرز و نزم ، حاجی دەڵێ :

تا بڵێی فەرقی هەیە میهری من و ماهی فەلەك

لە ئەراتا بە ثورەییا لە سەماتا بەسەمەك [٦٠ : ٦٩].

جیاوازی سەما و سەمەك کەیەك هەرەبەرز و یەك هەرەنزمە ، ئینجا یەك گرتنیان لە ( س )ی سەرەتا بۆ لێك نزیك کردنەوەی وشەکان وەك بڵێ لەگەڵ نزیکیشیان ئەوەندە لەیەك دوورن ئەمە بەرامبەر بە دوو وشەی هەمان لەت دەوەستێ تەرا ( خاك - هەرەنزم ) ، ثورەییا ( پەروین - هەرەبەرز ) ، ئەوانیش لەگەڵ دوورییان، لە ( ث ، ر ، ا ) یەکن ، ئینجا ئەم دوو جووتانە بۆ پێشاندانی پەیوەندی جووتێکی تر هاتوون ( میهر و ماه ) ئەوانیش لێك دوورییان لە جوانی و گەشی و نەزاکەتدایە بەلام وەکو ئەوانی تر لە ( م ، ه ) یەکسانن. ئەم لێکچوون و جیاوازییەی نێوان جووت وشەکان و ئەو پەیوەندییە تەفسیرییەی جووتەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە ، ئیقاعێکی دەلالی قووڵ دەخولقێنێ ، شیعرەکە لەم جۆرە پەیوەندییانە بە ( میهر ) دەست پێ دەکات کە مەبەستی شاعیرە و بەوشەی سەروای ( سەمەك ) کۆتایی دێ کە هەرە نزمی تەوەرەی بەرامبەر دەگەیەنێ ، لێرەدا سەروا دەوری ڕاگرتنی تەوەرەی ئیقاعیی دژیەك و بەرامبەرەکانی بینیوە.

- ڕیتمی دارشتن : گۆڕین و پاش و پێش کردنی شوێنی وشەکان و تێهەڵکێشان و لێك دابڕاندنی ڕەگەزەکانی دێرە شیعر دەگرێتەوە ، پێچان و کردنەوەی پەیوەندییەکان گرژی و خاوییەك بە ڕیتمی هۆنراوەکە دەدا ، وەکو لەم دێرەی حاجیدا هەستی پێ دەکرێ :

بەشەستی زولف و رووی ماهی وەکو ماهی گرفتارم
گەهێ دڵگەستەیی مارم ، گەهێ گیان خەستەیی نارم [٦٠ : ٧٩].

دروست کردنی پەیوەندی لە نێوان (زولف - شەست) و (روو - مانگ) و (خۆی - ماسی) کەتاکە تاک هاتوون ، ئینجا داگەڕانەوەی پێوەندییەکە بۆ دواوە کە گیرخواردنی خۆیەتی لەناو داو جارێکی تر ئەم (زولف و روو)ی لەتی یەکەم ، بە داڕشتنێکی پێچراو لەلەتی دووەم دەکاتەوە و بە (مار و نار) دەیانبەستێتەوە . وشەی سەرەوای دێرەکە کە (نار)ە لایەنێکە لەو پێچان و بڵاوکردنەوەی ئەوتی شیعرەکەی پێ چنراوە.

- ریتمی هاوشوێن ، لە دابەشبوونی وشەکان لە دوو لەتی دێرێك یا دوو دێری هۆنراوەیەکدا لە شوێنی وەکو یەك ، کە وشەکان دەوری رێزمانی و پەیوەندی داڕشتنیان لەیەك بکات دروست دەبێ ، نالی لە شیعرێکدا ئەو هاوشوێنییەی لە پەیوەندی دوو لێکچواندندا دامەزراندوە :

گەر بێبە دەرێ سەروی رەوانی لە ئیرەمدا
وەر نایێ دەرێ ئاهوویی چینی لە حەرەمدا [٢٠٩ : ٤٧].

وشەکان لەپەیوەندییەکی هاوشوێنیدا بەرامبەر یەك وەستاون (گەر ، وەر) (بێبە ، نایێ) (دەرێ) (سەروی رەوانی - ئاهوویی چینی) ئەمانە پەیوەندی لێکچواندن و دەرخەرو دەرخراویان لەنێودایە .

وەك دیارە کۆمەڵێ تریەو ئیقاع لە مەدای دێرە شیعر کاردەکەن ، هەمووشیان جەمسەر لەسەرواوە دەگرن ، سەروا وەك خاڵی ڕاکێشان ، هەموو ئیقاعەکان کۆدەکاتەوە و وەك سەدا دەبێ بە دەنگدانەوە بۆیان . مۆسیقای ناوەوە کە لەو پەیوەندییانەدا بەرجەستە دەبێ (جگە لەسەروای ناوەوە ) (لەپەیوەندی وشە بە وشەکانی دەورو بەری و لە پەیوەندی گشتی وشەوە لەسەراپای رەوتی دێر پەیدا دەبێ) [٣٥٧ : ٢٣]. هەموو وشەکان هێزی کاریگەریان وەکو یەك نییە ، جیاوازی هێزەکە لە خودی وشەکەو شوێنی لە رستە و دێردا دەگۆڕێ : (شاعیر دەبێ بزانێ چۆن وشە بەهێزەکان لە شوێنی خۆیدا لەناو وشەکانی تردا بڵاوبکاتەوە ) [٣٥٧ : ٢٣]. سەروا بە زۆری لەو وشانەیە کە بەهێز و تۆکمەن، سەروا جگە لە رێکخستنی ئیقاعی ناوەوە ، لەئاستی دەرەوە (کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە چونکە وەکو لازمەی ئاوازەیی دێرە شیعر وایە ) [٣٨٨ : ٢٨٣].

ب- سەرواو کێش :

لە پێناسەی تەقلیدی شیعردا کێش بەپلە یەك و سەروا بەپلە دوو بە مەرجی شیعر داندراون . لەم روەوە کێش لەسەروا پێشتر خراوە . بەڵام لە روانگەی مێژوویییەوە کە لای زۆربەی نەتەوەکان شیعر لە سەجعەوە گەشەی کردوە ، سەجعیش بایەخ زیاتر بە سەروا دەدا تا کێش ، دیارە سەروا بایەخی کۆنترە لە کێش بۆ گەڵاڵە کردنی بنەماکانی شیعر. پەیوەندی کێش و سەروا لە شیعردا لەم خاڵانەدا دەردەکەوێ :

- لە شیعری کلاسیکیدا کە یەکێتی بابەت دەترنجێنە ناو دێڕ ، بابەتەکە بە گشتی و کێش و سەروا پێکەوە ، وەک دوو ڕەگەز یەکێتی هۆنراوەکە دەپارێزن . هۆنراوەکە ( جگە لەبابەت ) هەمووی لەسەریەک کێش دەڕوا و کۆتایی بەیەک سەروا دێ.

- دەوری سەروا لە کێشە کورتەکان یان مەجزووئی کێشەکان زیاترە تا کێشە تەواو و زیادەکان ، چونکە تا دێڕە شیعر کورتتربێ سەروا زووتر دووبارە دەبێتەوە ، تا دێڕەکە درێژتر بێ سەروا درەنگتر سەر هەڵدەدا.

- زۆر جار ئیقاعی کێش ئەوەندە بەهێزە ، سەروا بۆ ناوەوەش ڕادەکێشێ . لە جیاتی ئەوەی لە پێی کۆتایی دێڕیان لەت سەروا دووبارەبێتەوە ، لە ناوەڕاستی لەتیش دێ (مُشطر) و جاری وا هەیە دوای هەر پێیەک سەروایەک ئیقاع بۆ کێشەکە ڕادەگرێ ، ئەمە لە کوردیدا ، زیاتر لەلای جزیری[٥٨ : ٤٤٠،٤٠٧ ...] هاتوە.

- لە کێشی عەرووزیدا ، پێی کۆتایی دێڕ کە سەروای تێدایە پەیوەندییەکی پتەوتری بەسەرواوە هەیە و زیاتر دەسەڵاتی بەسەردا دەسەپێ ، بۆ نموونە ئەگەر پێی کۆتایی (فعلن) بێ کە مەخبوونی (فاعلن) یان مەخبوونی مەحزووفی (فاعلاتن)ە دەبێ بزوێنی پێش ڕەوی کورت بێ . یان ئەگەر پێی کۆتایی عیللەی قەسری هاتبێتە سەر (فاعلاتن - فاعلان) ، دیارە سەرواکەی دەبێ ریدفی هەبێ و ریدفەکەی (١) بێ ولە دێڕی یەکەم تا کۆتایی پەیڕەو بکرێ ، ئەم پەیڕەوکردنی ریدفە جۆری وشەی سەروا دیار دەکا ، واتە لەم حاڵەتەدا کێش حوکم بەسەر جۆری سەروادا دەکات.

- لە شیعری کوردیدا ، بەزۆری یەکێتی سەروا لەگەڵ کێشی عەرووزی بەکاردێ، بەتایبەتی کێشە درێژەکان کەچی سەروای مەسنەوی زیاتر لەگەڵ کێشی خۆماڵی (بۆ نموونە کێشی شیعری گۆرانی) دەگونجێ لەگەڵ کێشە کورتەکانی وەکو خەفیف و ڕەمەلی شەشی مەحزوف وهەزەجی شەشی مەحزووف . لەبارەی کێشی عەرووزی ، کێشە کورتەکان بۆ هۆنراوەی درێژ و سەروای مەسنەوی دەست دەدەن وەکو مەم و زینی خانی [٢] یوسف و زلێخای سەلیمی سلێمان[١١٣] و لەیلەو مەجنوونی حارسی بتلیسی [٦١] و زۆربەی مەولوودنامەکان . کەچی غەزەل و قەسیدەکان کە زۆربەی هەرە زۆریان بە کێشە درێژەکان هۆنراونەتەوە ، ژمارەی دێڕەکانیان لەچاو ئەم چیرۆکە شیعرییانە کەمە و یەکێتی سەروایان تێدا هاتوە .. ئەم جۆرە پەیوەندییە لە دیوانی حاجی قادر زۆر ڕوونە . ئەو شیعرانەی بە کێشی درێژ نووسراون یەکێتی سەروایان هەیە و ئەوانەی بە کێشە کورتەکانن مەسنەوین . مەسنەوی بوونی سەروا و کورتی کێشەکان کە زۆربەیان (١١،١٠) برگەیین بۆ هەر لەتێ ، وای کردوە زیاتر خۆماڵیی بکەونە بەرچاو.

- زانستیترین شێوازی دۆزینەوەی پەیوەندی سەروا (بەتایبەتی ڕەوی) بە کێشی شیعر ، لە جەردێکی تەواوی کێش و ڕەوی شیعر و پەیوەندی لەگەڵ یەک هاتنیان دەردەکەوێ چ لە ئاستی

شیعری نەتەوایەتی بێ (کە ئەمە لەبەر زۆری زەحمەتە)، چ لە ئاستی تاکە شاعیرێك بێ کە بە ئاسانی ئەنجام دەدرێ. لە کوردیدا تا ئێستا جەردێکی فراوان بۆ دەرخستنی ئەو جۆرە پەیوەندیە، ئەگەر وەك پرۆژە هەشبێ، ئەنجام نەدراوە. بۆ دەرخستنی ئەم جۆرە پێوەندییە لە جەردێکی دیوانی نالیدا دەرکەوت تەنیا (٧) کێشی بەکارهێناوە، لەمانەش چواریان (تەویل، ڕەجەز، موجتەس، بەسیت) تەنیا یەکەو هۆنراوەیان بێ باندراوە، بۆیە ئەمان خستنە ناو ئەم ڕێژەیە، سێیەکەی تر (هەزەج، ڕەمەل، موزاریع) ڕێژەی بەکارهێنانیان بۆ ڕەوی جیا جیا بەم جۆرەیە:

| رەوییەکان / کێشەکان | | ا | ب | ت | ج | ح | د | ر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەزەج | سەرجەم | ١٤ | ١ | ٦ | ١ | ١ | ١ | ١١ |
| | ڕێژە | ١١٫٩ | ٠٫٩ | ٥٫١ | ٠٫٩ | ٠٫٩ | ٠٫٩ | ٩٫٤ |
| ڕەمەل | سەرجەم | ٥ | ٣ | | | | ١ | ٦ |
| | ڕێژە | ٤٫٣ | ٢٫٦ | | | | ٠٫٩ | ٥٫١ |
| موزاریع | سەرجەم | | ١ | | | | | ٢ |
| | ڕێژە | | ٠٫٩ | | | | | ١٫٧ |

| رەوییەکان / کێشەکان | | ز | ژ | س | ش | گ | ف | ق |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەزەج | سەرجەم | ١ | ١ | ١ | ١ | | | ٤ |
| | ڕێژە | ٠٫٩ | ٠٫٩ | ٠٫٩ | ٠٫٩ | | | ٣٫٤ |
| ڕەمەل | سەرجەم | | ١ | ١ | | ١ | ١ | |
| | ڕێژە | | ٠٫٩ | ٠٫٩ | | ٠٫٩ | ٠٫٩ | |
| موزاریع | سەرجەم | | | ١ | | | | ١ |
| | ڕێژە | | | ٠٫٩ | | | | ٠٫٩ |

| ڕەوییەکان<br>کێشەکان | | ک | گ | ل | م | ن | و | ه | ی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەزەج | سەرجەم | | ١ | | ٥ | ٨ | ٧ | ١ | ٦ |
| | ڕێژە | | ٠,٩ | | ٤,٣ | ٦,٨ | ٦ | ٠,٩ | ٥,١ |
| ڕەمەل | سەرجەم | | | ٣ | ٢ | ٥ | ٥ | | ٤ |
| | ڕێژە | | | ٢,٦ | ١,٧ | ٤,٣ | ٤,٣ | | ٣,٤ |
| موزاریع | سەرجەم | ١ | | ١ | | | | | ١ |
| | ڕێژە | ٠,٩ | | ٠,٩ | | | | | ٠,٩ |

کێش و سەروای هۆنراوەکانی نالی (١١٧ هۆنراوە)

وەکـــو لەنەخشەکـــەدا دیـــارە : (هـەزەج -أ) ڕێـژەی لـە هـەموویان زیـاترە ، لـەدوای ئـەوەوە (هەزەج -ر) ئینجا (هەزەج -ن) و (هەزەج -و) ، پاشان (ڕەمەل -ر) و (هەزەج -ی) بەم جۆرە تا ڕێژەی هەرە نزم کە خۆی لە (هەزەج - ب ، ج ، ح ، د ، ز ، ژ ، س ، ش ، گ ، ه) و (ڕەمەل - د ، ژ ، س ، گ ، ف) و لە (موزاریع - ب ، س ، ق ، ك ، ل ، ی)دا دەبینێ.

- (ج ، ح ، ش ، گ ، ه) تەنیا لەگەڵ هەزەج هاتوون .
- (گ ، ف) تەنیا لەگەڵ ڕەمەل هاتوون .
- (ك) تەنیا لەگەڵ موزاریع هاتوە .
- هەموو ڕەوییەکان بەپلە یەك لەگەڵ هەزەج هـاتوون تـەنیا (ب) بەپلـە یـەك لەگـەڵ ڕەمـەل هاتوە.
- لەدوای هەزەج ڕەمەل دێ لە ڕاکێشانی ڕەوییەکان .
- موزاریع لە دوای هەموویان دێ.

ج- <u>سەرواو بابەتی شیعر :</u>

ئایا سەروا پەیوەندی بەبابەتی شیعرەوە هەیە ؟ ئایا هەر جۆرە سەروایەك (ڕەوی) زیاتر لەگەڵ بابەتێکی تایبەتی دەگونجێ یان نا ؟ ئایا بابەت لای شاعیر پێشتر لـەبابك دەبێ ئینجـا بـەدوای وشەی سەروادا ڕا دەگەڕێ تا کۆتایی دێرەکانی پێ پڕبکاتەوە یان پێشتر کە بیەوێ هۆنراوەیەك دابنێ سەرواکان کۆدەکاتەوە ئینجا بابەتەکەی بە پێی وشە سەرواداڕەکان دابەشی سەر دێرەکان دەکا ؟ لای (طباطبا) سەروا مل کەچە بۆ بابەت و مانا : (شاعیر ئەگەر دێرێکی بۆ هات لەگەڵ ئەو

مانایەی مەبەستییەتی بگونجێ یەکسەر دەیچەسپێنێ ، پاشان بە پێی پێویستی مانا بیر لە جۆری سەروا دەکاتەوە ) [٢٤٤ : ٥] . زیاتر بۆچوونەکەی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ : ( شاعیر کە بیەوێ هۆنراوەیەک دابنێ بیر لەو مانایە دەکاتەوە کە دەیەوێ بە شیعرەکە دەری ببڕێ ، یەکەم جار لە مێشکی خۆیدا بە پەخشان دایدەڕێژێ ، پاشان وشەی وای بۆ دەدۆزێتەوە لەگەڵیدا بگونجێ و سەروای وا دێنێ لەگەڵیدا ڕێک بکەوێ و کێشی وا بەکار دێنێ دارشتنەکەی لەسەر ڕەوان بێ ) [٢٤٤ : ٥] . بەم پێیە ئەو سەروا دەخاتە دەرەوەی ژانی لە دایکبوونی شیعر . وەک بەرگێکی لێ دەکا پاش منداڵ بوون بکرێتە بەری ، نەک وەک ئەندامێکی عوزوی . سەیری کە چۆن سەروا لە بارێک دەگوازێتەوە سەربارێکی تر ئەگەر مانا پێویستی پێ بێ ( شاعیر ئەگەر سەروایەکی بۆ بێ و بۆ مانایەک بەکاری بێنێ ، پاشان مانایەکی تری بۆ پەیدا ببێ پێچەوانەی مانای یەکەم بێ و سەرواکەی بۆ ئەم مانای دووەمینە کاریگەرتر و لەبارتر بێ ، سەرواکە بۆ ئەو مانای دووەمینە دەگوازێتەوە . دێری یەکەم هەڵدەوەشێنێتەوە یان هەندێکی لێ لادەبا ئەوسا بۆی بەدوای سەروایەکی وادا دەگەڕێ لەگەڵیدا بگونجێ ) [٢٤٤ : ٥] . حازم قرتاجینیش بەهەمان چاو دەڕوانێتە پەیوەندی مانا و سەروا : ( شاعیر دەبێ یەکەم جار بیرو مانا هەڵبژێرێ ئینجا سەروای لەسەر بنیات بنێ و هەریەو شێوەیە ( ڕەوی ) هەڵبژێرێ و کێش دابڕێژێ . سەروای شاعیر پاشکۆی مانایە نەک پێچەوانە ) [٢٧٨ : ٢٠٤] . ئەبو هیلالی عەسکەریش ڕای وەکو ئەمانەیە : ( ئەگەر ویستت شیعرێک دابنێی ، ئەو مانایەی دەتەوێ بیهۆنیتەوە لە بیری خۆتدا ئامادەی بکە ، کێشێکی بۆ بدۆزەوە لەگەڵی بێت و سەروایەک هەڵی بگرێ . مانا هەیە دەتوانی بەسەروایەک دایبڕێژی کەچی ناتوانی بەسەروایەکی تر بیلێی ، یان ئەمەیان لەوەی تر نزیکتر و ئاسانترە ) [٢٥٠ : ١٤٥] . بوالۆی ڕەخنە گری سەدەی حەڤدەی فەرەنسی بابەت و سەروا بە دوو ڕەگەزی ڕق لەیەک دەزانێ : ( بابەت هەرچەندە خۆش و بەرز بێ ، ئاگادار بە کە باش لەگەڵ سەروا بڕوا ، چونکە ئەم دوە ڕقیان لەیەکە بەلام بێهوودەیە ، سەروا خزمەتکارە و دەبێ فەرمانبەردار بێ . ئەگەر بەدوایدا بگەڕێی ڕەنگە سەرەتا ماندووت بکات بەلام هۆش - عقل - هەر زوو لە دۆزینەوەی ڕادێ ، ئیدی سەر بۆ هۆش دادەنەوێنێ و خزمەتی دەکا ، بەلام ئەگەر پشت گوێ بخرێ هەڵدەچێ و ڕادەکا ، هەوڵی بۆ بدەی ماناکەیش لەگەڵیا ڕادەکا ) [٢٦١ : ٢٥٠] . ڕاستە سەروا دەنگە و دەنگیش بەتەنیا مانای نییە بەلام هەندێ وای بۆ دەچن هەر دەنگێک ( ڕەوی ) لەگەڵ جۆرە کەش و هەوایەکی تایبەتیدا دەگونجێ . وەکو سلیمان البستانی لە پێشەکی وەرگێڕانی ( ئەلیازە ) دا بیرێکی وای هێناوەتە ئاراوە : ( هیچ دەستوورێک نییە تیپەکانی سەروا بەبابەتی شیعرەوە گرێ بدا ، ئەمە وەکو پەیوەندی کێش و بابەتی هۆنراوە وایە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا تێبینی کراوە کە قاف ( ق ) دەشێ بۆ بابەتی شەڕو توندو تیژی بەکار بێ ، دال ( د ) بۆ یەسن و شانازی و بلێزی ، میم ( م ) و لام ( ل ) بۆ وەسف و خەبەر ، ڕێ ( ڕ ) بۆ غەزەل و دڵداری بەکار بێ ، بەلام ئەمە قسەیەکی گشتییە ئەگەر لە ڕووی زۆرینەییەوە ( الغلبە ) ڕاستیش بێ ، لە ڕووی ڕەهاییەوە ( المطلق ) ڕاست نییە [٢٥١ : ٤٧٧] . هەر لە

پەیوەندی سەروا بە سۆزو ماناوە ، د.محەمەد نوەیهی دەڵێ ( دەبێ سەروا بە شێوەیەکی سروشتی بێ تا لەگەڵ شەپۆلەکانی سۆزدا بگونجێ ) [٢٥٧ : ٣٢]. لەبارەی شاعیرانی نوێ و بەکارهێنانی سەرواوە دەڵێ ( ڕاستی شاعیرەکان لە بەکارهێنانی سەروا و مۆسیقییەت ناپەنگێنەوە ئەگەر بە شێوەیەکی سروشتی لەگەڵ ناوەرۆکدا بگونجێ و هەرتەنیا خشڵێکی ڕووکەش نەبێ ) [٢٥٧ : ٢١٥] . گونجانی سەروا لەگەڵ هەست و سۆز و ناوەرۆکدا ، نەك بەمانای تەعبیر کردنی رووت ، مەرجێکی سەرەکییە بۆ سەرکەوتنی کردەوەی خولقاندنی شیعر، چونکە وشە لەمانا جیا نابێتەوە ، تەنانەت لە مێشکیش ناکرێ مانات بۆ دروست ببێ ئەگەر لە قالبی وشەی زەینیدا نەبێ ، هەر ئەو وشە زەینییانەش بەرەو زمانی دەرەوە دەگوازرێنەوە کە قسە و نووسینە . ڕەنگە لە جەردێکی شیعری شاعیران و پێکەوە گرتنی بابەت و ڕەوی هۆنراوەکانیان بگەینە ئەنجامێك یا بە دەستووریکی زۆر وردیش لێك نەدرێنەوە بەلام پەیوەندییەك هەر دەردەخا یا ( عفوی )یش بێ . ئێمە تاقی کردنەوەی جەردێکی لەم جۆرەمان لە دیوانی یەك شاعیری کورد ( شێخ رەزا ) کرد[٦] و تەنیا قەسیدەو غەزەلەکانمان وەرگرت نەك پارچە بچووك و فەردەکان ، ئەنجام بەم شێوەیە دەرچوو :

| | ا | ب | پ | ت | د | ر | ز | س | ش |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| گلەیی | ١ | | | | | | | | |
| مەدح | ١ | ٢ | | | | | | ١ | |
| غەزەل | ١ | ١ | | ١ | ١ | | | | |
| هەجوو | ٥ | | | ١ | ١ | ٩ | ١ | ١ | ٥ |
| شین و خەم | | ١ | | | | | | | |
| وەسف | | | ١ | ١ | | ١ | | | |
| شانازی و ستایش | | | | | ١ | ١ | | | |
| پارانەوە | | | | ١ | | | | | |
| حیکمەت | | | | | | ١ | | | |

(٦) شاعیرانی کلاسیکی لەبەر لاسایی کردنەوە و بەیرەو کردنی یەك سەبك و سووڕانەوەی زۆربەی بابەتەکانیان بەدەوری غەزەل و بلداریدا ، ڕەنگە ئەنجامێکی رێکمان نەداتێ لە جەردێکی وادا ، بەلام لەبەر ئەوەی شێخ رەزا ، شیعرەکانی زیاتر لەگەڵ ژیان و ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی تێکەڵە ( هەرچەندە ئەویش هەجوی بەسەردا زاڵە ) بەلام ئەومان بەباشتر و لەبارتر زانی بۆ ئەم جەردە.

| | غ | ف | ق | ك | ل | م | ن | و | ی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| گلەیی | | | | | | | | | |
| مەدح | | ١ | | | | | ٢ | | |
| غەزەل | | | | | | | | | |
| هەجوو | ١ | | ٢ | | | ٢ | ٢ | ٤ | ٢ |
| شین و خەم | | | | | | | | | |
| وەسف | | | | | ١ | | | | ١ |
| شانازی و ستایش | | | ١ | ١ | | ١ | | | ١ |
| پارانەوە | | | | | | | | | |
| حیکمەت | | | | | | | | | |

پەیوەندی بابەت و رەوی لە هۆنراوەکانی شێخ رەزا دا

لەم خشتەیەدا ئەم خاڵانە دەخوێنینەوە :

١- وەك دیاردەیەکی ئاسایی بۆ شێخ ، هەجوو زۆربەی هۆنراوەکانی داگرتوە ، لەسەرجەمی (٦٢) هۆنراوەدا ، هۆنراوەی هەجوو(٣٦) و مەدح (٧) و شانازی و ستایش (٦) و وەسف (٥) و غەزەل (٤) و گلەیی و شین و پارانەوە و حیکمەت یەکەو (١) هۆنراوەن.

٢- زۆرترین رەوی رێیە (١٢) هۆنراوەی پێ نووسراوە ، لەمانە (٩) هەجوە ، یەکی وەسفە ، یەك شانازییە و یەك حیکمەت.

٣- کەمترین رەوی لامە (١) بۆ وەسف بەکارهاتوە .

٤- لەناو رەوییەکان هەجوو ، زۆرترینیان رێیە (٩) و کەمترین تێ و دال و زێ و سین و غەینە کە (١) هۆنراوەن .

٥- بەدوای یەکدا هاتنی رەوی لەهەجوەکانی شێخ رەزا ، لە زۆرەوە بۆ کەم بەم جۆرەیە : (ر) ، (ا، ش) ، (و) ، (ق ، م ، ن ، ی) ، (ت ، د ، ز، س ، غ) .

٦- واتە لای شێخ رەزا (ر) زیاتر لەگەڵ هەجوو دەگونجێ .

### ٦- سەرواو هەندێ دیاردەی دووبارە بوونەوەی دەنگ:

جگە لە سەروا کە بەیاسایەکی تایبەتی کار دەکات لە هۆنراوەدا ، دووبارەکردنەوەی دەنگ یا دەستە دەنگ لە شوێنی تری دێرە شیعردا یارمەتی پتەو کردنی ئیقاعی شیعرەکە دەدەن و لەگەڵ سەروادا ، کە شوێنی دیاری خۆی هەیە ،لەنگەر بۆ یەکتر ڕادەگرن .

شۆسری لابری لای وایە (هەندێ هۆنراوە مۆسیقا و ئیقاعیان لە سیستەمی پەنامەکی ناوەوەی ئاشکرا نەکراوی دووبارەبوونەوەی دەنگو دەلالەت وەردەگرن کە تەواو جیایە لە ڕەوتی پێکهاتنی ڕستە سازیبان و ئەم سیستەمی دووبارەبوونەوەیە دەچێتەوە سەر سیستەمی سەروای دەرەوەی توند و ڕێك و پێك ) [٢٧٦ : ٩٠].

زۆر جار دووبارەبوونەوەی دەنگ لە وشەکانی ناوەوەی دێرە شیعر ، بە ڕێکی یان بە ناڕێکی لەگەڵ ڕەویدا یەك دەگرنەوە. ئەمە دروست کردنی پەیوەندیەکی ترە بۆ سەروا و بلاوکردنەوەی کاریگەر و سێبەرە بەسەر دێرەکەدا ، چۆن ئەم دووبارەبوونەوەیەی دەنگی ناوەوە، مۆسیقای شیعر قووڵ دەکاتەوە ئاوهاش دەلالەت و ئاراستەی دەلالی تایبەتی بەمانای گشتی دێر و هۆنراوە دەبەخشێ : ( دووبارە کردنەوەی تیپێکی تایبەتی لای شاعیر ڕەنگە دەلالەتێکی دەروونی هەبێ ، ئەمە بۆی هەیە بۆوێنە یان دەنگو ئیحای دەنگی تیپەکە بگەڕێنەوە لە دەروونی شاعیرەکەدا ، هۆکەیشی ڕەنگە پەیوەندی بە باری فزیۆلۆجییەوە هەبێ کە گۆکردنی دەنگەکەیە .. ) [٢١٧ : ٢٤٠] . لەبەر ئەوەی چوونە پاڵ یەکتری دەنگەکانی زمان بۆ دروست کردنی وشە دەکەوێتە خانەی فۆنۆلۆجییەوە ، سەروایش چوونە پاڵ یەکتری دەنگی تێدایە، دەنگەکانی تر کە لە وشەی تر دووبارە دەبنەوە و لەگەڵ سەروادا یەك دەگرنەوە بەپێی یاسای فۆنۆلۆجی کار دەکەن چ لەیەك وشەدا بێ و چ (وشەی لەتەك یەك) ، بۆیە لانزولیچ و یاکوبسن هەوڵیان داوە لە ڕوانگەی فۆنۆلوجییەوە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم دیاردەیە بچن و بە دەستوور لێکی بدەنەوە . هەندێ جار نووسەر یا شاعیر زێدەڕەوی دەکا لە دووبارە کردنەوەی دەنگێکی تایبەتی . بۆ نموونە حەریری دوو نامەی هەیە سینی و شینی لە یەکەمیان هەموو وشەکان سینیان تێدایە و لە دوەمیان هەموو شینیان تێدایە ، جاری وا هەیە نەك یەك دەنگ دوو دەنگ لە وشەکان دووبارە دەبنەوە [٢٥٠ : ٦٠٤-٦١١] . لەسریانیدا عەبدیەشوعی سوباوی لەم سێیینەیەدا ، تیپی ( ق )ی لەسەرەتا یان ناوەڕاستی هەموو دێرەکان بەکار هێناوە :

قاڵ دقطا قاىٹ لقرا لقبلانا
دنقل بوقرا دقطيرالا مقروانا
اڤ و قرى وبقى قارويا شبقبابانا [٣٦٨ : ٢٠]. (٧)

---

(٧) مانای ئەم سێینەیە بە کوردی بەم جۆرەیە :

ئەم دووبارەکردنەوەی نەبزوێنە زۆر جار لە زماندا ( هەموو زمانێکدا ) بۆ ڕاهاتنی گۆکردنی دەنگەکان و هەوڵی زمان ڕەلاندنی منداڵ بەکارهاتووە بە تایبەتی کە دوو دەنگی نەبزوێنی وایێ گواستنەوەی گۆکردن لە دەنگێکیانەوە بۆ ئەوەی تر نەختێ قورس بێ ، لە کوردیدا وەکو :

- قوڕێ کۆڕێ کەرتێ قڕ بوو
- کەنداڵە قەڵ قەت قەلی لێ کەوی نابێ.

لەم دوو نموونەیەدا هاتنی ک/ق لە وشەکاندا قورسایەکی دروست کردوە. خێرا گوتنی ڕستەکە زمان دەزەلێنێ و جێگای ک/ق بەیەک دەگۆڕێتەوە . ئەمە پێچەوانەی زمانڕەوا نییە.

هەندێ دیاردەی دووبارە بوونەوەی دەنگیان کۆمەڵە دەنگەهەر لەکۆنەوە ، لە زمانی جیا جیا بۆ مەبەستی دەلالی و مۆسیقی لە دێرە شیعر بەکارهاتوون کە سەروا خەست بوونەوە و جێگیربوونی ئەو دیاردەیە و زاڵبوونیەتی بەسەر ئەوانی تر ، ئەوە ڕەنگە لەبەر شوێنەکەی ئەو دەورەی دی بێ. ئەمەش هەندێ لەو دیاردانە :

أ- <u>هاوبزوێنی (assonance)</u> :

ئەوەیە کە دوو وشە بزوێنی سەرەکییان ( ئەوەی هێزی سەرەکی لەسەرە ) یەک بێ وەکو ( هاتەوە - دەباتەوە ) . جگە لە پێکچوونی بزوێنەکانی تر ، بزوێنی بڕگەی هێزداری وشەکان ( ها/با ) کە (١) یە یەک شتە . لە هەندێ زمانی ئەورووپیدا بە تایبەتی فەڕەنسی بەپلە یەک و ئینجا ئینگلیزی بەپلە دوو ، ئەم هاوبزوێنییە ، سەرەتا لە جیاتی سەروا بەکار هاتوە . کە دەکەوێتە کۆتایی دێرەوە پێی دەگوترێ سەروای هاوبزوێنی ( ئەم زاراوەیە بە دوا بزوێنی هێزداری دێرە شیعر دەگوترێ ، بەڵام دەبێ ئەو بزوێنە هەر دووبارە بێتەوە تا ئەدگارێکی مۆسیقی بە شیعرەکە بدات ) [٢٣٠ : ٦٩-٧٠]. لە فەڕەنسیدا ، هاوبزوێنی لە سەرەتادا پێش گەلاڵە بوونی سەروای کۆتایی دێر هەبووە : ( شاعیران لە بنچینەدا - ئەم دیاردە - یان بەکارهێناوە بۆ دەستەبەرکردنی کاریگەری زایەڵەی دەنگی بزوێن کە بریتی بوە لە دووبارە بوونەوەی هەمان بزوێن لە کۆتایی دێرە شیعردا ) [٤٨٥ : ١٤٥]. ئەم هاوبزوێنییە لەسەدەکانی ناوەڕاستیشدا هەر پەیڕەو دەکرا ( شاعیران زۆر سوور بوون لەسەر هێنانەوەی هاوبزوێنی و هەرگیز نەدەبوو شاعیر لە دوو دێری دوای یەک بڕگەیەکی کورت و یەکی درێژ بەکاربێنێ ، لەمە بترازێ هیچ بایەخیان بە دەنگی نەبزوێنی پاش و پێش بزوێنەکە نەدەدا ، دەشێ وشەی montagne لە شیعردا لەگەڵ rame و patte دابێ ) [٢٣٠ : ٧٠] . بە کورتی هاوبزوێنی بۆ زمانی فەڕەنسی لەباتی سەروا بەکار دەهات بە تایبەتی ( ئەو کاتەی لە کۆتایی

---

دەنگی نائومێدی ، بانگی هاتووەکەم پێ کرد ،
بۆ ئەوەی سەنگیی نائومێدی نزیك خۆی بگوازێتەوە
هەنسك بدە و بانگبکەو خوێنەری تاقی‌کراوە تاقی بکەوە.

دێرەکان پەیڕەو دەکرا پێی دەگوترا سەروا )[٤٧٤ : ٦٧] . هەمان دیاردەی دووبارە بوونەوەی بزوێن و ئەرکی لە چڕکردنەوەی مۆسیقیەتدا لە ئینگلیزی پەیڕەو کراوە ، جا هەرچی بزوێنێك بێ و لەهەر کوێی دێرە شیعر بێ ، گرنگئەوەیە دەنگە دووبارە بووەکان لەتەك یەك یان لە نزیك یەك بن (دووبارەبوونەوەی دەنگی بزوێن بەتایبەتی لە نزیك یەکتر بۆ دەستەبەرکردنی کاریگەرییەکی مۆسیقی و دەنگی تایبەتی )[٥٠٣ : ٦٠] . لە ئینگلیزیدا دەوری هاوبزوێنی ئەگەرچی دیارە بەڵام ناگاتە ڕادەی دووبارەبوونەوەی نەبزوێنەکان لین و لیزلی دەڵێن : ( شاعیر کە نەبزوێنەکانی پەراوێزی برگە دەگۆڕێ و بزوێنی چەق دووبارە دەکاتەوە ، ئەمە هاوبزوێنییە . ئەگەرچی هاوبزوێنی بەقەد هاونەبزوێنی بەکاردێ بەڵام کاریگەری لەو کەمترە )[٤٧٦ : ٣٤] . دەبێ ئەوەش لەبەر چاو بگیرێ، ئەگەر هاوبزوێنی ، لە دێرە شیعردا نەك هەر لە کۆتایی بەڵکو لە زۆر شوێنی تری دێرە شیعر بەکاربێ ، دەوری لە خێراکردن یان هێدی کردنەوەی ڕیتمی شیعرەکەدا هەیە چونکە (بزوێنەکان - مەبەست بزوێنی درێژە - ئەگەر زۆر دووبارە ببنەوە جۆرە هێدی بوونەوەیەکی مۆسیقی یان خاوبوونەوەیەك بە برگەکان دەدەن . هەروەکو نەبوونیان جۆرە مۆسیقایەکی مەیلەو خێرا دروست دەکا)[٢٤٠ : ٣٠٧] . وەکو ئەم دوو دێرە شیعرە:

- ڕابڵێ تا ڕووبودی کوڵۆی بەفرە ئابشار

با بای دەدات و ماسی پێدا دێ وەکو مەکووك[٢٠٨ : ٧٠].

- ئەتەوێ ئەگەر گوڵی سەرمەدی ، وەرەباخی نەعتی موحەممەدی

بە بولبولێکی موئەببەدی ، ئەمە شێوەیی ئوندبایە[٣٦ : ١٠٤].

لەم دوو دێرەدا ، بە خوێندنەوەی بەدەنگ، زۆر چاك دەردەکەوێ کە یەکەمیان هێمن و لەسەر خۆیە ، کەچی دوەمیان ئەوەندە خێرایە هەر دەڵێی ڕاوی دەنێن . یەکەمیان لەسەر کێشی موزاریعە، تەفعیلەکانی ئەمانەن (مفعول، فاعلات، مفاعیل، فاعلن)، هەرلەتە دێرێکی (١٤) برگەیە (٨)ی درێژو (٦)ی کورت. برگە درێژەکان یان کراوەن و بزوێنەکەیان درێژە یان داخراون جا بزوێنیان کورت بێ یا درێژ. لێرەدا بزوێنە درێژەکانی (ا ، وو ، ێ ، ی) زۆر دووبارە بوونەتەوە و ئیقاعەکەیان خاو کردۆتەوە چونکە بزوێنی درێژ کاتی زیاتر دەوێ لە بزوێنی کورت ، ئەم زیاتر کات خەرج کردنە خێرایی دوا دەخات.

کەچی دێری دوەمیان لەسەر کێشی کاملە (متفاعلن / متفاعلن / متفاعلن / متفاعلن) کە هەرلەتی (٢٠) برگەیە (١٢) برگەی کورت و (٨) برگەی درێژ ، بزوێنەکانیش بە زۆری (ە ، ی) کورتن دووبارە بوونەتەوە و ئیقاعەکەیان توند کردوە ، چونکە گۆکردنیان کەم دەخایەنێ و هەر زوو دەگوازرێتەوە بۆ برگەی داهاتوو.

بێجگە لە دەوری بزوێن (کورت یا درێژ) لە جۆری ئیقاعەکە، دەوریان لە دروست کردنی وشەی هاو ئاواز و ئیقاعی هاو شوێن - تاظری - نێوان دوو لەتە دێر یان دوو دێری دوای یەك هەیە ، وەکو

ئەم دێرەی ئەحمەدی خانی :

هەریەك ب کەمال بەدری ماهەك

هەریەك ب جەمال سەدری شاهەك [٢ : ٤١].

لەم دوو لەتەدا ، وەك دیارە (هەریەك ب) لەسەرەتای هەردووکیان دووبارە بۆتەوە کە خۆی لە خۆیەوە ئیقاعێکی دووبارە بوونەوەی هاوشوێنی بە دوو لەتەکە داوە ، جگە لەمیش وشەکانی تر بە پێی شوێن دوو دوو بەرامبەر یەك وەستاون لە ڕووی ئاوازەوە کە جۆری بزوێنەکەیان دروستی کردوە (کەمال - جەمال) یەکەو (بزوێنی کورت + بزوێنی درێژ) یان تێدایە جگە لە دوو نەبزوێنی (م-ل) ، (بەدری - سەدری) ، بزوێنەکەیان وەکو یەکە (ە-ی) و دوو نەبزوێنی (در)یشیان وەکو یەك هاتوە ، (شاهەك ، ماهەك) بزوێنەکانیان (ا - ە) وەکو یەك وایە ، لێرەش دوو نەبزوێنی (هـ - ك) وەکو یەکن . هەڵبەت ئەوەی ئیقاعی هاو شوێنی لە وشەکان و لە شوێنی وشەکان لە دێڕدا دروست کردوە بزوێنەکانە.

هەندێ لە شاعیر و نووسەر هەر لە سەدەی ڕابردووەوە بیریان لەوە کردۆتەوە بەهای دەلالی بۆ بزوێنەکان دیار بکەن . ڕامبۆی فەرەنسی لە هۆنراوەی (voyelle-بزوێن)دا هەوڵی داوە هەر بزوێنێك بە ڕەنگێك ببەستێتەوە و لێکدانەوەی جیاجیایان بۆ بکات :

A Noir , E blanc , I rouge Uvert , D bleu , voyelles .

Je dirai quelque jour vos niassances latentes :(8) [٦٩ : ٤٨١]

شاعیر لە پێداچوونی ئەم هۆنراوەیەدا کە سێ چوارینە و دوو سێینەیە پەیوەندییەك دروست دەکات لە نێوان ڕەنگەکان و دەنگە بزوێنەکان یەك بەیەك. جگە لە ڕەنگ ئەم بزوێنانە دەلالەتی تریشیان لێ دەکەوێتەوە (تاقی کردنەوەی بیستن دەشێ ئەوە بسەلمێنێ کە پەیوەندییەکی بنەڕەتی لە نێوان بزوێنەکانی پێشەوە - I , e - و بابەتی نەرم و خێرا و گەش و ئاشکرا هەبێ ، هەروەها لە نێوان بزوێنەکانی دواوە u ، o - و بابەتی قورس و هێدی و تاریك و بێزەوەر هەبێ کە بە تاقی کردنەوەی بیستن دەردەکەوێ) [٤٧٨ : ١٦٢] . جگە لە دەلالەت لە ڕووی مۆسیقیشەوە ، بزوێن ڕەگەزی سەرەکیی دروست بوونی ئاوازی مۆسیقییە لەم ڕووەوە هەندێ تۆژەرەوە هەوڵیان داوە جۆری بزوێن و جۆری دەنگیی مۆسیقی بەیەکەوە ببەستنەوە (بزوێن بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ

(8) ئەم دێرە بە کوردی وای لێ دێ :

بزوێنی A ڕەش ، E سپی ، I سوور ، U سەوز ، O شین

ڕۆژێ باس لە دایکبوونی شاراوەتان دەکەم.

لایەنی مۆسیقی شیعر گرنگە ، ڕەنگە بتوانین بەم جۆرە پۆلینیان بکەین : دەنگی تیژ : I , e / دەنگی گەش : eu, e, e ی داخراوو in ی لووتی / دەنگی گڕ : eu ی کراوە و دەنگە لووتییەکانی , an , on و un , a , o ی کراوە یان داخراوو ou ) [٤٨٥ : ١٤٦] . بەم جۆرە بزوێن کە چەقی بڕگەیە و دیاردەی هاو بزوێنی لە دێرە شیعردا دروست دەکا چ لە سەرواوە چ لە شوێنەکانی تر ، دووبارەبوونەوەکەی ئەرکی مۆسیقی و دەلالی دەگێڕێ و خزمەتی تەعبیری شیعرەکە دەکا.

ب- هاونەبزوێنی Alliteration :

لە عەرەبیدا (الجناس الاستهلالی) و لە فارسیدا (همحرفی) بۆ دانراوە . بریتییە لە دووبارەبوونەوەی دەنگی نەبزوێن لە وشە لەیەک نزیکەکانی دێرە شیعر. لە ئینگلیزی کۆن و ناوەڕاست زۆر جەخت لەسەر ئەوە کراوە دەنگە نەبزوێنە دووبارەبووەکە لەسەرەتای وشەکان بێت (نەبزوێن دووبارە دەبێتەوە بەتایبەتی لەسەرەتای وشە یان بڕگەی بەهێزدا ، ئەمە هونەرێکی زۆر کۆنە لە شیعری ئینگلیزیدا ) [٥٠٢ : ٢٧]. لە ئینگلیزی کۆندا ئەم دیاردەیە بەشێکی سەرەکی و بەردەوامی کێش و ئیقاعی شیعر بوە تا بەرەبەری کۆتایی چاخەکانی ناوەڕاستیش باوی هەبوە بەلام (پاش کۆتایی سەدەی پازدەهەم کەم بوەوە ) [٥٠٢ : ٢٧] . ئەم هاو نەبزوێنییە بۆ ئەوسا جێگای سەروای دێرە شیعری پڕ دەکردەوە (بینای شیعر لەسەر یەکەیەکی مۆسیقی دادەڕژا کە لەباتی سەروا بەهۆی هاو نەبزوێنییەوە دەستەبەر دەبوو) [٤٠١ : ١٠٢] . بۆ نموونە ( لانگلند ) ی شاعیری سەدەی چواردەمی ئینگلیزی ، بەرهەمی piers man - plow - پیری جوتیار -ی بەهاونەبزوێنی نووسیوە ئەگەرچی ئەو وەختە سەروایش کەوتبوە ناوەوە[٤٠١ : ١٠٢]. هەرچەندە لەسەرەتا هاونەبزوێنی بریتی بوو لە دووبارەبوونەوەی هەمان دەنگو لەسەرەتای وشە دەهات ، بۆیە پێی دەگوترا (سەروای سەرەتا) یان (سەروای سەرەوە) ، بەلام وردە وردە گۆڕانی بەسەردا هات و وای لێ هات دووبارە بوونەوەی دەنگی لەیەک نزیکیش وەکو س /ز ، ش /ژ بگرێتەوە و بشێ لەهەر شوێنێکی وشە بێت.

لەئینگلیزیدا باوترین نموونەی ئەم دیاردە مۆسیقییە ، ئەم شیعرەی ئەدگار ئەلان پۆیە :

The cry in the sea
The viol the violet and the vine. [٤٠١ : ١٠٢][9]

لە دێری دوەمدا دەنگی (v) لەسەرەتای سێ وشەدا دووبارە بۆتەوە :

لە کوردیدا نالی دەڵێ :

[9] مانای شیعرەکە بە کوردی : هاواری ناو دەریا
کەمان ، مۆر ، شەراب
هەڵبەت وشەکانی دواوە ڕەمزی شیعرین شاعیر بۆ دەلالەتی تایبەتی بەکاری بردوون.

خاووبیٚ خاوی دو زولفی خاوم ئەز
چاوە چاوی یەك غەزالە چاوم ئەز [٢٠٨ : ٦٣].

لەنیوەی یەکەمدا سیٚجار ( خ ) لەسەرەتای وشە دووبارەبۆتەوە ، دەنگەکە زۆرچاك لەگەل ئەو حالەتەدا دەگونجیٚ کە دەیەویٚ باسی بکا ، ئەویش بیٚ خەوی و خاو بوونەوەیە ، دەنگەکان پرخەی خەو بیر دەخەنەوە . لە نیوەی دوەمیشدا سیٚجار ( چ ) لەسەرەتای وشە دووبارەبۆتەوە . هەرچەندە لەوشەی چاودا هاتون بەلاّم چاوە و چاوەڕیٚی چاو دەکات ، چاوەڕیٚی نیگەرانی و پرس و دوودلی تێدایە ، ئەوەی نیگەران بیٚ زۆر پرسیار بەچی‌یەوچ بوو چۆن بوو دەکا، ( چ )ەکان ئەو پرسیارەله مێشکی خوێنەر دەروژێنن.

زۆر تـوژەرەوە هـەولیان داوە وەکـو بزوێـن نـەبزوێنیش بـەمانای تایبـەتی و دلالـەتی تایبـەتی بیەستنەوە (لە پەیوەندی تیپ و ڕەنگکارل ستەمپف ڤۆلفگانگکۆهلەر هەولێکی لەم بارەیەوە داوە و گەیشتۆتە ئەو قەناعەتە دەشیٚ تیپی نەبزوێن دابەش بکریٚ بۆتیپی تـاریك (لێوی و گەرووی)و تیپی ڕوناك (پدوویی و مەلاشوویی) ، ئەمەش نەك هەرتەنیا مەجاز نییە بەلّکو جۆرە پەیوەندییەکە گومـانی تێـدا نییـە لـەسـەر بەیەکچوونی دەنـگو ڕەنگـهـاتوە ) [٤٧٨ : ١٦٢] . لەفارسیدا سیروس شمیسا لـە لێکۆلّینەوەی (ایمان بیاوریم بە آغاز فصل سرد )ی ( فروغ )دا کـە( ٣٥٦ ) دێرە ، شوێن تیپی (س )ی هەلّگرتوە و هەولّی داوە لـەهەر وشەو دێرێکدا دەلالـەتی ئەوتیپە ڕون بکاتەوە[٢٩٩ : ٢٤١].

وەکـو بـاس کـرا مـەرج نییـە هاونـەبزوێنی هـەر لـەسـەرەتای وشـە بێـت ، وا دەبـیٚ دەکەوێتە ناوەڕاست یان کۆتایی وشەکانەوە . ئەمە لەم شیعرەی ئەحمەدی خانی‌دا ڕون دەبێتەوە :

مولك و مەلەك و فەلەك بجارەك
بیلجوملە تەچیٚ کرن ، تەبارەك [٣ : ٦].

لـە نیوەی یەکەمدا دەنگی (ل) سیٚجارلـە ناوەڕاسـتی سیٚ وشـەی تـەك یـەك دووبارەبۆتەوە. دەنـگی (ك) لـە لـەتی یەکـەم (٤) جـار ، لـە کۆتـایی هـەر چـوار وشـەو لـە لـەتی دوەم دوو جـار دووبارەبۆتـەوە . (ك) کـە ئـەوەندە جـارە دووبارەبۆتـەوە دوو جاریـان وەك (ڕەوی) هـاتوە . لێرەدا سـەروا (ڕەوی) لەگـەلّ هاونـەبزوێنی نـاوەوە یـەکیان گرتـوە و مۆسـیقیەتی دێرەکـەیان قوولّتر کردۆتەوە.

ج- <u>کۆنسۆنانس Consonance</u> :

لـە نێوان دوو دیاردەکەی پێشوو هـاوبزوێن و هـاونـەبزوێن جـۆرە دیاردەیـەکی تـر سـەر هـەلّدەدا کە بریتییە لە ( دووبارەبوونەوەی لەیەك نزیکی دەنگی نەبزوێنی پێش یان پاش بزوێنی جیاواز)[٥٠٢ : ل١٥٢] . نموونەی لەئینگلیزی وەکو slip - slop یان fill - feel ، لەفەڕەنسیدا وەکو par - pour

یان longue - langue ، لەفارسیدا وەکو (ساخت - سوخت) یان (داد - دود) لە کوردیشدا وەکو (داو - دێو) یان (باك - بووك) ئەگەرچی (هەندێ ڕەخنەگر پێلەکە لەسەر ئەوە دەکەن کە بەکارهێنانی زاراوەی کۆنسونانس تەنیا ئەو کاتە بەکاردێ کە نەبزوێنی پێش و پاش بزوێنە گۆڕاوەکە یەك بێ) [٤٧٧ : ٨٥] ئەمە پێیشی دەگوترێ Pararhyme ، بەلام مەرج نییە لەم لاو ئەو لای بزوێنەکە هەردوو نەبزوێنی وەکو یەك بن ، یەکیان هاویەش بێ بەسە وەکو: (داك - پووك) (ناسك ، برووسك) .. نموونەیەکی باوی ئەم دیاردەیە لە شیعری فارسیدا ئەمەیە کە حافظ دەڵێ :

نقد صوفی نەهمە صافی بی غش باشد
ای بسا خرقە کە مستوجب آتش باشد [٤٠١ : ١٠٤][(١٠)].

کۆنسونانس لە نێوان (ص) یا (ف)ی (صوفی) و (صافی)دا هاتوە . لە کوردیدا ، نالی ئەم دیاردەیەی لە نێوان (مار - موور) کە هەم کۆنسانسە و هەم لەگەڵ سەروادا خۆی لێکداوە ، پیشان داوە :

ئەو غاری یارە ئێستە پڕ ئەغیارە یا نەخۆ
هەر غاری یارە یا بوەتە غاری مار و موور [٢٠٩ : ١٤٤].

لە نێوان (مار - موور) بزوێنەکان جیان (ا - وو) بەلام نەبزوێنەکانی پاش و پێش بزوێنەکان یەکە (م - ر) یان بە زاراوەی برگە بڵێین ئەم دوو برگەیە چەقیان جیاو هەردوو پەراوێزیان یەکە.

هەندێ شاعیری ئینگلیزی ئەم دیاردەیە بۆ کۆتایی وشە بەکار دێنن وەکو دەنگی (t) لە وشەکانی (east , west)دا . (ئیمیلی دکسنی شاعیری ئەمریکی لە باتی سەروای کۆتایی و ئاسایی، لەشیعرەکانیدا سوودی لە کۆنسونانسی کۆتایی وشە وەرگرتوە ، بۆ نموونە (came , home)ی کردووە بەسەروا ) [٤٠١ : ١٠٤].

د - <u>دەنگە لاسکە (onamatopoeia)</u> :

ئەم دیاردەیە (بریتییە لەو هونەرەی کە دەنگمانا بگەیەنێ) [٥٠٢ : ٤٦٦] ، یان (دەنگەکانی وشە لاساکردنەوەی دەنگە سروشتییەکان بن) [٤٧٦ : ٣٥] . وەکو گرمەو هاژەو گڤڤە و تەقەقە .. دەنگەلاسکە (پشت بەتوانای دەنگەکان دەبەستێ کە بتوانن ببن بەڕایەڵە و دەنگدانەوەی مانا) [٤٧٤ : ٦٦] . ئەم دیاردەیە لە شیعردا زۆرە بەلام لەپەخشانیشدا دێ ، لە هەموو سەردەمێك و لە هەموو ئەدەبێکدا خۆی دەنوێنێ . دەنگەلاسکە ئەو دەنگو وشانە دەگرێتەوە کە ماناکەیان لە دەنگیانەوە نزیکە یا لەدەنگەکەوە گوێگر ماناکەی وەردەگرێ چونکە دەنگی وشەکە وەك

---

(10) مانای شیعرەکە بە کوردی :
پارەی سوفی هەمووی ساف و بێ غەش نابێ
وای غەرگەی زۆر هەیە کە شایانی ئاگر بێ

لاساکردنەوەی دەنگی سروشتی وایە . (هەریەکە لە دەنگەکان ، بێ ڕەچاوکردنی لایەنی ئەتیقی کە لەگەڵ دەنگی تر یەك دەگرێ بۆ دروست کردنی وشە ، بەتەنیا حاڵەتێ یان مەبەستی دەخاتە مێشکەوە . یەکەم بنەمای ئەم کاریگەرە بەیەکچوونی دەنگە لەگەڵ دەنگی سروشتی)[٢٩٥ : ١٣٣]. ئیبن سینا ، هەوڵی داوە دەنگەکانی زمان لێك بداتەوە داخۆ لە دەرەوە (سروشت) لەچ جۆرە دەنگێ دەکەن ، یا بە چ جۆرێ دروست دەبن ، ئەمەش هەندێ نموونە لە هەوڵەکانی ئیبن سینا :

(هاء : لە تێپەڕاندنی هەوا دەکات بەهێز بەناو تەنێکدا کە نەبێتە بەربەستی . خاء : وەکو ئەوە وایە تەنێکی وشك بە تەنێکی ڕەقی باریك و درێژدا بخرێنی کە تفری سەری بدا بەڵام تیا ڕۆنەچێتە خوارەوە. وەکو ڕووشانی پێستە بە تەنێکی زبر. قاف : وەکو شەق بردنی تەن و لێك بوونەوەی بە تایبەتی کە شێدار بێ . فاء : وەکو دەنگی باڵەدا و درەختان و شتی وا . راء : وەکو شەکانەوەی توندی قوماشی بەربای توند وایە کە بە ڕستەیەکەوە کرابێ و لێی نەبێتەوە)[٢٩٥ : ١٣٣-١٣٤]. بەم جۆرە ئەگەر هەریەکێ لە دەنگە نەبزوێنەکان بە توندی بڵێی سەیر دەکەی بە جۆرە جوولەیەکی سروشتی یان حاڵەتێکی مرۆڤ دەچێ . وەکو بۆ نموونە گوتنەوەی دەنگی (خ) چەند جارێك ، دەنگی لوخە لوخی مردن یان سەربڕانی ئاژەڵمان بیر دەخاتەوە ، یان پرخە پرخی خەومان بیر دێنێتەوە کە ئەویش حاڵەتی وەستانی هۆشە . (خەو برای مردنە) . یان دووبارەکردنەوەی دەنگی (ن) / منگە منگی گریانی منداڵمان بیر دەخاتەوە ، کەبەدەم ئاوازەوە بۆ شتێ دەگری، دووبارەکردنەوەی (ق) دەنگی بڵقە بڵقی ئاولەشەربە یان لەهەر دەفرێکی گەروو تەنگکردن ، یان هەڵقوڕاندنی ئاوی بێ پشوودانمان بیر دەخاتەوە (١١).

ئەم دیاردەیە وەکو یەکێ لە تیۆرەکانی پەیدا بوونی زمان سەیری کراوە کە بە تیۆری (بۆویوو) ناسراوەو دەڵێ زمانی سەرەتایی بریتی بوە لە لاسایی کردنەوەی دەنگەکانی سروشت، پاشان وردە وردە گەشەی کردوە و کەوتۆتە ئەم سیستەمە وردەی ئێستا[٤٥٧ : ٣١-٣٢]. لەئەدەبدا بەتایبەتی لە شیعردا، ئەم دیاردەیە بۆ خوڵقاندنی کاریگەرییەکی درامی بەکاردێ ، یەکێ لە نموونە هەرە باوەکانی زمانی فەرەنسی بۆ ئەم دیاردەیە شیعرەکەی ڕاسینە لە (ئەندروماك) ، کاتێ کە ئۆرێست گوێی لە فیشکەی مار دەبێ لە هەواوە دێ ، تووشی جۆرە حەپەسان و شێتییەك دەبێ و هاوار دەکات :

---

(١١) لەبارەی کاریگەری عاتیفی دەنگەکانەوە هەندێ زانای زمانەوانی لێکۆڵینەوەی وردی زانستییان ئەنجام داوە ، مەبەست لەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە ئەوە بوە دەری بخەن گێڕانەوەی کاریگەر یا حاڵەتی تایبەتی بۆ دەنگەکان بنچینەیەکی سەرەکی و گشتی هەیە یان لەسەر خەیاڵ و سەلیقەی تاکە کەسییەوە هاتوە . بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە (٢٥) منداڵیان هەڵبژارد کە هێشتا فێری ڕێزمان نەکرابوون ، داوایان لێ کردن وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە کە پێشتر ئامادە کرابوون ، وەڵامەکان هەموو وەکو یەك یان لەیەك زۆر نزیك بوون.
هەموو گوتوویانە بزوێنی (I) لە بزوێنی (U) سووکتر و خێراتر و ناسکترە . تیپی (R) پیاوە و تیپی (L) ژنە . هەموو دەریانخستوە (A) لە (O) میهرەبانترە ، (K) و (R) لە (L) سەختترن ، (M) و (L) لە (T) و (K) نەرمترن-[٢٩٥ ، ل١٣٥].

Pour qui sont ces serpents qui sifflent sur vos tetes. [١٢]

دووبارەکردنەوەی دەنگی (s-س) لەسەرەتای پێنج وشەدا ، لاسای فیشکە کردنی ئەو مارەیە کە باسی دەکات . لە کوردیدا ، بۆ نموونە مەولەوی لە دێرە شیعرێکدا دەڵێ :

شاخەی شریخەی خشل نیمە ڕەنگ
فرەی فوتەی شۆڕ پازنۆی گوڵەنگچەنگ[١٨٦ : ٤١٤].

لە دێری یەکەمدا دووبارە بوونەوەی (ش ، خ) لە سێ وشەدا ، یەکسەر خشەخشی پلپلە و لەرزانە و گۆیەرۆك و خشڵەکانی ترمان بیر دەخاتەوە . یان پیرەمێرد دەڵێ :

گیانە لە پرخەی خەوی خاومدا
پێت بنێ وە بان هەردو چاومدا
مەڵێ برژانگت تیژە وەك چقل
ئەچەقێنە پای نازکتر لە گوڵ

لە لەتی یەکەمدا ، کە ئەوەندە (خ)ە بە دوای یەکدا دێن و باسی خەو دەکا هەر دەڵێی نووستوە و پرخەپرخی خەوی دێت ، لە دێری دوەمدا دووبارەبوونەوەی (چ ، ق) لە دوو وشەدا ، دەنگی چقەی دڕك لە لەش چەقاندنمان دەخاتە بەر گوێ کە باسیش باسی چقل چەقینە پێی نازکە.

دەنگەلاسکە لە بەجێ هێنانی ئەرکی خۆیدا سوود لە دوو دیاردەی پێشوو (هاوبزوێنی و هاونەبزوێنی) وەردەگرێ.

## ئەرکی ئەم دیاردە دەنگییانە :

ئەم دیاردە دەنگییانەی باس کران دەوریان لە قووڵ کردنەوەی ئاوازی دێرە شیعردا هەیە ، هەروەکو وشەکانی دێرە شیعر بەیەکەوە دەبەستنەوە و سەرەتاو کۆتایی دەخەنە ناو پەیوەندییەکی دەنگیی ترەوە کە زیاتر پێوەندی سەروا بە دا ڕشتنی دێرە شیعرەوە دەبەستێنەوە : (شاعیر پەنا دەباتە بەر دروست کردنی هەندێ کۆمەڵەی دەنگیی هاوجۆر و هاو ڕەگەز ، کە بریتین لە بڵاوبوونەوەی هەندێ دەنگبەناو وشەکانی دێرە شیعر) [٢٤٠ : ٢٤٢] و زۆر جار ئەو دووبارەبوونەوەی دەنگە جۆرە مۆسیقایەکی ناوەوە دروست دەکا (ڕێك بێ یان نارێك) کە کەشێکی مۆسیقی تایبەتی بە شیعرەکە دەبەخشێ و بەزۆری کەشێکی هێمن و لەسەرخۆ و ڕەوانە ، وەکو سەروای تەقلیدی کۆتایی زەق و ئاشکرا نییە . خۆشیی و جوانییەکەیشی لەو سیحرە نهێنی و کاریگەرە هێمنەیدایە . دەشێ بەکورتی ئەرکی دیاردە دەنگییەکان لەم خاڵانە چڕ بکرێنەوە :

---

[١٢] شیعرەکە بە کوردی :
بۆ کێن ئەو مارانەی بەسەر سەرتانەوە دەفیشکێنن.

- لێك نزیك كردنەوەی وشەكان و تێك هەڵكێشانیان لە ڕێی دەنگە هاوبەشەكانەوە ، كە دەبێ بە مایەی پتەو كردنی پەیوەندی نێوانیان ، چ بۆ جەخت بێ و چ بۆ دەرخستنی جیاوازی بێ لە حاڵەتی دژیەك و بەرامبەریدا.

- ئەم دیاردە دەنگییانە وەكو سەروا پشت بەهاودەنگی وشە دەبەستن بەڵام لە چۆنیەتی دروست بوون و شوێنی دووبارەبوونەوەیان لەسەروا جیا دەبنەوە ، چونكە سەربەستن لە شوێن و كاتی دووبارەبوونەوەدا بەڵام سەروا وا نییە . لایەنێكی ئەركی سەروا بەجێ دێنن كە لایەنی مۆسیقی و دەلالی و دەروونی تێدایە.

- دەستەبەركردنی لاسایی كردنەوە و كارلێكی چڕی نێوان دەنگو مانا ، بەهۆی پەنا بردنە بەر دەنگەلاسكە و بڵاوكردنەوەی نەبزوێنی تایبەتی لەبابەت و باسی تایبەتی بەخۆیدا .

- قووڵ كردنەوەی مۆسیقا و ئاوازی گشتی دێرە شیعر كە ئەمەیش خۆش كردنی كەشە بۆ پیشاندانی وێنەی شیعری و بۆ گەیاندنی مانا و خەست كردنەوەی سێبەر و ئیحای وشەكان.

## باسی دوەم – بنەمای سەروای شیعری جیهانی :

سەروا وەکو دیاردەی دووبارەبوونەوەی دەنگلە هەموو زمانەکانی دونیا هەبوە و هەیە بەلام ئەوەندە هەیە لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی ترو لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕێ .

ساپیر ، دوای ئەوەی لەسەر بنچینەی دەنگسازی لە ئەدەبی زمانەکانی جیهان دەکۆڵێتەوە ، بوون و نەبوونی سەروا بۆ جۆری کێش دەباتەوە . کێش هەیە بەتەنیا لەنگەری شیعر ڕادەگرێ و پێویستی بەسەروا نییە . ئەگەر سەروا بێ بۆ بەهێزکردنی ئەرکی کێشەکەیە . کێشیش هەیە ناتوانێ بەتەنیا لەنگەری شیعر ڕابگرێ و هەردەبێ سەروا سەنگی بۆ ڕابگرێ . ئینجا جۆری کێشیش بۆ خەسیەتی فۆنۆلۆجی زمان دەباتەوە . واتە سەروا بەبنەمای فۆنۆ .جی زمانەوە گرێ دەدا ، جا لەبەر ئەوەی بنەمای فۆنۆلۆجی زمانەکانی جیهان یەك شت نییە و جیایە ، ئەم جیاییە جیاوازی دەخاتە نێوان ڕادەی پێویستی و ناپێویستی سەروا لە شیعردا . ساپیر لەم بارەیەوە هەموو زمانانی جیهان دابەشی سێ کۆمەڵە دەکات:

١- ئەو زمانانەی چەندی و چۆنین ، واتە (کورتی و درێژی) برگە و (بەهێزی و بێهێزی) برگەیان تێدا زاڵە . وەکو زمانی سەنسکریتی و گریکی و لاتینی (چەندین) ، ئینگلیزی و ئەڵمانی (چۆنێتین) . ڕەچاوکردنی ئەم چەندی و چۆنێتییە و چۆنیەتی بەدوای یەکدا هاتنی جۆری جیاوازی برگەکان لە دروست کردنی یەکەی ڕیتمی کە پێیە، بەسە بۆ دەستەبەر کردنی خەسیەتی شیعری . تەنیا کێش ڕەگەزی بنیاتیی شیعرە ، بۆیە ئەمانە پێویستیان بەسەروا نییە وەکو ڕەگەزێکی بنجی و بنیاتی. ئەگەر سەروا هەشبێ بۆ ڕاگرتنی لەنگەری کێش و زیادکردنی مۆسیقییەتی شیعرە نەك وەك پێویستیەکی شیعری .

٢- ئەو زمانانەی کێشی شیعریان پشت بە ژمارەی برگە و لەنگەری وەستانی پێیەکان دەبەستێ نەك جۆری برگە و تەسەلسولیان ، وەکو زمانی فەڕەنسی و ئەسپانی و پورتوگالی . یەکسانیی ژمارەی برگە و زایەلەی سەروا شان بەشانی یەکتر دەڕۆن ، وەکو دوو ڕەگەزی بنجی ئەرکی بنیاتی هۆنراوە دەبینن.

٣- ئەو زمانانەی ژمارەی برگە و تەبەقەی دەنگ(pitch) دەور لە کێشی شیعردا دەبینن وەکو زمانی چینی . ئەمانە پێویستیان بە ڕەگەزێکی تریش هەیە کە زایەلە (سەروا )یە بۆ تەواو بوونی شیعرییەت . واتە لەو زمانانە سێ ڕەگەز دەوری بنیاتی لە شیعردا دەبینن : ژمارەی برگە و تەبەقەی دەنگو سەروا .

پاش ئەم دابەش کردنە ساپیر دەڵێ : (هەریەکە لەم سیستەمی ئیقاعانە ، لە ڕەفتاری دینامیکی نائاگایی (لاشعوری) زمانی ئەو خەڵکەوە پەیدا دەبێ کە قسەی پێ دەکەن ) [٤٦١ : ١٦٤].

بۆ پشتگیری ئەم بۆچوونەی سابیر ، ڕای دوو تۆژەرەوەی تر وەردەگرین کە تا ڕادەیەك لەگەڵ ئەمەدا یەك دەگرنەوە :

- ڤانسانی فەرەنسی لەبارەی سەروا لە شیعری فەرەنسیدا دەڵێ (سەروا پێویستە بۆ هۆنینەوەی شیعری فەرەنسی چونکە ڕەگەزێکی بنجی خولقانی شیعرە. ئەگەر سەروا نەبێ هێزی پێوەرەکانی شیعر خاو دەبێتەوە و وەکو پێوەرەکانی پەخشانی لێ دێ لای ڕوسۆو شاتۆبریان و میشولێ. دەبێ دان پێدا بنێین شاعیرە ئینگلیز و ئەڵمان و ئیتالییەکان زۆر سەرکەوتوون لە بەکارهێنانی (شیعری سپی - الشعر المرسل)، چونکە برگەکان کێش دەکەن و هیچ پێویست بەسەروا ناکا کەچی لەفەرەنسیدا هەوڵەکانی ڤۆڤنارگ و مارمۆنتێل لەم بارەیەوە فەشەلی هێنا، جا ئەمە بەهۆی ڕاهاتنی گوێچکەی فەرەنسی بێ یان لە بلیمەتی زمانەکە خۆی دابێ کە هێز (نبرە)ی بەهێزی تێدا هێندەی زمانەکانی تر تیژ نییە) [٢٣٠ : ٨٧]. ئەوەی جێی سەرنجە ڤانسان حیسابی زمانی ئیتالی وەکو ئینگلیزی و ئەڵمانی کردوە . بەپێی بۆچوونەکەی سابیر تەنیا ئینگلیزی و ئەڵمانی بەهۆی جۆری کێشەوە پێویستیان بەسەروا نییە . ڕاستە ئیتالیش بەبێ سەروا دێ بەڵام ئەم هۆیەکی تری هەیە ئەویش زۆری برگەی کراوەیە لەو زمانەدا کە دەبێ بەهۆی زۆری سەروا و زۆری سەرواش سواوی دەکات و بەهای ئیستاتیکی و مۆسیقی و تەنانەت دەلالی کەم دەکاتەوە و پێویستی دادەبەزێنێ .

- قێلی ئەڵمانی لەبارەی پێویستی سەروای شیعری عەرەبی دەڵێ : (لەعەرەبیدا ، سەروا نابێتە هۆی دەست نیشان کردنی بنیات و ڕاستەقینەی شیعر ، هەر هێندە زیادەیەکە بۆ پاڵپشتی کێشەکە) [٢٧٣ : ٢٠] ، هەرچەندە شیعری عەرەبی هەر لەسەرەتاوە زۆر توند بەسەروا بەسراوەتەوە لەگەڵ ئەوەشدا چونکە بنیاتی کێشەکەی چەندییە ، سەروا نابێ بە ڕەگەزێکی بونیادی شیعر.

سیستەمی سەروا لای هەموو نەتەوەیەك یەك نییە . ئەو سیستەمەی لە عەرەبیدا پەیڕەو دەکرێ (یەکێتی سەروا) کاریگەری بۆ زۆر نەتەوەی دەوروبەر و تەنانەت دووریش ڕۆیشتوە . ئەمە وای لە هەندێ تۆژەرەوە کردوە هەر تەنیا لە ڕوانگەی سەروای کۆتایی و یەکێتی سەرواوە بڕواننە دیاردەکە و عەرەب بەداهێنەری سەروا بزانن و وادابنێین نەتەوەکانی تر پێش وەرگرتنی سەروای عەرەبی سەروایان بەکار نەهێناوە ، وەکو فارابی [٣٦٣ : ٧] و محەمەد غونەیمی هیلال [٣٥١ : ٤٧٥] و سلیمان بوستانی [٣٦٢ : ٤٦] و نەسیرەدین تووسی [٣٩٠ : ١٨] و ئەلفرێد ژانروا [٣٨٣ : ٨٣]. لە ڕاستیدا ئەو نەتەوانە و هی تریش هەریەکە دیاردەی دەنگو دووبارە بوونەوەی وەك ڕەگەزێکی شیعری بەکارهێناوە ، بەڵام هەریەکە بە پێی زمانی خۆی و بە گوێرەی زەوقی خەڵکەکە گەشەی پێ داوە :

١- <u>گریکی و لاتینی</u> : ئەگەرچی سروشتی ئەم دوو زمانە و بنەمای کێشیان وای کردوە

سروشتیی شیعر یان پێویستی سەرەکی بەسەروا نەبێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرچەندە هۆمیرۆس داستانەکانی بە شیعری ڕەها نووسیوە [٣٦٣ : ٧] و شانۆگەرییە ناودارەکانی ئەسخیلوس و ئەرستۆفان و یوریبیدیس سەروایان تێدا پەیڕەو نەکراوە . لە ئینسکلوپیدیای بەریتانیدا هاتووە لەم بارەیەوە دەڵێ : (سەروا تەنانەت جاروبار لە شیعری کلاسیکی گریکی و لاتینیدا بەرچاو دەکەوێ) [٥٠٦ : ٥٥٨]. ئەرەستۆ لە (ڕیتۆریکا)دا ، لەباسی شێوازدا لەسەجع دەدوێ کە سەروای فاسیلەی پەخشانەو دەڵێ : (بەیەکچوونی بڕگەکانی کۆتایی لەهەر بەشێکدا پێی دەگوترێ سەجع و دەبێ ئەمە بکەوێتە سەرەتا یان کۆتایی بەشەکان . لەسەرەتا ، لێکچوونەکە هەمیشە لە وشەی تەواودا ئاشکرایە ، لە کۆتاییشدا لێکچوونەکە لە بڕگەکانی کۆتایی . یان گەڕیان کردنی هەمان وشە یان دووپات کردنەوەی هەمان وشەدایە) [٢٦٢ : ٢١٧] ئینجا نموونەی بۆ هەموو جۆرەکان داوە .

لە شیعری لاتینیشدا ، هەر لەسەردەمی گەشە سەندنی ئەدەبییەوە لە ڕۆما ، شاعیرەکان سەروایان بەکارهێناوە . هۆراس لە هونەری شیعر (Ars poetica)دا لانی کەم لەشوێنێکدا سەروای هێناوە (دێری ٩٩-١٠٠) کە دەڵێ :

non statis est , pulchra esse peomata , dulcia sunto
et quocumque volent animum auditoris agunto . [١١٧ : ٣٧٠](١٣)

ئەوەی جێی سەرنجە شاعیر لەم دوو دێرەدا سەروای بەکارهێناوە ، کە داوا دەکا هۆنراوە کاریگەر بێ . داوای کاریگەرێتی هۆنراوە و بەکارهێنانی سەروا نرخدانێکە بەدەوری کاریگەری سەروا دا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆیش بێ . (ئۆفید)یش لە (هونەری خۆشەویستی)دا ئەم جۆرە سەروایەی بەکارهێناوە و زۆرتریش [٢٧١ : ٩٣] جگە لەمانە (دەقی لاتینی وا هەیە جۆرە سەروایەکی ڕێکی تێدا ڕەچاو کراوە ، وەکو شیعرێکی تیودۆری ڕاهیبی کانتربری کە بۆ سەدەی حەفتەم دەگەڕێتەوە ، شیعرەکە سیستەمی سەروای بەم جۆرەیە - AAABB - ) [٢١٦ : ٢٧] . وەك دیارە لە گریکی و لاتینیدا ، سەروا بەکارهاتوە - با بەکەمیش بێ - بەڵام دیاردەکە ئەوەندە زەق نەبوە.

### هەندێ لە زمانە ئەوروپییەکان :

پاش گەڵاڵە بوون و دەرکەوتنی زمانە ئەوروپییەکان ، هەریەکە بە پێی تایبەتێتی خۆی گەشەی بەئەدەب و شیعری خۆیدا ، هەر بۆیە ئەگەرچی زۆربەیان سەرچاوەیان یەك بوو یان لەیەك نزیك بوو بەڵام پەیڕەوی سەروایان تا ڕادەیەك جیا بوو. بەگشتی لەبابەخدان بە هێنانی کۆمەڵەی دەنگی (التجمعات الصوتیە) و دووبارەکردنەوەیان پەرەیان بە سەروا داوە ، لە ئیسکلوپیدیای

(13) مانای شیعرەکە بەکوردی :
هەر ئەوەندە بەس نییە هۆنراوە جوان بێ
بەڵکو دەبێ کاریگەر بێ و هەستی گوێگر ڕابکێشی لە هەرکوێ بێ [٣٧٠ : ١١٧].

بەریتانیدا هاتوە (لەوانەیە لە شیعری ڕۆژاوادا ، سەروا لەیەکگرتنی تەکنیکە زۆرەکانی وەکو هاوبزوێنی و هاوبزوێنی و کۆنسوناس دروست بووبێ) [٥٠٦ : ٥٥٨].

٢- ئینگلیزی : لە کۆندا ، لەئینگلیزی سەروای کۆتایی نەبوە ، ئەوەی زۆر باو بوو هاونەبزوێنی سەرەتا (alliteration) بوە کە (هونەرێکی زۆر کۆنە و لە ئینگلیزیدا لەسەروا کۆنترە) [٥٠٢ : ٢٧]. ئەم هونەرە تا سەدەکانی ناوەڕاست زۆر بەکاردەهات ، بەلام لەوە بەدواوە وردە وردە لەکەمی دا . شیعری ئینگلیزی پێش غەزوی نۆرمەندی (١٠٦٦) دێری لە دوولەتی بێ سەروا پێك دەهات بەلام ئیقاعی هاونەبزوێنی تێدا بەکاردەهات کە لە سەرەتا و ناوەڕاستی وشە دەهات نەك کۆتایی [٢٨٢ : ٩٩]. کەچی شیعری ئینگلیزی نوێ کە لەسەدەی دوازدە و سێزدە گەلاڵە بوە ، لەسەرەتاوە کاریگەری شیعری پرۆڤنسی پێوە دیارە چ لەبارەی درێژیی لەتەکان بێ و چ لەبارەی بەکارهێنانی سەرواوە . شیعری ئینگلیزی بەسروشت کەم سەروا بەخۆیەوە دەگرێ بۆیە زیاتر بایەخ بە شیعری ڕەها (Blank verse) دراوە . (ئەم جۆرە شیعرە سەرەتا لە ئیتالیا باو بوە بەلام لەئەدەبی ئینگلیزیدا گەشەی پێ دراو گەیشتە پلەیەکی بەرز) [٢٤١ : ٦٦٠]. گوایە لەئینگلیزی یەکەم کەس بەکاری هێنابێ هینری هوارد بوە [٢٤١ : ٦٦١]. پاشان شەکسپیر لە شانۆگەرییەکانیدا، بەتایبەتی لە ڕۆمیۆ و جولیتدا گەیاندییە پۆپە. بەلام پاش شەکسپیر شیعری ڕەها لە پایەی بەرزی خۆی هاتە خوارەوە. لە ئینگلیزیدا ، سنوور و جۆری سەروا بە برگە دیارکراوە ، لە سنووری برگەدا زاراوەی تاك برگە و جووت برگە و سێ برگە (١٤) بەکاردێ : لەشیعری ئینگلیزیدا (سەروای سێ برگە و زیاتر بۆ شیعری گاڵتە و هەندێ جار هەر تەنیا بۆ مەبەستی مۆسیقا و هەندێ جاریش لە شیعری هاتەران و ماتەران بەکاردێ) [٤٦٣ : ٨٨].

بۆ جۆری سەروایش ، لیچ لە (ڕابەری زمانەوانیی بۆ شیعری ئینگلیزی)دا ، برگە و جۆرەکانی دەکا بە بنچینە و شەش جۆری لێ دیار دەکات :

(١- cvc - هاونەبزوێنی سەرەتا / ٢- cvc - هاوبزوێنی / ٣- cvc - کۆنسۆناس / ٤- cvc - سەروای ئاوەژوو / ٥- cvc - برگەی سەروایانە / ٦- cvc - سەروا) [٤٦٦ : ٨٩] . فرێزەر تەعلیقی سادەی ئەنگلۆسەکسونی بگرێتەوە ، سەروای ئالۆزی (ویلز)یش دەگرێتەوە کە هەندێ جار لە ئینگلیزیدا دەردەکەوێ . دووەم لە شیعری میللی زۆر و لەشیعری بەرز کەمە ، سێیەمیان سەروای ئاسانە و لە شیعری نوێدا زۆر بەکاردێ، بەلام شاعیرانی ئینگلیز زۆر بەکاری ناهێنن، پێنجەم کە لە شیعری ئایسلاندی سەدەکانی ناوەڕاست بەکارهاتوە ، لەگەڵ شیعری نەبر و برگە ناگونجێ و تا

(14) (لەهەندێ ڕەخنەی ئەدەبی تەقلیدیدا ، زاراوەی (سەروای نێرینە) بۆ سەروای یەك برگەیی و (سەروای مێینە) بۆ سەروای دوو برگەیی بەکاردێ) [٤٧٧ : ٨٦] . بەلام ئەم زاراوانە زیاتر لە ژێر کاریگەری لاتینی و فەرەنسیەوە هاتوون.

ئێستا بەسەرکەوتوویی بەکار نەهاتوە [٤٦٣ :٦٣-٦٦]. ئەگەر چی (شیعری ئینگلیزی لە رووی سەرواوە لە زۆر زمانان هەژارترە) [٤٦٣ : ٦١] بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لە دابەش کردنی سەروای چوارین و سۆنێت و سەروای شاهانەدا تایبەتێتی خۆی هەیە.

٣- فەرەنسی : لە فەرەنسیدا ، سەرەتا سەروانەبوە ، هاوبزوێنی assonance باو بوە (شیعری شاعیرە هەرە کۆنەکانمان سەروایان نەبوە ، تەنیا هاوبزوێنییان هەبوە) [٤٨٤ : ٣٣]. ئەم هاوبزوێنییە بەرێکی لە شیعری فەرەنسیدا بەکاردەهات (لە سەدەی دوازدەمەوە ، کێشناسی فەرەنسی زانستانەتری لێ هات ، وای لێ هات پێیان دادەگرت لەسەر هاودەنگی نەک تەنیا دوابزوێنی بەهێز ، بەڵکو لەهەمان کاتدا هەموو ئەو دەنگانەی بەدوای بزوێنەکەدا دەهاتن ، واتە سەروا) [٤٨٤ : ٣٤]. لەسەدەی سێزدەدا سەروا جێی هاوبزوێنی گرتوە ، بەلام لەتەکنیکی زمانە رۆمانسیەکان نرخی هەرما بوو) [٥٠٦ : ٥٥٨] لە رووی ئەرکەوە هاوبزوێنی لەفەرەنسیدا دەوری سەروای دەدی لە دیارکردنی جۆری شیعری (ئەگەر کۆمەڵە دێرێک هاوبزوێنی کۆتاییان یەک بێ ، بێ ئەوەی ماوەیان لە نێوان هەبێ ، یان لە کورتی و درێژیدا (کێش) جیابن ، پێی دەگوترا زنجیرە یان پەت - laisse -) [٣٢٠ : ٧٠]. لەسەدەی شازدەدا ، کە (لاپلیاد) سەری هەڵدا (دوبایێفی لاپلیاد و شاعیری تری وەکو پاسورا و رهیان شایەنی ئەوەن وەکو شاعیرانی بەرایی یادیان بکرێتەوە کە گومانیان لە شیعری برگەیی سرفی، فەرەنسی دەکرد و سەروایان وەکو شتێکی چەسپاو و نەگۆڕ بە شتێکی هەرە پیرۆز دانەدەنا) [٤٦٥ : xxvIII]. لەشیعری فەرەنسیدا ، بۆ دیارکردنی سنووری سەروا زاراوەی نێرینە (masculine) و مێیینە (feminine) بەکاردێ یەکەمیان بۆ ئەو سەروایەی کۆتایی بە برگەیەکی بەهێز دێ (کۆتایی نەبزوێنە) وتەنیا یەک برگە لەنێوان وشە هاوسەرواکان هاوبەش دەبێ ، دووەمیشیان بۆ ئەو سەروایەی کۆتایی بە (e) بێ کە دەنگی نیشانەی (مێ) یە ، وشە هاوسەرواکان دوو برگەیان یەک دەبێ ، برگەی بە هێزی پێش کۆتایی و برگەی بێ هێزی کۆتایی [٤٨٤ : ٣٤]. ئەمە جۆری برگەکانی کۆتایی ، ئینجا لەبارەی سنووری برگەکانی کۆتایی سێ زاراوەی تر هەن : سەروای (کافی - suffisante) ئەوەیە دوابزوێنی بەهێز و نەبزوێنەکانی دواوەی وەکو یەک بن وەک (desir - soupir)، سەروای (دەوڵەمەند - riche) ئەگەر دوو برگەی کۆتایی وەکو یەک بن (riviere - lumiere) سەروای عەیبدار (defectueuse) کە کۆتاییەکەیان وەکو یەک نەخوێندرێتەوە یا نووسینیشیان یەک بێ وەکو (mer - aimer) کە لەیەکەمدا ® دەخوێندرێتەوە و لەدووەمدا ناخوێندرێتەوە [٢٦١ : ٢٤٧-٢٤٩]. چۆنێتی دابەشبوونی سەروا ، ئەگەر چی بەگوێرەی شوێنی دووبارەبوونەوەی حسێبی بۆ کراوە بەلام پارچە شیعر (strophe) یش کە سیستەمی تایبەتی خۆی هەیە، لەفەرەنسیدا زۆر باوە و بەژمارەی دێرو سەروا دیار دەکرێ [٤٨٤ : ٧٩- ...] جگە لە هەندێ جۆری تایبەتی وەکو رۆندۆ و

تریۆلێ و .... (١٥).

٤- زمانە هیند و ئێرانییەکان : هیگل لە باسی سەرواى ڕۆمانسیدا کە بایەخ بە دەلالەتی ناوەوە دەدا نەك هەر دەنگەکە ، ئەمە بەجیاوازییەکی دادەنێ لەگەڵ (سەرواى هندوسی کە بۆ سەردەمی هەرە کۆن دەگەڕێتەوە) [٣٧١ : ٩٤]. واتە هیندی کۆن سەرواى هەبوە بەڵام مەرج نییە وەکو زمانەکانی تر بێ. لە سنسکریتی و ئەڤیستایی و پارسی کۆن سەروا بە پچڕپچڕی هەیە ، خانلەری دەڵێ: (لە دەقەکانی -تورفان- پەیڕەو کردنی سەروا هەمیشەیی نییە و لە -درخت اسوریك- زۆر دەگمەنە) [٢٩٠ : ٣٨]. لە زمانی پەهلەویدا کە تا ئێستا بە وردی هەمووی دیراسە نەکراوە ، سەروا بە مانای وردی نەهاتوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ توێژەرەوەیەك ناتوانێ نکوڵی لە بوونی بکا [٢٩٠ : ٥٢]. دەقەکانی -یادگار زریران- لە رووی دابەشبوونی سەرواوە زۆر لە شیعری پارچەداری هاوچەرخ دەکات و (تا رادەیەك سەرواى تێدا بەکار هاتوە) [٢٩٠ : ٣٨]. ڕای هەندێ توێژەرەوەی عەرەبیش هەروایە کە (سەروا لە شیعری فارسیدا هەبوە ، پاشان گەشەی کردوە و هەندێ لایەنی لە شیعری عەرەبی وەرگرتوە) [٣٧٤ : ١٣١]، کەچی لە فارسەکان هەیە بە پێچەوانەوە دەڕواننە ئەم مەسەلەیە. پرویز ادکائی دەڵێ : (من ڕام لەگەڵ ئەوانەیە کە دەڵێن شیعری عەرەبی تەواو کراوی شیعری هەشت برگەیی سەروادار ی ئاخر و ئۆخری سەردەمی ساسانییە) [٢٨٩ : ٢١٥] (١٦). ئەگەرچی فارس لەگەڵ بووژانەوەی شیعر و ئەدەبی فارسی پاش ئیسلام ، تا ڕادەیەکی زۆر کەوتنە ژێر کاریگەری شیعری عەرەبی و ئەم کاریگەرە لایەنی سەروایشی گرتەوە و (یەکێتی سەروا) و کێشەکان لە فارسی کەوتنە پەیڕەو کران بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فارس لە رووی سەرواوە تایبەتێتی خۆیان پاراست کە لە مەسنەوی و روباعیدا خۆی دەنوێنێ : (مەسنەوی و روباعی سەر بە سیستەمی سەروان و لە داهێنانی فارسەکانن [٣٧٤ : ١٣٠]، لەگەڵ هەندێ هونەری وەکو تەرجیع بەند و تەرکیب بەند.

٥- عەرەبی : سەرواى عەرەبی لەسەجعەوە پەرەی گرتوە بۆ ڕەجز و ئینجا بۆ قەسیدە. هەڵبەت پێش یەکێتی سەروا کە لای مهلهل یان ئیمرئولقەیس قالبی خۆی گرتوە شاعیران بە

---

(15) ئەمانە هەریەکە جۆرە شیعرێکی پارچەدارە کە پارچەکان بە ژمارەی دێر و چۆنیەتی دابەشبوونی سەروا (وهەندێ جار کێشیش) دەناسرێنەوە ، بۆ نموونە (le triolet) لەسەدەی سێزدەمەوە نموونەی هەبە ، تا سەدەی رابەرین زۆر بەکار دەهات ، پاشان بەرەو کزی چوو تا نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەم ، لەو سەدەیەدا دووبارە بایەخی هاتەوە و لەو ساوە هەر بەکاردێ. بەگشتی لە (٨) دێر پێك دێ. دێری یەکەم و چوارەم هاوسەروان ، دێری حەوتەم و هەشتەم لەگەڵ یەکەم و دووەم هاوسەروان. سەرواى سەرەکی لە دێری کۆتایی دووبارە نابێتەوە [٤٨٤ : ٩٤].

(16) مەبەست لەو کەسانەی ڕایان وایە ، ملك الشعراء بهارە لە بەرگی چوارەمی سبك شناسیدا. ئەم ڕایەی داوە (بهار ، سبك شناس ، دفتر چهارم ، بخش١ ، ١٣٤٥ ، ل٤٤-٦٧).
ئەگەر پارچەی حەوت دێر بێ ، دێری هەشتەم دەڕوا ، واتە سەرواى دووەم لە

تاقیکردنەوەی دوور و درێژدا تێپەڕیون و (ئەوەهای ئەوە پێشتر خەریکی هۆنینەوەی سەروای موسەممەت -هەمە ڕەنگە و شیعری ڕەها -مرسل- بوون کە پشت بە زەنگی وشەو شوێنی وەستان دەبەستێ) [٢١٤ : ٨]. لە عەرەبیدا دیراساتی سەرواو زاراوەی تایبەتی بەسەروا پێش کێش کەوتوە، بەلاَم لای خەلیل و ئەخفەش و قوترووب و فیراء زاراوە و ڕێبازی لێکۆڵینەوەی سەروا چەسپاوە، ئەگەرچی جیاوازی کەم لە بۆچوونەکانیان دەبیندرێ بەلاَم چوار چێوەی گشتی لای هەموویان یەکە. بە پێی تایبەتێتی زمانەکە کە تیپی ساکن و موتەحەریك دەوری تێدا هەیە و ئەوسایش لێکۆڵینەوەی دەنگیی وا پەرەی نەسەندبوو، بۆیە هەر لەسەر بنچینەی تیپ و حەرەکە یاساکانیان داڕشتوە و زاراوەکانیان چەسپاندوە. ئەوان باس لەچەند تەوەرێکی سەروا دەکەن، وەکو: تیپەکانی سەروا (ڕەوی، ریدف، تەئسیس، دەخیل، وەسل، خروج) و حەرەکەکانی سەروا (ڕەس، ئیشباع، حەزو، تەوجیە، مەجرا، نەفاز) و جۆرەکانی سەروا (موتەرادیف، موتەواتیر، موتەداریك، موتەکاویس، موتەراکب) و ئەنگیبەکانی سەروا (سیناد، ئیتا، ئیکفا، تەزمین، ئیقواء) [٥١١ : ٦٧] دەکەن. پاشتر هیچی وای بۆ زیاد نەکراوە (دیاردەی هەرە باوی لێکۆڵینەوەکانی سەروای عەرەبی ئەوەیە ئەوانی دواوە هیچیان بۆ ئەوانی پێشەوە زیاد نەکردوە. جیاوازی نێوانیان، ئەگەر هەبێ، لە کورت کردنەوە و فراوان کردن و بەڵگە و داڕشتندایە) [٢٨٢ : ١٥]. لەسەردەمی عەباسییەکان، گەشە سەندنی ژیانی شارستانێتی و ڕابواردنی کۆشك و سەرای دەولەمەندو خەلیفەکان و تێکەڵ بوونی عەرەب لەگەڵ نەتەوەکانی تر و پەرەسەندنی بزووتنەوەی وەرگێڕانی ئەدەب و فەلسەفە و مەنتیق و پزیشك و هەموو لقەکانی تری ڕۆشنبیری، گۆڕانێکی گەورەی لە بنەمای ڕۆشنبیری عەرەبی دروست کرد. ئەو گۆڕانە شیعرو سەروایشی گرتەوە، لە عیراق و شام و ئەندەلوس موەششەحات(١٧) پەیدا بوو (بەزمانی عامی موالیا و قوماو دوبیت و کان یاماکان و سلسیلە پەیدا بوو. بەزمانی ستاندەردیش موسەممەت و موزدەویج و موشەتتەرو چوارین و موخەممەس، کێشیان پاراست بەلاَم سەروایان گۆڕانی بەسەر داهات) [٢٥٩ : ٢٢٧]. لەسەدەی ڕابردوودا (١٩) رزق الله حسون و لەم سەدەیەشدا (٢٠) جەمیل زەهاوی پێشەنگی ڕەت کردنەوەی سەروا بوون [٢٠٦ : ٩٤]. لە کۆتاییشدا دەبێ بڵێین کە (س. مۆرێ) لە پەراوێزی ل(٥-٦)ی کتێبەکەیدا هەوڵی داوە جۆرەکانی سەروای عەرەبی بە پێی بەدوای یەکدا هاتنی ح=حەرەکەو س=ساکن لێك بداتەوە و (١١) جۆری لێك جویا کردۆتەوە.

٦- <u>عیبری</u>: شیعری(١٨) عیبری کۆن ئەگەرچی (پشت بەئاوازی کۆتایی دێر دەبەستێ و هیچ

---

[17] (کێشەیەکی بەردەوام و نەبڕاوە لە نێوان تۆژەوەرەکانی ڕۆژهەلاَت و ڕۆژئاوا لەسەر ئەوە هەیە ئاخۆ عەرەب ئەم هونەرەیان لە (ترۆبادۆر)ی پرۆڤنسالی ترۆڤێری فەرەنسی وەرگرتوە کە لە شێوە و بابەتدا زۆر لە موەششەح دەکەن، یان ئەوروپییەکان هونەری موەششەحیان لە عەرەبی وەرگرتوە) [٤٩٤ : ٢٦٧]، بۆ ڕای جیاوازی تۆژەرەوە لەم بارەیەوە بڕوانە: [٢٨٣]، [٣١٦]، [٢٩٥]، [٣٤٨]، [٣٦٠].

[18] هەندێ ڕۆژهەلاَتناس لایان وایە وشەی شیعر لە (شیر)ی عیبرییەوە هاتوە کە بۆ وێرد و تەسبیحی پیرۆز

شیعرێ نییە پەیڕەوی یەکێتی سەروای تێدا بێ ) [ ٣٥٠ : ٤٧ ] . بەلام سەروای تایبەتی خۆی هەبوە . لەپەیمانی کۆندا (التوراه) سروودی یەکەمی ( دەرچوون -الخروج ) لە ئایەتی یەکەم بەدواوە هاوبزوێنی تێدا ڕەچاو کراوە . شیعری عیبری (لەسەدەی هەشتەمەوە کەوتە ژێر کاریگەری عەرەبی بەلام لەسەدەی دەیەم ولەسەر دەستی زانای نەحوی دوناش بن لابرگ( ٩٢٠ - ٩٧٠ ) کەوتە قالبی کێش و یەکێتی سەرواوە ) [٣٨٥ : ٦٥٥] . لە عیبریدا بۆ مەبەستی ئیستاتیکی زۆر جار تیپی ئەبجەد لەسەرەتا یان کۆتایی دێر بە جۆرێ بەکاردێ کە ئەگەر کۆیان بکەیتەوە ناوی ئەو کەسە دەردەچێ کە شیعرەکەی پێ هەڵدراوە. ئەمە لە شیعری سریانیشدا هەیە ولە کوردیش نموونەی بەرچاو دەکەوێ . ئیبراهیم هنداوی و ئەبو حەسەن لاوی و یەهوودا هالیڤی و حەریری ڕایان وایە شیعری عیبری سەروای لە عەرەبی خواستۆتەوە [ ٣٥٠ : ٥٠ ]. ئەوەی لەدابەش بوونی سەروای عیبریدا سەرنج ڕادەکێشێ دوو دیاردەیە : دیاردەی تەسمیت ( کە دێرێ دەکرێ بە چوار بەش - صلعیوت- ، سێ بەشی پێشەوە یەك سەروایان هەیە و بەشی چوارەم سەروای جیایە لەوان ) [٢٨٥ : ٦٥٦ ] . لەگەڵ دیاردەی هاتنەوە یەکی سەروا . لەم جۆرە هۆنراوەیەدا لەتی یەکەم و کۆتایی هاوسەروا دەبن ، لەتی دوەم و پێش کۆتایی .. بەم جۆرە تا دوو لەتەکەی ناوەڕاست دەکەونە تەك یەك [ ٣٥٠ : ٥١ ]. ئەم جۆرە نابەشبوونە دەگمەنە لای ترووبادورەکانیش هەیە [ ٣١٦ : ٧٢ ] و لەکوردیشدا گۆران نموونەی وای هەیە [ ١٧٣ : ١٧١ ].

٧- <u>سریانی</u> : سەروا لە شیعری سریانیدا زۆر کۆنە . لەسەدەی چوارەمی زایینی سەروا ( یان دیارەی وەکو سەروا ) لە مدراشەکانی [19] ئەفرام ( ٣٧٣م لەدایك بوە ) و مێمرەکانی [20] ئیسحاقی ئەنتاکی ( ٤٩١م لەدایك بوە ) و مێمرەکانی یەعقووبی سروجی ( ٥٢١م لەدایك بوە ) هەیە [ ٣٦٨ : ٢٠ ]. ئەفرام سەروای سەرەتا ( د ) و سەروای کۆتایی ( ن )ی بەکار هێناوە [ ٤٥٢ : ١٨ ]. سریان هۆنینەوەی شیعریان لەسەر تیپی ئەبجەد دا هەیە . ( ئەفرام لە میدراشەکانی زۆر جار لاسای زەبووری داودی کردۆتەوە هەندێ جار لەسەر تیپی ئەبجەد و هەندێ جار لەسەر تیپی ناوی مەسیح شیعری داناوە . یەعقوب سروجیش لە میمرەکانیدا هەمان هونەری سەروایی نواندوە ) [ ٢٦٩ : ٤١ ] . ئەفرام جاری وا دەبوو ناوی خۆی وەکو ( تخلص ) بە تیپی ئەبجەد دەخستە سەروای میدراشەکانی، یان کورت کراوەی ناوی خۆی ( ئەفریمون )ی بەکاردەهێنا [ ٢٢٧ : ٢-٤ ] . وا دەبێ

---

دەگەڕێتەوە . وشەی شیعرلە زارەکانی کەنعانی و فینیقی و ئۆگاریتی و عیبری و مۆئابی و جلعادی بە شێوەی (شیر) هاتوە . لە کەنعانیدا فرمانی (شاربشیر) بەمانای گۆرانی گوت و گۆرانی دەڵێ هاتوە و بەکەنعانی (شیارە) کاروانە چونکە زۆر گۆرانی تێدا دەگوترێ . ئەگەرچی لە عەرەبیدا گوایە لەبەر زۆر بۆیشی پێی دەگوترێ سیارە ) [٣٥٩ : ٦٨].

[19] میدراش بە سروودی ئایینی سریانی دەگوترێت.

[20] مێمر بە سروودی ئایینی سریانی دەگوترێت.

هەر پێیەکی (تفعیلە) دێرە شیعر سەروایەکی بۆ دادەندرێ، یەعقووبی سروجی ئەمەی لە مێمرێکدا بەکار هێناوە [٣٦٨ : ٢٢]، ئەمە لە کوردیدا لای جزیری دەست دەکەوێ [٥٨ : ٣٢٠].
جگە لە لازمە کە لە سرووده ئایینەکان دوبارە دەبێتەوە (لە سریانیدا تەبرە هەیە کە وەکو لازمە وایە بەڵام لەباتی ئەوەی لە کۆتایی بێ لەسەرەتا هەموو باعوتێکی [21] پێ دەکرێتەوە) [٢٦٨ : ٤٩٨] جگە لەمانە لە سەدەکانی ناوەڕاست (زۆر شاعیر هاتوون کە لە دوو دێر یان چوار دێریان سەراپای هۆنراوە پەیڕەوی سەروایان کردوە. بەناویانگترینیان ئیبنولعیبری و عەبد یەشوعی سوباوی و گورگیس وەردە و ئیشو عەباب و خامیسی قەرباحی) [٢٦٩ : ٤٤،٤٥]ن. سریان بە حوکمی دراوسێتی لە (سەرەتای سەدەی نۆیەمەوە کەوتنە ژێر کاریگەری شیعری عەرەبی و سەروایان لێ وەرگرتن و یەکێتی سەروایان پەیڕەو کرد) [٢٦٨ : ٣٥]، یەکەم کەس کە لە سریانیدا توانی سەروا بچەسپێنێ قەشە ئەنتونی زمانپاراو - انطون البلیغ او الفصیح- بوو) [٢٦٩ : ٤٤-٤٥].
بە پێی شوێنی هاتنی سەروا، شیعری سریانی سەروای سەرەتای دێر و ناوەوە و کۆتایی دێری هەبوە، هەندێ دیاردەی وەکو دووبارە کردنەوەی دەنگێک لە هەموو وشەکان (بزوێن یان نەبزوێن)ی تێدا بەکارهاتوە، جگە لەسەروای دوو سەرە، کە هەمان دەنگ لە سەرەتاو کۆتایی دێر دووبارە دەبێتەوە[٣٦٨ : ٢٠-٢١].

---

[21] سرووددێکە رۆژانە لە کاتی نوێژ دەخوێندرێتەوە.

## باسی سێیەم : جۆرەکانی سەروا

سەروا لە ئەنجامی مێژووی دوور و درێژی بەکارهاتن و سووڕانەوەی لەناو زمانەکانی جیهان و هونەر نواندنی شاعیرانی جیا جیا لە چۆنیەتی داڕشتن و دابەش کردنی ، زۆر جۆری جیاوازی لێ کەوتۆتەوە کە بە پێی سەردەم و نەتەوە و شاعیرەکان دەگۆڕێن . سەروا بە پێی گۆشە نیگای جیاجیا دابەش جۆری جیاجیا دەکرێ.

یەکەم : دابەشبوونی لە روانگەی ئاسۆییەوە : ئەگەر لە ئاستی ئاراستەی ئاسۆییەوە کە کشانی دێڕە شیعر دەگرێتەوە سەیری جۆرەکانی سەروا بکەین ، سەروا دوولایەنی سەرەکی دەگرێتەوە :

یەك : لایەنی وشەیی. دوو : لایەنی دەنگی.

یەك : لایەنی وشەیی لە ئاراستەی ئاسۆیی سەروادا :

١- بە پێی پێکهاتنی وشەیی سەروا :

أ- سەروای سەربەخۆ : ئەوەیە لە کۆتایی لەتە دێڕ یان دێڕە شیعردا ، تەنیا یەك وشە (وشەی سەروا ) بە هاوبەشبوونی دەنگێ یان چەند دەنگێکی کۆتایی سەروایان دروست کردبێ، وەکو نالی دەڵێ :

مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت
دەخیلت بم کە خانەی سەبرەکەم سووت [٢٠٩ : ٥٩].

سەروا لە وشەکانی ( فەرمووت - سووت )دایە ، ئەگەر ئەم وشانە لابدرێن وشەکانی پێشیان هیچ لەنگەری سەروای تریان پێ ڕاناگیرێ ، واتە (کە ) لەگەڵ (سەبرەکەم ) سەروا دروست ناکەن. جگە لەمە لە پاش ئەم وشانەی سەروا ، یان لە پێشیانەوە ، وشەیەك یان چەند وشەیەك دووبارە نەبۆتەوە کە پاڵپشتی وشەکانی سەروا بێ لە ڕاگرتنی مۆسیقای کۆتایی دێڕ.

وا دەبێ لە دوولەت یان دوو دێڕی هاوسەروادا ، دەنگەکانی سەروا لە یەکێکیان یان لە هەردووکیاندا بەسەر دوو وشە دابەشبووبێ . ئەم جۆرە سەروایە لە ئینگلیزی هەیە و پێی دەگوترێ (mosaic rhyme - سەروای توخم جیا ) ئەویش (سەروایەکە دوو برگەیی یان زیاتر ، لەیەك وشە ، زیاتر بەشداری تەواو کردنی -یەکە-ی سەروا دەکەن . ئەمە لە شیعری جوێن و گاڵتە جاری زۆر بەکاردێ)[٥٠٣ : ٤٠٤] . لە ئینگلیزیدا وەکو نموونەی شیعرێکی سویفت swift کە بۆ دکتۆر- شێریدان-ی نووسیوە ، لە دێرێکدا دەڵێ :

I went in vain to look for Eupolis
Down in the Strand , just where the new pole is . [٤٠٤ : ٥٠٣](٢٢)

لە لەتی یەکەم دەنگەکانی سەروا هەموو وشەی سەروایان گرتۆتەوە کەیەك وشەی سێ برگەییە (eu/po/lis) ، کەچی لەلەتی دووەمدا ، دەنگەکانی سەروا کە سێ برگەن بەسەر سێ وشەدا دابەش بوون (new/pole/is) برگەی دوەم و سێیەم بە تەواوی و برگەی یەکەمیش بێجگە لە پەراوێزی پێشەوە. ئەم جۆرە سەروایە لە فەڕنسی پێی دەگوترێ (equivoquee) وەکو

Et cest a peine si l'allumette amorphose
Meme en reve eclairer cette metamorphose [٢٠ : ٤٨٢](٢٣)

لە کوردیدا نموونەی ئەم جۆرە سەروایە لەم شیعرەی نالیدا دەردەکەوێ :

ساقی بەمەیی کوهنە لەسەر عادەتی نەوبە
بشکێنە بەیەك نەوبە ، دوسەد مانەمی تەوبە [٢٠٩ : ٩٢].

دەنگەکانی سەروا کە لە دوو برگەدایە ، لەلەتی یەکەمدا بەسەر دوو وشەدا دابەش بوە (نەو/بە) ناوەڵناوێك و فرمانێکی داخوازی ، کەچی لەلەتی دوەمدا لەیەك وشەدایە (تەوبە) .

ب- سەروای موڕەددەف : ئەو سەروایەیە جگە لەوشەی سەروا کە دەنگە هاوبەشەکانی لە کۆتاییدا هاتوە ، رەدیف - پاش سەروا -ی تێدا بێ ، جا پاش سەرواکە لە هەرچی ئاستێکدا بێ (وشە ، دەستەواژە ، رستە) و هەر جۆرە وشەیەك بێ (ناو ، راناو ..) . نموونەی ئەم جۆرە سەروایە وەکو نالی دەڵێ :

نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ
نەچم شەرتە هەتا ئەو خوارە بێ تۆ[٢٠٩ : ٩١].

دەنگی سەروا لە (ئەمجارە - ئەو خوارە) دایە کە وشەی سەروان . پاش تەواو بوونی دەستووری سەروا ئینجا شاعیر لەهەردوو لەتدا دەستەواژەی (بێ تۆ)ی بەهەمان مانا دووبارە کردۆتەوە . ئەمە پاش سەروایە.

ج- سەروای مەحجووب -پەردەدار- ئەو سەروایەیە پێش وشەکانی سەروا (حاجب)ی هەبێ

---

(22) مانای بەکوردی :
چووم ، بێهوودە بەدوای یوپۆلیزدا گەڕام
لە ناوەندی ستراند ، دەق لەو شوێنەی دیرەگەکەی لێیە.

(23) مانای شیعرەکە بە کوردی :
ئەمە زۆر زەحمەتە دنکە شقارتە بتوانێ تێکی بدا
ئەم مەسخە، بگرە لە خەونی رۆناکیشدا.

جا هەرچی هەبێ - حاجب وشەیەکە یا زیاتر بەهەمان مانا لە پێش وشەی سەروای لەتەکان یان دێرەکان دووبارە دەبێتەوە . حاجی دەڵێ :

کــورێکی وا نەبوو هەستێتە ســەر پێ
بزانێ خەلقی چۆن کەوتوونە سەر ڕێ [٦٠ : ٢٣١].

لە پێش وشەکانی سەروادا ، وشەی (سەر) بەهەمان مانا دووبارە بۆتەوە . ئەگەر وشەکانی سەروا لابدرێن ئەو هاوەدەنگییەی لە دوبات کردنەوەی ئەم وشەدا هەیە تا رادەیەك قەرەبوی دەکاتەوە . کە هەردووکێشیان پێکەوە دێن قوولییەك بە ئاوازو زایەلەی سەروا دەدەن .

د- سەروای مەحجووب موڕەددەف : ئەوەیە کە جگە لە وشەی سەروا ، پاش سەروا و پێش سەروای هەبێ . حەمدی دەڵێ :

بەم بەم چی ڕۆژێکی نەوە
هەی هەی چی عومرێکی نەوە [٦ : ١٢٩].

لەم دێرەدا ، جگە لە وشەکانی سەروا ، پێش سەروا (چی) و پاش سەروا (نەوە) هەن ئەمەو (بەم بەم) و (هەی هەی) سەرەرای دووبارە بوونەوەی (م) لە هەردووکیاندا ، لە پەیوەندییەکی هاوشوێنی دان و ئاوازەکەیشیان وەکو یەکە .

٢- بە پێی ژمارەی سەروا لە ئاستی ئاسۆییدا : شاعیروا دەبێ بنیاتی لەتە دێر یا هەموو دێر لەسەر یەك سەروا (سەروای کۆتایی) دادەمەزرێنێ ، وا دەبێ لەسەر دوو سەروا و بگرە سێ سەروا دایدەمەزرێنێ .

أ- تاك سەروا : ئەولەتە یا ئەو دێرەیە تەنیا حیسابی یەك سەروای لە کۆتایی بۆکراوە ، ئەمە سەروای هەرە باوە ، حاجی دەڵێ :

فەلەك بە تیروکەمانی لە ئێمە چووبتە کەمین
شکارگاهی زەمینە ، لەچەنگی کێوە دەچین [٦٠ : ٩٦].

هەر تەنیا وشەکانی کۆتایی (کەمین-دەچین) سەروایان تێدایە ، ئەگەر ئەم وشانە یان پێیەکانی (تفعیلە) کۆتایی هەر دوولەت لابدرێن ، هیچ سەروا نییە جێگای سەروای کۆتایی پڕ بکاتەوە .

ب- جووت سەروا : ئەوەیە شاعیر هۆنراوەکە لەسەر دوو سەروا بنیات بنێ ، وشەکانی کۆتایی وەکو باری ئاسایی سەروایان هەبێ و ئەگەر وشەکانی سەروای لەتەکان یان دێرەکان لابرێن ، وشەکانی پێش کۆتایی جێگایان پڕبکەنەوە و لەگەڵ یەکتر بین بەهاوسەروا .

حەمدی لەیەکێ لە هۆنراوەکانیدا سەراپای دێرەکانی لەسەر دوو سەروا دامەزراندوە ،

هەردووکیشیان یەك شتن تەنیا دوەمەکان دەنگی کۆتاییان لە یەکەمەکان زیاترە :

تاکەی ئەدەی بە خەلقی لە عەقل و زەکا ، زەکات

کوردە دەکا لە لیباسی حەیاتا حەیا ، حەیات[٦ : ١٨٥](٢٤).

وشەی سەروا لەم دوو لەتەدا ، ئەمانەن (زەکات - حەیات) ، ئەگەر گریمان لابدرێن وشەکانی پێش ئەوان هێزی بوونە سەروایان هەیە چونکە ئەوانیش دەنگی کۆتاییان (١) یەکە (زەکا - حەیا).

هەر لە جووت سەروا ، وا دەبێ هەر لەتێ بکرێ بە دوو بەش و هەر بەشە و سەروای خۆی هەبێ لەسەری بوەستێ ، عەبدولقادر ئەحمەد لە شیعرێکدا کە (٥) بەشە و هەر بەشێکی چوار لەتە و هەر لەتی لەسەر دوو سەروا بنیات نراوە ، لەسەرەتادا دەڵێ :

دڵداری نەو گوڵێکم ، هوژاری سەر چڵێکم

زەدەی زام لە دڵێکم ، عەوباڵی خوو سڵێکم [١٣٧ : ١٧٦].

لەم دێرە و لە هەموو دێرەکانی هۆنراوەکەدا ، بیناى لەت لەسەر دوو سەرواو دێر لەسەر چوار سەروا هاتوە ، هەردوو پارچە سەروایان یەکە . لە هەر لەتێکدا نیوەی لابدە ، ئەو دوو نیوەی دەمێننەوە هەمان سەروایان هەیە :

دڵداری نەو گوڵێکم

زەدەی زام لەدڵێکم

ج- سەروای سێیانە : لەمەدا ، لەتەکان لەسەر سێ سەروا دادەمەزرێن ، بە جۆرێ سەروای کۆتایی لابدرێ ، ئەوەی تر جێگەی دەگرێتەوە و دەبێ بە کۆتایی ، ئەویش لابدرێ سێیەم دەبێ بە کۆتایی . لەم جۆرەدا سەرواکان لەگەڵ کۆتایی پێ (تەفعیلە) رێك دەخرێن ، بۆیە لە کاتی خوێندنەوەدا ئیقاعی لەتەکان لەگەڵ یەکتر بەهێز دێنەوە چونکە دوو ئیقاع لە کۆتایی پێیەکاندا تێکەڵ دەبن ، ئیقاعی پێ (تفعیلە) و ئیقاعی سەروا . کامیل ژیر لە هۆنراوەی (نیگاری مەم) دا ئەم جۆرە سەروایەی هێناوە . دێری یەکەمی بەم جۆرەیە :

خۆی پڕ بە چنگ    گۆی پڕ بەدەم    دیمەنی جوان

لەتەختی سنگ    درزێکی کەم    ئەیگا بە دوان [١٦٥ : ٤٥].

ئەم هۆنراوەیە لە ئەسڵدا (٦) دێرە ، لەسەر کێشی خۆماڵی دوازدە برگەیی (٤+٤+٤) دامەزراوە و لەسەر سێ سەروا داندراوە و سەرواکان بەپێی پێیەکان شوێنیان دیارکراوە . دوای هەر

---

(24) لەتی دوەمی ئەم دێرە لەنگە ، ئەگەر وەکو چاپی دوەم (١٩٨٥) ، وشەی (لیباسی) بکرێ بە (بەحی) کێشەکەی ڕاست دەردەچێ.

پێیەك سەروایەكی جیا جێی كراوەتەوە . سەروای كۆتایی لە وشەكانی (جوان-دوان)دا خۆی دەنوێنێ ، ئەگەر پێیەكانی كۆتایی هەردوو لەت لابەری ، دەمێنێ :

خۆی پڕ بە چنگ     گوێ پڕ بەدەم
لەتەختی سنگ     درزێكی كەم

بەم كارە ، هۆنراوەكە نە لەمانا و نە لە شێوەدا (بەتایبەتی سەروا ) بەهای شیعری لەدەست نەداوە هەر بە شیعرێكی كێشدار و سەروادار ماوەتەوە، ئەوەندە هەیە بۆتە (٨) برگەیی (٤+٤)، وشەكانی (دەم-كەم)ی كۆتایی پێی دوەم ، بۆ ئێرە بوونەتە سەروای كۆتایی .

ئەگەر پێیەكانی دوەمیش فڕێ بدەی ، هەر دێڕەی یەك پێ بمێنێتەوە دیسان سەروای خۆی هەر دەمێنێ

خۆی پڕ بە چنگ
لەتەختی سنگ

ئەم دێڕە (مەنهووك[(٢٥)])ە ، هەم مانای خۆی پاراستوە و هەم سەروایش . (چنگ-سنگ) بوونەتە سەروای كۆتایی .

وا دەبێ شاعیر بینای لەتەكانی لەسەر سێ سەروا بكات بەلام ئیقاعی سەروا و پێ بەیەكەوە نەبن ، واتە سەرواكان لە كۆتایی پێیەكانی یەكەم و دوەمەوە نێن ، بەڵكو ئەم دوو جۆرە ئیقاعەی (پێ) و (سەروا ) لەیەك جیا كرابنەوە . ئەحمەدی خانی هەرچەندە لە جۆری یەكەمی ئەم سەروا سێیانەدا زۆر دێری داڕشتوە و بەزۆری لای ئەو دووبارە دەبێتەوە بەلام بۆ (تنوع) ئەمەیشیانی هێناوە ، وەكو:

سەیرا فەلەكان لنك تە گاڤەك
فەخرا مەلەكان ژتەسلاڤەك [٣ : ١٧].

لەیەك جیاكردنەوەی سێ سەرواكە بەم جۆرەیە :

سەیرا / فەلەكان / لنك تە گاڤەك /
فەخرا / مەلەكان / ژتە سلاڤەك /

ئەگەر سەرواكانی كۆتایی لابدرێن (لنك تەگاڤەك-ژ تە سلاڤەك ) ، ڕاستە سەروای دوەم جێی پڕ دەكاتەوە (فەلەكان-مەلەكان ) ، پاش ئەوانیش سەروای سێیەم دێتە پێش (سەیرا-فەخرا ) بەلام دابەشبوونی سێ سەرواكە لەگەڵ دابەشبوونی پێیەكانی كێش ناڕوا ، بۆیە دوو ئیقاعەكە

(25) دێڕی مەنهووك ئەو دێڕەیە كە هەر لەتێكی دوو پێی فڕێ درابێ و یەك پێ مابێ . وشەكە مانای شەكەت و داهێزراو دەگەیەنێ.

لێك دەترازێن و لەباتی ئەوەی بکەونە بۆنەی یەك گرتنەوە دەکەونە پەیوەندی بەدوای یەکدا هاتن و تەنیا لەسەروای کۆتاییدا تێك دەکەنەوە . دابەشبوونی پێیەکانی دوو لەتەکە بەم جۆرەیە :

سەیرا فە | لەکان لێك | تە گاڤەك |
فەخرا مە | لەکان ژتە | سلاڤەك | (٢٦)

- - ب | ب - ب - | ب - - |

مفعول | مفاعیل | فعولن |

ئەگەر لە سنووری پێیەکانەوە بڕوانینە سەروای دوەم و سێیەم ، هەستیان پێ ناکەین چونکە خزاونەتە ناو پێیەکانەوە .

وا دەبێ لەگەڵ سێ سەرواکە ڕەگەزێکی دەنگیی مۆسیقی لە ئاستێکی ئاسۆیی لەگەڵ وشەکانی سەروادا کاردەکات و پەیوەندییەکی بەیەك بەستنەوەی ئاسۆیی و ستوونی لە ڕووی ئاوازەکە لە نێوان وشەکان دادەمەزرێنێ ، وەکو ئەم دێڕەی ئەحمەدی خانی :

داری و دەولەت و دیانەت

سەرداری و سەولەت و سیانەت [٣ : ٣٥].

لەم دێڕەدا کە لەسەر سێ سەروا دامەزراوە و سەرواو پێیەکانی لەگەڵ یەکتر هاتوون ، جگە لەمەش لەسەر ئاستی ئاسۆیی پەیوەندی نێوان وشەکانی هەر لەتێکدا ، سەرباری ئەوەی سەروای یەکەم و دوەم یەك شتن ، وشەکانی هەر لەتێك بە پەیوەندییەکی تری دەنگیی ئاوازە بۆ یەکتر دەسەننەوە کە هاوبەشییانە لە دەنگیی یەکەم (Alliteration) . لەلەتی یەکەم هەموو وشەکان بە (د) و لەلەتی دوەمدا هەموویان بە (س)، دەست پێ دەکەن . لێرەدا کۆبوونەوەی هاونەبزوێنی سەرەتا و یەکگرتنی ئیقاعی پێیەکان و سەروا ، جۆرە ئاوازێکی بەهێزی بەدێڕەکە داوە .

٣- <u>بەپێی شوێنی ئاسۆیی وشەکانی سەروا لە کشانی لەت یان دێڕە شیعردا</u> :

سەروا بە پێی شوێنەکەی لە ئاستی ئاسۆیی دێڕە شیعردا ، سێ جۆرە :

أ- <u>سەروای کۆتایی</u> : ئەو هاوەدەنگییەیە لە وشەکانی کۆتایی لەتە دێڕ یان دێڕ دێ و لەهەموو جۆرەکانی تری سەروا باوترە و زیاتر وشەی سەروا بەمەوە بەسراوەتەوە ئەگەر چی فرێزەر لای وایە (هاتنی سەروا لە کۆتایی دێڕ نەك سەرەتا ، تەنیا مەسەلەی لاساکردنەوەیە و بەس ، ئەگەر نا سەروای ناوەوە دیاردەیەکی زۆر باو و کاریگەرە ) [٤٦٣ : ٦٠] . سەروای کۆتایی مەسەلەی لاساکردنەوە بێ وەك فرێزەر دەڵێ یان مەسەلەی هێزی شوێنەکە بێ، سەروا لەوێ دەگیرسێتەوەو ،

---

(26) پێی دوەمی لەتی دوەم دەبێ بڕگەی کۆتایی درێژ بکرێتەوە ، (تە-تا) چونکە مفاعیلن لەبەك کاتدا قەبز وکەف وەرناگرێ ، هەر یەکێکیان وەردەگرێ

سەرواى كۆتايى لە هەمووى باوتر و كاريگەرترە.

ب- سەرواى ناوەوە : ئەوەيە وشەكانى ناوەوە (حەشوو) لە نێوان خۆياندا يان لەگەڵ وشەى كۆتاييدا هاوسەروابن. نموونەى ئەوەى لەگەڵ وشەى كۆتاييدا هاوسەروابن وەكو مەولەوى دەڵێ :

سابێم دەر دەى دەى پەى پەى ئەوەمەى مەى
لەتايف مەردەم يەكسەر بكەرحەى[١٨٦ : ٣٩].

سەرواى ئەم دێرە لە وشەكانى (مەى-حەى)داية ، رەوييەكەى (ى-y)ى نيمچە بزوێنە . سەرواى ناوەوە لە وشەكانى هاندان (دەى دەى) و بەردەوامى (پەى پەى)داية. ئەم دوو وشەيە جگە لەوەى لەگەڵ وشەى سەرواى كۆتايى هاو سەروان ، لەنێوان خۆيشيان رێتم و ئاوازێكى زۆر بە هێزى دووبارەبوونەوەيان دروست كردوە كە لە سێ شوێندا سەر هەڵدەدا چونكە بە هاورێتمى و هاوشوێنييەكى لەبار دوو برگە دوو برگە دەكەونە جوولەى دووبارەبوونەوە :

(دەى دەى / پەى پەى / مەى مەى). يەكگرتنى سەرواى دەرەوە (كۆتايى) و ناوەوە لێرە ، قووڵييەكى ترى بەمەداى ئاوازەيى شيعرەكە داوە كە لە داگەڕانەوەى دەنگى كۆتاييە بەرەو سەرەتا يان بەردەوام بوونى سەرواى ناوەوەيە تا لەگەڵ كۆتايى لەتەكەى ترى خۆى لێك دەدا.

سەرواى ناوەوە ، هەر جۆرێ بێت ، ئاوازێكى ناوەكى دەخولقێنێ و بەهايەكى ئيستاتيكى و بگرە دەلالى زيادەكى بە دێرەكە دەدا. (سەروا بەگشتى لە كۆتايى دێرەوە چاوەروان دەكرێ، ئەمە پێى دەگوترێ سەرواى دەرەوە. هەندێ شاعير بۆ دەوڵەمەند كردنى ئاوازەى دەنگوشەيەك دەخەنە ناو دێرەكە، لە ناوەڕاست يان نزيك ناوەڕاست كە هاوسەرواى وشەى كۆتايى بێ. ئەم جۆرە سەروايە كاريگەرى گرێدانى سەروا بە هێزتر دەكا. ئەگەر لە هەموو دێرەكان نەبێ، جەختێكى زۆرە بۆ سەر هەندێ دێرى مەبەست)[٤٧٦ : ٣٢].

وا دەبێ سەرواى ناوەوە كە لە چەند وشەيەكدا دەردەكەوێ ، سەربەخۆيێ و پەيوەندى سەروايى بە وشەى كۆتاييەوە نەبێ. سەفوەت دەڵێ :

ئەو سەركەشە ، بەرچەم رەشە ، ئەو چاوگەشە ، تاكەى؟
بۆ من بەرەوا ، شەربەتى مەرگ و بە رەقيب مەى؟ [١٠٨ : ٩٥].

جگە لەسەرواى كۆتايى كە لە وشەكانى (كەى-مەى)داية ، لەتى يەكەم سێ سەرواى ناوەوەى تێدا هاتوە. كەوتوونەتە كۆتايى دەستەواژەكانى (سەركەشە ، بەرچەم رەشە ، چاوگەشە). جگە لەسەروا ئەم وشانە رێتمى فۆنۆلۆجى ئاهەنگێكى تايبەتى پێ بەخشيون چونكە هەموويان ئاوەڵناوى لێكدراون (ناو+ئاوەڵناو) و سەر و بەرچەم و چاويش كە بنەماى دروست كردنى وشەكانن پەيوەندى تناسبيان لەنێوانداية چونكە شوێنەكەيان لە لەشى دڵبەردا لەيەك نزيكە.

- هەر لەسەرواى ناوەوە وادەبێ هەموو پێیەکانی حەشوو هاوسەروابن ، جزیری دەڵێ :

من دی سەحەر شاهێ مەجەر لەبسی دبەر مەخموور بوو
ئەو دێم زەری سوپ موشتەری یارەب پەری یا حوور بوو [٥٨ : ٤٠٧].

لەم دێرەدا ، سەرواى کۆتایی لە وشەکانی (مەخموور ، حوور) دایە . (بوو) پاش سەروایە، سەرواى ناوەوەش لەهەردوو لەتدا ، لەگەڵ کۆتایی پێیەکان هاتوون ، سەرواى ناوەوەی لەتەکان لەگەڵ یەکتر لەسەرواى کۆتایی جیان . لەلەتی یەکەم (سەحەر ، مەجەر ، دبەر) سەروایان هەڵگرتووە و لەلەتی دووەمدا (زەری ، موشتەری ، پەری) سەروایان هەیە . دامەزراندنی سێ تەشکیلەی سەروا لەیەك دێرە شیعردا ، کە هەریەکەیان سیستەمی خ.ـ.ـ هەیە، وەستایی شاعیرەکە دەردەخا . سەرواى کۆتایی لە دوو وشە کە بەرامبەر دوو لەت دەوەستێ ، سەرواى ناوەوەی هەر لەتێك لە سێ وشەدا کە سێ بەرامبەر سێ دەوەستن جۆرە هاوشوێنی و تەرتیبێکی ئیقاعی تۆکمەی بە دێرەکە داوە .

وا دەبێ سەرواى کۆتایی و ناوەوە یەك بگرن و هەموو پێیە عەرووزییەکان لەسەرەتای دێر (نەك هەر لەت) تا کۆتایی بەیەك سەروا بڕۆن . جزیری دەڵێ :

بەژنا شەپال ، دێمێ بخال ، ئیعراب و دال ، قەوسێ هیلال
نەقشێ جەلال ، جاما زەلال ، خەمرا حەلال ، سوحبەت بحال [٥٨ : ٣٢٣].

وەك ئاشکرایە ، لەم دێرەدا کە (٨) پێیە و بەسەر دوو لەتی وەکو یەك (٤) پێیدا دابەش بوە ، هەر هەشت پێی یەك سەروایان تێدایە (ـال) . ئەم دەسەڵاتە بەسەر سەروادا ، توانایەکی فەرهەنگی و عەرووزی زۆری دەوێ جگە لە بەهرەی شاعیرێتی. ئەوەی لەم دێرە شیعرەدا سەرنج ڕادەکێشێ وشەی سەرواى کۆتایی لەتی یەکەم لە سنووری سەروادا لەگەڵ وشەکانی سەرواى ناوەوەی لەتی دووەم یەك دەگرنەوە (هیلال ، جەلال ، زەلال ، حەلال) کە هەموویان لە دەنگەکانی (لال) یەك دەگرنەوە ، بە پێچەوانەی ئەمەوە وشەی سەرواى لەتی دووەم لەگەڵ وشەکانی سەرواى ناوەوەی لەتی یەکەم لە سنووری سەروادا لەیەك نزیك دەبنەوە کە تەنیا (ال)ە، (حال ، شەپال ، خال ، دال) . ئەم لێك تێپەڕاندنەی سەرواى کۆتایی لەتی یەکەم لەگەڵ سەرواى ناوەوەی دووەم و سەرواى کۆتایی لەتی دووەم لەگەڵ سەرواى ناوەوەی لەتی یەکەم جۆرە ڕایەڵەیەکی لێك تێپەڕیوەی بە دێرەکە داوە کە وەستایانە خراوەتە پەنا سنووری سەرواوە .

ج- <u>سەرواى سەرەتا</u> : ئەم جۆرە سەروایە پەیوەندی بەیەکەم وشەی لەت یان دێرە شیعرەوە هەیە . ئەو هاودەنگییەی بۆ بەهێز کردنی مۆسیقیەتی شیعر بەکاردێ دەخرێتە سەر یەکەم وشەی لەت یان دێرە شیعر. ئەمە بە دوو جۆر هاتوە :

• یان ئەوەتە وشەکانی سەرەتای لەت یان دێر هاوسەروا دەبن (هاوبەشی دەنگی دەکەوێتە

دواوە وەکو هەموو سەروایەکی تر) . خانی دەڵێ :

ئەعلایێ دکەت بقەهرێ ئەدنا
ئەدنایێ دکەت بلوتفێ ئەعلا [٣ : ٢٧].

وشەکانی سەرەتا (ئەعلا-ئەدنا) هاوسەروان ، ڕەویان (ا)یە . گۆڕینی جێگای ئەعلا و ئەدنا لە لەتی یەکەم و دوەم (ئەعلا ئەدنا) کە پێچەوانەی یەکترن بەهێزی جووت وشەی دژیەکی (قەهر-لوتف) ئەم گۆڕانە دێنە دی. جوولەی هەڵکشان و داکشانی دەلالەتی دژیەک جۆرە ئیقاعێکی پتەوو جوولانەوەیەکی درامی بە دێڕە شیعرەکە داوە . دوو جولانەوەی تەریب سەرەتایان دوو وشەی دژیەکەو کۆتاییان بە پێچەوانەی سەرەتا دێتەوە . ئەم دێڕە ئاوازەکەی بە هونەرێکی تریش قوولّ بۆتەوە ، دەنگی سەرەتا و کۆتایی هەرلەتێك ، سەرەڕای دژیەکی وشەکان ، وەکو یەك وایە ، ئەم وەك یەکیی سەرەتا و کۆتاییە لەهەمان کاتدا لە ئاستی لەتدا لەدەوری وشە یەکەمەکان چەقی بەستوە کە هەردووکیان بە (ا) دەست پێ دەکەن و بە (ا) کۆتاییان دێ، بەلام لەسەرەتا هەمزەو لە کۆتایی مەددەیە.

• یان ئەوەتە وشەکانی سەرەتای لەت یان دێر دەنگی سەرەتایان یەك دەبێ، ئەم دیاردەیە لە هاونەبزوێنی (alliteration)ی ئینگلیزی خۆی دەدۆزێتەوە. ئیبراهیم ئەفخەمی هۆنراوەیەکی دوورو درێژی هەیە . هەموو دەنگەکانی ئەلف وبێی کردوە بەسەرەتا و بۆ هەر دەنگێ کۆمەڵێ دێری نووسیوە کە هەموویان بەیەك دەنگدەست پێ دەکەن. شیعرەکە پارچەی (ا)ی (١١) دێرە و ئەوانەی تر ژمارەی دێرەکانیان بەم جۆرەیە (ب=١٠ ، پ=٩ ، ت=٧ ، ج=٩ ، چ=٩ ، خ=٨ ... هتد). نموونەیەك بۆ سەروای سەرەتای (چ) لەم هۆنراوەیەدا :

چێ ڕم بکەوە جا بیچەقێنە     بیر لە قسە کەوە جا بیدرکێنە
جەرگ کەنەبوو سیپەلاك چییە     غیرەت پێویستە چەك شتێك نییە
چۆ بە دیوارا هەڵدەگەڕێنێ     کلاوی بابا عەییار دەفڕێنێ [٢٦ : ٦٦].

ئەم پارچەیە (٩) دێرە و هەموو دێرەکان وەکو ئەم سێ دێرەیە بە دەنگی (چ) دەست پێ دەکەن. ئەم هۆنراوەیە لەئەسلدا مەسنەوییە ، واتە هەر دوو لەتی لەسەر سەروایەکی کۆتایی دەڕوا و سەروای دێرەکان دەگۆڕێ. ئەوەی هەموو دێرەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە (جگە لە کێش) لێرەدا سەروای سەرەتاییە . ئەم دەنگە هاوبەشەی سەرەتا (چ) وەکو داوێك سەراپای دێرەکانی هەر پارچەیەك بەیەکەوە گرێ دەدا .

ئەم جۆرە سەروایە لە سریانیشدا هەیە ، (لەجۆرەکانی مەداریش سرودێك پێی دەگوترێ ‌السوکیث - لە شێوەی گفتوگۆدایە ، بەکێشی حەوتی دەهۆنرێتەوە و زۆربەی لەسەر ئەبجەد دادەڕێژێ وەکو سۆکیی نێوان مێرەمی پاکیزە و جبریلی فریشتە یان پاکیزە و مەجووسی ، یان ئیبراهیم و

قوربانییەکەی ) [٢٦٨ : ٣٥] . بەکارهێنانی یەك دەنگ( تیپ ) لەسەرەتای هەموو دێرێکی هەر پارچەیەك و ڕەچاوکردنی تسلسلی ئەبجەدی لەپارچەکان لەسریانیدا زۆر هاتوە ، وەکو ئەم پارچەیەی مار ئەفرام کە هەموو دێرەکانی بە ( د ) دەست پێ دەکەن :

دا وێهو رعیانن

دا مێو لایلانا

دسنق بخول یومین

دشمشیە شقیا

دلیلای دنو دێلاخ [٣٦٨ : ٢٠](٢٧).

لەم پارچە شیعرەدا ، سەروای کۆتایی پەیڕەو نەکراوە ، ئەوە نەبێ لەتی ( ١ ) و ( ٣ ) ڕەوییان یەکە ( ن ) و لەتی ( ٢ ) و ( ٤ )یش ڕەوییان ( ا )یە . کەچی هەموو لەتەکان بەدەنگی ( د ) دەستیان پێکردوە . ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ دوا لەت لە سێ وشە پێك هاتوە ، سەروای سەرەتای پارچەکە لە سەرەتای هەموو وشەکان دووبارە بۆتەوە . ئەمە داخستنێکی سەروای سەرەتایە کە تا دوا وشەی دوا لەت کشاوە .

لە ئاستی لەت و دێر یان لەئاستی هۆنراوەدا ، ئەو هۆنراوانەی کەیەکەم دەنگیان وەکو یەکە واتە یەکەم دەنگی وشەی یەکەمی لەتە دێری یەکەم ، دەشێ هەموو بەیەکەوە لەیەك خانەدا پۆلێن بکرێن ، ئەم پێکچوونی دەنگی سەرەتایە ، لە کوردیدا ، بۆ ڕێکخستن و پۆلێن کردنی هۆنراوەی مەسنەوی لە دوتوێی دیوانەکاندا سوودی لێ وەرگیراوە. چونکە هۆنراوەی مەسنەوی یەکێتی سەروایان تێدا نییە تا بەپێی سەروای هۆنراوەکە پۆلێن بکرێن . ئیدی یەکەم دەنگی هۆنراوە لەو جۆرە دیوانانەدا کراوە بە بنچینەی پۆلێن کردن وەکو دیوانی مەولەوی [١٨٦] و دیوانی سەیدی [١١١] و دیوانی بێسارانی [٣٧] .

دوو : <u>لایەنی دەنگ لە ئاراستەی ئاسۆیی سەروادا</u> :

١ – <u>بەپێی دوا دەنگی سەروا</u> : دوا دەنگی سەروا لە ڕووی پەیوەندی بە وشەی سەروا یان بەشێکی ڕەسەنە لە بنیاتی وشەکەدا ، جا چ سادە بێ و چ ناسادە ، یان زیادەیەکە و پێویستیەکی ڕێزمانی هێناویە و لکاندوویە بە کۆتایی وشەکەوە و ڕەوی بەرەو پێشەوە پاڵداوە و شوێنی هەرە

---

([27]) مانای ئەم چەند دێرە بە کوردی :

هزرمان تەپە

وەکو درەخت وایە

دەپەوێ هەموو ڕۆژێ

بەئاودان خزمەتی بکرێ

کەم کەس سوپاسگوزاری تۆن.

دواوەی بۆ خۆی داگرتووە. بەمەوە بەشێکی زۆری هێزی ڕەوی بۆ خۆی بردوە. لەم ڕووەوە سەروا دەکرێ بە دوو بەش :

أ- ئەو سەروایەی کۆتایی بە ڕەوی دێ و ڕەوییەکە کۆتایی دێڕ دەگرێ . نالی دەڵێ :

وەك قەفەس ئەم حوجرە کون تێیە کەوا گرتوومە بە ناو
تارو پوودی عەنکەبووتی زۆرە لێی کردووم بە داو[۲۰۹ : ۱٤٥] .

ئەم دوو لەتە وشەی سەروایان بریتییە لە (ناو ، داو) کە جگە لەوەی لەسەر یەك کێشن ، کۆتاییان بەڕەوی هاتوە (و-w) . لەم جۆرەدا نابێ پاش سەروا هەبێ، چونکە پاش سەروا شوێنی کۆتایی دێرلە وشەی سەروا و ڕەوی دەسێنێ و دیسان نرخی ڕەوی لە ڕووی ئیقاعی کۆتاییەوە کەم دەبێتەوە. لێرەدا (ڕەوی) دەوری بنچینەیی خۆی دەبینێ کە ڕاگرتنی لەنگەری کۆتایی دێرو بەیەکەوە گرێدانی هەموو دێرەکانە بە داوێکی وەهمییەوە.

ب- ئەو سەروایەی کۆتایی بەڕەوی نایە ، یان پاش ڕەوی هەیە یان پاش سەروای هەیە یان پاش ڕەوی و پاش سەروای هەیە. - ئەو سەروایەی جگە لە دەنگی ڕەوی پاش ڕەوی هەیە وەکو نالی دەڵێ :

شەوهات و ئەمن مەستی خەیاڵاتی کەسێکم
مەشغوولی نەفەس گرتنی مشکێن نەفەسێکم[۲۰۹ : ۷۷] .

وشەکانی سەروا (کەسێکم ، نەفەسێکم)ن . دەنگەکانی سەروا بریتین لە (-ەس) و (س) ڕەوییە . (ێکم) بریتییە لە پاش ڕەوی چونکە لە ئەسڵی وشەکانی سەروادا نییە. پێویستی ڕێزمانی و واتاسازی هێناویە . ئەم پاش ڕەوییە لە دوو مۆرفیمی (ێك ، م) دروست بوە . لەم جۆرە سەروایەدا ڕەوی لە ڕووی کاریگەرییەوە نرخی کەم دەبێتەوە و دوا دەنگی پاش ڕەوی جێگای دەگرێتەوە.

- وا دەبێ لە باتی پاش ڕەوی ، پاش سەروا جێگای بە ڕەوی لەق کردبێ و ئەگەر چی لە هەموو دێرەکانیش وەکو خۆی دووبارە دەبێتەوە بەلام دیسان گوێچکەو چاو بەلای دوا دەنگی دێرەکەدا دەچن کە دوا دەنگی پاش سەروای دووبارەبووەوەیە. هەرلەم جۆرەدا، وا دەبێ ڕەوی بە دوو قۆناغ بەرەو پێشەوە نەکان دەدا ولە شوێنی ڕەسەنی خۆی دوور دەکەوێتەوە ، ئەو کاتەی پاش سەروا و پاش ڕەوی هەبێ : نالی دەڵێ :

ئەللا ئەللا کەچ عەقل و چ کەمالێکی هەیە
لەگەڵ ئەو عەقل و کەماڵە چ جەمالێکی هەیە[۲۰۹ : ۱۱۲] .

لەم دێرەدا ، (هەیە) پاش سەروایە . (کەمالێکی ، جەمالێکی) وشەی سەروان . وشە ئەسڵییەکان بریتین لە (کەمال ، جەمال) ، واتە (-ەمال) چەپکە دەنگی سەروایە کە بەسەر دوو

بڕگەدا دابەش بوە ، ( ل ) ڕەوییە . وشەکانی سەروا پاش ڕەوییان هاتۆتە سەر ( ێکی ) کە لە دوو مۆرفیم پێکهاتوە ( ێك ، ی ) . لێرەدا دیارە ڕەوی دوو قۆناغ شوێنی خۆی گواستۆتەوە ، جارێکیان لەگەڵ وشەی سەروادا جێگای کۆتاییان بە پاش سەروا داوە ، جارێکی تریش خۆی پاش ڕەوی قبوول کردوە و کۆتایی وشەکەی بەو بەخشیوە ، بەمەوە دوو جار لەئەرکی ئیقاعی کەم بۆتەوە وەك دوا دەنگی دێرە شیعر.

٢- به‌پێی مەودای دەنگەکانی سەروا : بەپێی ژمارەی ئەو دەنگو بڕگانەی لە کۆتاییدا وەکو سەروا دووبارە دەبنەوە ، دەتوانین بەگشتی سێ جۆر سەروا دەست نیشان بکەین :

أ- سەروای لاواز : ئەوەیە تەنیا لەیەك بزوێنی بێهێز دروست بووبێ ، لەبەر ئەوەی بزوێنی کورت و بێهێز بەتەنیا باری سەروای پێ ڕاناگیرێ ، ئەم جۆرە سەروایە بە یەکێ لە کەم و کورتییەکانی سەروا داندراوە . بۆ نموونە جزیری دەڵێ:

شێوەیی دلبەری بزان سوننەتە شێوە عیشوە فەرز

هەردو نەزەر کوین قیران واجبە یەك گرشمە فەرز[٥٨ : ٥٨٨](٢٨) .

( فەرز) پاش سەروایە ، ( عیشوە ، گریشمە ) وشەی سەروان ، وشەکانی تری سەروای هەمان هۆنراوە ئەمانەن ( سەجدە ، فەرزە ، تەوبە ، ڕەقسە ، قیبلە ، شەهدە ، عومرە ) ئەو دەنگەی لە کۆتایی ئەم وشانەدا دووبارە دەبێتەوە بۆ دروست کردنی سەروا تەنیا دەنگی ( ە )یە ، ئەمە بزوێنێکی کورتە و سەروای پێ هەڵناگیرێ، بۆیە ئەم جۆرە سەروایە بە ( لاواز) حسێب دەکرێ. لە فەڕەنسیدا ئەم جۆرە سەروایە پێی دەگوترێ defectueuse – عەیبدار ، جا چ لەم جۆرە لاوازەی کوردی بێت و چ ڕەوییان جیابێ یان هەر عەیبێکی تری هەبێ .

ب- سەروای ئاسایی : ئەوەیە دەنگەکانی دواوەی وشەکانی سەروا توانای ڕاگرتنی لەنگەری سەروایان هەبێ . جا چ بزوێنێکی درێژبێ و چ بزوێنێك (کورت یا درێژ) و نەبزوێنێك بێ. ئەم جۆرە سەروایە لە ئینگلیزیدا پێی دەگوترێ ( single ) و لەفەڕەنسیدا پێی دەگوترێ ( suffisante ) . نموونەی ئەم جۆرە سەروایە وەکو حەمدی دەڵێ :

قەت مەکە شەکوە لە ڕەفتاری کەچی ئەفلاکی پیر

مەنزیلی دوورە هەدەف هەر کورت ئەهێنێ دیارەتیر[٦ : ٢٢٩] .

وشەکانی سەروا (پیر ، تیر) هەریەکە یەك بڕگەو دەنگەکانی سەروا دوانن ، بزوێن و نەبزوێنی دواوەی (-cv). لەکوردیدا بزوێنی درێژ بەتەنیا دەتوانێ سەنگی سەروا ڕابگرێ ، ئەگەر چی لە

---

(28) هەژار ، سێ لاپەڕە پێش ئەم هۆنراوەیە ،لە (سەرنجێکی هەژارانە )دا ئەم هۆنراوانە بەهی جزیری نازانێ چونکە جزیری قافیەی زەندەاری نەبوە ،لەکێش و ڕەوتی شیعردا کەمتر شاعیر گەبونێ[٥٨ : ٥٨٥]. جزیری کە وەستاو شارەزایەکی بێ بەقلەلە داڕشتنی سەروادا ، بەسەروای لاوازی وەکو ئەمە ڕازی نابێ.

ئینگلیزیدا (لیچ) کە لێکدانەوەی بڕگەیی بۆ سەروا دەکا ئەو شیمانەیە (احتمال) دانانێ کە سەروا تەنیا لە بزوێنی بەهێز پێك بێ ، لەهەر شەش حاڵەتەکەی تر کە (cvc) بڕگە بەخۆیەوە هەڵیدەگرێ تەنیا ئەمەیانی (cv-) بە سەروا ناو بردوە [٤٦٦ : ٨٩] . ئەم جۆرە سەروایەی کە لە یەك بڕگە پێك دێ و کۆتایی بە نەبزوێن دێ (بڕگەیی داخراو) ، لە زمانی فەرەنسی و ئەسپانی ، بگرە لە کۆنا لە ئینگلیزیش ، بەسەروای (نێرینە masculines) ناو دەبرێ. لە لایەکی تریشەوە ، لە زۆربەی زمانە ئەورووپییەکان سەروا بە دوا بڕگەی بەهێز دیار دەکرێ ، جا ئەگەر دوا بڕگەی بەهێز کەوتبوە کۆتایی ، بەتەنیا سەروا دروست دەکات. ئەگەر بڕگەیەکی تری بێ هێزی بەدوادا هاتبوو ، لەبەر ئەوەی بڕگە بێ هێزەکە سەروای پێ دروست ناکرێ ، بەهەردوو بڕگە ئینجا سەروای ئاسایی پێك دێنن . ئەمە لەئینگلیزیدا پێی دەگوترێ دوو بڕگەیی (double) . لە کۆنیشا هەر لە ئینگلیزی و ئێستایش لەفەرەنسی و ئەسپانی پێی دەگوترێ سەروای (مێینە -feminines) چونکە بڕگەی بێ هێزی کۆتایی بە بزوێنی (e)ی نیشانەی مێیینەی لاتینی دروست بوە . لەکوردیدا ئەگەر بڕگەی کۆتایی بڕگەیەکی کراوەی بزوێن کورت بوو وەکو لە جۆری یەکەم دیمان دەبێ بڕگەی پێشەوەی لەگەڵدا بێ ئەوسا بە هەردووکیان سەروای ئاسایی پێك دێنن وەکو مەولەوی دەڵێ :

وە خارو خاشاك موژەی چەسپیدە
سەد بەستەن نەدور سەرچەمەی دیدە [١٨٦ : ١٥٦] .

وشەکانی سەروا بریتین لە (چەسپیدە ، دیدە) ، دەنگەکانی سەروا دوو بڕگەیان داگرتوە (پیـ/دە) ، (دیـ/دە) . بزوێنی کۆتایی کورتە (ە) بەسەروا ناشێ ، بۆیە بڕگەی پێشتر کە کراوەیە و بزوێنەکەی درێژە حسێبی بۆ کراوە، بە هەردوو بڕگە ئینجا سەروایەکی ئاسایی دروست بوە.

ج- سەروای زێدەبار: ئەوەیە کە لە ڕادەی پێویستی خۆی دەنگیی زیادەی تێدا ڕەچاو بکرێ لە ئینگلیزیدا ئەم جۆرە سەروایە لە سێ بڕگە پێك دێ و پێی دەگوترێ (سەروای سیانە triple rhyme) و جاری وا هەیە لە سێ بڕگەیش تێدەپەڕێ . لە عەرەبیدا ئەم پەیڕەو کردنە بە (لزوم مالایلزم) ناو براوە و هەندێ جاریش بە (اعنات) ئەم (اعنات)ە لەفارسیدا زیاتر چەسپاوە و لە لێکۆڵینەوەکانی سەرواناسیدا لە زاراوەی (لزوم مالایلزم) زیاتر بەکاردێ . لەفەرەنسیدا بەم جۆرە سەروایە دەگوترێ سەروای (دەوڵەمەند riches). لەکوردیدا وەکو حەمدی لە هۆنراوەیەکدا دەڵێ :

قەومی کوردن ئەم گرۆهە ، ئەی ڕەفیقان ، یا مەلەك ؟
ئەرزە کەییە ئاسمان یا بۆتە فەرشی ئەرز فەلەك ؟ [٦ : ٢٧١] .

وشەکانی سەروای ئەم دوولەتە و هەموو دێرەکانی هۆنراوەکە ئەمانەن : (مەلەك ، فەلەك ، کەلەك ، بەلەك ، دەلەك ، وەلەك) . لەم وشانەدا کە کۆتاییان بە نەبزوێنی (ك) هاتوە ، تەنیا بزوێنی پێشەوەی لەگەڵدا بێ ، با کورتیش بێ ، (ەك) بەسە بۆ دروست کردنی سەروای ئاسایی

ئیدی ئەوەی تر (ەل) کە لە هەموو وشەکاندا دووبارە بۆتەوە زێدەبارە بەسەرسەرەوای هۆنراوەکەوە. ئەگەر چی ئەمە سەرواکەی دەوڵەمەند کردوە بەڵام بارگرانییە بەسەر شاعیرەوە . هەر لەم جۆرەدا ، وادەبێ دەنگەکانی سەروا لەیەك برگەوە بگەن بە چوار برگە ، ئەم زۆرییەی دەنگەکانی سەروا زیاتر لەمەسنەوی دێ کە پشووی کورتە و بە زۆریش دەکەوێتە قالبی رەگەزدۆزییەوە ، بۆ نموونە مەولەوی لە دێرە شیعرێکدا دەڵێ :

یانەی دڵ وە فەیز ڕای مەولاناوا
تەوار تەڕلان لان مەولاناوا [١٨٦ : ٧٤][(٢٩)].

هەر دوو وشەی سەروا لە شێوەدا یەکن (مەولاناوا) ، واتە رەگەزدۆزین . ئەم دەستە دەنگە لە چوار برگە پێك هاتوە (مەو-لا-نا-وا) ، بەڵام دابەشبوونی فۆنۆلۆجییان جیایە ، یەکەم دوو وشەیە (مەولا ، ناوا) ، دوەم یەك وشەی لێکدراوە (مەولاناوا) . لە لەتی دوەمدا جگە لەوەی (تەوار) و (تەڕلان) بە هاونەبزوێنی سەرەتا بەیەکەوە بەسراون ، (تەڕلان) لەهەمان کاتدا بە (لان)ەوە بەسراوەتەوە چونکە وشەی دوەم وەکو دووبارە بوونەوەی بەشی دوەمی وشەی یەکەمە ، ئەمە جۆرێکی تری سەروایە. لەهەمان کاتدا هەموو وشەکانی لەتی دوەم بزوێنی (ا) یان تێدا دووبارە بۆتەوە کە بزوێنێکی بەهێزە ، واتە هاوبزوێنی assonance- ی یەکترن .

٣- بەپێی جۆری دەنگەکانی وشەی سەروا : بەپێی جۆری دەنگەکانی وشەی سەروا و چۆنیەتی ڕیزبوونیان شەش جۆرە سەروا هەن :

أ- نیمچە سەروا (half-rhyme) : بریتییە لە هاوبەشی وشەکانی سەروا لە دوا دەنگی نەبزوێنی دوا برگەی بەهێزی داخراوی وشە، بێ ئەوەی بزوێنەکەیان وەکو یەك وا بێ[٥٠٣ : ٣٠١] ئەمە جۆرێکە لە کۆنسۆنانس -consonance- کە برگەکانی سەروا پەراوێزی دواوەیان یەکەو چەقیان جیایە . ئەم جۆرە سەروایە بەزۆر ناوی تر ناسراوە وەکو (approximate- ، embryonic- ، imperfect- ، near- ، para- ، slant-). ئەمە لە شیعری ئایسلاندی و ئێرلەندی و وێلزی باوی هەبوە . هنری فۆگان یەکەم کەسە لە ئینگلیزی بەکاری هێناوە ، بەڵام بە فراوانی و بەرێکی نا ، تا سەردەمی هۆپکنز و ییتس لەو ساوە برەوی سەندو شاعیری وەکو وولفرید ئۆین و ت.س. ئیلیۆت و ئیمیلی دکنسن و ئۆدن بەکاریان هێناوە. نموونەی ئەم سەروایە وەکو pair- peer/step-up) [٥٠٣ : ٣٠١]. ئەم جۆرە سەروایە لە کوردیدا ، وەکو سەروای کۆتایی نەهاتوە ،

---

(29) لە دیوانەکەدا ،لەلەتی دوەمدا مەولاناوا لەناوکەوانە دایە و بەم جۆرە نووسراوە (مەولان ئاوا) ، بەڵام لەبەر ئەوەی بۆ سووکی (ئ) دەسوێ ، وەکو سەدەها وشەی تر ، دەمێنێتەوە (مەولاناوا) و ئەمەش لەگەڵ وشەکانی کۆتایی لەتی پێشەوە رەگەزدۆزی باشتر دروست دەکات بۆیە وام نووسیوە . مانای هەندێ لە وشەکان بەم جۆرەیە : یانە=خانە (ماڵ) ، را=رێگا ، مەولا=خودا ، ئاوا=سواغدەر ، تەوار=بازی مێبینە ، تەڕلان=چابووك و چالاك ، لان=هێلانە ، مەولاناوا=ناوی دێیەکە .

ئەگەر شتی وا لـە شـاعیرێ رووبدا بـە پێـی یاسـا تەقلیدییـەکانی سەرواناسـی بەکـەم و کورتـی دادەندرێ، بەڵام دەشێ وەکو سەروای نـاوەوە (کۆنسۆنانس) لـەناو دێرە شیعردا بێ جا چ وشەی سەروای کۆتایی بگرێتەوە یان نا. وەکو نالی دەڵێ:

دەمگوت دوچاوی خۆمە ئەگەر بەکرە جۆیی ئەشك
ئەبوایە لێل و بێ سەمەرو گەرم و سوێر و سوور[٢٠٩ : ١٤١].

نیمچە سەروای ناوەوە لە وشەکانی (سەمەر، سوێر، سوور)دایە کە لە برگەکانی (مەر، سوێر، سوور) سەروایان دروست کردووە و پەراوێزی کۆتاییـان یەکسانە و بزوێنییـان جیایە. لەفارسیدا نموونەی ئەم جۆرە سەروایە هەر بەسەروای ناوەوە هاتوە، وەکو مەولانا دەڵێ:

چون بنوشم قدح راح مروح زکفش
رخت زهد وورع از صومعه پس برچینم[٤٠١ : ١٠٤].

(قدح، راح، مروح) هەموویان تەنیا لەیەك دەنگی نەبزوێن هاوبەشن کە دوا پەراوێزی برگەی کۆتاییە و بزوێنی برگەکان جیایە.

ب- برگەی سەروایانە - pararhyme، بەو سەروایە دەگوترێ کـە برگـەی هـاوجـۆری وشـە سەرواکان (cvc) بێ و هەردوو پەراوێز یەك بن و چەق (بزوێن) جیا بێ. لە ئینگلیزیدا وەکو (groat - great)، (sound - send)[٤٦٦ : ٨٩]، لەکوردیدا وەکو نالی دەڵێ:

ئەو غاری یارە ئێستە پڕ ئەغیارە یانەخۆ
هەر غاری یارە، یا بوەتە غاری مار و موور[٢٠٩ : ١٤٤].

ئەم جۆرە سەروایە لە (مار، موور)دایە، کە تەنیا بزوێنییان جودایە.

ج- سەروای ئاوەژوو reverse rhyme، ئەوەیە کە ئەو برگانەی دەبن بە سەروا لـەباتی بزوێن و پەراوێزی دواوەیان، بزوێن و پەراوێزی پێشەوەیان وەکو یەك دەبێ. لە ئینگلیزیدا وشەکانی (send , sell) ئـەم سەروایەیان تێدایە. لـە کوردیـدا ئـەم جـۆرە سـەروایە لـە کۆتـایی نایـە، لەسـەرەتا و ناوەڕاست دەست دەکەوێ، وەکو وشەی (جار، جام) یان (کـەم - کـەف) بۆیـە ئـاوەژووی پێ دەگوترێ چونکە لەباتی ئەوەی بزوێنەکە پەراوێزی دواوە لەگەڵ خۆی بخاتـە پەیوەندی لێکچوون و سەرواداریەوە کە ئاراستەیەکی ئاساییە، پەراوێزی پێشەوە ڕادەکێشێ، ئەمە وەکو گەڕانەوەیەك دەکەوێتەوە بەرچاو چونکە بنچینەی برگە بزوێنەکەیە C V C. نالی دەڵێ:

رۆژ پڕە گوێمان لەبەر ئەنهار و جۆگە و هاژە هاژ
شەو نییە خەومان لەبەر قرژاڵ و بۆق وزاوە ژاو[٢٠٩ : ١٤٦].

(قرژاڵ و ژاوەژاو) ئەم جۆرە سەروایە دەیانگرێتەوە . برگەکانی کۆتاییان ئەمانەن (ژاڵ ، ژاو) کە لە هەردووکیاندا بزوێن و بەراوێزی یەکەم وەکو یەکە و بەراوێزی کۆتایی جیایە .

• د- سەروای پاژەیی (partial) : ئەم جۆرە سەروایە ، لەو وشانەدا دێتە دی کە برگەی کۆتاییان بێ هێزبێ و برگەی پێش کۆتاییان بەهێزبێ ، جا بۆ ئەوەی سەرواکە تەواو بێ دەبێ هەردوو برگەی دواوە حیسابیان بۆ بکرێ . لە زمانە ئەورووپیەکاندا (ئینگلیزی ، فەرەنسی ، ئەسپانی ..) لەم جۆرە سەروایە لە پاش بزوێنی برگە بەهێزەکەوە دەبێ هەموو فۆنیمەکان وەکو یەك بن و ئەوە سەروای تەواوە ، بەلام جاری وا هەیە بەتایبەتی لە زمانی ئەسپانیدا پاش بزوێنی برگە بەهێزەکە نەبزوێنێك لە هەردوو وشەدا جیا بێ ، ئەوەیە سەروای پاژەیی ، وەکو ئەم جووت وشە ئەسپانییانە (sienes - eres) لەم چوارینەیەدا :

Madre del alma mia
que viejecite eres
ya los ochenta anos
pesan sabre tus sienes

Salvador Rueda [٢٢ : ٤٨٦]

لەنێوان هەردوو بزوێنی کۆتایی نەبزوێنێك گۆڕاوە لەیەکەم (r) و لەدوەم (n)ە. یان لە وشەکانی (elemento - cuerpo) لەم دوو وشەیەدا ، لە نێوان دوو بزوێنی کۆتاییدا دوو نەبزوێن هەن و گۆڕاون، لەیەکەمیان (rp) و لە دوەمیان (nt). ئەمە لە کوردی و عەرەبیدا لەو کاتەدا دەردەکەوێ کە (ا)ی تەئسیس هەبێ ، ئیدی دەنگی دوای ئەو (دەخیل) پەیرەوکردنی واجیب نییە.

هـ- سەروای کراوە : ئەوەیە کۆتایی بە برگەی کراوە هاتبێ . ئەمە دوو جۆرە :

- وا دەبێ بزوێنی کۆتایی کورت بێ ئەو حەڵە دەبێ جگە لەبرگەی کۆتایی برگەی پێش کۆتاییش دەوری هاوبەشیی لە ڕۆنانی سەروادا ببینێ ، وەکو نالی دەڵێ:

سەراپای گوارە زەردێ ترس و لەرزە .
دەڵێی عاسێ بوە لەو جێگە بەرزە [٢٠٩ : ٩٦] .

دوا برگەی وشەکانی سەروا کورت و کراوەن (زە) ، بۆیە دوو برگە دەوری سەروایان دیوە (لەر- زە ، بەر-زە) .

- وا دەبێ بزوێنی کۆتایی درێژ بێ و ئەمە بەتەنیا سەرواکە دادەڕێژێ ، حەمدی دەڵێ :

کێ هیلالی دیوە شەق بێ ، ماهی نەخشەب بێ بەگۆ
تیفلی چاوی یار ئەکا یاری بە سەر کوڵم و برۆ [٦ : ٣٢٥] .

و- سەروای داخراو : ئەوەیە برگەی کۆتایی بەنەبزوێن دوایی هاتبێ ، واتە دوا بەراوێزی

ئەفرتانی . خانی دەڵێ :

خوەش ڕەنگی ئەدا گیایێ سۆر گول
خوەش دەنگی ئەدا نەوایێ بولبول [٢ : ٨] .

٤- بەپێی دەنگەکانی پێش ڕەوی : ئەو دەنگانەی جگە لە ڕەوی حیسابی سەروایان بۆ دەکرێ، ئەگەر ڕەوی نەبزوێن بێ وادەبێ بزوێنی پێشەوە درێژ بێ یان کورت، وا دەبێ نەبزوێنێکی لە پێش بێ و پێش ئەویان بزوێن هەبێ ، هەروەکو وا دەبێ سەروا دوو بڕگە بێ و بڕگەی پێشەوە بزوێنەکەی (ا) بێ . بەم بۆچوونە سەروا دەکرێتەچوار بەش :

ا- سەروای موردەف : ئەگەر پێش ڕەوی نەبزوێن ، بزوێنێکی درێژ (ا ، ی ، وو ، ۆ) هەبوو ، وەکو خانی دەڵێ :

ئیرۆ مەبهیست کو خەل دگەل میر
تێکدا ب تەبایی چوونە نێچیر [٣ : ١٣٥] .

ب- سەروای موسمەت (مصمت) : ئەوەیە کە ڕەوی نەبزوێن بێ و پێش ئەویش ڕاستەوخۆ نەبزوێن هاتبێ [٢٧٣ : ٤٢] ، وەکو وشەی (دەشت ، بەرد ، خەست) خانی دەڵێ :

بێژیتە ، سەما و سازو گۆڤەند
شیرین وشەکەر لەب وشەکەر خەند [٣ : ٨٥] .

جگە لە نەبزوێنی کۆتایی (د) ، یەکسەر نەبزوێنی پێش ئەویش وەکو یەك هاتوە (ن) .

ج- سەروای مونەسسەس : ئەوەیە سەروا لەسەر دوو بڕگە دامەزرابێ ، بڕگەی پێش کۆتایی بزوێنەکەی (ا) بێ (الف التأسیس). دەبێ تا کۆتایی پەیڕەو بکرێ و نابێ بە بزوێنی درێژی تر بگۆڕێ ، وەکو ، خانی دەڵێ:

شەققول قەمەراتە یەك ئیشارەت
زاغول بەسەراتە یەك عیبارەت [٣ : ١٧] .

وشەکانی سەروا (ئیشارەت ، عیبارەت) ، دوو بڕگەیان بەر سەروا دەکەوێ (شا-ڕەت ، با-ڕەت) ، لەهەردووکیاندا بزوێنی بڕگەی پێشەوە (ا)یە . دەنگی نەبزوێنی نێوان ئەلف و ڕەوی کە لێرەدا (ر)یە ، دەشێ گۆڕانی بەسەر دابێ ، بەمەوە لەسەروای پاژەیی ئەسپانی نزیك دەبێتەوە .

د- سەروای ڕووت (مجرد) : ئەوەیە نە ریدفی هەبێ و نەتەئسیس ، وەکو مەولەوی دەڵێ:

ئای بێ وەفا وێم من ڕاحەت وەش ڕەنگ
تۆ دڵتەنگ، بێ ڕەنگ، نەسای سەردسەنگ [١٨٦ : ٣٤٤] .

(ڕەنگ، سەنگ) سەرواى ڕووت ( مجرد )يان پێك هێناوە .

٥- بەپێی کێشی زەرب : زەربی دێرە شیعر بینای کێش و سەروای لەسەر دادەمەزرێ لە شیعری کلاسیکی یەکێتی سەروادا . بە پێی کێشی زەرب کە دەبێ بە هۆی گۆڕانی ئاوازی دەنگەکانی کۆتایی، سەروا دەکرێتە چەند جۆرێك :

أ- سەرواى موتەرادیف : ئەوەیە کە لە کۆتاییدا دوو تیپی وەستاو (ساکن) بەدواى یەکەوە بێن بەبێ ئەوەی هیچ تیپی بزوێنییان لە نێواندا بێ ، واتە ئەو دوو وەستاوەی خەلیل سنووری سەرواى پێ دیار کردوون [٣٠٢ : ٧٦] لە کۆتاییدا دەکەونە تەك یەك . ئەم جۆرە سەروایە لەم کێش و پێیانە (تەفعیلە)دا دەردەکەوێ:

- هەزەجی هەشتی موسەببەغ ، مفاعيلان .
- هەزەجی هەشتی مەقسوور ، مفاعيل .
- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور ، مفاعيل .
- هەزەجی شەشی مەقسوور ، مفاعيل .
- هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەقسوور ، مفاعيل .
- ڕەمەلی هەشتی مەقسوور ، فاعلان .
- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەقسوور ، فعلان .
- ڕەمەلی شەشی موسەببەغ ، فاعلاتان .
- ڕەمەلی شەشی مەقسوور ، فاعلان .
- ڕەمەلی شەشی مەخبوونی مەقسوور ، فعلان .
- ڕەجەزی هەشتی موزال ، مستفعلان .
- موزاریعی هەشتی ئەخرەبی موسەببەغ ، فاعلاتان .
- موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور ، فاعلان .
- موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەقسوور ، فعلان .
- موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم موسەببەغ ، فع لان .
- بەسیتی هەشتی مەتوی موزال ، فاعلان .
- موتەقاریبی هەشتی موسەببەغ ، فعولان .
- موتەقاریبی هەشتی مەقسوور ، فعول .
- خەفیفی شەشی مەخبوونی مەقسوور ، فعلان .
- خەفیفی شەشی مەخبوونی ئەسلەم موسەببەغ ، فع لان .

ئەو تەفعیلانەی دەکەونە زەرب، کە تەفعیلەی سەروایە، لە کێشەکانی سەرەوە ئەمانەن :

(مفاعيلان ، مفاعيل ، فاعلان ، فعلان ، فاعلاتان ، مستفعلان ، فع لان ، فعولان ، فعول ) . ئەمەیش نموونەی هەندێ لەم جۆرە سەروایە :

هێمن دەڵێ :

تریقە و پێکەنین و چەپڵە ڕێزان
هەموو بەشداری بەزمن خاوو و خێزان [٢١٨ : ٢١٣] .

عەرووز و زەربی ئەم دێرە (مەقسوور - مفاعیل ، فعولان ) هاتوە.

ئەمەیش بۆ جۆرە زەربێکی تر (ئەسلەم موسەببەغ - فع لان ) ، هێمن دەڵێ :

هەر لە بۆتانەوە هەتا سۆران
هەموو سۆرانی شینە بۆ گۆران [٢١٨ : ١٥٢] .

بۆ زەربی (موزال - مستفعلان ) ئەم دێرەی جزیری :

دیسا ژنوبێ حالە دڵ ، ساقی ، وەرین جاما زوجاج
موشتاقی خەمری ئالە دڵ لێ خۆشی ئانی بت میزاج [٥٨ : ١٧٣] .

ب- سەروای موتەواتیر : ئەوەیە لە کۆتاییدا ساکنێك هەبێ و حەرەکەیەکی لە پێش هاتبێ (متحرك+ساكن) ، ئەمە لە کێشدا بەرامبەر بەسەبەبی سووك دەوەستێ ، ئەم جۆرە سەروایە لەم تەفعیلانەدا دێ و لەم کێشانەدا دەردەکەوێ :

- هەزەجی هەشتی تەواو ، مفاعیلن .
- هەزەجی هەشتی مەحزووف ، فعولن .
- هەزەجی هەشتی ئەخرەب ، مفاعیلن .
- هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف ، فعولن .
- هەزەجی شەشی مەحزووف ، فعولن .
- هەزەجی شەشی ئەخرەبی مەقبووزی مەحزووف ، فعولن .
- هەزەجی چواری تەواو ، مفاعیلن .
- ڕەمەلی هەشتی تەواو ، فاعلاتن .
- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم ، فع لن .
- ڕەمەلی شەشی مەخبوونی ئەسلەم ، فع لن .
- ڕەمەلی چواری تەواو ، فاعلاتن .
- موزاریعی هەشتی ئەخرەب ، فاع لاتن .
- موزاریعی چواری تەواو ، فاع لاتن .

- موزاریعی چواری ئەخرەب ، فاع لاتن .

- موجتەسی هەشتی مەخبوون ، فعلا تن .

- موجتەسی هەشتی مەخبوونی ئەسلەم ، فع لن .

- موجتەسی چواری تەواو ، فاعلاتن .

- موتەقاریبی هەشتی سالم ، فعولن .

لەم کێش و قاڵبانەدا ، ئەو زەربانەی سەروای موتەواتیریان تێدایە ئەم تەفعیلانەن (مفاعیلن ، فعولن ، فاعلاتن ، فع لن) . ئەمانە هەندێ نموونەی ئەم جۆرە سەروایەن. موتەواتیر لە (مفاعیلن)دا وەکو کوردی دەڵێ :

روخی وەك گوڵ ، تەنی وەك سیم ، لەبی وەك لەعلی روممانی

دەهان وەك فندق وغەبغەب وەکو نارنجی ئیمانی [١٧٢ : ٨٧] .

موتەواتیر لە (فعولن)دا ، وەکو هێمن دەڵێ :

ئەوێستاش بێ کەس و دوورەوەتەن هەن

ئەوێستاش شاعیری پیر و ڕەبەن هەن [٢١٨ : ٢١٦] .

ئەو سەروایەی ڕەوییەکەی بزوێنی درێژە ، هەر بەرئەم جۆرە موتەواتیرە دەکەوێ چونکە بزوێنی درێژ وەستاو (ساکن)ە و پێشەوەی بزوێنێکی هاو ڕەگەزی خۆیەتی ، وەکو نالی دەڵێ :

دەروونم پڕ کەباب و دەردە بێ تۆ

دڵم گەرم و هەناسەم سەردە بێ تۆ [٢٠٩ : ٩٠] .

ج- سەروای موتەدارێك : ئەوەیە کۆتایی زەرب دوو حەرەکە و یەك وەستاو بێ (متحرك+متحرك+ساکن) ، واتە وەکو وەتەدی کۆ (الوتد المجموع) بێ . ئەم جۆرە سەروایە لەم کێش و پێیانەدا دەردەکەوێ :

- ڕەجەزی هەشتی تەواو ، مستفعلن .

- ڕەجەزی هەشتی مەخبوون ، مفاعلن .

- ڕەجەزی هەشتی مەتوی مەخبوون ، مفاعلن .

- ڕەجەزی شەشی تەواو ، مستفعلن .

- ڕەجەزی چواری تەواو ، مستفعلن .

- موزاریعی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف ، فاع لن .

- بەسیتی هەشتی تەواو ، فاعلن .

- بەسیتی هەشتی مەتوی ، فاعلن .

- ڕەمەلی هەشتی مەحزووف ، فاعلن .

- ڕەمەلی شەشی مەحزووف ، فاعلن .
- سەریعی مەتوی مەکشووف ، فاعلن .
- موتەقاریبی هەشتی مەحزووف ، فعل .

زەربی ئەم کێش و قالبانە کە سەروایان تێدایە ، ئەم تەفعیلانەن : (مستفعلن ، مفاعلن ، فاعلن، فعل) . ئەمەیش هەندێ نموونەی ئەم جۆرە سەروایە :

سەروای موتەداریک لە (مستفعلن)دا ، جزیری دەڵێ :

خەلقۆ لن کەن شیرەتێ ئەو دلبەرا زەرڕین کەمەر
من دی دحالی غەفلەتێ ، هات دەر ژ بورجێ وەك قەمەر[٥٨ : ٢٣١] .

دوا پێی ئەم دێرە لەسەر کێشی (مستفعلن) هاتوە و روکنی کۆتایی وەتەدی کۆیە کە لە دوو (متحرك) و یەك (ساکن) پێك هاتوە. سەروای موتەداریك لەگەڵ (فاعلن)دا ، خادیم دەڵێ :

ناڵەیی دڵ زۆر بە مەحزوونی لەسینەم دێتە دەر
قەت نەبووم ڕاحەت لەشەو ساتێ هەتا وەقتی سەحەر[٧٥ : ١٣٠] .

زەربی ئەم دێرە کە لەسەر کێشی (ڕەمەلی هەشتی مەحزووفە) ، لەسەر کێشی (فاعلن) هاتوە (دێتە دەر - ... تی سەحەر) .

سەروای موتەداریك لەگەڵ زەربی (فعل)دا ، خادیم دەڵێ :

لە گێڕانی ساقی قەدەح پڕ لەمەی
لە دەورانی موتریب بە ئاوازی نەی[٧٦ : ١٨٩] .

دوا تەفعیلەی لەتەکان (لەمەی ، زی نەی) لەسەر کێشی (فعل) هاتوە.

د- سەروای موتەراکیب : ئەوەیە کۆتایی زەرب سێ حەرەکە و یەك وەستاو بێ (متحرك+ متحرك+ متحرك+ ساکن) ، واتە کۆتاییەکەی فاسیلەی بچووك یان (سەبەبی گران+سەبەبی سووك) بێ . ئەم جۆرە سەروایە لەم کێش و تەفعیلانەدا دەردەکەوێ :

- ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووف ، فعلن .
- ڕەمەلی شەشی مەخبوونی مەحزووف ، فعلن .
- خەفیفی شەشی مەخبوونی مەحزووف ، فعلن .
- موجتەسی هەشتی مەخبوونی مەحزووف ، فعلن .
- ڕەجەزی شەشی مەتوی ، مفتعلن .

ئەم جۆرە سەروایە ، وەك دیارە لە زەربێکی وا دێ کە لەسەر کێشی (فعلن) یان (مفتعلن) بێ . نموونە بۆ زەربی فعلن ، خادیم دەڵێ :

شاهی گوڵ خیوەتی هەڵدا لە بەهارا ،لەچەمەن
کەوتە سەجدە بەقەدەمیا چەمەن و سەروو سەمەن [٧٥ : ١٨٩] .

ئەم دێرە کە لەسەر کێشی ڕەمەلی هەشتی مەخبوونی مەحزووفە ، عەرووز و زەربی لەسەر کێشی (فعلن) هاتوە (لەچەمەن - ووسەمەن) .

نموونە بۆ (مفتعلن) وەکو مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس دەڵێ :

قوربانی تۆم ئەی سەروەری زیندو دڵم
گیانم فیدات ، ئەی دڵبەری خونچە گوڵم [١٣١ : ٩٤] .

زەربی ئەم دێرە لەسەر کێشی (مفتعلن) هاتوە (خونچە گوڵم) و سەروای موتەراکیب لە (چەگوڵم) دایە .

هـ- سەروای موتەکاویس : ئەوەیە کە کۆتایی زەربی چوار حەرەکە و یەک ساکن بێ (متحرك+ متحرك+ متحرك+ متحرك+ ساكن) ، واتە لە نێوان دوو ساکینی کۆتایی ، (چوار حەرەکەی تیا بێ و ئەمەش بریتییە لە فعلتن و بەس) [٢٤٥ : ١٩]. ئەمە لە خەبلی مستفعلن هاتوە (خەبل = خەبن+تەی) [٣٠٧ : ٤٨] . ئەم جۆرە سەروایە تایبەتە بەعەرەب ،لە کوردیدا نموونەیمان نەدیوە بەتایبەتی لە شیعری عەرووزی . چونکە ئەم جۆرە سەروایانەی باس کران لەگەڵ عەرووز و تەفعیلەکان هاتوون و بەهۆی تەفعیلەکانی زەربەوە لەیەک جیا کراونەتەوە .

ئەم هێلکارییەی خوارەوە، دابەشبوونی سەروا بە پێی تەفعیلەکانی زەرب، باشتر روون دەکاتەوە

دابەشبوونی سەروا بەپێی کێشی زەرب



**هەندێ سەرنج :**

- موتەکاویس کە لە عەرەبیدا هەیە (بەڵام کەمە) ، لەکوردیدا ، نییە .

- ئەو دوو ساکینەی خەلیل بۆ هەردوو سەروای داناوە ، تا لەیەك نزیك ببنەوە ژمارەی پێیەکانی سەرواکە و بەکارهێنانی زیاتر دەبێ و تا لەیەك دوور بکەونەوە و حەرەکەیان لە نێواندا زۆربێ ، ژمارەی پێیەکانی سەرواکە و بەکارهێنانی کەمتر دەبێ ، تەنیا (موتەواتیر و موتەدارێك) نەبێ کە ژمارەی پێیەکانیان وەکو یەکە بەڵام ژمارەی حەرەکەی نێوان دوو ساکینەکانییان جودایە ، لە ڕووی زۆر بەکارهاتنەوە لە مەدای کێش و هۆنراوەدا ، دیسان هەر موتەواتیر ، کە حەرەکەی کەمترە ، لە موتەراکیب زیاتر بەکاردێ . موتەواتیر لە (مفاعیلن ، فاعلاتن)دایە کە بنچینەی کێشی هەزەج و ڕەجەز و موزاریعن و ئەم سێ کێشەیەش ڕادەی هەرە زۆری شیعری کلاسیکی کوردییان پێ نووسراوە .

- موتەرادیف ئەگەرچی ژمارەی پێیەکانی لە موتەواتیر زیاترە ، بەڵام ئەگەر بە گوێرەی کێش و ژمارەی هۆنراوەی کلاسیکی بێ ناگاتە ئەو .

- لەسەر ئاستی کێشی تەنیا زەرب ، ڕیزی سەرواکان لە زۆرەوە بۆ کەم بەم جۆرەیە :

١- موتەرادیف . ٢- موتەواتیر و موتەدارێك . ٣- موتەراکیب .

- لەسەر ئاستی جۆری کێش و بەکار هاتنەوە بێ بەم جۆرەی لێ دێ :

١- موتەواتیر. ٢- موتەرادیف . ٣- موتەدارێك . ٤- موتەراکیب .

٦- بەپێی <u>چالاکی ڕەوی</u> : دەنگەکانی زمان لە بوون بە ڕەوی شیعردا ، چالاکییان وەکو یەك نییە ، هەیانە زۆر چالاکە و زۆر دووبارە دەبێتەوە ، هەشیانە کەمتر دەوری ڕەوی دەبینێ . لەهەندێ زماندا بەگشتی دەنگی نەبزوێن زیاتر دەبێ بە ڕەوی وەکو عەرەبی کە بزوێنەکان دەوری وایان لە بوون بە ڕەویدا نییە ، لە نەبزوێنەکانیش هەر لەکۆنەوە هەوڵ دراوە جیاوازی دەنگەکان (تیپەکان) لە ڕووی زۆر بەکارهاتنەوە دەربخرێ . مەعەڕی لە پێشەکی (لزومیات)ەکەی دوای جەردێکی دەنگەکانی ڕەوی ، دەیانکا بەسێ جۆر : (سەروا دەکرێ بەسێ جۆر : الذلل و النفر و الحوش ، زولول ئەوەیە کە زۆر بەسەر زمانەوە بێ ، لەکۆن و نوێ هەروا هاتوون . نوفور ، ئەوەیە لەوانی پێشوو کەمتر بەکاردێن وەکو جیم و ژای و ئەمانە ، حوش : ئەوانەن کە بە دەگمەن بەکار دێن)[: ٣٠] . لە تۆژەرەوە نوێکانیش ئیبراهیم ئەنیس هەوڵی داوە جەردێکی تر بکا و چالاکی دەنگەکان لە بوونە ڕەویدا دەربخا ، ئەو لەم ڕووەوە چوار جۆرە ڕەوی دەست نیشان دەکا : ١- ئەو دەنگانەی زۆر

دەبن بە ڕەوی ، ٢- ئەو دەنگانەی بە ڕادەی مام ناوەنجی بەکاردێن، ٣- ئەو دەنگانەی کەم بەکاردێن ، ٤- ئەو دەنگانەی بەدەگمەن بەکاردێن [٢٤٣ : ٢٤٨] . لە کوردیشدا دەتوانین لە ڕووی ڕادەی بەکارهاتنەوە ڕەوی بکەین بە شەش بەش :

- ئەوانەی زۆر دووبارە دەبنەوە .
- ئەوانەی بە ڕادەی ئاسایی بەکاردێن .
- ئەوانەی کەم بەکاردێن .
- ئەوانەی زۆر کەم بەکار دێن.
- ئەوانەی بەدەگمەن بەکاردێن .
- ئەوانەی هەر بەکار نەهاتوە.

ئەم جۆرە دابەش کردنەی ڕەوی لە بەشی دوەمدا ڕوونتر دەکرێتەوە .

دووەم : دابەشبوونی سەروا لە ڕوانگەی ستوونییەوە :

یەك : لایەنی وشەیی لە ئاراستەی ستوونی سەروادا : ئەگەر بە ستوونی وشەکانی سەروا بەراورد بکەین ، دەکرێن بەچەند جۆرێکی جیا جیا :

١- سەروای ڕەگەزدۆزی ، کە وشەکانی سەروا هاوشکل بن ، بەلام ئەم جۆرەیە تەنیا لە دوو دێر یان دوولەت دەبێ . کەم وا دەبێ لەمە زیاتر وشەی ڕەگەزدۆزیی تەواو بە دوای یەکدا بێن . حەمدی دەڵێ :

دەخیلت بم لە شاخ و بەردو تەق تەق
ملم ئەشکێ ئیشارەم کە بە تەق تەق [٦ : ٢٦٦] .

وشەکانی سەروا ، لە هەردوولەتدا بە ڕواڵەت هەمان شتە (تەق تەق) ، بەلام مانایان جیایە . یەکەم بە مانای بەردی زل هاتوە و دوەم بە مانای دەنگی لێدانی شتی ڕەق هاتوە جا دەرگا بێ یان بەرد بێ ...

٢- سەروای هەڵگەڕاوە : ئەوەیە کە دەنگەکانی وشەی سەروا پاش و پێش کرابن ، ڕیزیان هەڵگەڕابێتەوە ، لە هەندێ زماندا ڕەوی بەدەم هەڵگەڕانەوە دەگۆڕێ وەکو لە ئینگلیزیدا فرێزەر ئەم وشانەی داوە : dab-bad/crab-bark/mate-tame [٤٦٣ : ٦٣] . کەچی لە کوردیدا ، وشەکە تووشی هەڵگەڕانەوەی دەنگەکان دەبێ بەلام سەروای خۆشی هەر دەپارێزێ ، حەمدی دەڵێ :

دەست لە دەریادا دەبا بۆ پووشێ ئینسانی غەریق
ناعیلاجی مەرد ئەکا ئەلبەت بەنامەردان ڕەفیق
گەر ڕەفیقت دڵ بشێوێنێ بەبێ عەقڵی برا
ئەو ڕەفیقە زوو موقابیل تۆ دەوەستێ وەك فەریق [٦ : ٢٦٧] .

( ڕەفیق و فەریق ) کە وشەی سەروان ، دەنگەکانیان لەسەرەتاوە هەڵگەڕاوەتەوە بەڵام لە کۆتایی سەروایان پاراستووە (..یق) . ئەم نموونەیە لای نالی لە وشەی ( فتاح-تفاح )دا،لە شیعرێکدا بۆتە سەروا [٢٠٩ : ٦١] ،لە شوێنێکی تریشدا نالی بۆ ئەم جۆرە سەروایە وشەی ( گردون ) و ( گدرون )ی بەکارهێناوە [٢٠٩ : ١٠٣] .

٣- سەروای هاو ئاواز : ئەوەیە وشەکانی سەروا ئاوازەیان یەك بێ ، بەڵام ڕەگەزدۆزی نەبن. بۆ ئەوەی ئاوازەی وشەکان یەك بێ دەبێ دەنگەکانیان بەقەد یەك بێ و بزوێنەکان بەهاوشوێنی وەکو یەك لە هەموو وشەکاندا نابەش بووبن و جیاوازی لە نەبزوێنەکاندا هەبێ ، حەمدی دەڵێ :

نابەجایی کەس نەدی حەتتا لە حەیوانی ئەسیل
هەر بەنا ئەسلی بزانن زاڵمی ئەحمەق دەخیل [٦ : ٢٧٥] .

وشەکانی سەروای ئەم هۆنراوەیە هەر هەمووی لەسەر یەك ئاوازە دەڕوا ( ئەسیل ، دەخیل ، بەخیل ، بەسیل ، جەمیل ، مەچیل ، زەلیل ، دەلیل ، بەدیل ، بەقیل ) .

٤- سەروای ئاسایی : ئەو جۆرە سەروایەیە کە وشەکانی هیچ پەیوەندییەکی دەنگو ئاواز یەکیان ناخات جگە لە دەنگەکانی کۆتایی . حاجی دەڵێ :

قوربان بە هەموو وولاتەوەدا
تا موڵك و ڕەعییە پاکی فەوتا [٦٠ : ٢٠٠] .

( دا ، فەوتا ) کە وشەی سەروان ، هەرچەندە هەردووکیان فەرمانی ڕابردووی سادەن بەڵام لە ڕووی دەنگو ئاوازەوە تەنیا ڕەوی (ا )یان وەکو یەك وایە .

دوو : سیستەمی دووبارە بوونەوەی سەروا : سەروا بەیەك لەت یان دێڕ ( ئەگەر مەسنەوی نەبێ ) دروست نابێ ، دەبێ لەلەتی تر ( مەسنەوی و موسەممەت ) یان لە دێری تر دووبارەبێتەوە ئەوسا سەروا دێتە کایەوە ، دووبارەبوونەوەی سەروا بە زۆر جۆر دەبێ گرنگترینیان ئەمانەن :

١- سەروای مەسنەوی یان موزدەوەج ( couplet ) : لەم جۆرە سەروایەدا دوو لەت هاو سەروا دەبن ( لەزمانە ئەورووپییەکان دێر هەریەك لەتە بۆیە لای ئەوان دەگوترێ دوو دێری هاو سەروا ) . مەرج نییە سەروای ئەم دوولەتە لەگەڵ لەتەکانی تر یەك بگرنەوە ، ئەگەر بە ڕێکەوت یان بەنەفەس لەگەڵ چەند دێرێکی جیا جیا لە سەراپای هۆنراوەدا یان لە چەند دێرێکی دوای یەکتر یەکیش بگرنەوە ئەنگی نییە . بۆ نموونە سەیدی هەورامی دەڵێ :

تاقەت چێم بڕیان ، نەمەندەن تابم
هوون مەشۆنە جەرگ ، کزەی کەبابم [١١١ : ٥٠] .

شیعری کوردی زاری گۆران ( لەمەلا پەرێشانەوە تا ئێستا ) ، چەند هۆنراوەیەکی سەیدی و کاکۆ

شەهابی زەکەریایی و چەند دێرێکی مەولەوی لێ دەرچێ ئەوەی تر هەمووی سەروای مەسنەوییە ، هەموو چیرۆکە شیعری و بابەتە ئاینییەکانیش هەر مەسنەوین .

٢- یەکێتی سەروا : ئەو پارچە (stroph) و قەسیدە و غەزەلانە دەگرێتەوە کە هەموو لەتەکانیان یان هەموو دێرەکانیان لەسەر یەك سەروا بێ .

یەکێتی سەروا : ئەم جۆرە سەروایە لە شیعری لاتینی و ئیتالی و عەرەبی و ویلزی و سلاڤیدا هەیە . لە سلاڤیدا زۆر باوە بەتایبەتی لە شیعری زار گۆتندا . لە شیعری ئینگلیزیدا یەکێتی سەروا باو نییە چونکە زمانی ئینگلیزی لەو زمانانە نییە سەروای بەئاسانی تێدا بێتە دەست ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شەکسپیر نموونەیەکی باشی لێ هێناوە ، شیعرێکی داناوە نۆ دێری هاو سەروایە [٥٠٢ : ٤٠١].

٣- سەروای موتەناویب (alternative) : ئەوەیە کە لەت نالەت سەروایان وەکو یەك بێ ، بەزۆری لە چوارین و هەندێ جار لە شەشینەدا پەیڕەو دەکرێ. سیستەمەکەی بەم جۆرەیە : (ABAB).

لەم جۆرە سەروایە ، وەکو گۆران دەڵێ :

بەڕەنگی زەردو شێوەی دەست و شمشاڵی کزا دەروێش ------ A
حەزم کرد بەستەیەك ببیەم سەرا سەر حوزن و ماتەم بێ ----- B
لە سیماتا بەدیم کرد هەیکەلی عومرێکی حەسرەتکێش ------ A
وەها دیارە کە بەختت ئاشیانی بولبولی خەم بێ ------- B [١٧٢ : ١١٩].

٤- سەروای موتەعانیق (embraced) : لەم جۆرەدا هەر پارچەیەك ، کورت یان درێژ ، سەروای لەتی یەکەم و لەتی کۆتایی وەکو یەك دەبێ و سەروای لەتەکانی تری نێوانیان لەوان جیا دەبێ . بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە وەکو ئەوە وایە دوو سەروای یەکەم و کۆتایی ، سەرواکانی تریان لە باوەش گرتبێ .

وەکو گۆران دەڵێ :

لەبەر بەیانی شەباب و جوانیدا ، ئەی گوڵ A
گوڵی گەشی پەمەیی وەك ستارە پرشنگدار B
لەخەندەتا ئەگەڕا جیلوەیی تلووعی بەهار B
لەنەغمەتا مەلی خوێندن ئەهاتە سۆزو کوڵ A [١٧٢ : ٩٥].

ئەمە لە سێینە (ABA) و چوارینە (ABAB)دا دەبێ و زیاتریش وەکو شیعرەکەی دلزار ، کە دابەشی چەند پارچەیەکی کردوە ، هەر پارچەیەکی (٩) لەتەو لەتی یەکەم و کۆتایی هاوسەروان [٨٧ : ٥٥] . ئەمە لە پێنج خشتەکیدا باش دەردەکەوێ کە لەسەرەتا تا کۆتایی پارچەکانی

دەکەونەوە ناو ئەڵقەی سەرەوای پارچەی سەرەتا و سەرەوای لەتی کۆتایی هەر پارچەیەك:

AAAAA , BBBBA , CCCCA , DDDDA

٥- سەرەوای لەناو یەك (المتداخلە) : سەرەواکانی هەر پارچەیەك بەجۆرێ دابەش دەبن کە جووت جووت دەکەونە ناو یەکتر، جووتەکەی ناوەڕاست وەکو مەسنەوی دەبن ، لەگەڵ دوەکەی تر وەکو (موتەعانیق) دەردەکەون و کە لەوە زیاتر بوو دەبێ بە سەرەوای لەناویەك . محەمەد عەونی لەباسی ئەم جۆرە سەروایەدا دەڵێ : (شاعیر سەرەوای دوا دێر لەئەبجەدیدا وەکو سەرەوای دێری یەکەم دێنێ ، سەرەوای پێش دێری کۆتایی وەکو سەرەوای دێری دوەم ... هتد) [٣٥٠ : ٥٥] . ئەم جۆرە سەروایە لە سریانی و عیبریدا هەیە و لای تروبادۆرەکانیش نموونەی هەیە [٣١٦ : ٧٢] . لە کوردیدا گۆران چەند نموونەیەکی کورتی لەم جۆرە سەروایە هێناوە، قالبی ئەم جۆرە سەروایە بەم شێوەیەیە :

A B C D D C B A

گۆران دەڵێ :

| | |
|---|---|
| لەم حاڵەتەدا ڕۆحم وەکو چاوی گلاوی | A |
| ئانێکی بەقەد ساڵێ پڕی زەهری ئەلەم بوو | B |
| ئاگا : هەمیسان نیشتەوە لافاوی تەبیعەت | C |
| ئاهیستە نەما زەلزەلەوو نەعرەیی حیدەت | C |
| کەوتە تەنکی هەوری ڕەش و چلکنی پێشوو | B |
| ئەلوانی قەزەح تێکەڵی بووکون بوە ناوی | A [١٧٢ : ١٧٣] . |

٦-سەرەوای دانتییانە : ئەم قالبە سەروایە (سێینە) لەسەر دەستی دانتی ئیتالی ، لەشاکاری کۆمێدیای یەزدانیدا چەسپا . کۆمێدیا سێ بەرگ و (١٠٠) سرووده ، هەر سروودێك دابەش پارچەی سێ لەت سێ لەت بوە و کۆتایی بەیەك لەتی تەنیا هاتوە . سێینەکانی بەم جۆرە هاتوون و تێك هەڵکشاون :

A B A B C B C D C D E D

هەموو پارچەکان سێینەن بەڵام وەکو ئەڵقەی زنجیرە تێك هەڵکشاون . سێینەکان موتەعانیقن . بەڵام سەرەوای لەتی ناوەڕاست دەبێ بە سەرەتای سێینەی دواوە. واتە هەر سەروایەك ، لەنگەری ناوەوە بۆ سێینەی پێشەوە ڕادەگرێ و دەبێ بە ڕەوی سەرەکی سێینەی دوەم. هەر ڕەویەك سێ جار دێت ، جارێك لە ناوەڕاست و دووجار لە سەرەتاو کۆتایی بەڵام لە دوو سێینەی دوای یەك. لە کۆتایی هەر سرووودێك ئەولەتە تاکەی بەتەنیا دێ ، بۆ ئەوەیە ڕەوی ناوەڕاستی دوا سێینە بەتەنیا نەمێنێ ، لەنگەری بۆ ڕادەگرێ :

بۆ نموونە ، ئەمە دوو سێینەی سەرەتای سروودی چوارەمی (بەهەشتە) بە دەقە ئیتالیەکە خۆی

intra due cibi distanti e moventi ----------- A
d'un modo , prima , si morria di fame -----B
che libre ' unomo l'un recasse de denti ----A
Si si starebbe un agno intra due dame ------B
di fieri lupi , ignalmente temendo -----------C
Si si starebbe un cane intra due dame -------B [ ٦٠ : ٤٨٩ ]

لەهەموو سێینەکاندا ، لەنێوان دوو سێینەدا هەر سەروایەك سێ جار دووبارە دەبێتەوە ، تەنیا لە سێینەی یەکەم نەبێ ، یەکەم سەروا دووجار دووبارە دەبێتەوە، دوا سێینەش سەروای ناوەڕاست یەك جار دێ و بۆ ئەوەی بەتەنیا نەمێنێتەوە و لانی کەم بیێ بە دوو سەروا ، لە کۆتایی هەر سروودێك تاکە دێڕێکی هێناوە لەگەڵ لەتی دووەمی دوا سێینەدا هاوسەروایە . لە کوردیدا ئەم جۆرە ئەڵقەبەندە بەم شێوەیە بەرچاو ناکەوێ ، بەلام وا دەبێ سێینەکان ، دوو دوو، بەشێوەیەکی تر تێك هەڵبکشێن ، وەکو ئەم نموونەیەی گۆران :

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقا خرۆشی ڕۆحی بێگانە ---- A
میزاجی کوردەواریم تێك چوە ، دەروێش عەبدوللا ---- B
دەخیلت بم دەسا بەو لاوکی ئای ئای و حەیرانە ------ A
شەپۆلی زەوقی میللی پڕ دەروونی مات و چۆلم کە ---- C
لە بتهۆڤن گەلێ زیاتر بە ڕۆحم ئاشنای ، وەللا ------- B
دە ، ئەی دەروێش ، سکاڵەیەك لەگەڵ ڕۆحی کلۆلم کە -- C [ ١٧٣ : ١٢٠ ].

دوو سێینەکە بەلەتی ناوەڕاست سەروایان بەیەکەوە بەستراوەتەوە کە لە هەردووکیاندا ( ـللا)یە .

٧- سەروای ئازاد : لەم جۆرە سەروایەدا ، شاعیر خۆی بەهیچ جۆرە قاڵبێکی تایبەتی و پێشتر بڕیار لەسەر دراودا نابەستێتەوە . کەی بیەوێ و چۆن و لەکوێ شیعرەکە بخوازێ بەو جۆرە سەرواکە دووبارە دەکاتەوە . بەشێو لەپارچەی دووەمی (سێ نامەی کورت)دا دەڵێ :

(١) خۆشەویستم ،
(٢) لەپیاوێکی گەڕۆکم بیست
(٣) لەلای ئەوان کچانی کۆك،
(٤) لەباتی گوڵ ،
(٥) هۆنراوە ئەدەن لەبەرۆك،
(٦) گەورەکانیان،
(٧) بۆ پەیکەری هونەرمەندێ،
(٨) دێنە سەرچۆك،
(٩) کەچی لەگشت کوردستانا
(١٠) لە مەڵبەندی،

(١١) (بێکەس) و (حاجی) و (گۆرانا).
(١٢) گەر بگەڕێی ، سەر تا خوارێ ،
(١٣) وەك غەریبێ..
(١٤) بەدی ناکەیت،
(١٥) تاپۆی پەیکەری ئەدیبێ. [١٣٣ : ٣٢-٣٣].

ئەم هۆنراوەیە لەسەر سێ سەروا دامەزراوە (ۆك) لە وشەکانی (کۆك ، چۆك ، بەرۆك) ، (انا) لە وشەکانی (کوردستانا ، گۆرانا) ، (یبێ) لە وشەکانی (غەریبێ ، ئەدیبێ) . ئەم سێ سەروایە بەپێی هیچ سیستەمێکی تایبەتی نەهاتوون ، سروشتی داڕشتنی شیعرەکە چۆنی ویستبێ ، شاعیر بەو جۆرە هێناوینی . ڕەوی (ك) لە کۆتایی لەتی (٨،٥،٣) و ڕەوی (ا) لە کۆتایی لەتی (١١،٩) و ڕەوی (ێ) لە کۆتایی لەتی (١٥،١٣) دووبارە بوونەتەوە . کورتی و درێژی لەتەکان و ژمارەی لەتەکان لە نێوان سەرواکان و لە نێوان دوو سەروای جیاوازدا مل کەچی هیچ قالبێکی پێشتر داڕژاو نییە ، سەروا هەیە بەڵام ئازادە لە چۆنیەتی دووبارەبوونەوە .

بەشی دووەم

# سنوور و ڕەگەزەکانی سەروای شیعری کوردی

**باسی یەکەم** : دەنگەکانی سەروای کوردی :

یەك - ڕەوی

دوو - پێش ڕەوی

أ- ریدف (الردف) .

ب- قەید (القید) .

ج- تەئسیس (التأسیس) .

د- دەخیل (الدخیل) .

هـ- ئیشباع (الاشباع) .

و- تەوجیه (التوجیه) .

سێ- پاش ڕەوی

أ- پاش ڕەوی ئەسلی

ب- پاش ڕەوی زیادە

**باسی دووەم** : وشەکانی سەروای کوردی

یەك- وشەی سەروا

دوو- پاش سەروا (ڕەدیف)

سێ- پێش سەروا (حاجب)

**باسی سێیەم** : تێکەڵ بوونی کۆتاییەکان :

١- تێکەڵ بوونی دەنگەکان .

٢- تێکەڵ بوونی وشەکانی سەروا .

## باسی یەکەم : دەنگەکانی سەروای کوردی :

مەبەست لە سنوور و ڕەگەزەکانی سەروا ، ئەو دەنگە یا ئەو دەنگو وشانەیە کە لە کۆتایی هەموو لەت یان دێرە شیعرەکاندا دووبارە دەبنەوە . هەموو زمانەکانی دونیا سنووری سەروایان وەکو یەک نییە ، هەریەکە سنووری خۆی هەیە بەڵام لە هەر زمانێکدا سنوورێك بۆ سەروا داندراوە ، سنوورەکە لە نێوان ڕادەی هەرە کەم و ڕادەی هەرە زۆر دایە . ئەوەی بۆ دیارکردنی سەروا گرنگبێ ڕادەی هەرە کەمی دەنگەکانە ، چونکە دەنگەکان نەگەنە ئەو ڕادەیە سەروا دروست نابێ ، بەڵام دەشێ شاعیر لەو ڕادە کەمە زیاتر پەیڕەوی دەنگو تەنانەت وشە بکات بۆ پتەوکردنی مۆسیقای کۆتایی شیعرەکە. سەروا کە لە ڕادەی هەرە کەم زیاتر بوو ، زیادییەکە هیچ مەرج و سنووری بۆ دانەندراوە ، چونکە بەپێی توانای شاعیر و بگرە زمانەکەش دەگۆڕێ.

لە کوردیدا ژمارەی ئەو دەنگانەی سەروا دروست دەکەن بە پێی بزوێن و نەبزوێنییان دەگۆڕێ . سەروا بەبێ هەبوونی بزوێنێك یان دوان هەرگیز دروست نابێ . بزوێنی درێژ دەتوانێ بەتەنیا ئەرکی هەموو سەروا ببینێ و ببێ بە (ڕەوی) ، بەڵام بزوێنی کورت ئەمەی پێ ناکرێ ، بۆیە ئەگەر کەوتە کۆتایی، دەبێ لە بڕگەی پێشەوە بزوێنێکی تر (کورت یان درێژ) لەنگەری بۆ ڕابگرێ . بەڵام ئەگەر دەنگی کۆتایی (ڕەوی) نەبزوێن بوو، بەتەنیا سەروای پێ دروست ناکرێ، دەبێ بزوێنی پێشەوەی هەر لەگەڵدا دووبارە بێتەوە ، جا چ بزوێنی هەرە درێژ بێ‌و ، چ بزوێنی هەرە کورت. مەرج نییە وشەی سەروا کۆتایی بە ڕەوی بێ ، بۆی هەیە داڕشتنی ڕێزمانی (مۆرفیم)ێك یان زیاتر بە کۆتایی وشەی سەروا بلکێنێ، بەمەوە ڕەوی جێگای خۆی بۆ دەنگێکی تر جێ دێڵێ و خۆی بەرەو پێشەوە دەخزێ. بۆیە دەبێ ڕەوی و پاش ڕەوی لێك جیا بکەینەوە. ڕەوی دوا دەنگی ڕەسەنی وشەی سەروایە و هەر مۆرفیمێکی تری لکاو کە پاش ڕەوی بێ دەبێ بە پاش ڕەوی، واتە سنووری ڕەوی و پاش ڕەوی لێك کردنەوەیان بە ئاستی مۆرفۆلۆجی و ڕستە سازی دیار دەکرێ . ڕەوی کە دەکەوێتە کۆتایی قورسایی هەرە زۆری ئاوازەکەی دەکەوێتە سەر ، بەڵام کە پاش ڕەوی لەگەڵدا بێ ئەم ئەرکەی کەم دەبێتەوە و بەشی زۆری دەکەوێتە سەر دوا دەنگی پاش ڕەوی کە شوێنی ڕەوی دەگرێتەوە. بۆ دیارکردنی ڕەوی و پەیوەندی بە وشەی کۆتاییەوە ، د.ئیبراهیم ئەنیس دەڵێ : (بنچینەی ڕەوی و هەست کردن بە ئاوازەکەی لەوەوە هاتوە کە بەشێکە لەبنیاتی وشەکە ، لکاوەکان ئەگەرچی بە کۆتایی وشەوەش نووساون بەڵام هەست بە سەربەخۆیی و جیاییان دەکەین . جا شاعیرەکان هەستیان بە پێویستی پتەوکردنی ئەم پەیوەندییە کردوە کە دەبێ وشەکان بە ڕەگەزێکی بنچینەیی بەیەکەوە ببەسرێنەوە) [٢٤٣ : ٢٥٦] . قەیسی ڕازیش بەمەرجی دەزانێ کە ڕەوی بەشێك بێ لە هەمان وشەی سەروا : (ڕەوی دوا تیپی وشەی سەروایە . ئەگەر لەهەمان وشە دابێ و سەبارەت بە هۆیەکەوە پێی نەلکا بێ ، پێی دەگوترێ ڕەوی) [٤٠٢ : ١٩٥] . سەروا دەشێ تەنیا یەك دەنگبێ و دەشێ زیاتر ، زیادەکە دەشێ لە پێشەوە هاتبێ (پێش ڕەوی) کە

لە ئەسلی وشەکەدا بەو دەشێ لە دواوە هاتبێ (پاش رەوی) کە مۆرفیمی رێزمانین و لە رووی وشە رۆنانەوە پێوەندییان بە وشەی سەرواوە نییە و دەشێ زیادەکە لە پێشەوە و لە دواوەی رەوی هەبێ ، بەم جۆرەی خوارەوە :




بەرلەوەی بچینە ناو لێکۆڵینەوەی دەنگەکانی سەروا ، دەبێ ئەم چەند خاڵەمان لەبەر چاو بێ:

- دەشێ دەنگەکانی سەروا بەسەر سێ تەوەرەدا دابەش بین : پێش رەوی، رەوی، پاش رەوی.

- رەوی دەبێ لەئەسلی وشەی سەروادا بێ و مۆرفیمی رێزمانی نەبێ .

- ئەگەر رەوی بزوێن بێ ، دەبێ بزوێنی درێژ بێ ، چونکە بزوێنی کورت ئەرکی رەوی پێ رایی ناگرێ و ئەگەر بزوێنی کورت لە کۆتایی ئەسلی وشەدا بوو ، دەنگی نەبزوێنی پێشەوەی دەبێ بە رەوی و ئەوسا دەبێ بزوێنێکی تری پێش نەبزوێنەکەش رەچاو بکرێ ، واتە دوو برگە دەکەونە چوار چێوەی دەنگەکانی سەرواوە .

- ئەگەر کۆتایی وشەی سەروا (وەك وشەی بنجی ) بەنەبزوێن ( رەوی) هات ، دەبێ بزوێنی پێشەوەی هەمان شت بێ .

- لەدوای بزوێنی سەرەکی سەروا ، هەر دەنگێکی هەبێ دەبێ هەمووی وەك یەك بێ .

- پاش رەوی هەرچی هەبێ (یەك مۆرفیم یان زیاتر) دەبێ بەبێ گۆڕان وەکو خۆی دووبارە بکرێتەوە .

ئێستایش بۆ شیکردنەوەی هەریەکە لە سێ بەشەکەی دەنگەکانی سەروا .

یەك- رەوی (٣٠) : دوا دەنگی بنچینەیی وشەی رەسەنی سەروایە و هۆنراوەی لەسەر بنیات دەنرێ و هۆنراوەکە هەر بەناوی ئەوەوە دەکرێ بەتایبەتی ئەگەر قیتعە وغەزەل و قەسیدە بێ ، واتە لەچەند دێڕێك پێك هاتبێ و یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەو کرابێ ، وەکو هۆنراوەی نالی و میمی و

(30) رەوی : دەڵێن بۆیە پێی دەگوترێ رەوی چونکە لە (الرویە) هاتوە کە بەمانای بیر کردنەوە دێ، چونکە شاعیر لەکاتی شیعر داناندا زۆر بیری لێ دەکاتەوە. یان دەڵێن لە (ریواء) هاتوە ئەویش ئەو گوریسەیە کە شتی پێ لەیەك دەبەسرێ، چونکە کۆتایی دێرە شیعرەکان بەیەکەوە دەگەیێنێ و پێکەوە دەیانبەستێتەوە [٢٠٢ : ٧٧]. خەتیبی تەبریزی دەڵێ (پێی دەگوترێ رەوی چونکە بنچینەی رەوی لەقسەدا کۆکردنەوەو بەیەك گەیاندن و خستنە سەریەکە. ریوائیش هەرلەوەوە هاتوە کە مانای ئەو گوریسەیە کە بارو کەڵ و پەل پێ شەتەك دەدرێ) [٢٨٥ : ١٥].

نوونی و ... مەرج نییە هەموو دەنگێك هێزی بوون بەسەروای هەبێ ،لەعەرەبیدا هەندێ دەنگهەن نابن بە ڕەوی ولە کتێب و لێکۆڵینەوەکانی سەرواناسیدا باسیان کراوە ، ئیبن جنی دەڵێ : ( بزانە کە هەموو تیپەکانی میعجەم دەبن بە ڕەوی تەنیا ئەوانە نەبێ کە بۆت جیا دەکەمەوە ) [٢٤٥ : ٢١-٢٢] . ئینجا ناوی ئەو دەنگانە دێنێ کە لە عەرەبیدا بۆ ڕەوی ناشێن. تەنوخی [٢٧٣ : ٦٦-٧٦]. ئەبو عەلا مەعەرری [٢٥١ : ٢] و سەبیان [٢٠٢ : ٨٢-٨٣] و ئیبن عەبد ڕەبیە [٢٤٨ : ٢٠٧] و ئیبن ڕەشیق [٢٤٦ : ١٥٦] و دەمەنهوری [٢٤٧ : ١٣٩-١٤٣] باسی ئەو دەنگانەیان کردوە کە لە عەرەبیدا بۆ سەروا نابن تنوخی لە بارەی گرنگی دەنگی ڕەوییەوە دەڵێ: ( ڕەوی چەسپان و چەقینێکی وای تێدایە لە تیپە پێویستەکانی تردا نییە ، چونکە شیعر جار وایە بێ تەئسیسە و جار وایە بێ ریدفە ، هەیە سیلەو خروجی لە سەروادا نایە ، بەڵام هیچ شیعرێ بەبێ ڕەوی نابێ ) [٢٧٣ : ٦٥]. لە کوردیدا ،لەدەنگە ڕەسەنەکانی وشەی سەروا ، بزوێنە کورتەکان، بەتایبەتی ( ە ) و هەمزە نابن بە ڕەوی و دەنگی ( هـ )ش زۆر کەم دەبێ بە ڕەوی. ئەمانەی لێ دەرچێ هەموو دەنگەکانی تر، دەنگی ڕەسەن و ئەو دەنگانەش کە لەگەڵ وشەی عەرەبیدا هاتوونەتە ناو زمانی کوردی بۆ سەروا دەشێن ، ئەوەندە هەیە دەنگە عەرەبییەکان زۆر جار دەکەونە قالبی فۆنۆلۆجی کوردی و لەگەڵ دەنگی کوردی ڕەسەن دەبن بە هاو سەروا ، وەکو : خانی دەڵێ :

شەهری ژ موزەککەرو موئەننەث

بیلجوملە موزەییەن و مولەببەس [٣ : ٨٢].

هەرچەندە وشەی ( ملبس ) عەرەبییە ، بەڵام دەنگی ( س ) چۆن عەرەبییە ، ئاوا کوردیشە بەڵام وشەی ( مؤنث ) کە عەرەبییە دوا دەنگی ( ث ) لە کوردیدا بەرامبەری نییە ، بۆیە لە کوردیدا هەندێ جار دەبێ بە ( ت ) و بەڵام بە زۆری دەبێ بە ( س ) و لێرە لەم شیعرەدا ، دەنگە عەرەبییە کە لە ژێر کاریگەری فۆنۆلۆجی کوردییەوە گۆڕاوە و لەگەڵ ( س )دا بوە بە ڕەوی . لە کوردیدا ، زۆر جار ، چۆن بۆ کێشەکان وشەی ( بەحر ) بەکاردێ ، ئاوا بۆ ڕەوییەکان وشەی بەحریان بەکار هێناوە ، بەحری میم و بەحری ئەلف و بەحری جیم ... ڕەفیق حیلمی لەبارەی ناسینەوەی شیعر بە ڕەوی و ناونانی بە بەحر دەڵێ : ( نازانم بۆچی پێیان وتوە -بەحر- ) [٩٥ : ١٣٦] ئینجا لەهەمان لاپەڕەدا وەك نموونە دێڕێك دێنێتەوە و ئەم تەعلیقەی لەسەر لێ‌دەدا ( پێی دەڵێن غەزەل لە -بەحری هـ- ، بەمەی کە پیتی دوایین قافیەکانی -جۆبارێکە- ، -لالەزارێکە- ، پیتی -هـ-یە ، وا ئەزانم پێویست نییە کە بڵێین بە پێی -عیلمی عەرووز- مانای -بەحر- شتێکی ترە ) . جارێ دەنگی ( ە ) لە ( جۆبارێکە و لالەزارێکە ) بزوێنی کورتەو لە عەرەبیدا بەرامبەر فەتحە دەوەستێ و هیچ پەیوەندی بە ( هـ )وە نییە کە نەبزوێنێکی کپە، جگە لەمەش ( ە ) ڕەوی نییە، چونکە ( ێکە ) لە نیشانەی نەناسیاوی ( ێك )و فرمانی بێ‌هێز ( to be ) ( ە ) پێك هاتوە، پاش ڕەوییە، چونکە مۆرفیمی ڕێزمانین و هاتوونەتە سەر وشەی سەروا. ڕەوی دەنگی ( ر )یەو سەروای وشەکان ( -ار )ە. دکتۆر مارف خەزنەداریش باسی

بڵاوبوونەوەی شیعری نالی دەکات و ئەم وشەی بەحرە بۆ ڕەوی بەکاردێنێ (بۆ یەکەمین جار دە غەزەلی نالی لە ساڵی ١٩١٣ بڵاوکراوەتەوە ، نۆ غەزەلی لەبەحری -ە-یە ، وە غەزەلێکی لەبەحری -ی-یە ) [٢٢٥ : ٩٤]. بێگومان ڕەوی یان دوا دەنگی دێرە شیعر یەکێکە لە هۆیەکانی ناونان و ناسینەوە و پۆلین کردنی شیعری کلاسیکی ، زۆربەی دیوانە بڵاوکراوەکان بە پێی دەنگی کۆتایی (نەك ڕەوی) پۆلین کراون و بە پێی ڕیزی ئەلف و بێ دانراون ، وەکو دیوانی نالی (هەردوو چاپی مەلا عەبدولکەریم و د.مارف) ، دیوانی سالم و کوردی و ئەدیب و وەفایی و غەزەلەکانی حاجی و دیوانی مەحوی .... ئەوەی لێرەدا پێویست بە ڕاست کردنەوەیە ، زۆربەی ئەوانەی دیوانە کلاسیکییەکانیان کۆکردۆتەوە و ڕێکییان خستوون و شیعرەکانیان پۆلین و ڕیز کردوە، دەنگی (ە)یان بە (ه) داناوە ، بۆ ئەو شیعرانەی کۆتاییان بە بزوێنی کورتی (ە) هاتوە بردوویاننەتە کۆتایی و لەگەڵ دەنگی (ه) ڕیزیان کردوون . لە ڕاستیدا (ە) هیچ پەیوەندی بە (ه)وە نییە ، یەکەمیان بزوێنی کورتە ، دوەمیان نەبزوێنێکی کپە. ئەمانە بە هیچ جۆرێ نابن بەیەك . چۆن لەفەرهەنگدا هەموو جۆرە بزوێنەکان (کورت و درێژیان) بەدوای یەکەوە دێن، (ا ، ە)یش کە هەردووکیان یەك جۆر بزوێنن تەنیا لە کورت و درێژی جیان ، پێویستە لە ڕیزکردندا بکەونە تەك یەك. ڕەوی بە پێی جۆری دەنگەکە دەبێ بە دوو جۆر : بزوێن و نەبزوێن .

أ- ڕەوی بزوێن : ئەو بزوێنانەی دەبن بە ڕەوی بزوێنی درێژن و هەر بەتەنیا دەنگدەتوانن باری سەروا ڕابگرن ، واتە بڕگەی کۆتایی دەبێ بە بڕگەیەکی کراوە و لەم بڕگەیەدا پەراوێزی یەکەم بۆ سەروا بەمەرج دانەندراوە ، کەواتە تەنیا بزوێنەکە دەمێنێتەوە. ئەگەر شاعیر جگە لە بزوێنەکە پەراوێزی پێشەوەی بڕگەکەیان ئەگەر دەنگو بڕگەی تریش پەیڕەو بکات ئەمە ئاوازەکە قووڵتر دەکاتەوە ، بەڵام شتێکی پێویست نییە ، شاعیر تا بەکەمترین دەنگی پێویست وازبێنێ باری سووکترەو هەناسەی درێژتر دەبێ بەتایبەتی لە شیعری یەکێتی سەروادا ، تا دەنگی زیاتر ڕاکێشێتە ناو بازنەی سەروا باری قورسترو هەناسەی کورتتر دەبێ ، چونکە وشەی کەمتر دەست دەکەوێ کە هەموو دەنگەکانی کۆتاییان تێدا هاویەش بێ . ئەمەیش ڕەوییە بزوێنەکان و نموونەیان لە کوردیدا :١- (ا) ، نموونەی ئەم جۆرە ڕەوییە ، حاجی دەڵێ :

گوتم بەبەختی خەواڵوو بەسە ئەتو بێ خودا
لەخەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا [٦٠ : ٣١] .

ئەم دەنگە لە دەنگە چالاکەکانی کوردییە لە بوون بە ڕەوی. لەسەرجەمی (٤٦٨٠) هۆنراوەی (٦٤) دیوانی کوردی[31] ، (٥٣٨) هۆنراوە ڕەوییان (ا)یە کە (١١,٥٪) دەکات. لە زۆر

---

[31] ئەم زانیارییەی لەمەودوا بەژمارە دەخرێتە روو لە (٦٤) دیوانی شاعیرانی کوردەوە وەرگیراوە کە یەکێتی سەروایان بەکارهێناوە: جزیری ، نالی ، حاجی ، مەحوی ، سالم ، حەمدی ، کوردی، تایەر بەگی جاف ، حەریق ، نانیق ، ئەدیب ، سافی ، مەستوورە ، مەلا وەسمان ، سەیدی ، بێخود ، بێوەی ، ئەدەب ، بلدار ،

بەکارهاتندا بەپلە سێ دێت. زۆرترین هۆنراوە بەم ڕەوییە لای نالی هاتوە (٢٦) و کەمترینی (١) لای سەیدی و بێکەس و شێخ ڕەزا و ئەختەرو فەقێ تەیران و مەلای گەورە و هەردی و سەلام هاتوە کە یەکە و هۆنراوەیان پێ هەیە.

٢- (وو) : ئەدەب دەڵێ :

خاڵی حەبەشی قامەتە وا نەقشە لەسەر ڕوو
یا ڕەنگی هیندوو نەسەبە ، ساکینی مینوو[١٤ : ٧٨].

هەمووی (٦٤) هۆنراوە بەم ڕەوییە (وو) هەیە کە ڕێژەی (٠،٣٪)ی هەموو هۆنراوەکانە و لە زۆریدا بەپلە (١٥) دێت. زۆرترینی ئەم ڕەوییە لای سالم هەیە (١٤) و کەمترینی لای کوردی و تایەر فوئاد و جاهید و ئەورەحمان بەگی بابان و شاهۆ و نالبەند و کەماڵی کە هەریەکە یەکە و هۆنراوەیان پێ هەیە.

٣- (ۆ) ، نالی دەڵێ :

زولفت کە لەسەر ڕوو بەخەم و تابشە ئەمڕۆ
دوودی سیەهی عوودە لەسەر عاریزی پشکۆ[٢٠٩ : ٨٩].

(٤٢) هۆنراوە بەم ڕەوییە هەیە ، دەکاتە ٩٪ی سەرجەمی هۆنراوەکان. (ۆ) بە پلەی (١٨) دێ لە زۆر بەکارهاتندا. زۆرترینی ئەم ڕەوییە لای حەمدی هاتوە (٦) و کەمترینی لای ئاتیق و سافی و مەلا وەسمان و دلدار و شێخ ڕەزا و وەفایی و خانی و ئەسیری و مینە جاف و شاهۆ هاتوە کە یەکەو هۆنراوەیان پێ داناوە.

٤- (ێ) ، حاجی دەڵێ :

کورێکی وا نەبوو هەستێتە سەر پێ
بزانی، خەلقی چۆن کەوتۆتە سەر ڕێ [٦٠ : ٢٣١].

(٥٧) هۆنراوە بەم ڕەوییە هەیە ، (١،٢٪)ی هەموو هۆنراوەکانە. (ێ) بەپلەی (١٦) دێ لە چالاکیدا. زۆرترینی ئەم ڕەوییە لای عەلی عارف ئاغا (شاری) هەیە (٥) و کەمترینی لای جزیری و نالی و حەریق و مەلا وەسمان و بێکەس و شێخ ڕەزا و وەفایی و ناری و ئەحمەد موختار و چڕوستانی

---

میهری ، تایەر فوئاد ، جاهید ، بێکەس ، شێخ ڕەزا ، وەفایی ، ناری ، کانی ، خەلیل موخلیس دووسەرەیی ، بڕتەوی هەکاری ، ئەحمەد موختار جاف ، خانی ، چڕوستانی ، بەختیار زێوەر ، شێخ نووری شێخ سالح ، میرزا غەفوور ، ئەسعەد مەحوی ، خادیم ، ئەختەر ، ئەسیری ، مینە جاف ، قانیع ، فەقێ تەیران ، مەلای باتەیی ، زێوەر ، لوتفی ، شاکەلی ، عەونی ، سایری ، مەلای گەورە ، هەردی ، ئەورەحمان بەگی بابان ، حیلمی ، ئەخۆل ، پیرەمێرد ، شاهۆ ، سەلام ، سەید ئەحمەد نەقیب ، سەفوەت ، ئەحمەدێ نالبەند ، کەمالی ، عەلی عارف ئاغا (شاری) ، ویسالی ، عارف عورفی.

و مینه جاف و شاکەلی و موفتی پێنجوێن و سەیید ئەحمەد نەقیب و نالبەند و کەمالی و ویسالی هاتوە.

٥- (وێ)، نالی دەڵێ :

تەشریفی نەوبەهارە کە عالەم دەکا نوێ
دڵ چونکە میسلی خونچەیە بۆیە دەپشکوێ [٢٠٩ : ١٣٢].

ئەمە لە ڕەوییە هەرە کەم بەکارهاتووەکانە ، تەنیا دوو هۆنراوە بەم ڕەوییە هەیە کە ڕێژەی دەکاتە (٠٤، ٠٪). ئەم ڕەوییە بەقەد (ض ، ط ، ظ)، کە دەنگی عەرەبین، بەکارهاتوە و بەپلەی (٣٥) دێ لەبەکارهاتن . ئەم دوو هۆنراوەیەش یەکێکی لای نالی و ئەوەی تر لای حاجی هاتوە .

دوو تێبینی لەبارەی ڕەوی بزوێنەوە :

(١) دەنگەکانی (و-w) و (ی-y) کە لە گۆکردن بزوێن و لەبەکارهاتن نەبزوێنن و سەبارەت بەمە پێیان دەگوترێ نیمچە بزوێن یان نیمچە نەبزوێن ، لێرەدا باس نەکراون ولەگەڵ نەبزوێنەکان دێن .

(٢) بزوێنە کورتەکانی (ە-e) ، (و-u) ، (ی-i ) ، لەبەر بێهێزی توانای ڕاگرتنی قورسایی سەروایان نییە و نابن بە ڕەوی ، ئەگەر (ە-e) لای چەند شاعیرێك بووبێ بە ڕەوی (١٠ هۆنراوەی بە ڕەوی -ە- هەن) ، ڕەوییەکی بێهێزە ، بۆیە لێرە شوونەمان بۆ نەداوە .

ب- ڕەوی نەبزوێن : بەگشتی نەبزوێن لە بزوێن زیاتر دەبن بە ڕەوی ، چ لەبەر ئەوە بێ ژمارەیان لە ژمارەی بزوێن زیاترە ، چ لەبەر ئەوە بێ شوێنی سەروا پێویستی بەوەستان و داکوتانەوەیە کە ئەمە زیاتر لەگەڵ نەبزوێن دەگونجێ ، بەلام هاتنی هێشوە نەبزوێن لە کۆتایی باری سەرواکە گرانترو شاعیرەکە ماندووتر دەکات . ئەمە ڕەوییە نەبزوێنەکانن :

١- (ب) ، سالم دەڵێ :

لە زوڵف و پەرچەمت بۆ کوڵم و غەبغەب
موهەییایە لە ڕووی دڵ مار و عەقرەب [١٠١ : ٤٣].

(١٣٢ ) هۆنراوە بەم ڕەوییە هەیە دەکاتە (٢،٨٪)ی هەموو هۆنراوەکان و ئەمەیان بە پلە (١٠) دێ ، واتە لە ڕەوییەکانی پێشەوەیە لە چالاکییدا . زۆرترینی ئەم ڕەوییە لای قانیع و حەمدی هاتوە (١٠) هۆنراوە و کەمترینی کەیەك هۆنراوەیە لای حەریق و بێخود و تایەر فوئاد و جاهید و ئەحمەد موختار جاف و مەلایێ باتەیی ولوتفی و مەلای گەورە و ئاورەحمان بەگی بابان و موفتی پێنجوینی و شاهۆ و سەلام و سەفوەت و کەمالی و ویسالی و عورفی هاتوە .

٢- (پ) ، ئەسعەد مەحوی دەڵێ :

بێشەنێ کەرێ قەناری وا لە قوڕدا گوێچکە تەپ
خاوەنی ناماوەتێ ، بێ ڕەونەق و بێ گاڵت و گەپ [١٦ : ١٥].

تەنیا یەك هۆنراوە بەم ڕەوییە هەیە ، ئەویش ئەمەی ئەسعەد مەحوییە کە نموونەمان لێ وەرگرتوە . ئەم دەنگە لەگەڵ (پ) و (ء) کەمترین هۆنراوەیان پێ هۆنراوەتەوە. ڕێژەکەی دەکاتە (٠،٠٢٪)ی هەموو هۆنراوەی کوردی و دوا پلەی لە بەکارهێناندا وەرگرتوە .

٣- (ت) ، حەمدی دەڵێ :

ئەو سەروو قەدە سەرکەش و من خاکسار و پەست
چ بکەم خوا ، کە نامەنی جارێ بگرمە دەست [٦ : ١٨٩].

ئەم دەنگە لە ڕەوییە زۆر چالاکەکانە ، (٢٥٣) هۆنراوە بەم ڕەوییە هاتوە کە ڕێژەی (٥،٤٪)ی سەرجەمی هۆنراوەکانەو بەپلە (٤) دێ لە زۆریدا . زۆرترینی ئەم ڕەوییە لای حەمدی هاتوە (١٣) هۆنراوەو کەمترینی کە یەك هۆنراوەیە لای ئەمانە هەیە : ناتیق و سەیدی و بێوەی و دلدار و تایەر فوئاد و فانی و میرزا غەفوور و ئەختەر و زێوەر و سەفوەت .

٤- (ث) ، مەحوی دەڵێ :

ڕەمزەم چیە ، بە ڕەمزەمەی ئایات و سەد حەدیث
پا بوونەوە لە شەئنی نبیە تینەتی خەبیث [١٨٠ : ٩٠].

تەنیا ئەم هۆنراوەیەی حەمدی بە ڕەوی (ث) هەیە ویەس ، واتە کەمترین ڕەوی شیعری هۆنراوەی یەکێتی سەروای پێ ناندرابێ ئەمەیانە لەگەڵ (پ) و (ء) کە ڕێژەیان (٢٪)ی هەموو هۆنراوەکانە و دوا پلەیان وەرگرتوە .

٥- (ج) ، جزیری دەڵێ :

شمشادی خەرام و سەروی غەنناج
جانان دبرت بەعیشوە تاراج [٥٨ : ١٦٤].

ئەم دەنگە بە ڕادەیەکی مام ناوەنجی بەکارهاتوە . (٢٤) هۆنراوە بەم ڕەوییە هەیە ، ڕێژەی دەکاتە (٠،٥١٪)ی سەرجەمی هۆنراوەکان و بەپلە (٢٠) دێ لە زۆریدا . زۆرترینی ئەم ڕەوییە لای جزیری هاتوە (٤) هۆنراوە و کەمترینی کە یەك هۆنراوەیە لای نالی و مەحوی و سالم و مەلا وەسمان و بێکەس و وەفایی و ناری و پرتەوی هەکاری و ئەسعەد مەحوی و ئەختەر و عەونی و سەفوەت و شاری هاتوە .

٦- (چ) ، گۆران دەڵێ :

ئەپ ھا تریەت دێ ولنگەر قووچ
بۆی ئەکەویت دەعبای وەك حووچ [١٧٢ : ٢٥٠] .

ئەم دەنگە لە ڕەوییە ھەرە کەمەکانی یەکێتی سەروایە . (٤) ھۆنراوەی پێ نووسراوە و ڕێژەی سەدی (٠،٠٩)یەو بە پلە (٢٦) دێت لە زۆریدا . زۆرترینی لای عەونی ھەیە کە دوو ھۆنراوەی پێ نووسیوە و کەمترینی لای عارف عورفی ھەیە کە یەك ھۆنراوەی پێ داناوە .

٧- (ح) ، حەمدی دەڵێ :

ئەھلی دونیا نین ئەوی پیاوێن لەگن ئەھلی سەلاح
گەر دەڵێن پیاوین ، لە دونیا بۆ ئەگەن خۆیان نیکاح [٦ : ٢٠٧] .

ھەمووی (١٥) ھۆنراوە بەم ڕەوییە ھەن ، بە ڕێژەی (٠،٣٢٪) و لەگەڵ دەنگی (خ) ڕادەی بەکارهاتنیان وەکو یەکە . لە زۆریدا بە پلە (٢٢) دێ . ڕادەی ھەرە زۆری لە شیعری حەمدی دایە (٤) ھۆنراوە و ڕادەی ھەرە کەمی کە یەك ھۆنراوەیە لای نالی و سالم و شێخ ڕەزا و ئەسعەد مەحوی و خادیم و ئەورەحمان بەگی بابان ھەیە. جێی سەرنجە (ح) لەگەڵ کەمیش ، بە زۆری ھەر لەو وشانەدا ھاتوە کە عەرەبین و کراون بەوشەی سەروا لەشیعرەکاندا ، زۆر کەم وشەی کوردی بە ڕەوی (ح) ھاتوە مەگەر وشەی سەر سوڕمانی وەکو (بەح بەح) و (ئەح ئەح) . ئەمە ئەگونجانی ئەو دەنگە پیشان دەدا بۆ ڕەوی کوردی .

٨- (خ) ، حەمدی دەڵێ :

ناعیلاجە ، عاقیبەت ، سەر ڕەق ئەچێتە سەنگلاخ
چەند بەمەعنایە وتوویانە قەدیمی : شێخ و شاخ [٦ : ٢٠٩] .

ئەمەیش وەکو دەنگی پێشەوە (ح) زۆر کەم بەکار ھاتوە ، ئەنیا پازدە ھۆنراوەی پێ نووسراوە. بە ڕێژەی (٠،٣٢٪) و بەپلە (٢٣) دێ . زۆرترینی دوو ھۆنراوەیە لای جزیری و یەکە لای حەمدی و سەیدی و بێخود و جاهید و موخلیس دووسەرەیی و ئەسعەد مەحوی و خادیم و کەمالی و شاری.

٩- (د) ، مەحوی دەڵێ :

چە خەیاڵێکە لیقایێ بەفەنا چوونی جەسەد
تا پریشان نشود کار بسامان نرسد [١٨٠ : ١١١] .

لە ڕەوییە چالاکەکانە: (١٤٠) ھۆنراوەی پێ داندراوە بە ڕێژەی (٣٪)ی شیعری کوردی و بەپلە (٨) دێ لە زۆریدا . زۆرترینی (١٢) ھۆنراوەیە لای حەمدی و کەمترینی یەك ھۆنراوەیە لای کوردی و تایەر بەگی جاف و حەریق و ئەدیب و بێوەی و جاهید و شێخ ڕەزا و مینە جاف و قانیع و لونفی و

مەلای گەورە و موفتی پێنجوێنی و سەلام و سەفوەت .

١٠- (ذ) : ئەم دەنگە تاکە دەنگێکە لە هۆنراوەی کوردیدا نەکراوەتە ڕەوی یەکێتی سەرەوای هۆنراوە .

١١- (ر) ، سالم دەڵێ :

غەم وەکو کۆهـ ، تەن زەعیف و نزار

دڵ یەکێ غائیلەی زەمانە هەزار[١٠١ : ٥٩] .

ئەم دەنگە لە ڕەوییە هەرە چالاکەکانە و لە ریزی هەرە پێشەوەیە . هەمو ‌(٩٩٨) هۆنراوەی پێ نووسراوە کە ڕێژەی (٢١,٢٪)ی هەموو هۆنراوەکانە و بەپلە دوو دێ دوای (ن). زۆرترینی لای حەمدی هاتوە کە (٥٨) هۆنراوەی پێ نووسیوە و کەمترینی لای مەلای گەورەو بەس کە یەك هۆنراوەی پێ هەیە .

١٢- (ز) ، جزیری دەڵێ :

عاشیق ئەر جارەك ژبالا لێ بدەت بەرقامە جاز

دێ لنك ساحیب دلان حەتتا ئەبەد بت سەر فیراز[٥٨ : ٢٤٤] .

ئەم دەنگە تا ڕادەیەك بەزۆری بۆتە ڕەوی ، هەمووی (٧٧) هۆنراوەی پێ نووسراوە کە دەکاتە (١,٧٪)ی هەموو هۆنراوەکان و بەپلە (١١) دێ . زۆرترینی لای (حاجی) هاتوە (٥) هۆنراوەو کەمترینی کە یەك هۆنراوەیە لای نالی و مەحوی و ناتیق و ئەدیب و وەفایی و مەلا خەلیل دووسەرەیی و فانی و بەختیار زێوەر و شێخ نوری و ئەسعەد مەحوی و مینە جاف و قانیع ولوتفی و شاکەلی و شاهۆ و سەفوەت هاتوە.

١٣- (ژ) ، نالی دەڵێ :

هەی کەرێکم بوو ، چ پەیکەر ، تەیکەری هەوراز و لێژ

سینەپان و مووچە کورت و شانە بەرز و گوێ درێژ[٢٠٩ : ٦٤] .

ئەم دەنگە تا ڕادەیەکی باش بۆتە ڕەوی، هەمووی (١٨) هۆنراوەی پێ نووسراوە بە ڕێژەی (٤,٠٪)ی سەرجەمی هۆنراوەی کوردی و بەپلە (٢١) دێ لە زۆریدا . ڕادەی هەرە زۆری حەمدی بەکاری هێناوە (٤) هۆنراوە و ڕادەی هەرە کەمی کە یەك هۆنراوەیە لای مەحوی و پرتەوی هەکاری و ئەحمەد موختار جاف و فانی و ئەسعەد مەحوی و مینە جاف و قانیع و پیرەمێرد و ناڵبەند هەیە.

١٤- (س) ، حەمدی دەڵێ :

فەلسەفەی لوقمان لەکن ئەو زاتە ناکا فلووس

چی لەئەسبابی دەکا لایق بەڕاوا بێ عەرووس [٦ : ٢٤١] .

(س) دەنگێکە تا ڕادەیەك دەوری ڕەوی دیوە ، هەمووی (٦٦) هۆنراوەی پێ هەیە ، بە ڕێژەی (١.٤١٪)ی هۆنراوەکان و بەپلە (١٣) دێ . زۆرترینی کە (٦) هۆنراوەیە لای حاجی و سابیری هاتوە و کەمترینی کە یەك هۆنراوەیە لای تایەر بەگی جاف و ناتیق و ئەدیب و شێخ ڕەزا و ناری و پرتەوی هەکاری و فانی و شێخ نووری و خادیم و ئەسیری ومینە جاف و قانیع و زیوەر ولوتفی و شاکەلی و عەونی و ئەورەحمان بەگی بابان و حیلمی و نالبەند و کەمالی و شاری و ویسالی هاتوە.

١٥- (ش) ، سالم دەڵێ :

عەودالی ئەبەد هەر منم ئەی چەرخی جەفاکێش

تا دەربەدەرو شەهر بە شەهرم وەکو دەروێش [١٠١ : ٧٥] .

(ش) لەو دەنگانەیە تا ڕادەیەك بۆتە ڕەوی . (٧٣) هۆنراوە بەم ڕەوییە نووسراوە بە ڕێژەی (١.٦٪)ی هۆنراوەکان و بەپلەی (١٢) دێ . زۆرترینی پرتەوی هەکاری (٩) هۆنراوەی پێ نووسیوە و کەمترینی کە یەك هۆنراوەیە لای ئەم شاعیرانە هاتوە : نالی و حاجی و مەلا وەسمان و بێخود و میهری و جاهید و ناری و دووسەرەیی و شێخ نووری و لوتفی و ئەورەحمان بەگی بابان و حیلمی و سەفوەت و ویسالی و عورفی .

١٦- (ص) ، حەمدی دەڵێ :

تۆ دوژمنی گرۆهی وەفایی بە (ئیختیصاص)

زیاتر لەگەڵ منا بەجەفایی بە (ئیختیصاص)[٦ : ٢٤٩] .

هەرچەندە لەم دێرەدا کە مەتلەعی هۆنراوەکەیە (بەئیختیصاص) دووبارە بۆتەوە و دەوری پاش سەروای دیوە چونکە لەبەر ئەوەی بەهەمان مانا دووبارە بۆتەوە و کەوتۆتە حوکمی پاش سەروا ، وشەی پێشتر (وەفایی ، جەفایی) سەروایان ڕاگرتوە لەگەڵ ئەمەشدا تەنیا لەم دێرەدا وایە ، لە دێرەکانی تر وشەی سەروا لەگەڵ ئیختیصاص دێن کە ئەمانەن : (قەصاص ، خاص ، ئیخلاص ، خەلاص) ئەم دەنگە عەرەبییە کە لە بنچدا لە کوردیدا نییە[٣٢] ، لەگەڵ دەنگی (ڤ) کە لە کوردیدا هەیە و بەرامبەری لە عەرەبیدا نییە ، بەیەك ڕادە بوونەتە ڕەوی . بەکەو سێ هۆنراوەیان پێ دانراوە . بە ڕێژەی (٠.٠٦٪)ی هۆنراوەکان و کەوتوونەتە دواوە . (ص) بەپلە (٢٧) دێ . سابیری دوو هۆنراوە و حەمدی یەك هۆنراوەی پێ نووسیوە .

١٧- (ض) ، مەحوی دەڵێ :

واعیز لە ڕەندی مەیکەدە دەگرێ کە (لعیراض)

ڕازی نییە بەسەرنوشتی ئەزەل : (اننی لراض)[١٨٠ : ١٥٦] .

---

• [32] ئەم دەنگە تەنیا لە هەندێ وشەی کرمانجی خواروو وەکو (صەد) و هەندێکی دەنگی کرمانجی سەروو وەکو (صه ، وصا) دەردەکەوێ .

(ض) لەدەنگە هەرە تایبەتیەکانی زمانی عەرەبییە و بگرە بۆتە ناویّ بۆ ئەو زمانە . زۆر جار لەباتی زمانی عەرەبی دەگوترێ (لغة الضاد) ، ئەم دەنگە لە کوردیدا نییە ، بەلاّم بۆی هەیە لەگەلّ وشەی عەرەبی لە کوردیدا بەکاربیّ . لە دەنگە هەرە کەم بەکارهاتووەکانە بۆ ڕەوی شیعری کوردی ، لەگەلّ دەنگی (ط ، ظ ، ویّ) بەیەك ڕادە بەکار هاتوون . هەمووی دوو هۆنراوەی پیّ نووسراوە بە ڕێژەی (٠,٠٤٪)ی هۆنراوەکان . مەحوی و حەمدی یەکەو هۆنراوەیان پیّ داناوە. بە پلە (٢٨) هاتوە.

١٨- (ط) ، نالی دەلّیّ :

مووی سپی کردم بە شووشت ن ئاوی عەینی (شۆرە شط)

شۆرە شەت، یەعنی کە تێیدا، خود بەخود، قەل بوو بە (بط) [٢٠٩ : ٥٧].

ئەم دەنگە عەرەبییە و زۆر بەئاسانی لە کوردیدا بە (ت) دەخوێندرێتەوە . (ط) لە دەنگە هەرە کەم بەکار هاتووەکانە بۆ ڕەوی کوردی . تەنیا (٢) هۆنراوەی پیّ نووسراوە کە دەکاتە (٠,٠٤٪)ی هۆنراوەکان و بە پلە (٢٨) دیّ لەگەلّ (ض ، ظ ، ویّ) بەیەك ڕادە بەکار هاتوون . نالی و حەمدی یەکەو هۆنراوەیان پیّ نووسیوەو بەس .

١٩- (ظ) ، مەحوی دەلّیّ :

بەداوە وەعزی بیّ خۆشی بە ئاوە (یا حافظ)

لە هەلّقولاّنە کەلیکی دەم و لچی (واعظ) [١٨٠ : ١٦٢] .

ئەمەش یەکێکە لەو دەنگانەی لە عەرەبیدا هەیە ولە کوردیدا نییە . لە ڕەوییە هەرە کەم بەکار هاتووەکانە . تەنیا دوو هۆنراوەی پیّ نووسراوە کە (٠,٠٤٪)ی هۆنراوەکانە و بە پلە (٢٨) هاتوەو بە ڕادەی (ض ، ط ، ویّ) بەکار هاتوە . جزیری و مەحوی یەکەو هۆنراوەیان بەم ڕەوییە نووسیوە و بەس .

٢٠- (ع) ، حەمدی دەلّیّ :

غەیری ئەسراری جنوون نابیّ بکا عاشق سەماع

رووتیە گەر دەست بدا بۆ عاقیلان ئەمرۆ مەتاع [٦ : ٢٥٦] .

ئەم دەنگە لە ڕەوییە کەم بەکارهاتووەکانە . (٨) هۆنراوەی پیّ نووسراوە بە ڕێژەی (٠,١٧٪)ی سەرجەمی هۆنراوەکان . بەپلە (٢٥) دیّ لە زۆریدا . زۆرترین هۆنراوەی پیّ نووسرابیّ دوو هۆنراوەیە لای حەمدی و پرتەوی هەکاری و کەمترین هۆنراوە کە یەکێکە، لای مەحوی و جاهید و خادیم و سابیری هاتوە .

٢١- (غ) ، خادیم دەلّیّ :

سەحەر دیفاعی غەمم بوو دەمیّ ئەچووم بۆ باغ

کە بەلکی هەر وەکو بلبل بکەم عیلاجی دەماغ [٧٥ : ١٥٤] .

ئەم دەنگە تا رادەیەك دەوری ڕەوی دیوە ، هەمووی (١٨) هۆنراوەی پێ نووسراوە، بە ڕێژەی (٤ ،٠٪). بەپلە (٢١) دێ لە زۆریدا ولەگەڵ دەنگی (ژ) بەیەك ڕادە بوونەتە ڕەوی. ئەم دەنگە زۆرترینی (٣) هۆنراوەی پێ نووسراوە لای شێخ ڕەزا و کەمترینی یەك هۆنراوەی پێ هەیە لای مەحوی و بێخود و جاهید و وەفایی و دووسەرەیی و پرتەوی هەکاری و لوتفی و عەونی و سابیری و شاهۆ.

٢٢- (ف) ، حەمدی دەڵێ :

سەیری حەربەی عیشقی جانان کەن کەهاتۆتە مەساف

ئەبرۆ وەك مەهـلەت کەرە ، موژگانە تیری دڵ شکاف [٦ : ٢٦٢].

هەمووی (٢٣) هۆنراوە بەم ڕەوییە هەیە کە ڕێژەی (٤٩ ، ٠٪)ی هۆنراوەکانە. ئەم ڕەوییە بەپلە (٢٠) دێ لەزۆریدا . زۆرترینی (٦) هۆنراوەیە لای حەمدی و کەمترینی یەك هۆنراوەیە لای جزیری و نالی و مەحوی و بێخود و شێخ ڕەزا و ئەسعەد مەحوی و خادیم و ئەورەحمان بەگی بابان .

٢٣- (ڤ) ، نالبەند دەڵێ :

ئەو چەك و ئەو زینەت و زێرو دراڤ

ئەو بوخار و عەنبەر و مسك و گولاڤ [١١ : ١٨٧ ].

(ڤ) لە ڕەوییە کەم بەکارهاتووەکانە . هەمووی (٣) هۆنراوەی پێ نووسراوە بە ڕێژەی (٠٦ ، ٠٪). بەپلە (٢٧) دێت . لەگەڵ دەنگی (ص) بەقەد یەك لە هۆنراوەی کوردی بوونەتە ڕەوی تەنیا یەك شاعیر لە یەکێتی سەروای هۆنراوەدا بەکاری هێناوە ئەویش نالبەندە ، کە (٣) هۆنراوەکە هی ئەون . ئەوەی شایەنی سەرنجە ئەم دەنگە لەعەرەبی و تورکیدا نییە ، لە فارسی دەنگەکە هەیە بەڵام ڕەمزی (تیبی) بۆ دانەندراوە . بەش بە حاڵی کوردی ئەم دەنگە زیاتر لە کرمانجی سەروو هەیە ، لە کرمانجی خوارووا لەچەند وشەیەکی کەمی وەکو ڤڤە و گڤە دەردەکەوێ و بەس . ئەوەی تر هەمووی وشەی کرمانجی سەروە هاتۆتە ناو زاری کرمانجی خواروو وەکو مرۆڤ و ڤیان و ئەڤین و ئاڤگە و ....... .

٢٤- (ق) ، مەحوی دەڵێ :

وەك بلبل ، ئەی تازە گوڵم ، پڕ بە دڵمە شەوق

وەك قومری ئەی نوسەروسەهی پڕ بە ملمە تەوق [١٨٠ : ١٨٢].

(ق) لەو ڕەوییانەیە تا ڕادەیەکی باش بۆ یەکێتی سەروا بەکار هاتوە . (٤٦) هۆنراوەی پێ نووسراوە ، بە ڕێژەی (٠،١٪)ی هۆنراوەکان ، بەپلە (١٦) دێ لە زۆریدا . زۆرترین هۆنراوەی پێ نووسرا بێ (٩)یە لای حەمدی و کەمترینیش کە یەك هۆنراوەیە لای حاجی و جاهید و بێکەس و ناری و پرتەوی هەکاری و بەختیار زێوەر و میرزا غەفوور و قانیع و سابیری و حیلمی و پیرەمێرد و

شاهۆ هەیە .

٢٥- (ك) ، سالم دەڵێ :

تیری ئاهی سوبحگاهم ، ڕەنگە کون کون کا فەلەك

ئەشکی ئاتەشناکی من تەحقیق ئەگاتە سەر سەمەك [١٠١ : ٧٧] .

ئەم دەنگە لەو ڕەوییانەیە تا ڕادەیەکی باش لە کوردیدا بەکارهاتوە . (٧٣) هۆنراوەی پێ نووسراوە و بە ڕێژەی (١.٠٦٪)ی هۆنراوەکان و بەپلە (١٢) دێ . زۆرترینی بەکارهاتنی لە (٧) هۆنراوەدایە لای حەمدی و خادیم کەمترینی کە یەك هۆنراوەیە لای ئەم شاعیرانە هاتوە : نالی و کوردی و ئاتیق و مەلا وەسمان و تایەر فوئاد و جاهید و وەفایی و پرتەوی هەکاری و شێخ نووری و میرزا غەفوور و ئەسعەد مەحوی و عەونی و موفتی پێنجوێنی و سەلام و سەید ئەحمەد نەقیب و نالبەند و کەمالی و ویسالی و عورفی .

٢٦- (گ) ، جزیری دەڵێ :

کو ئیشارەت ب بیشارەت بدەرت نەغمەیی چەنگ

ژرویی ئابینەیی دل برتن پەرەیی ژەنگ[٥٨ : ٢٢٩] .

(گ) لەو ڕەوییانەیە بە ڕادەیەکی مام ناوەنجی بەکارهاتوە . (٢٧) هۆنراوە بەم ڕەوییە هەیە بە ڕێژەی (٠.٥٧٪)ی هۆنراوەکان و بەپلە (١٨) دێ . زۆرترین هۆنراوە بەم ڕەوییە نووسرابێ (٣)یە لای حەمدی و ئەدەب ، کەمترینی یەك هۆنراوەیە لای نالی و حاجی و مەحوی و سالم و تایەر بەگی جاف و ئاتیق و ئەدیب و مەلا وەسمان و بێدار و خادیم و ئەختەر و قانیع و شاکەلی و شاهۆ و سەفوەت و کەمالی و ویسالی .

٢٧- (ل) ، حەمدی دەڵێ :

ڕۆژی وەسڵێکم ئەوێ هەروەك شەوی هیجران بە توول

تا لە نیسبەت میحنەتم دا ئارەزووم بێتە حوسوول [٦ : ٢٧٨] .

لە پێشدا دەبێ بڵێین ، لە کوردیدا دوو فۆنیمی لەیەك نزیك هەن (ل ، ڵ) ، ئەمانە هەریەکە فۆنێمی سەربەخۆیەو دەبێ حیسابێکی تایبەتی بۆ بکرێ ، بەڵام لەبەر ئەوەی شاعیرانی کلاسیکی کە بەبڕەوی یەکێتی سەروایان کردوە لە غەزەل و قەسیدەکانیاندا ، بەیان بەجیاوازی ئەم دوو دەنگە نەبردوە و شوێن شکڵەکانیان کەوتوون (ئیپەکە) نەك دەنگەکانیان ، بۆیە لە زۆربەی هەرە زۆری ئەو هۆنراوانەدا کە دەنگی (ل)یان کردوە بە ڕەوی ، بەهەردوو فۆنیم هاتوە . واتە تێکەڵییەکی سەیر لەم ڕووەوە هەیە . بۆیە ئێمە لە ژێر یەك ناونیشاندا باسیان دەکەین ، بەڵام ئەگەر یەك دێر وەربگرین یان یەك ڕەوی دەبێ جۆرە (ل)ەکە دیار بکرێ .

ئەم ڕەوییە لە (٢٢٧) هۆنراوەدا بەکارهاتوە کە دەکاتە ڕێژەی (٤.٠٩٪)ی هۆنراوەکان. بەپلە

(ە) دێ لە زۆریدا ، واتە لە ریزی هەرە پێشەوەی ڕەوییەکانی شیعری کلاسیکییە. زۆرترین هۆنراوە بەم ڕەوییە لای حەمدییە کە (٢٤) هۆنراوەی پێ نووسیوە و کەمترینییان یەك هۆنراوەیە لای شێخ ڕەزا و چڕوستانی و حیلمی و شاری.

٢٨- (م) ، نالی دەڵێ :

(فاتیحە!) تەسخیرە شاری دڵ بە تابووری ئەلەم

موددەتێکی زۆرە پاتەختە لەبۆ خاقانی غەم [٢٠٩ : ٧٢].

(م) لە ڕەوییە هەرە چالاکەکانە ولە ریزی پێشەوە دێ ، (١٩٠) هۆنراوە بەم ڕەوییە هەیە بە ڕێژەی (٤،١٪)ی هۆنراوەکان و بەپلەی (٧) دێ. زۆرترین هۆنراوە بەم ڕەوییە (٢٢) هۆنراوەیە لای سالم و کەمترینییان کە یەك هۆنراوەیە لای ئەم شاعیرانە هەیە : حەریق و بێخود و مبهری و جاهید و کانی و میرزا غەفوور و ئەختەر و ئەسیری و مەلایێ باتەیی و موفتی پێنجوینی و سەلام و سەید ئەحمەد نەقیب و نالبەند.

٢٩- (ن) ، حەمدی دەڵێ :

گەر تەقازای عیشقە هەڵکەندن ، رەفیقان ، بێستوون

با بە تیشەی ئاهەوە هەڵچم لە چەرخی بێ ستوون [٦ : ٢٠٩].

ئەم دەنگە (ن) لەهەموو دەنگەکانی زمانی کوردی چالاکترە ، (١١٤٨) هۆنراوەی پێ نووسراوە بە ڕێژەی (٢٤،٥٪). واتە نزیکەی چارەکێکی هەموو هۆنراوەکان بەم ڕەوییە هاتوون کە بە پلە یەك دێ. زۆرترین هۆنراوە بەم ڕەوییە (٩٢) هۆنراوەیە لە هەردوو بەرگی دیوانی خادیم و کەمترینی کە یەك هۆنراوەیە لای بێوەی و فەقێ تەیران و پیرەمێرد هاتوە.

٣٠- (ھ) ، خانی دەڵێ :

رۆژان دگری ، بشەف دکر ئاھ

ئەو ڕەنگەڕیا زەعیف ئەو ماھ [٢ : ١٠١].

ئەم ڕەوییە (ھ) تا ڕادەیەکی کەم بەکارهاتوە . هەمووی (١٦) هۆنراوەی پێ نووسراوە بە ڕێژەی (٠،٣٤٪) و بەپلە (٢٢) دێ لە زۆریدا . زۆرترینی (٢) هۆنراوەیە لای جزیری و سالم و بڕتەوی هەکاری کەمترینی یەك هۆنراوەیە لای نالی و مەحوی و سافی و مبهری ئەحمەد موختار جاف و عەونی و شاهۆ و کەمالی و عورفی.

٣١- (و-w) ، بێخود دەڵێ :

هاتە بەزمی ئێمە دوێنێ شەو برۆ داسێ بەدەو

هەر بەناکامی پەلەی سەبری دڵی کردم درەو [٣٦ : ٧٦].

(و) لە ڕەوییە هەرە چالاکەکانە (١٣٧) هۆنراوەی پێ نووسراوە بە ڕێژەی (٢،٩٪)ی

هۆنراوەکان و بەپلە (٩) دێ لە زۆریدا . زۆرترینی (١٥) هۆنراوەیە لای خادیم بە هەردوو بەرگە دیوانەوە ، کەمترینی کەیەك هۆنراوەیە لای ئەم شاعیرانە هاتوە : ئەدیب و مەلا وەسمان و شێخ ڕەزا و مەلای گەورە و موفتی پێنجوینی و پیرەمێرد .

٣٢- (ی-y) ، نالی دەڵێ :

وەرە ساقی بە شینی مەزهەبی دەی

ئەوا فەرشی حەیاتی خۆم دەکەم تەی[٢٠٩ : ١٢٥] .

ئەم دەنگە لە ڕەوییە هەرە چالاك و لە پێشەوەکانە . هەمووی (٢٢١) هۆنراوەی پێ نووسراوە بە ڕێژەی (٤.٧٪)ی هۆنراوەکان و بەپلە (٦) دێ لە زۆریدا . زۆرترینی (١٦) هۆنراوەیە لای سالم و کەمترینی کە یەك هۆنراوەیە لای حەریق و مەستوورە و سەیدی و بێوەی و بلدار و دووسەرەیی و پرتەوی هەکاری و ئەختەر و ئەسیری و مینە جاف و لوتفی و مەلای گەورە و هەردی و حیلمی و موفتی پێنجوینی و سەلام و سەید ئەحمەد نەقیب و ئەخۆل.

- هەڵسەنگاندنێکی ڕەوی لە یەکێتی سەرواى شیعری کلاسیکی کوردیدا :

لە وردبوونەوەیەکی ئەو سەر ئەژمێرییەی بۆ (٦٤) دیوانی شیعری کلاسیکی کوردی ئەنجام دراوە ، چەند ڕاستییەکمان لەبارەی ڕەوی شیعری کوردی بۆ دەردەکەوێ کە دەتوانین بە کورتی بەم جۆرە دەست نیشانیان بکەین :

١- مەحوی لە هەموو ڕەوییە باسکراوەکان (٣١) ڕەوی جۆراو وجۆری بەکارهێناوە ، ئەو بەپلە یەك دێ لەناو هەموو شاعیرەکان و دوای ئەو حەمدی دێ کە (٣٠) ڕەوی بەکارهێناوەو لەهەموویشیان کەمتر مەستوورەیە کە تەنیا دوو ڕەوی بەکارهێناوە. ئەمە بێگومان هۆی ئەوەیە کە شیعرەکانی مەستوورە زۆربەیان بەزاری گۆرانی و قالبی مەسنەوی نووسراون و لەدیوانەکەیدا تەنیا سێ هۆنراوە یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەو کراوە ئەوانیش لەسەر دوو ڕەوی داڕژاون . مەستوورە لێ دەریچێ چڕوستانی کەمترین سەروای بەکارهێناوە ، لەهەموو هۆنراوەکانیدا تەنیا (٤) ڕەوی هەیە . لەهەموو شاعیرەکان ، دوو یان سی سەرواو بەسەرەویان هەیە ، دەیان لە نێوان (٢٠-٢٩) سەروایان هەیە و سی وسێیان لەنێوان (١٠-١٩) سەروایان هەیە و ئەوانی تر کە (١٩) شاعیرن لە نێوان (١-٩) سەروایان بەکارهێناوە ، بەمەوە دیارە ڕادەی هەرە زۆریان ئەوانەن کە لە (١٠-١٩) سەروای جیاوازیان هەیە و ڕێژەی ئەمانە لەچاو هەموو شاعیرەکان دەکاتە (٣٤.٤٪) و لە هەموویشیان کەمتر ئەوانەن لە سی بەسەرەوەیان هەیە و دەکاتە (٣.٢٪) .

٢- چالاکی ڕەوییەکان لە زۆر بەکارهاتندا ئەگەرچی لە شاعیرێکەوە بۆ شاعیرێکی تر تا رادەیەك دەگۆڕێ بەلام هەمووی بەسەریەکەوە ، وەربگرین زۆر و کەمی بەکارهاتنیان لەم خشتەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێ کە ژمارە و ڕێژەی سەدی و ریزی هەریەکێکیان دەردەخا :

| ڕەوی | ن | ر | ا | ت | ل | ی | م | د | و | ب |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی | ١١٤٨ | ٩٩٨ | ٥٢٨ | ٢٥٣ | ٢٢٧ | ٢٢١ | ١٩٠ | ١٤٠ | ١٣٧ | ١٣٢ |
| ڕێژەی سەدی | ٢٤،٥ | ٢١،٣ | ١١،٥ | ٥،٤ | ٤،٩ | ٤،٧ | ٤،١ | ٣ | ٢،٩ | ٢،٨ |
| ڕیزی | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ |

| ڕەوی | ز | ش | ک | س | وو | ێ | ق | ڤ | گ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی | ٧٧ | ٧٣ | ٧٣ | ٦٦ | ٦٤ | ٥٧ | ٤٦ | ٤٢ | ٢٧ |
| ڕێژەی سەدی | ١،٧ | ١،٦ | ١،٦ | ١،٤ | ١،٣٦ | ١،٢ | ١ | ٠،٩ | ٠،٥٧ |
| ڕیزی | ١١ | ١٢ | | ١٣ | ١٤ | ١٥ | ١٦ | ١٧ | ١٨ |

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ج | ف | ژ | غ | ه | ح | خ | ە | ع | چ |
| ٢٤ | ٢٣ | ١٨ | ١٨ | ١٦ | ١٥ | ١٥ | ١٠ | ٨ | ٤ |
| ٠،٥١ | ٠،٤٩ | ٠،٤ | ٠،٤ | ٠،٣٤ | ٠،٣٢ | ٠،٣٢ | ٠،٢ | ٠،١٧ | ٠،٠٩ |
| ١٩ | ٢٠ | ٢١ | ٢١ | ٢٢ | ٢٣ | ٢٣ | ٢٤ | ٢٥ | ٢٦ |

| | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ڤ | ص | ض | ط | ظ | وێ | پ | ث | ء | ڒ |
| ٣ | ٣ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ١ | ١ | ١ | |
| ٠،٠٦ | ٠،٠٦ | ٠،٠٤ | ٠،٠٤ | ٠،٠٤ | ٠،٠٤ | ٠،٠٢ | ٠،٠٢ | ٠،٠٢ | |
| ٢٧ | ٢٧ | ٢٨ | ٢٨ | ٢٨ | ٢٨ | ٢٩ | ٢٩ | ٢٩ | ٣٠ |

ژمارە و ڕێژەی سەدی و ڕیزی ڕەوییەکان

٣- شتێکی ئاساییە کە ئەو دەنگانەی لە عەرەبی هەن و لە کوردیدا نین (ص ، ض ، ط ، ظ ، ث ، ذ) بە ڕادەی کەم دەوری ڕەوییان دیوە ئەویش لەگەڵ ئەو وشە عەرەبییانەی کە بۆ سەرواى شیعرەکان بەکارهاتوون . بگرە لە یەکێتی سەروادا هیچ ڕەوی (ذ) مان بەدی نەکرد ، ڕەنگە لە شیعری مەسنەوی تاك و تووك هاتبێ بەڵام بۆ غەزەل و قەسیدە ، نەء . ئەوەی جێگای سەرنجە ، شاعیرانی کلاسیکی بۆ ئەوەی شاعیرێتی خۆیان بسەلمێنن زۆر جار بیریان لەوە کردۆتەوە کە بە هەموو کێشەکان و بەهەموو ڕەوییەکان شیعر دابنێن ، ئەگەر نا دیوانەکەیان تەواو نابێ، جا بۆ ئەو دەنگە عەرەبییانە ، لەباتی ڕەوی ، کە ڕەنگە ئەوەندە وشەیە دەست نەکەوێ کە لەگەڵ زەوق و شێوازی ئەدەبی کلاسیکی بگونجێ ، پەنایان دەبردە بەر یەك وشەی وەکو (حظ) یان (واعظ) یا (حدوث) یان (للبذ) و دەیانکرد بە پاش سەروا . ئەو دەنگە عەرەبییانە وەك لەخشتەکەدا دیارە کلکەی دواوەیان گرتوە (٢٧،٢٨،٢٩،٣٠) یەمین ڕەوین .

٤- جێی سەرنجە کە ئەو دەنگانەی تایبەتین بە کوردی وەکو (گ ، ژ ، چ ، ڤ ، پ) چالاکییان لە بوونە ڕەویدا بەهێز نییە ، بەتایبەتی (چ ، ڤ ، پ) کەوتوونەتە کلکەی دواوە و تەنیا بە ڕادەی دەنگە ناکوردییەکان بەکار براون ، بەڵام (گ ، ژ) نەختێ لەوان زیاتر هاتوون ، هۆی ئەمە بەلای منەوە بۆ چەند ئەگەرێك دەگەڕێتەوە :

- سروشتی دەنگەکان بە جۆرێ هەڵکەوتوە ، بۆتە هۆی کەم بەکارهاتنیان لە ڕەوی ، (ڤ ، ژ ، چ، پ) دووبارە بوونەوەیان لەسەرەتاو ناوەڕاستی وشە زیاترە تا لە کۆتایی ، ئەمە وای کردوە دەوریان لە بوون بە ڕەویدا کز بێ ، ئەمە نەك هەر لەشیعری کلاسیکی لە شیعری نوێش هەستی پێ دەکرێ کە ئەم دەنگانە کەمتر دەبنە ڕەوی .

- شاعیرانی کلاسیکیی کوردمان ڕۆشنبیرییان عەرەبی - ئیسلامی بوەو زیاتر فەرهەنگی عەرەبییان لە مێشك بوە تا فەرهەنگی وشەی کوردی ڕەسەن و پەتی . ئەوەندەی وشەی عەرەبی هێزی بەپتەو کردنی شێوازی شیعری کلاسیکی دەدا ، وشەی ڕەسەن پێی نەدەدا ، بگرە لە هێزی کەم دەکردەوە ، بۆیە بیریان لەبەکارهێنانی وشەی ڕەسەنی کوردی (کە ئەو دەنگە ڕەسەنانەیان تێدا بێ) نەدەکردەوە بەتایبەتی بۆ شوێنێکی بەهێزی وەکو شوێنی سەروا ، ئەمەش لە ڕادەی ئەم ڕەوییانەی کەم کردۆتەوە .

٥- دەتوانین دەنگەکانی ڕەوی لە زۆرییەوە بۆ کەمی دابەشی ئەم شەش کۆمەڵەیە بکەین :

- ن ، ر ، ا .
- ت ، ل ، ی ، م ، د ، و ، ب .
- ز ، ش ، ك ، س ، وو ، ێ ، ق ، ڤ .
- گ ، ج ، ف ، ژ ، غ ، ه ، ح ، خ .

- ه ، چ ، ڤ ، ص ، ض ، ط ، ظ ، وێ ، پ ، ث ، ء .

- ذ (نییە).

دوو- <u>پێش ڕەوی</u> : تەنیا ئەگەر ڕەوی بزوێنی درێژ بێ پێویستی بە پێش ڕەوی نابێ ، ئەگەر پێش ڕەوی دەنگێك یان چەند دەنگێك پەیڕەو بکرێن لەبەر پێویستی نییە بەڵکو بۆ قووڵ کردنەوەی ئاواز و بەهێز کردنی تریە (ایقاع)ی شیعرەکەیە، بەلام ئەگەر ڕەوی نەبزوێن (نیمچە بزوێنیش) بێ دەبێ دەنگێك یان چەند دەنگێکی پێشەوەی ڕەچاو بکرێ :

١- ئەگەر یەکسەر نەبزوێنێکی تری لە پێش هاتبێ ، واتە کۆتایی وشەکە بە هێشوە نەبزوێن هاتبێ ، هێشوەکە دەبێ بەتەواوی پەیڕەو بکرێ ، واتە نابێ دەنگی نەبزوێنی پێش ڕەوی بگۆڕێ .

٢- لە پێش ڕەوی نەبزوێن (وئەگەر هەبوو هێشوە نەبزوێن) ، دەبێ بزوێنەکە (کورت بێ یان درێژ) لە سەرەتا تا کۆتایی پەیڕەو بکرێ ، واتە بڕگەی کۆتایی لە ناوکەوە بە دواوە دووبارە دەبێتەوە.

٣- ئەگەر بڕگەی پێش کۆتایی ناوکەکەی (ا) بێ ، ئەم (ا)یە دەبێ لەگەڵ ناوك و پەراوێزی کۆتایی بڕگەی دوەم (کە دوا بڕگەیە) پەیڕەو بکرێ .

<u>پێش ڕەوی بەم زاراوانە ناسراوە :</u>

أ- ڕیدف : ئەو نەبزوێنە وەستاوە یان بزوێنە درێژەیە کە یەکسەر لە پێش ڕەوی دێ ، (بۆیە پێی دەگوترێ ڕیدف چونکە وەکو پاشکۆی زین وایە لەچاو ڕەوی یان وەکو ئەو کەسە وایە لە پشت سوارەوە سوار بوو بێ . ڕیدف هەرچەندە لە پێش ڕەوی دێ بەلام پایەی لەو کەمترە چونکە بەقەد ئەو(لازم) نییە ) [٢٠٢ : ٧٩] . ڕیدف سێ جۆرە :

١- ڕیدفی ئەسلی : بریتییە لە بزوێنە درێژەکانی پێش ڕەوی .

- (ا) ، ئەدەب دەڵێ :

ئەی شەککەرین دەهان و شەکەر نوتقی لەب نەبات
شیرین هەموو شەمایل و شیرین هەموو ئەدات [١٧٧ : ٢٦] .

وشەکانی سەروای ئەم هۆنراوەیە ئەمانەن : (نەبات ، ئەدات ، پات ، وەفات ، حەیات ، تات، ئیلتیفات ، نەهات ، دوعات) . لەهەموویان (ا) ڕیدف و (ت) ڕەوییە . تەنیا لە (وەفات ، دوعات) نەبێ دەبێ (ا) ڕەوی بێ چونکە (ت) لەئەسلی وشەکەدا نییە و مۆرفیمێکی ڕێزمانییە. بەلام چونکە لەگەڵ وشەکانی تر چۆتە سەروا بەندی دەبێ حیسابی ڕەوییان بۆ بکرێ.

- (وو) ، حەمدی دەڵێ :

کەسەر ڕوخساری داگیرساوی ناو ئەگریجەی وەك عوود

لەسەر مەجمەر خەیاڵی مشکی چینی کردە دەر وەك دوود[٦ : ٢١٨] .

لەم هۆنراوەیەدا (د) ڕەوییە و (وو) پێش ڕەوی کە لە هەموو وشەکانی سەروادا هاتوە (عوود ، دوود ، مەوجوود ، سوود ، ڕوود ، ڕووید ، مەعدوود ، مەحموود ، مەمدوود ) .

- (ۆ) ، حەمدی دەڵێ :

ئۆخەی ئۆخەی چەندە یارم نازەنینە و شۆخ وخۆش

وەك کریدارە بە خەندە وا بە غەمزە خود فرۆش [٦ : ٢٤٧] .

ڕەوی (ش) و ڕیدف (ۆ)یە کە لەم وشانەی سەروادا دووبارە دەبێتەوە (خۆش ، خۆدفرۆش ، نۆش ، هۆش ، خرۆش ، بۆش ، بادەنۆش ، پۆش ، خەمۆش ) . تەنیا لەوشەی (نۆش ) ، (ۆ) ڕیدف نییە و ڕەوییە ، (ش) ڕەوی نییە و پاش ڕەوییە بەلام چونکە لەگەڵ وشەکانی تر کەوتۆتە سەروابەندی جێگەی ڕەوی گرتوە و (ۆ) کشاوەتەوە بوە بە ڕیدف .

- (ی)ی درێژ ، سالم دەڵێ :

هەڵپڕژا خوێن بە جگەرما دەمی غەمزەت لە زەمیر

هاتە جونبوش کە بە ئاهم لە دەروونما پڕی تیر[١٠١ : ٦٨] .

ڕیدفی (ی) لەهەموو وشەکانی سەروادا (زەمیر ، تیر ، حەریر ، ئەسیر ، دەبیر) دووبارە بۆتەوە .

- (ێ) ، گۆران دەڵێ :

بۆنی درەخت و دەوەنی ناو کێو

تازەی کردەوە نیو گیانی سەرلێو[١٧٣ : ١٤٠] .

(و)ی نیمچە بزوێن ڕەوییە و (ێ) پێش ڕەوی .

- (وێ) ، هەژار لە مەم و زینی خانیدا دەڵێ :

بیگوێزنەوە ئاشکرایە جێ و شوێن

زۆر خۆشە تلانەوەی لەسەر نوێن [٣ : ٣١٢] .

(وێ) ڕیدفە و (ن) ڕەوییە .

تێبینی :

-(وو ، ۆ) لەیەکەوە نزیکن ، بۆیە وا ڕوودەدا کە لە یەکێتی سەروادا پێکەوە بێن بەسەروا بەلام ئەمە ڕاست نییە ، بەکەم و کورتییەکی سەروا دادەنرێ .

-لەعەرەبیدا کە ڕیدف تەنیا بە سێ دەنگ(و ، ا ، ی) دروست دەبێ ، دەشێ (واو و یێ پێکەوە سەروا دروست بکەن. بەیەکەوە لەیەك هۆنراوە بێن بە ڕیدف ، واولە دێڕێك و یێ لە دێڕێکی تر بێ) [٢٧٣ : ٨٨] ، بەلام هەرگیز لەگەڵ (ا)دا نابن بە ڕیدف لەیەك هۆنراوەدا[٢٤٥ : ٢٥] . لە

عەرەبیشدا شاعیری بەدەسەڵات بوە، واو وئی پێکەوە نەهێناوە ، بۆ نموونە ( ئیبن ڕومی یەکێ بوە لەو شاعیرانە خۆی بە دیاردەی ناپێویست بەستۆتەوە ، ئەو هەرگیز واو و یێی بەیەکەوە نەکردوە بە ڕیدف ) [٢٤٦ : ١٦٠].

٢- ڕیدفی زائد : ئەو دەنگە نەبزوێنە وەستاوەیە کە لە نێوان ڕیدفی ئەسلی و ڕەوی دێت ، واتە لەگەڵ ڕەویدا هێشوە نەبزوێن دروست دەکا ، ڕیدفی زائد لە فارسیدا ژمارەیان شەشە ولە دوو وشەی ( شرف سخن )دا کۆبوونەتەوە [٤١٠ : ١٤٩-١٥٠] . لەکوردیدا ، ئەم دەنگە نەبزوێنانە بوونەتە ڕیدفی زائد :

- ( ن ) ، حەریق دەڵێ :

چاوەکەم ، ئەمڕۆ لە گوڵشەن گوڵ بە عیشوە خۆی نواند
نەك ئەمك گیر بم بەمەرگی تۆ قەسەم هیچ نەمدواند [٦٣ : ١٩] .

دوای بزوێنی درێژی ( ا ) کە ڕیدفە ، دوو نەبزوێن لەناریەك هێشوودا هاتوون ( ن، د ). یەکەمیان ( ن ) ڕیدفی زائدە و دووەمیان ( د ) ڕەویە ، ئەمە لە هەموو وشەکانی سەرواکا دووبارە بۆتەوە ( ستاند، کڕاند ، ڕفاند ، شکاند ، چەقاند ، دڕاند ، هەڵکڕاند ) .

- ( س ) ، خانی دەڵێ :

هەرچەندە تۆ چوویە بەر دەرێ دۆست
لێ دۆست لنك منە ل وێ پۆست [٣ : ١١٨] .

( ۆ ) ڕیدفی ئەسلییە. هێشوە نەبزوێنی ( ست ) ، دەنگی پێشەوەی ( س ) ڕیدفی زائدە و دەنگی دووەمی ( ت ) ڕەوییە .

- ( ش ) ، خانی دەڵێ :

مەیلا تەبە عاشیقان دکێشت
دەردێ تەیە دل ژیەر دئێشت [٢ : ٧] .

( ێ ) کە بزوێنی درێژە بۆتە ڕیدف و ( ش )ی نێوان ڕیدفی ئەسلی و ڕەوی بۆتە ڕیدفی زائد .

٣- ڕیدفی مورەککەب : بریتییە لە ڕیدفی ئەسلی و ڕیدفی زائد بە سەریەکەوە ( سەرجەمی ڕیدفی ئەسلی و ڕیدفی زائد پێی دەگوترێ ڕیدفی مورەککەب ) [٤٠٢ : ١٥٥] . بەحیسابی حەرەکە و ساکینی عەرەبی ، لەم جۆرە سەروایەدا سێ ساکین کۆدەبێتەوە کە شتی وا لە فۆنۆلۆجی عەرەبیدا ڕێ نەدراوە ، هەر بۆیەش ئەم جۆرە ڕیدفە ، یان ڕیدفی زائد لەعەرەبیدا نییە . خانی دەڵێ :

هەردوو تەرەفان قەبیلی کرمانج
بۆ تیری قەزا کرینە ئامانج [٢ : ٢٢] .

( ج ) ڕەوییە و ( ان ) کە لە پێش ڕەوی هاتوون ، بە هەردووکیان ڕیدفی مورەککەبیان پێك هێناوە

لێکی بکەینەوە دەبێ بە ڕیدفی ئەسلی (بزوێنی درێژ) و ڕیدفی زائد نەبزوێنی ساکن.

ڕیدفی موڕەککەب

ڕیدفی زائد (نەبزوێنی ساکن) — ڕیدفی ئەسلی (بزوێنی درێژ)

ب- قەید: ئەو نەبزوێنەیە کە لە نێوان بزوێنی کورتی برگەی کۆتایی و ڕەوی دێ. لە فارسیدا بەم جۆرە پێناسەی کراوە (هەر ساکنێکی جگە لە -واو و ئەلف و یێ - بێ دابڕان پێش تیپی ڕەوی بێ، پێی دەگوترێ قەید) [٤١٠ : ١٥٢]. لە فارسیدا قەید (١٠) دەنگە و لە ڕستەی (سەشب فرخ نغز) کۆبوونەتەوە و بەم دێڕە شیعرەیش پێشان دراون:

باء و خاء و زای و سین و شین
غەین و فاء و نون و ها می دان یقین [٤١٠ : ١٥٢].

لە عەرەبیدا زۆرە بەلام پەسند نەکراوە، عەبدوللا مەجزووب لە هەڵسەنگاندنی قەیددا دەڵێ (زەحمەتترین سەروای موقەیەد سەروای موتەرادیفە کە لە کۆتاییدا دوو ساکن بەدوای یەکەوە بێن، بەلام لەویش زەحمەتتر ئەوەیە دوو ساکینەکە نەبزوێن بن وەکو - سحل، فحل - ئەمە جۆرێکی سەختە و شاعیرەکان خۆی لێ لا دەدەن، تەنیا لە مەشتوورە کورتەکان دێن) [٣١٤ : ٤٢]. بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی قەید و شوێنی نیمچە بزوێن تێیدا، دەڵێ: (ئەگەر تیپی پێش ڕەوی وەستاو، یێی یان واوی وەستاوێ و پێشیان مەفتوح بێ، وەکو یوم، دوم[33]، لەسەختیدا وەکو دوو ساکین وایە) [٣١٤ : ٤٢].

جیاوازی نێوان قەید و ڕیدفی زاید لە بزوێنی پێشەوەیاندایە، ئەگەر بزوێنەکە درێژ بێ ڕیدفی زائدە و ئەگەر کورت بێ قەیدە.

لە کوردیدا قەید دوو جۆرە و هەر جۆرەی چەند دەنگێک دەگرێتەوە.

- قەیدی نیمچە بزوێن: ئەو بزوێنانەن کە لە بەکارهاتنندا وەکو نەبزوێن پەراوێز دەگرن و لێرەدا لەگەڵ ڕەوی دەبن بە هێشووی دواوەی برگە.

• (و-w)، مەولەوی دەڵێ:

فەقێ بێ تەدریس، مەدرەسە بێ زەوق
مزگی بێ ئیمام، جەماعەت بێ شەوق [١٨٦ : ٢٨٧].

---

[33] ئەم دوو شوونە هەردووکیان بۆ (و) هاتوون، ئەگەر شوونەیەکی (ی) بایە باشتر بوو وەکو بیت.

( ڤ ) ڕەوییە و ( و )ی نیمچە بزوێن قـەیدە . بەهـەردووکیان ( -وڤ ) هێشووی پـەراوێزی کۆتـایی بڕگەی دواوەیان پێك هێناوە .

• ( ی-y ) ، مەولەوی دەڵێ :

گێچ سەرکاوان جە سەرد بین کەیل
بۆ مەدان چون بۆی بێ وەفایی لەیل [١٨٦ : ١٦٠] .

( ل ) ڕەوییە و ( ی ) نیمچە بزوێن قـەیدە . لـێرە ( یـل ) بۆتـە هێشووی پـەراوێزی دواوەی بڕگـەی کۆتایی وشەکانی سەروا .

- قەیدی نەبزوێن : ئەو نەبزوێنەیە کە لە وشەی سەروادا بێ بە قەید. باوترینیان ئەمانەن :

• ( س ) ، حەمدی دەڵێ :

ئەو سەروو قەدە سەرکەش و من خاکسارو پەست
چ بکەم خوا کە دامەنی جارێ بگرمە دەست [٦ : ١٨٧] .

• ( ش ) ، خانی دەڵێ :

وان سەیرگەهان تولێ دکی گەشت
ئەژمامە ژبۆمرا دەرو دەشت [٣ : ١١٢] .

• ( ر ) ، حەمدی دەڵێ :

وەختی شەفەق ، لە غەربەوە بارم کە کەوتە بەرق
عالەم وتی قیامەتە خۆر غەربی کرد بە شەرق [٦ : ٢٦٧] .

• ( ف ) ، خانی دەڵێ :

خونچەژ خەوا سەحەر ڤەپشکفت
وێ بوویی ب بولبولێ خوە ڕاجفت [٣ : ١٣١] .

• ( ن ) ، ئەدەب دەڵێ :

ئەگەر زیندانە ، گەر دارە وە گەر بەند
بەسە ، جانا ، عەزابی مە هەتا چەند [١٤ : ٣٥] .

• ( ل ) ، خانی دەڵێ :

مەحبووبێ قولووبێ ( من لە القلب )
قەلبان تو دکی ب بال خۆڤە جەلب [٣ : ٣] .

ئەگەر چی ( ل ) لێرە لە وشەی عەرەبیدا هاتوە بەڵام لە شیعری کوردیدایە .

• ( خ ) ، حەمدی دەڵێ :

بۆ گەدایانیان بەجێ هێشت پادشاهان تاج و تەخت
ئاسمان بۆ پارە وەك سەحرا ئەکەن بەکپارە تەخت [٦ : ١٨٦] .

لێرەدا ، ئەگەرچی یەک وشەیە لە هەردوولەتدا بۆتە وشەی سەروا (تەخت) بەلام لەهەریەکێکیاندا مانایەکی هەیە ، (ڕەگەز دۆزی)یە. هەموو وشەکانی تری سەروای هۆنراوەکە ئەم قەیدەیان تێدا پەیڕەوکراوە (بەخت ، سەخت ، نەخت ، درەخت ، چەخت) .

•(هـ) ، خانی دەڵێ :

تاجدین و بران ب شەریەتەک زەهر

تو دشی دەمەکی ئەوان بکی قەهر[٢ : ١٦٣] .

• (ب) ، مەلایێ باتەیی دەڵێ :

(امطرا منها جما) هاتە ئەمر

ئادەما دی بێتە ڤە لێکن ب سەبر[٥١ : ٣١] .

بیناى کێش و سەروا لەسەر زەربە نەک عەرووز ، بۆیە سەرواى سەرەکی لەزەربدا دێ بەلام لێرە لەبەر ئەوەی مەسنەوییە دەبێ سەروا لە هەردوولەتدا پەیڕەو بکرێ ، ئەوەی جێی سەرنجە قەید لەلەتی دوەم (ب)ە ، بەلام لەلەتی یەکەم (م)ە ، ئەمە یەکێکە لە کەم و کورتییەکانی قەید، نابێ شاعیری بالأ دەست ڕێگا بەم جۆرە عەیبەبدا .

• (م) ، شوونەکەی سەرەوە ، ئەم قەیدەیشی تێدایە .

• (ص ، ظ) ئەم دوو دەنگە عەرەبین و لە ئەسلدا لەکوردیدا نین . هاتنی هەردووکیان وەک قەیدی یەک دێری مەسنەوی یان لەیەک هۆنراوەدا ، یەکێکە لە کەم و کورتییەکانی قەید ، بەلام لێرەدا ، هەردووکیان بە (ز) دەخوێنرێنەوە لە کوردی ، بۆیە ئەگەر قەیدەکە بکرێ بە دەنگی (ز) بۆ هەردووکیان ، کارەکە لەبارترە ، خانی دەڵێ :

دەم ماحیە بێت ئەوێ بکەت هەضم

دەم دافیعە بێت ئەوێ بکەت کەظم[٢ : ٢٠٦] .

ڕوون کردنەوە : ئێمە لە کوردیدا ، تەنیا ئەم (١٤) قەیدەمان کەوتە بەرچاو ، کە دوویان (و-w ، ی-y) نیمچە بزوێنن و دوازدەیان نەبزوێنن . لەمانەش دوویان دەنگی تایبەتین بە زمانی عەرەبی و لەکوردیدا نین (ص ، ظ). ئەگەر بە پێی فۆنۆلۆجی کوردی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین دەبن بەیەک دەنگ(ز) و بەمەوەش ژمارەی قەیدە نەبزوێنەکان دەبێ بە یازدە . کەچی لەفارسیدا دە دەنگبۆ قەیدی نەبزوێن دیارکراوە . لەبەراوردکردنی قەیدی نەبزوێنی کوردی و فارسی دەردەکەوێ :

نۆ دەنگ لە هەردوو زمان هاوبەشن (س ، هـ ، ش ، ب ، ف ، ر ، خ ، ن ، ز) دەنگێک لە فارسی هەیە و لەکوردیدا نییە (غ) ، دوو دەنگیش لە شیعری کوردی هاتوون و لە فارسیدا نین (ل ، م) . جگە لە قەیدی نیمچە بزوێن کە دوو دەنگن (y،w) فارس لە لێکۆڵینەوەی سەرواناسیدا نەیانخستوونەتە ناو قەیدەکانەوە ، کەچی لەعەرەبیدا باسیان کراوە بەلام نەک بەناوی قەید ،

تەنئوخی ئەم دوو نیمچە بزوێنەش بە ڕیدف دەزانێ بەڵام زاراوەی (الجزم المبسط)ی بۆ داناون، بەرامبەر بە ڕیدفی (و،ی)ی بزوێن کە پێیان دەڵێ (الجزم المرسل) [٢٧٣ : ٨٤].

جـ- تەئسیس : ئیبن ڕەشیق لە پێناسەی تەئسیسدا دەڵێ : (ئەلفێکە لەگەڵ ڕەویدا تیپێکیان بەینە دەشێ ئەو تیپە بگۆڕێ) [٢٤٦ : ١٦١]. تەئسیس دەبێ وەکو ڕەوی لەسەرەتاوە تا کۆتایی هۆنراوە پەیڕەو بکرێ، ناشێ (ا)ی تەئسیس بگۆڕێ ولە دێڕێکی تر ببێ بە (و) ولە یەکێکی تر ببێ بە (ی)، هۆیەکەش ئەوەیە (ئەلفی مەد لە تیپەکانی تری مەد، لەبەر گوێ ئاشکراترە، بۆیە شاعیر و عەرووز زانەکان زیاتر بایەخیان پێداوە، نەك هەر پێش ڕەوی (کە دەبێتە ڕیدف) بەڵکو کاتێ لەگەڵ ڕەوی تیپێکیشیان بکەوێتە نێوان شاعیر هەر ئیلتزامی پێ دەکا و عەرووز زانەکان بە واجیبی دەزانن شاعیر پەیڕەوی بکات ... هۆی ئاشکرایی دەنگی (ا) زیاتر لە بزوێنەکانی دی ئەوەیە کە ماوەیەکی زەمەنی زیاتری دەوێ بۆ گۆکران) [٢٤٣ : ٢٧٢-٢٧٣]. هەر لەبارەی ئەم تەئسیسەوە زاناکانی عەرووزی عەرەبی مەرجێکی تریشیان بۆ داناوە : دەبێ (ا)ی تەئسیس و ڕەوی لە یەك وشەدا بن، ئەگەر بەسەر دوو وشە دابەش ببن بە تەئسیس دانانرێ (ئەگەر ڕەوی لە وشەیەك و تەئسیس لە وشەیەکی تر بێ، لەبەر دووری بە تەئسیسی دانانێن) [٢٤٦ : ١٦١]. ئەم ئەلفە بۆیە پێی دەگوترێ تەئسیس چونکە (لە پێش هەموو تیپەکانی سەروا دێ ولەم بارەیەوە وەکو بناغەی خانووایە) [٢٤٧ : ١٥١]. حەمدی دەڵێ :

فەلاتوون بۆیە وتوویە نابێ قەت ئەمسالی خۆر جازیب
بزانە چۆنی ڕاکێشا، بە ڕووی یاری کە کرد حاجیب [٦ : ١٨٣].

(جازیب، حاجیب) وشەی سەروان. (ب) ڕەوییە، (ا) تەئسیسە. ئەم ئەلفە لە هەموو وشەکانی تری سەروای هۆنراوەکە پەیڕەو کراوە (نائیب، واجیب، غائیب، غالیب، کازیب، تالیب) ئەگەر تەئسیس لە دێڕێك بێت ولە دێڕێك نەیەت، ئەمە دەبێ بە کەم و کورتی) [٢٥١ : ٩] چونکە ئاوازی وشەکە دادەڵەنگێ.

د- دەخیل : ئەو دەنگە نەبزوێنەیە کە ڕاستەوخۆ دوای ئەلفی تەئسیس دێ. ئیبن جنی بەم جۆرە پێناسەی دەخیلی کردوە : (ئەو تیپەیە کە دەکەوێتە نێوان تەئسیس و ڕەوی، وەکو زای - المنازل - و هائی - الدراهم) [٢٤٥ : ٢٧]. هۆی ناونانی ئەم دەنگەی بە دەخیل بەم جۆرە لێك دراوەتەوە (بۆیە پێی دەڵێن دەخیل چونکە وەکو دەخیلی ناو میللەت وایە، بە پێچەوانەی ئەسلەکەوە دێ. هەرچەندە لە دوای تیپێك دێ کە نابێ بگۆڕێ ئەو خۆی دەشێ بگۆڕێ. لە بنچینەدا هەق وانییە ئەم تیپە بگۆڕێ چونکە لەتیپی پێش خۆی، زیاتر لە کۆتایی سەرواوە نزیکە، لەبەر ئەوەی پێچەوانەی ئەم بنچینەیەیە، وەکو پاشکۆیەکی سەروای لێ دێ، دەشێ بۆیە پێی بگوترێ دەخیل چونکە دەچێتە نێوان تەئسیس و ڕەوی) [٣٠٢ : ٨٢]. و سەبیان ڕای وایە کە دەخیل دەشێ بگۆڕێ و مەرج نییە لە هەموو دێڕەکان پەیڕەوی بکرێ، ئیبن ڕەشیقیش هەروای بۆ

دەچێ (خەڵك هەموو ڕایان وایە کە دەخیل دەگۆڕێ ، بگرە هەندێك هەر ناویان نەهێناوە چونکە لە گۆڕان و جیاوازیدایە ، بەشتێکی نا پێویستی سەروایان زانیوە و خۆیان لێ بێ دەنگکردوە ) [٢٤٦ : ١٦١]. مەحوی دەڵێ :

کەلامێکە لە حیکمەت کەیل و جامیع

عەتاکەر هەریەکە ، هەر ئەوشە مانیع [١٨٠ : ١٦٧].

وشەی سەروا (جامیع ، مانیع)ن . (ع) ڕەوی و (ا) تەئسیسە ، (م ، ن) دەخیلن . وەك دیارە دەخیل لەم دوو وشەیەدا یەك نییە و گۆڕانی بەسەردا هاتوە. بۆ وشەکانی تریش هەمان شتە (نافیع ، قانیع ، فاقیع ، تابیع ، جوامع ، قاتیع) وەك دیارە لەم (٧) دێڕ (٨) سەروایەدا ، دەنگەکانی دەخیل (م ، ن ، ف ، ق ، ب ، ت) تەنیا دوویان دووبارە بوونەتەوە (م ، ن) ، ئەوانەی تر تەنیا یەکە و جار هاتوون . پەیڕەو کردنی دەخیل لەسەراپای هۆنراوەدا ، جۆرێکە لە خۆیەستنەوە بەشتی ناپێویست . (لزوم ما لایلزم) و ئەگەر چی ئیقاعی وشەی سەروا پتەوتر دەکات بەڵام دەبێ بەبارگرانییەکی زیادەکی بەسەر ئەستۆی شاعیرەوە ، بە تایبەتی ئەگەر هۆنراوەکە درێژ بێ .

٨- ئیشباع (الاشباع) : ئیشباع (حەرەکەی تیپی دەخیلە) [٢٤٥ : ٢٩]. ئەم بزوێنە کورتەی دوای دەخیل (کە دەکەوێتە پێش ڕەوی) . خەلیل دەڵێ دەشێ لە دێڕێکەوە بۆ دێڕێکی تر بگۆڕێ بەڵام ئەخفەش دەڵێ نابێ بگۆڕێ [٢٤٦ : ١٦١]. قازی ئەبولفەزڵ ڕای لەگەڵ خەلیل یەك دەگرێتەوە ، دەڵێ (بزوێنی دەخیل مادام ئیشباع بێ دەشێ لە نێوان سەرو بۆرو ژێردا بگۆڕێ)[٢٤٦ : ١٦١]. بەڵام ئەم گۆڕانە لە نێوان بۆروژێردا کەمترە تا لە نێوان سەر لەگەڵ هەریەکێ لە بۆروژێردا . ئەبوعەلاء دەڵێ دەخیل بەزۆری بزوێنەکەی ژێرە ، ئەگەر بەبۆریان سەر بێ ئەمە ناپەسندە ، هاتنی بۆروژێر لە گوێ ترە چونکە وەکو جووتە خوشك وان ، کەچی سەر لەگەڵ هەریەکێ لەمانە بێ درێوی دەکا) [٢٥١ : ١٢] ئیشباع بەزۆری ژێرە ئیبن جنی دەڵێ : (تەئسیس بەزۆری بە دەخیلی ژێردار هاتوە دەشێ دەخیلەکەی بۆریش بێ بەڵام (سەر) نارەکەی کەمە) [٢٧٢ : ٨٢]. لەعەرەبیدا ، ئەوەندە شیعر بەتەئسیس و ئیشباعی ژێر نووسراوە وەکو پێویستی لێ هاتوە ، هۆنراوەی بە ئیشباعی سەر زۆر کەم دەست دەکەوێ ، د.ئیبراهیم ئەنیس لەبارەی بزوێنی ئیشباعەوە دەڵێ : (عەرووززانەکان وایان پێ پەسندە ، ئەگەر ئەلفی تەئسیس هەبوو، تیپەکەی نێوان تەئسیس و ڕەوی بزوێنەکەی دواوەی ژێر (کەسرە) بێ)[٢٤٣ : ٢٧٤]. لە کوردیدا ، بەتایبەتی لەغەزەل و قەسیدەدا، ئیشباع و دەخیل و تەئسیس لەو کاتە دێن کە وشەکانی سەروا عەرەبی بن ، لەهەموو هۆنراوەی کلاسیکی کوردی هۆنراوەیەك دەست ناکەوێ هەموو وشەکانی سەروای وشەی کوردی بە تەئسیس بن ، ڕەنگە بەدەگمەن لەمەسنەویدا هەبێ بەڵام ئەویش بشووی کورتە. گەڕانەوەیەك بۆ دوو شوونەکەی پێشەوە (تەئسیس) و (دەخیل) دوو ڕاستیمان لەم بارەیەوە بۆ دەردەخا : ١- هەموو وشەکانی سەروای هەردوو هۆنراوە . وشەی عەرەبین . ٢- بزوێنی ئیشباع لە هەردووکیاندا

ژێرە (کسرە) یەو لە هیچ وشەیەکدا ئەم بزوێنە نەگۆڕاوە . گۆڕانی ئەم بزوێنە بۆتە یەکێ لە کەم و کورتییەکانی سەروا. نموونەیەکی ئیشباع ، حاجی دەڵێ :

مەعدەنی عیلم و عالیمی عامیل
قوتبی دەوران و مورشیدی کامیل [٦٠ : ٢٢١] .

بزوێنی کورتی دوای (م)ەکان ئیشباعە .

و- تەوجیە (التوجیە) : (بزوێنێکی کورتە لە پێش ڕەوی نەبزوێن دێت) [٢٤٥ : ٢٩] . لە بارەی ناونانی ئەو بزوێنەیە بە (تەوجیە)، سەییان دەڵێ (بۆیە پێی دەگوترێ تەوجیە چونکە بزوێنی پێش تیپی وەستاو وەکو بزوێنی خۆی وایە ، وەك ئەوەی ئەو ڕەوی ئاراستە بکات و ڕەوی وەکو قوماشی دوو ڕوو ، دوو ڕووی هەیە وەستان و بزوان) [٣٠٢ : ٨٥] . گۆڕانی بزوێنی تەوجیە لە دێڕێکەوە بۆ دێڕێکی تر بەکەم و کورتی سەروا دانراوە. تەوجیە و ئیشباع لەم ڕووەوە وەکو یەك وان کە هەردووکیان بزوێنی کورتن و پێش ڕەوین و دەبێ پەیڕەو بکرێن بەڵام تاکە جیاوازییەکیان لەوەدایە کە ئیشباع لەگەڵ تەئسیس دێ و تەوجیە لە کاتێکدا دێ کە تەئسیس نەبێ .

مەحوی دەڵێ :

ئەوەندەی ئەهلی دونیان ئەهلی دونیا ، تاقە ڕۆژێ گەر
بەقەڕنێ من ئەوەند ئەهلی خودا بم دەبمە پێغەمبەر [١٨٠ : ١٣٠] .

وشەکانی سەروا (گەر ، پێغەمبەر) ، ڕەویان (ر) بەو بزوێنی پێش ڕەوییەکە (ە) کورتەو پێی دەگوترێ (تەوجیە) .

چەند تێبینییەك لەبارەی دەنگەکانی پێش ڕەوی :

١- تەئسیس و ڕیدف هەرگیز بەیەکەوە لەیەك وشەدا کۆنابنەوە ، چونکە ئەگەر (ا)ی تەئسیس هەبێ ، بزوێنی درێژی ڕیدف نابێ ، ئەگەر بزوێنی درێژی ڕیدف هەبێ ، تەئسیس نابێ . دەشێ وشەیەکی سەروا هیچ یەکێ لەم دوانەی تێدا نەبێ ، بەڵام ناشێ هەردووکیانی تێدا بێ . ئەمەش ئاساییە کە تەنیا (موئەسسەس) یان تەنیا (موڕەدەف) بێ .

٢- ئیشباع و تەوجیە هەرگیز بەیەکەوە نایەن ، چونکە هەردووکیان لە پەیوەندییان بە ڕەوییەوە یەکن ، بزوێنی کورتی پێش ڕەوین بەڵام جیاوازی نێوانیان لە ئەلفی تەئسیس پەیدا دەبێ کە تەئسیس هەبێ ، دوای تەئسیس دەخیل دێ و بزوێنی دوای دەخیل ناوی دەبێ بە ئیشباع و ئەگەر تەئسیس نەبێ، یەکسەر بزوێنە کورتەکە دەبێ بە تەوجیە . دەشێ وشەیەکی سەروا هیچ یەکێ لە ئیشباع و تەوجیهی تێدا نەبێ .

٣- لە پێش ڕەوی ، تەنیا دەخیل بۆی هەیە پەیڕەو نەکرێ و لە دێڕێکەوە بۆ دێڕێکی تر بگۆڕێ

دەنگەکانی تر هەموویان دەبێ لە هەموو وشەکانی سەروادا وەکو خۆیان دووبارە ببنەوە ئەگەر نا یەکەم و کورتی دادەنرێ.

دەنگەکانی سەروا تا ڕەوی (بەبڕگە) : ئەو دەنگانەی کە لە کوردیدا ڕەوی و پێش ڕەوی پێک دێنن بە پێی بڕگە بەم جۆرە دەردەکەون :

أ- بزوێنی درێژ : - V -

ب- بزوێن (کورت یان درێژ) + نەبزوێن : - C V

ج- بزوێن (کورت یان درێژ) + نەبزوێن + نەبزوێن : -CCV .

د- بزوێن (کورت یان درێژ) + نەبزوێن + بزوێن (کورت) - V C - V -

ئەوەندە وەك پێویستی دروست بوونی ئیقاعی سەروا دەبێ لە وشەکانی سەروادا هاوبەش بن ئەگەر نا سەرواکە دروست نییە و ناتوانێ لەنگەر ڕابگرێ. بەڵام زۆر ئاساییە کە لە شیعری کورتی وەك مەسنەوی یان لە شیعری تریشدا شاعیر لەمە زیاتر پەیڕەوی یەکسانی دەنگەکان بکات بەمەوە تریەو ئاواز و زایەڵەی سەروا پتەوتر و کاریگەرتر دەبێ بەڵام ئەرکی شاعیر زیاد دەکات چونکە وشەکانی سەروا لەم ڕووەدا کەمتر دەبێتەوە و بواری ڕستەی لەگەڵ هەست و بیرو سۆزدا گونجاوی لێ تەسکتر دەبێتەوە. لە کوردیدا تا ئەم سنوورانەی خوارەوە پەیڕەوی دەنگو بڕگە کراوە :

ا- نەبزوێن + بزوێن (درێژ) : C V - حاجی قادر دەڵێ :

کام حەدیس و ئایەتی موعجیز نوما
هاتوە بۆ ڕەغبەتی ڕەقس و سەما [٦٠ : ٢٠٤].

وشەکانی سەروا (موعجیز نوما ، سەما) ، لە دوو دەنگی کۆتایی (ما) (-VC) هاوبەشن. لەبەر ئەوەی بزوێنی کۆتایی درێژە ، بە تەنیا دەکرا ببێ بە سەروا ، بەڵام شاعیر بۆ زیادکردنی ئاوازی هۆنراوەکە نەبزوێنی (م)ی لە پێش ئەو بزوێنە هێناوە.

ب- نەبزوێن + بزوێن (کورت یان درێژ) + نەبزوێن : C V C واتە بڕگەیەکی تەواوی داخراو لە کۆتاییدا دەبێ بە سەروا، حاجی دەڵێ :

لە دەشت و دێ و ویلایەت ببنە ئەحباب
وەکو شەخسێکی واحید بن لە هەرباب [٦٠ : ٢٣٣].

وشەکانی سەروا (ئەحباب ، باب) بڕگەی کۆتاییان (باب) وەکو یەك وایە ، تەنانەت دووەمیان هەر لەو بڕگەیە پێك هاتوە و وەکو بەشی دواوەی وشەی پێشوو خۆی دەنوێنێ.

ج- نەبزوێن + نەبزوێن + بزوێن (درێژ) :- - C C V - . لێرەدا وەك دیارە دەنگە هاوبەشەکان کەوتوونەتە ناو دوو بڕگەی کۆتاییەوە ، پەراوێزی کۆتایی بڕگەی پێشەوە و بڕگەی

کراوەی دواوە، حاجی دەڵێ :

لە ئادەم بگرە تا دەورای ئێستا
یەکێکە حاجی لەو خاکە هەڵستا[٦٠ : ٢٥٢].

دەنگە هاوبەشەکانی وشەکانی سەروا (ستا) بەسەر دوو برگەدا دابەش بوون، (س) لەگەڵ برگەی پێشەوە دایە (ئێس، هەڵس) و (تا) برگەی کراوەی سەربەخۆیە.

د- بزوێن (کورت یان درێژ) + نەبزوێن + بزوێن (درێژ) : - v - c v - لێرەشدا، دەنگە هاوبەشەکان بەسەر دوو برگەدا دابەش دەبن، ناوکی برگەی پێشوو و برگەی کراوەی دواوە، خانی دەڵێ :

لێ سەنعەتێ وی حەکیمێ زانا
نەقشێ ئەوی قادرێ تەوانا[٣ : ١١].

دەنگە هاوبەشەکان ئەمانەن (-انا)، (ا) ناوکی برگەی پێشەوەیە و (نا) برگەی کراوەیە.

هـ- بزوێن (کورت یان درێژ) + نەبزوێن + بزوێن (کورت یان درێژ) + نەبزوێن : v - c v c - ،لێرەشدا دەنگە هاوبەشەکان لە دوو برگەدان، ناوکی برگەی پێشەوە و برگەی داخراوی دواوە، حاجی دەڵێ :

بە فیکرت دێ زەمانێ چوونە بەڵەك
بەبێ خاوسی، نەکەوشم بوو، نەکەڵەك[٦٠ : ٢٤٦].

دەشێ لە وشەکانی سەروادا (بەڵەك، کەڵەك) دەنگی (ا) بە تەنسیس لێك بدرێنەوە و (ڵ)ەکە دەخیل (ە)ی پاش (ڵ) ئیشباعە. لەم حاڵەتەدا ئەوەی سەرنج رادەکێشێ دەخیل پەیرەو کراوە کە پەیرەو نەکردنیشی لە کێشناسیدا هەر رەوایە.

و- بزوێن (کورت یان درێژ) + نەبزوێن + نەبزوێن + بزوێن : - v c c v - ، دەنگەکانی سەروا دەچنەوە سەر دوو برگە، برگەی پێشەوە پەراوێزی پێشەوەی ئازادە و برگەی دواوەش کراوەیە. لەبەر ئەوەی بزوێنی دوو برگە دەکەونە ناو ئاوازی سەرواکە، مەرج نییە بزوێنی کۆتایی درێژ بێ، بە درێژی و بە کورتیش هاتوە، بۆ بزوێنی درێژ نالی دەڵێ :

حیرەت زەدە، وا دیدە وەکو حەلقەیی دەرما
بێ پایە نییە عاشیقی بێچارە بفەرما[٢٠٩ : ٥٠].

لە وشەکانی سەروا (دەرما، بفەرما)، دەنگە هاوبەشەکان (-ەرما) بەسەر دوو برگەدا دابەش بوون (-ەر) و (ما-). لێرە تەنیا (ا)ی کۆتایی، چونکە بزوێنێکی درێژە، بەس بوو بۆ سەروا، ئەوانەی تر هەموو زیادەن و بۆ زیاد کردنی مۆسیقیەتی سەروا هاتوون.

نموونە بۆ بزوێنی کورت، وەکو حاجی دەڵێ :

دەوەن ئاخیر دەبێتە داری گەورە
مەڕی لەڕ خدمەتی بۆ گۆشتی چەورە [٦٠ : ٢٦٠].

ز- ئەگەر وشەکانی سەروا ڕەگەز دۆزی بن ، ئەو حەڵە دەنگە هاوبەشەکان هەموو بڕگەکانی وشەکە دەگرنەوە هەرچەندی هەبێ . حاجی دەڵێ :

سەد وەکو ڕۆستەم بە دڵ قەمچی لە ڕەخشی دا ، بەزی
وەك گەیشتە خەندەکی پایانی عومری دابەزی [٦٠ : ١٦٤].

کۆتایی هەر دوو لەتە دێر ڕەگەز دۆزییە (دابەزی) ، لە یەکەمیان (دا) فەرمانی لێدانە و بەزی لە بەزینەوە هاتوە ، لە دوەمیاندا دابەزی لە فەرمانی دابەزین (پیابوون)ەوە هاتوە . پێش ئەویش لە هەردوو لەتدا (ی) هەیە ، واتە دەنگە هاوبەشەکان ژمارەیان (٧)ە و بەناو چوار بڕگەدا دابەش دەبن : - v - vc - vc - vc - کە هەموویان بڕگەی کراوەن .

سێ- پاش ڕەوی : ئەو دەنگە زیادانەیە کە وەکو مۆرفیمی ڕێزمانی بە کۆتایی وشەی سەرواوە دەلکێن ، چونکە لە کوردیدا وشەی سەروا ، بەشێوەی ڕووت و ڕەسەنی خۆی بەڕەوی کۆتایی دێ ، تەنیا ئەگەر کۆتاییەکەی بزوێنی کورت بێ ، جا کە لە ڕەوتی ڕستەی دێرە شیعردا زیادەیەکی ڕێزمانی پێوەلکا ، ئەم زیادەیە بە پاش ڕەوی دەناسرێ . لەعەرەبیدا پاش ڕەوی دوو جۆرە :

١- تیپێکە دوای ڕەوی دێ و پێیەوە دەلکێ و یەکێکە لەم چوار تیپە : و ، ا ، ی ، هـ وپێی دەگوترێ (الصله) یان (الوصل) [٢٧٣ : ٩٨].

٢- ئەو تیپەیە کە لە (هـ)ی (صله)ی بزواوەوە پەیدا دەبێ ، ئەگەر حەرەکەی (هـ) بۆر بێ دەبێ بە (واو) و ژێر بێ دەبێ بە (ی) و سەر بێ دەبێ بە (ا) ، ئەمەش پێی دەگوترێ خروج [٢٧٣ : ٩٨].

واتە (هـ)ی وەستاو (صله)یە و (و ، ا ، ی) ئەگەر لە ئیشباع کردنی حەرەکەی ڕەوییەوە هاتبن (صله)ن و ئەگەر لە ئیشباع کردنی (هـ)ی (وصل)وە هاتبن (خروج)ن . لەوە بترازێ لە عەرەبیدا هەر زیادەیەکی بێتە سەر وشەی کۆتایی نابێ بە پاش ڕەوی .

کەچی لەفارسیدا ، جگە لە (وصل) و (خروج) دوو دەنگی زیادەی تریش هەن (مەزید ، نایرە). بەم جۆرە پاش ڕەوی لە فارسیدا دەبێ بە چوار (وصل ، خروج ، مەزید ، نایرە) . (وصل) و (خروج)ی فارسی لەوانەی عەرەبی جیایە . لە فارسیدا وصل (ئەوەیە کە ڕەوی بەوەوە بلکێ و ئەمە لە شیعری فارسیدا ئەلف و دال و کاف و هاو یاو تیپەکانی ئیزافە و کۆ و چاوگ و بچووك کردنەوە و پەیوەندین) [٤٠٢ : ٢٢٩] ، قەیسی ڕازی یەکەو دێرە شیعری بە نموونە بۆ ئەم (وصل)ـە هێناوە. [٤٠٢ : ٢٣٩-٢٤٠] . (خروج)یش لە فارسیدا بە دەنگی تایبەتی نەبەستراوەتەوە ، هەر دەنگێکی

دوای (وصل) بێ بە (خروج) دادەنرێ[٤٠٢ : ٢٤١]. کەچی دوەکەی تر کە تایبەتین بە فارسی، یەکەمیان (مەزید) (ئەوەیە کە خروج پێیەوە دەلکێ و بۆیەش پێی دەگوترێ مەزید چونکە لە عەرەبیدا ئەوپەڕی تیپی سەروا تا خروج دەڕوا، جا ئەگەر لەسەروای عەجەم، تیپێك لەوە زیاتر بێ پێی دەگوترێ مەزید) [٤٠٢ : ٢٤١] و جۆری تیپەکەیان دەنگەکەی دیار نەکردوەو بە ڕەهایی جێی هێشتوە. دوەمیشیان (نایرە)یە، ئەویش (ئەوەیە کە تیپی مەزیدی پێوە دەلکێ، بنچینەی ئەم ناوە لە -نوار- هاتوە کە مانای ڕاکردنە و (نار)یش هەر بۆیە بە ئاگر دەگوترێ چونکە لە گڕی هالاوگرتوو بلاو بوەوە دایە، دەڵێن -امرأە نوار- واتە ئەو ژنەی پارێزگارەو لە کاری خراپە دوور دەکەوێتەوە، جا لەبەر ئەوەی ئەم دەنگە ئەوپەڕی تیپەکانی سەروایە، بە دوو پلە دوورتر دەکەوێتەوە و پێی دەگوترێ نایرە ... وا دەبێ کە نایرە دووبارەبێتەوە و دوو سێ نایرە بە دوای یەکتردا دێن) [٤٠٢ : ٢٤١-٢٤٢]. لە کوردیدا، وامان بە چاك زانی هەر زیادەیەکی بێتە سەر ڕەوی لە ژێر ناوی پاش ڕەوی لێی بکۆڵینەوە بێ ئەوەی ئەو زاراوانەی بۆ دابنێین چونکە جیاوازییەکی ئەوا لە نێوان کوردی و عەرەبی و فارسیدا هەیە لە ڕووی ئەو دەنگە زیادانەوە. پاش ڕەوی لە کوردیدا دوو جۆرە :

أ- پاش ڕەوی ئەسلی ئەو بزوێنە کورتەیە (ە) کە لە کۆتایی ئەسلی وشەی سەروادایە، ئەم دەنگە وە نەبێ زیادەی ڕێزمانی بێ، بەڵکو بەشێکە لە وشەکە خۆی بەلام لەبەر بێ هێزی نابێ بە ڕەوی و ئەبزوێنی پێشەوەی دەبێ بە ڕەوی، ئیدی ئەو دەکەوێتە خانەی پاش ڕەوییەوە، پاش ڕەوی ئەسلییە، حاجی دەڵێ :

زۆر سەگم دیوە فەقەت ئەمدی ڕەقیبی هەندە سە
وەزعی نامەوزون دەبێ وەك خانوویی بێ هەندە سە [٦٠ : ٢٧٢].

(ە)، هەرچەندە لەهەر دوو وشەی سەروادا (هەندە سە) لە ئەسلی وشەکەدایە، بەلام لەبەر ئەوەی بزوێنێکی بێ هێزە نەبۆتە ڕەوی، (س) بۆتە ڕەوی و (ە) کشاوەتەوە دواوە و کەوتۆتە پاش ڕەوی، جا لەبەر ئەوەی لە ئەسلی وشەکەدایە و زیادە نییە، پاش ڕەوی ئەسلییە.

ب- پاش ڕەوی زیادە : ئەو مۆرفیمە ڕێزمانییانە دەگرێتەوە کە بە کۆتایی وشەی سەرواوە دەلکێن و خانەی پاش ڕەوی داگیر دەکەن. لە کوردیدا ئەم جۆرە پاش ڕەوییە دەشێ تەنیا یەك مۆرفیم بێ، هەروەکو دەشێ لەیەك مۆرفیم زیاتر بێ.

١- پاش ڕەویی زیادەی یەك مۆرفیمی : ئەمە هەندێ لەم جۆرە پاش ڕەوییانە و نموونەیان :

- (ە) و (ەن - ی هەورامی)ی فەرمانی بوون (الكینونە ، tobe)، حەمدی دەڵێ:

لە ئەحوالی زەمانە گفتوگۆ ناکەم خرافاتە
هەموو عالەم کە سەرمەستی مەیە و دنیا خراباتە [٦ : ٣٢٤].

لە وشەکانی سەروا (خرافاتە ، خراباتە) کە هاو ئاوازن ، ڕەوی دەنگی (ت)ەو فەرمانی بوون کە بۆ کەسی سێیەمی تاك دەبێ بە (ە) ولێرەدا بە ئەسلی وشەی سەرواوە لکاوە پاش ڕەوییەو لە هەورامیدا ئەم فەرمانە دەبێ بە (-ەن) ، مەولەوی دەڵێ :

دڵ گوم بۆ یا گەش مەنزڵگەی چەمەن
چەم گوم بۆ یا گەش ڵلەی پڕ خەمەن [١٨٦ : ٨٠] .

وشەکانی سەروا (چەمەن ، خەمەن) ، ڕەوییەکەیان (م)ەو (ەن)ی فەرمانی بوون بۆتە پاش ڕەوی.

- نیشانەی ئیشارەت (ە) ، هەژار دەڵێ :

لەو بگرەو بەردە ، لەو هەرایە
لەو زرم و کوت و زەنازەنایە [٣ : ٣١٤] .

ڕەوی (ا)ەو پاش ڕەوی (ە)ی نیشانەیەو (ی) نیمچە بزوێنی ناو بەندە بۆ ڕاگرتنی نێوانی دوو بزوێن (ا-ە) هاتوە .

- نیشانەی کۆ (ان) ، مەولەوی دەڵێ :

خورشید سەمای شیرین جەمالان
ڕەشك ئەفزای گرۆی دیدە غەزالان [١٨٦ : ١٨٩] .

- نیشانەی نەناسیاوی (-ەك ، ێك) ، خانی دەڵێ :

تاجدین ب خوە بویە پادشاهەك
مەم ژی ل تەنیشتی شبهێ ماهەك [٢ : ٨٤] .

وشەکانی سەروا (شاە ، ماە) ڕەوییان دەنگی (هـ)یە ، (ەك)ی نیشانەی نەناسیاوی پاش ڕەوییە. هەژار دەڵێ :

نیتن ج وەزیر و یاریکارێك
لات وەك یەکە پادشاو هەژارێك [٢ : ٢٤١] .

(ێك) کە دوای (ر)ی (یاریکار ، هەژار) هاتوە ، پاش ڕەوییە .

- ڕاناوی لکاو بە هەموو جۆرەکانییەوە ، نالی دەڵێ :

حەنایی کردوە پەنجەیی بە خوێناوی دڵی زارم
ئەمە ڕەنگی شەهادەت بێ کە کوشتەی دەستی دڵدارم [٢٠٩ : ٧٥] .

(زارم - دڵدارم) وشەی سەروان ، (ر) ڕەوییە و (م) پاش ڕەوییە . دوا برگەی وشەکانی سەروای ئەسلی بریتین لە (زار ، دار) کە برگەی داخراون ، بەڵام کە ڕاناوی (م) دێ ، ئەمە دەنگێکی نەبزوێنە و بزوێنێکی بچووك لەگەڵ خۆیدا دێنێ و سنووری برگەکانی پێشوو بەرەو پێش پاڵ دەدا و

و بەراوێزەکانی کۆتایی بۆ خۆی ڕادەکێشێ و دەنگەکانی سەروا بەم جۆرە دابەش بڕگە دەبن (را-رم ، دا-رم).

٢- پاش ڕەوی زیادەی فرە مۆرفیمی : ئەمەش هەندێ لەم جۆرە پاش ڕەوییانە :

- نیشانەی ناسیاوی + نیشانەی کۆ ، حاجی دەڵێ :

پەندی من خامی دەڕانن ، خامەکان

شیرین و پوختەی دەڕانن ، پوختەکان [٦٠ : ٢٠٤]

وشەکانی سەروا (خامەکان ، پوختەکان) ، ئەسڵەکانیان (خام ، پوختە)یە . ئەمانە ڕەوییان یەك نییە و ئەمەش کەم و کورتییەکی گەورەی شیعرەکەیە . جێی سەرنجە حاجی لە زۆر شوێندا گوێی بە پاراستنی دەستووری سەروا نەداوە ، ئەو زیادانەی هاتوونەتە سەر وشەکان (ەکان یان کان) جێگای پاش ڕەوی گرتۆتەوە و لە دوو مۆرفیمی جیاواز پێك هاتوە ، نیشانەی ناسیاوی (ەکە) و نیشانەی کۆ (ان).

- نیشانەی نەناسیاوی و ڕاناو (هەر جۆرێ بێت) ، نالی دەڵێ :

شەوهات و ئەمن مەستی خەیاڵاتی کەسێکم

مەشغوولی نەفەس گرتنی مشکێن نەفەسێکم [٢٠٩ : ٧٧].

وشەکانی سەروا (کەسێکم ، مشکێن نەفەسێکم) ، ئەسڵەکانیان (کەس ، مشکێن نەفەس)ە و ڕەوییان (س)ە ، (ێکم) پاش ڕەوییە و لە دوو مۆرفیم پێك هاتوە (ێك) و (م).

- نیشانەی ناسیاوی و ڕاناو (هەر جۆرێ بێ) ، سافی دەڵێ :

دڵبەری ، نازپەروەری ، ڕوو ئەنوەری ، مەهپارەکەم

ئەونیهاڵ ، ئەبرۆهیلال ، شیرین جەمال ، نازدارەکەم [١٠٠ : ٢٦].

ئەم دێرە شیعرەی سافی پڕسەروایە ، هەرلەتێکی سێ سەروای ناوەوەی هەیە ، جگە لە سەروای کۆتایی کە لە وشەکانی (مەهپارەکەم ، نازدارەکەم) خۆی دەنوێنێ . ئەم دووەش ئەسڵەکانیان (مەهپارە ، نازدار)ەیە . ڕەوییەکەیان (ر)ەو (ەکەم) پاش ڕەوییە و لە دوو مۆرفیمی ناسیاوی (ەکە)و ڕاناوێك (م) پێك هاتوە .

- دوو ڕاناو ، حەمدی دەڵێ :

بەستەیی زنجیری زوڵف و داغداری خاڵتم

ئەی سەنەم ، شێتی ئەزەی زنجیرەیی خڕخاڵتم [٦ : ٢٩٨].

(خاڵتم ، خڕخاڵتم) وشەی سەروان . ئەسڵەکەیان (خاڵ ، خڕخاڵ)ە ، (ڵ) ڕەوییە دوو ڕاناوە لکاوەکەش (ت ، م) پاش ڕەوین .

- ڕاناوی لکاو و فەرمانی بوون (to be) ، ئەحمەد موختار دەڵێ :

حەقمە من شەو تا بەیانی ئارەزووی گریانمە
شێت نەبووم وا دایما هەر مەیلی قورپێوانمە [١٠ : ١٠٧].

(گریان ، قورپێوان ) وشەی ئەسلی سەروان و (ن) ڕەوییە ، (م ، ە) کە دوو مۆرفیمی ڕێزمانین (ڕاناوی لکاو و فەرمان ) بوونەتە پاش ڕەوی.

پاش ڕەوی دەبێ بەگشتی، لەهەموو وشەکانی سەروادا بەهەمان دەنگو ماناوە بێ بەلاّم جاری وا دەبێ پاش ڕەوییەکان دەنگیان یەك بێ و مانایان جیا بێ. هەژار دەڵێ :

هەر قەل نەگەیی بە تۆزێ گەردی
قەیسەر سەری خۆی دەدا لەبەردی [٢ : ٢٤٥].

(گەردی، بەردی) وشەی سەروان. (د) ڕەوییەو (ی) لە هەردووکیاندا پاش ڕەوییە بەلاّم مانایان یەك نیە لە یەکەمیاندا ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە، کەچی دوەمیان نیشانەی دۆخە (حالەت).

بەم جۆرە هەر زیادەیەك لە وشەی ئەسلی سەروا ڕێزمان بە وشەکەوە بیلکێنێ دەبێ بە پاش ڕەوی بەلاّم لە ڕووی ئاواز و ئیقاعەوە ، قورسایی ئاوازەکە دەکەوێتە سەر دەنگی دواوە ، جا چ تاکە پاش ڕەوییەك بێ و چ دوەم پاش ڕەوی بێ. بێگومان ئەمەش شوێنەکە وای لێ دەکا ئەم نرخە تایبەتییە بکات و نرخەکەی لەسەر حسێبی ڕەوی ڕاستەقینەیە کە دەخرێتە پێشەوە و تا ڕادەیەك دەکەوێتە ژێر سێبەری پاش ڕەوی و هەر ئەمەش وای کردوە زۆر شاعیر گوێ بە ڕەوی ڕاستەقینە نەدەن . وەکو شیعرەکەی حاجی قادر کە وشەکانی سەروای (خامەکان و پوختەکان) بوو .

باسی دووەم : وشەکانی سەروای شیعری کوردی :

سنووری سەروای شیعری کوردی هەر لە چوارچێوەی ئەو دەنگانەدا نییە کە لە کۆتایی وشەی سەروادا دووبارە دەبنەوە ، بەڵکو سەرواکە پەل بۆ پێش و پاش وشەی سەرەوایش دەکێشێ و ئیقاعەکە فراوانتر و قووڵتر دەکاتەوە ، بۆیە ئەگەر لە ئاستی وشەوە سەیری سەروا بکەین ، دەتوانین سێ جۆری لێ دەست نیشان بکەین ، وشەی سەروا و پێش سەروا (حاجب) و پاش سەروا (ڕەدیف) ، وەکو لەم هێلکارییەدا دیارە :




یەک- وشەی سەروا :

ئەو وشەیەیە دەنگەکانی سەروای لە کۆتاییەوە دێ و دەکەوێتە کۆتایی لەت یان دێرە شیعر و بەهەمان مانا دووبارە نابێتەوە، ئەگەر بەهەمان مانا دووبارە بێتەوە وشەکانی پێش ئەو دەبن بە وشەی سەروا ، حەمدی دەڵێ :

فەت مەکەن بۆمن حیکایەی عەندەلیب و باسی گوڵ
پڕ لە نەشئەی حوسنی یارە تێکهەڵێ بەو باسە دڵ [٦ : ٢٧٦].

(گوڵ، دڵ) وشەی سەروان، دەنگەکانی سەروا لە کۆتاییەوە هاتوون و وشەکان خۆیشیان کەوتوونەتە کۆتایی لەتەکانەوە.

بە زۆری وشەی سەروا یەک تاکە وشەیە ، بەڵام جاری وا هەیە دەنگەکانی سەروا بەسەر دوو وشەدا دابەش دەبن ، ئەمەیان هەرچەندە لە کوردیدا کەمە بەڵام هەیە ، بۆ نموونە خانی دەڵێ :

تا دەست ژ تێکێ بەر نەنادی
نابینی چولەززەتێ ژ بادی [٣ : ١٩٨].

دەنگەکانی سەروا بریتین لە (ادی) ، لە لەتی یەکەم لەیەک وشەدان (نادی). بەڵام لە لەتی دووەمدا کەوتوونەتە ناو دوو وشە (با ، دی -ئەوەی تر) . وا دەبێ (بەڵام زۆر بە دەگمەن) یەک دەنگ، مۆرفیمێکی سەربەخۆبێ و لە کۆتاییدا لەگەڵ دەنگی تری کۆتایی وشەی پێشەخۆی دەنگەکانی سەروا تەواو بکا ، هەژار لە مەم و زیندا دەڵێ :

یەک خەم دەڕەوێنێ ، یەک کزۆلکەو
یەک ڕۆژ دەپەرستێ ، یەک چرای شەو [٣ : ٢٦٢].

لە لەتی یەکەمدا دوو مۆرفیم دەنگەکانی سەروایان تەواو کردوە (کزۆلکە+و) ، لێرە (و) مۆرفیمێکی ڕێزمانی سەربەخۆیە و وەك یەك وشە وایە ، لە لەتی دوەمدا دەنگەکانی سەروا لە یەك وشەیان (شەو) ، دەنگی نیمچە بزوێنی (و) ڕەوییە و دەنگەکانی سەروا بریتین لە (-ەو). ئەم (و)ی ڕەوی لەتی یەکەم دیاردەیەکی دەگمەنە ، یەك فۆنیمە و بۆتە مۆرفیمێکی ڕێزمانی و جێگای ڕەوی گرتوە .

لێکۆڵینەوەی وشەی سەروا : ئەو وشانەی دەبن بە هاوسەروا ، دەشێ لە زۆر گۆشە نیگاوە سەیر بکرێن و هەڵبسەنگێنرێن .

أ- لە رووی دەنگسازییەوە (کێش و ئاواز) :

١- دەشێ وشەکانی سەروا ، کێش و ئاوازیان جیا بێ ، نالی دەڵێ :

چییە گوارە گوناهی وا بەنەستەق
بە گوێ هەڵتاوەسیوە سەر موعەللەق [٢٠٩ : ٦٩] .

وشەکانی سەروا (نەستەق ، سەر موعەللەق) لە رووی کێشەوە یەك نین ، (نەستەق = فع لن) ، (سەر موعەللەق = فاعلاتن) . بە ژمارەی برگەیش بێ یەکەمیان دوو برگەیە و دوەمیان چوار برگەیە . کە دوو وشەکە کێشیان جیا بوو ، بێگومان ئاوازیشیان جیا دەبێ .

٢- دەشێ وشەکان کێشیان یەك بێ بەڵام ئاوازیان جودا بێ ، سالم دەڵێ :

لە رووی تیری موژەی خوێنڕێزی مەحبووب
سەراسەر مولکی دڵ پڕ بوو لە ئاشووب [١٠١ : ٤٤] .

(مەحبووب ، ئاشووب) کە وشەی سەروان ، کێشیان یەکە (فع لان) و هەریەکە لە دوو برگەی درێژ پێك هاتوە ، بەڵام ئاوازیان جیایە . وایە برگەی دوەمیان هاو ئاوازە ، لە هەردوو وشەدا برگەی داخراوە و بزوێنەکەی هەر دووکیان یەکە بەڵام برگەی یەکەمیان لە رووی ئاوازەوە جیایە ، لەیەکەمیان برگەیەکی داخراوە (مەح) و لە دوەمیان کراوەیە (ئا) ، جگە لەوە بزوێنەکانیان جیایە ، بزوێنی یەکەم کورتە هی دوەم درێژە . بەگشتی ئاوازی وشەکانی وەکو یەك نییە .

٣- دەشێ وشەکان هاوکێش و هاوئاواز بن ، سالم دەڵێ :

لە تەرەف یارەوە نۆبەی زەفەرە
ئەی دڵ ئامادە بە خوێنت هەدەرە [١٠١ : ١٢٥] .

وشەکانی سەروا (زەفەرە ، هەدەرە) کێشیان یەکە (فعلن) ، ئاوازیشیان یەکە چونکە هەریەکە لە سێ برگەی کراوە پێك هاتوە و بزوێنی هەرسێکیشیان (ە)یە ، ئەم کورتی و کراوەییەی برگەکان ئاوازەیان یەك دەخا .

لە هۆنراوەی کلاسیکیدا (قیتعە و غەزەل و قەسیدە) کە یەکێتی سەروای تێدا بەیرەو دەکرێ ،

هەموو وشەکان لەبارەی کێش و ئاوازەوە دەکەونە ناو ئەم سێ پەیوەندییەی باس کران ، بۆ شوونە ئەو شیعرەی حەمدی کە بەم دێرە دەست پێ دەکا :

لاچارە دەرهێنانی ڕیشەی ڕۆحییە مەردی نەساز
تێك ئەدا قانوونی عیشرەت ئەو تەلەی دەرچێ لەساز[٦ : ٢٢٥].

وشەکانی سەروای ئەم هۆنراوەیە ئەمانەن : (نەساز ، ساز ، مەجاز ، بەراز ، ئەیاز ، ڕاز ، ناز ، شاز ، نەماز ، فەراز ، نیاز) .

ئەوانەی کێش و ئاوازیان یەکە : (ساز ، ڕاز ، ناز ، شاز) هەریەکە لەسەر کێشی (فاع) هاتوە و لە بڕگەیەکی ناخراو دروست بوە و بزوێنەکەی (ا)یە . (نەساز ، مەجاز ، بەراز ، ئەیاز ، نەماز ، فەراز)یش کێش و ئاوازیان یەکە ، هەموویان لەسەر کێشی (فعول) هاتوون و بزوێنی یەکەمیان (ە) و بزوێنی دوەمیان (ا)یە ، بڕگەی یەکەمیان کراوە و دوەمیان ناخراوە . وشەی (نیاز) لە کێش وەکو کۆمەڵەی دوەمە (فعول) بەلام لە ئاوازلەوان جیایە ، چونکە بزوێنی کورتی بڕگە کراوەکەی لەوان جیایە. لەم سێ کۆمەڵەی سەرەوەدا ، کۆمەڵەی یەکەم و دوەم لەناو خۆیاندا هاوکێش و هاو ئاوازن ، کۆمەڵەی یەکەم و دوەم توخمەکانیان لە کێش و ئاوازدا جیاوازن ، کۆمەڵەی سێیەم لەگەڵ کۆمەڵەی یەکەم لە کێش و ئاوازدا جیان ، بەلام لەگەڵ کۆمەڵەی دوەم کێشیان یەکە و ئاوازیان جیایە .

وەکو ئەمە هەیە ، ئەوەیش هەیە کە هۆنراوەیەك لەسەرەتا تا کۆتایی هەموو وشەکانی سەروای هاوکێش و هاوئاوازبن ، نالی دەڵێ :

ساقی وەرە مەیخانە کە تۆکۆنە ڕەفیقی
گەر مایلی تەوقی حەرەم و بەیتی عەتیقی[٢٠٩ : ١٢١].

ئەم هۆنراوەیە پێنج دێرە و وشەکانی سەروای ئەم شەشەن : (ڕەفیقی ، عەتیقی ، حەقیقی ، عەقیقی ، تەریقی ، سەلیقی) کە هەموو هاوکێشن (فعولن) و ئاوازیان یەکە ، هەریەکە لە سێ بڕگەی کراوە پێك هاتوە ، لە هەموویان بزوێنی بڕگەی یەکەم (ە)و بزوێنی بڕگەی دوەم و سێیەم (ی)یە .

ب- لە ڕووی وشە سازییەوە :

١- بەشەکانی ئاخاوتن : دەشێ وشەکانی سەروا هاوجۆر بن لە ڕووی بەشەکانی ئاخاوتنەوە ، وەکو :

- وا دەبێ هەردووکیان (ناو) بن ، عەونی دەڵێ :

گوتی : عود و کەمانت بێ ، گوتم : نەی
گوتی : جامی شەرابت بێ ، گوتم : مەی[١٤٥ : ٢٢٣].

(نەی ، مەی) هەردووکیان ناون .

- وا دەبێ وشەکانی سەروا (ئاوەڵناو) بن ، حەمدی دەڵێ :

شێواوە ، پەرێشانە ، بڵم حەقییە کە تەنگە

مەحروومە لە دیاری کەسێ شۆخ و قەشەنگە[٦ : ٣٢٢] .

(تەنگە ، قەشەنگە) کە وشەی سەروان ، ئاوەڵناون .

- هەردوو وشەکە (کار) بن (هەر جۆرێك و هەر کاتێك بێ) ، نالی دەڵێ :

ئەو سیلسیلە وا مشکی خەتا ناوی براوە

پڕ پێچ و شکەن ، خەم بە خەم و حەلقە گراوە[٢٠٩ : ١٠٥] .

(براوە ، گراوە) کە وشەی سەروان ، هەردووکیان بۆ ڕابردووی تەواو (ئەنجامداری) بکەر نادیاری کەسی سێیەم بەکار هاتوون .

- هەردووکیان (ئاوەڵکار) بن (بەهەموو جۆرەکانییەوە) ، نالی دەڵێ :

نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ

نەچم شەرتە بێ هەتا ئەم خوارە بێ تۆ[٢٠٩ : ٩١] .

وشەی سەروا لەم دوو لەتەدا (ئەمجارە ، ئەم خوارە)[٣٤] ن . (بێ‌تۆ) پاش سەروایە . هەردوو وشەکە ئاوەڵکارن ، یەکەم ئاوەڵکاری کاتی و دووەم ئاوەڵکاری شوێنییە .

ئەمە بەشە سەرەکییەکان. دەشێ بەشە ناسەرەکییەکانیش بین بە سەروا ، بەڵام ئەوان لەگەڵ یەکتر نایەن ، چونکە ئەگەر بێن دەبێ دووبارە ببنەوە ، ئەوەی دووبارەش بێتەوە لە سەروا دەترازێ و دەبێ بە پاش سەروا ، دەشێ بەشە ناسەرەکییەکان لەگەڵ سەرەکییەکان بکەونە پەیوەندی سەرواییەوە ، ئەمەیش چەند نموونەیەك بۆ جیاوازی وشەکانی سەروا لە رووی بەشەکانی ئاخاوتنەوە :

- ناو و ئاوەڵناو ، مەلا وەسمان دەڵێ :

سەرم سەودایە بۆ زوڵفی پەرێشان

دڵم مەجمووعە بۆ ئێشانی نێشان[٢١٣ : ٩٤] .

وشەکانی سەروا (پەرێشان ، نێشان) یەکەمیان ئاوەڵناوە ، دووەمیان ناوە ، کۆی (نێش)ە .

- ناو و ئاوەڵکار ، حاجی دەڵێ :

گوتم بە بەختی خەواڵوو بەسە ئەتووبی خودا

لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا[٦٠ : ٣١] .

---

[34] ئەم جۆرە ئاوەڵکارە پێی دەگوترێ (adverbial) چونکە لەوشەیەك زیاتر پێك هاتوە ، وەکو دەستەواژەی زەرفی وایە ، (ئەم + جارە) (ئەم + خوارە) .

( خوبا ، ئەولا ) کە وشەی سەروان ، یەکەمیان ناو و دووەمیان ئاوەڵکارە .

- ناو و کار ، حەریق دەڵێ :

بەقوربان ئێستە هیجرانت دەناسم
کە ناری فیرقەتت بۆتە لیباسم[٦٣ : ٢٤] .

( دەناسم ، لیباسم )، یەکەم کارو دووەم ناوە . لەم دوو وشەیەدا ( س ) ڕەوییە ( م ) پاش ڕەوییە .

- ناو و ڕاناو ، سالم دەڵێ :

ئەژدەهایەك شەو ببینێ ماری زوڵفت گەر لە خەو
ئەم دەسێنێ ئینتیقام هەرچی ئەزییەت بێ لە ئەو[١٠١ : ١١٧] .

( خەو ، ئەو ) وشەی سەروان ، یەکەم ناوە و دووەم ڕاناوی سەربەخۆی کەسی سێیەمی تاکە .

- ناو و ڕاناوی پرس ، سالم دەڵێ :

دەدا هەردەم شەکەر خەندەت ( ئەمەر قەند )
بەقوربانی شەکەر خەندەت سەمەر قـــەند
خوبایا ، میحنەتی ســالم هەتا کـــەی
لە کارا سستی ، بێ بەختی ، هەتا چەنـــد ؟ [١٠١ : ٥٦] .

( سەمەرقەند ، چەند ) وشەی سەروان ، سەمەرقەند دووجار هاتوە ، هەرجارەی بەمانایەك ، یەکەمیان ( ئەمەر - قەند ) واتە خەندەی شیرین وەك شەکری تۆ هەمیشە بەری شەکر دەدات . دووەمیشیان ( سەمەرقەند )ی شاری بەناو بانگە . ( چەند ) ڕاناوی پرسە .

ئەمە چەند لایەنێك بوو لە پەیوەندی وشەکانی سەروا ، لەگۆشە نیگای بەشەکانی ئاخاوتنەوە ، ڕەنگە بەشی تریش بکەونە ناو ئەم چجزەوە بەلام کەمن و ئەوەندە بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەست بەسە . لەبەر ئەوەی هۆنراوەی کلاسیکی یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەو کراوە ، هەر هۆنراوەیەك کۆمەڵێ وشەی سەروا دەگرێتە خۆی و وشەکان دەچنە خانەی جیاجیای بەشەکانی ئاخاوتنەوە ، با نموونەیەك وەربگرین ، حەمدی دەڵێ :

لەباسی زوڵفیا ، جانا ، قسوورم بوو بە موو ، فەرموو
ڕەزام هەڵما وەسی ، ئەمما نەئاڵۆزێ بە شەرتێ موو[٦ : ٢٢٩] .

هاتنی وشەی ( موو ) لەسەروای دووەم و پێش سەروای یەکەم ، جۆرە جوانکارییەکی تێدایە . هەموو وشەکانی سەروای هۆنراوەکە ئەمانەن : ( فەرموو ، موو ، بەدخوو ، شوو ، زوو ، ڕوو ، ئاهوو ، چوو ) . ئەم وشانە بەناو خانەی چواربەشی سەرەکی ئاخاوتندا بلاو دەبنەوە :

- ناو : ( موو ، شوو ، ڕوو ، ئاهوو ) .
- ئاوەڵناو : ( بەدخوو ) .

- کار : (فەرموو ، چوو) .
- ئاوەڵکار : (زوو) .
وەك بەراوردێك ، دیارە (ناو) بەپلەیەك و کار بەپلە دوو و ئاوەڵناو و ئاوەڵکار بە پلە سێ دێن .

٢- ڕۆنانی وشەکان : لەم بۆچوونەدا ، چاو نادرێتە بەشی ئاخاوتنی وشەکە ، تەنیا لە ڕووی دروست بوونەوە سەیری دەکرێ.

• وشەکانی سەروا ، وا دەبێ لە ڕۆناندا هاوجۆر بن .

- وا دەبێ هەردووکیان وشەی سادە بن ، قانیع دەڵێ :

بێ حەیایی باوە ئەمڕۆ ، قوڕ بەسەر ناکا ، حەیا
کەندەلان سەر بەرز و شادە ، خۆی بشارێتۆ چیا [١٥٥ : ٤٨] .

(حەیا ، چیا) وشەی سادەن .

- وا دەبێ هەردووکیان وشەی لێکدراو بن ، خانی دەڵێ :

ئەی سونبول ئەگەر هەیی تو خوەش بوو
ڕەیحان ژتە بووینە سیەه روو [٢ : ١٣٠] .

(خوەش بوو ، سیەه روو) وشەی سەروان ، هەردوکیان وشەی لێکدراون ، یەکەمیان لە (خوەش + بوو) واتە (بۆنخۆش) ، دوەمیان لە (سیەه + روو) واتە (ڕووڕەش) پێکهاتوون و ئاوەڵناوی لێکدراون .

- وا دەبێ هەردوو وشەکە داڕژاو بن ، حاجی دەڵێ :

قەت تەسەوور مەکەن تەرەفداری
غەیری غیرەتکەشی بو غەمخواری [٦٠ : ٢١٠] .

(تەرەفداری ، غەمخواری) وشەی داڕژاون ، یەکەم لە (تەرەف + دار + ی) و دوەم لە (غەم + خوار + ی) دروست بوە . لە یەکەمیان (دار) لە (داشتن - هەبوون)ەوە هاتوە لە دوەم (خوار) لە (خواردنەوە) هاتوە .

• وا دەبێ وشەکانی سەروا لە ڕۆناندا جیا بن .

- سادە و داڕژاو ، جزیری دەڵێ :

دل یەکە ، دێ عیشق یەك بت عاشقان یەك یار بەس
قیبلە دێ یەك بت قولوبان دلبەرەك دلـــدار بەس [٥٨ : ٢٦٤] .

(بەس) پاش سەروایە . (یار ، دلدار) وشەی سەروان . یەکەم وشەیەکی سادەیە ، دوەمیان وشەیەکی داڕژاوە . لە ناوێك (دل) و ڕەگی فرمانێك (دار) دروست بوە .

- ساده و لێکدراو ، مەحوی دەڵێ :

ڕۆڵە ، گەر حەز دەکەی ببیە شا کوڕ

پەندی مەحوی لە گوێ گرە وەك دوڕ [١٨٠ : ٣٢٧] .

وشەکانی سەروا (شاکوڕ ، دوڕ) ، یەکەمیان لێکدراوە (شا + کوڕ) و دووەمیان سادەیە .

- لێکدراو و داڕژاو ، خانی دەڵێ :

ڤان سادیق و ڕاست و خێر خواهن

ڤان قەمسی و خوارو ڕووسیاهن [٢ : ٩٥] .

(خێرخواه ، ڕووسیاه) وشەی سەروان ، یەکەمیان داڕژاوە لە (خێر - چاکە) و (خواه) لە خواستنەوە هاتوە ، بچێتە سەر هەر وشەیەك مانای خوازیاری ئەو شتە دەگەیەنێ . دووەمیان لە دوو وشەی (ڕوو - سیاه) لێکدراوە .

لە هۆنراوەی کلاسیکیدا کە بە یەکێتی سەروا دێ ، بۆی هەیە وشەکانی سەروا ، لەسەرەتا تا کۆتایی هۆنراوەکە ، جۆری ڕۆنانی جیا جیایان هەبێ ، بۆ نموونە ئەو هۆنراوەیەی سالم کە سەرەتاکەی بەم دێرە دەکاتەوە :

وەکو نەی تا لەبەر نەگرێ لەبی یار

نەی ئاسا دێتە گوێم نالەی دڵی زار [١٠١ : ٥٨] .

وشەکانی سەروای ئەم هۆنراوەیە ئەمانەن : (یار ، زار ، تار ، سپاکار ، میعمار ، تاتار ، گوڵنار ، گرفتار) وشەکان دەکەونە ناو هەرسێ خانەی ڕۆنانەوە :

وشەی سادە (یار ، زار ، تار ، تاتار ، میعمار) ، وشەی لێکدراو : (سپاکار ، گوڵنار) وشەی داڕێژراو (گرفتار) .

٣- ڕەسەنێتی وشەکان : لێك جیاکردنەوەی وشەی ڕەسەن و ناڕەسەنی هەر زمانێك کارێکی زەحمەتە ، چونکە لێکۆڵینەوەی وردو زانستی ئێتیمولوجی بۆی هەیە ڕەگی هەندێ وشەی وا بباتەوە زمانەکانی ترکە بە وشەی زۆر ڕەسەن ناسراو بن ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ وشەی خوازراوە زەق دیارن . چونکە تەواو لە بۆتەی فۆنۆلۆجی و سیمانتیکی کوردیدا نەتواونەتەوە . لەبەر ئەوەی شاعیرانی کلاسیکی کورد زۆر لە ژێر کاریگەری زمانە دراوسێکانمان بوون ، زۆر وشەی ئەو زمانانەیان لە شیعرو بۆ سەروا بەکار هێناوە . هەندێ جار نەك هەر وشە بەڵکو دەستەواژەی زەقی بیانی لە کۆتایی دێر و لەتدا ڤیت دەبنەوە ، مەلای گەورە دەڵێ :

ڕوحی زەغلوول لە (جنه المأوی)

شادمان ئەبێت (کیف ما یهوی) [١٢٦ : ١٤٧] .

شاعیرانی کلاسیکیمان ، وشەی عەرەبی و فارسی و تورکی زۆریان خواستۆتەوە کردوویانە بە

وشەی سەروا. زۆر جار وشەی لەت و دێری یەکەم بە جۆرێ بوە وای سەپاندوە سەراپای وشەکانی سەروا بیانی بن ، بۆ نموونە شاعیر ئەگەر لە لەت و دێری یەکەمدا وشەیەکی سەروای بە ڕەوی دەنگێکی عەرەبی (ص ، ض ، ط ، ظ ، ث ، ذ) هێنا ، لەبەر ئەوەی ئەم دەنگانە لە کوردیدا نین شاعیر ناچار دەبێ هەموو وشەکانی سەروا بکا بەعەرەبی تا ڕەوییەکانیان یەك بێ. جار و باریش بە دەگمەن وا دەبێ ئەم دەنگە عەرەبییانە حسێبی دەنگی کوردییان بۆ کرابێ ، وشەیەکی کوردییان کردبێ بە هاوسەروای کە ڕەوییەکەی (س ، ز) بێ چونکە ئەو دەنگە عەرەبییانەی سەروا لە کوردیدا بە زۆری بەیەکێ لەم دوو دەنگە کوردییە گۆ دەکرێن . لێرەدا لە هەر سێ زمان هەندێ نموونەی وشەی سەروا دێنینەوە کە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بەکار هێنراوون . ئەمە چەند نموونەیەکی ئەم جۆرە وشانە:

-لە عەرەبیدا : ( فەنا ، قەدەر ، مەرەز ، سەحەر ، تۆفان ، حەرەم ، حاشا ، ئینشا،موتالا ، مال ، مەعنا ، سەبەب ، تەلەب ، سانی ، موخاتەب ، مورەککەب ، خەت ، غەلەت ، سەقەت ، موختەلەت ، وەسەت ، ئیشارەت ، ئەرواح ، میسباح ، توففاح ، میفتاح ، ئەفراح ، ئیلحاح ، لایوتاق، فیراق ، نیفاق ، مەحاق ، موعەللەق، موتەووەق ، عەدەم ، بولهەوەس ، نەفەس ، قەفەس ، مەسەل ، جەدەل ، عەسەل ، عەمەل ، ئیلاھ ، کاتیب ، لاعیب ، لەهیب ، موسیب ، نەسیب ، مەهیب، مەکسوورە ، مەعموورە ، کوففەلکەفە ، عوششاق ، قوبوور ، سورور ، مەزبەلە ، موحەووەلە ، مەشغەلە ، موعامەلە ، ئەسرار ، عەلەن ، بەیتولحەزەن ، قەرار ، ریبا، کەمال ، جەمال ، جەلال ، خەیال ، زولال ، لەجووج ، بەشارەت ، رەفیق ، عەتیق ، حەقیقی ، تەریق ، مینەللەیالی ، ئەسما ، ئیفتیخار ، ئافات ، خەسارات ، موناجات ، مویاهات ، عادات ، تەعبیر ، تەقسیر ، قەسیر ، زەمیر ، سونەن ...) ئەمانە و زۆر وشەی عەرەبی تریش کەنالی کردوونی بە وشەی سەروا .

- لە فارسیدا : سالم دەڵێ :

دابێنە بە پەهلوویی روخا حەلقەیی گێسوو

مەتبووعە بە ئەترافی گولا سونبولی خۆشبوو[١٠١ : ١١٥] .

(گێسوو ، خۆشبوو) وشەی سەروان ، هەردووکیان وشەی فارسین ، یەکەمیان لە کوردیدا تەنیا لە شیعری کلاسیکی هاتوە و دوەمیان کوردیەکەی داڕشتنی جیایە (بۆنخۆش) .

ئەمانەش هەندێ وشەی سەروای فارسی : ( هوما ، فەردا ، زائیقەبەخشا ، بیا ، گەوهەر ئەفشانی ، ئایشار ، ئەرجوو ، خورووس ، بێدار ، بیمار ، دەست ڕەس ، سیا، رووسیا ، سەرشار، کولاه ، ماه ، راه ، شکەم ، تەخت ئارا ، جەمجا ، خار ، دلفریب ، شاپوور ، شام ، خام ، نەیشەکەر ، خیرەدمەن ، خورسەند ، فرزەند ، بریان ، زیبا ، زەنەخدان ، دەریان ، سوخەندان ، سەناخوان ، موهرەگوشا ، بیار ، پەرهیز ، کووس ، کوور ، شاهوار ، نام ، زانوو ، تەبهوو ، زەبەر ، ناخودا ، جاروب ، دلجو ، فریب ، نشیب ، دەهەن ، دوختەر ، کەبوتەر ، سیمبەر ، دلاوین ئەخگەر ، شەنا ، مادیان ،

پستەر ، ماکیان ، سەبوو ، سوگواری ، هەما غوش ، خەرگوش ، دولجەوشەن...) .

هۆی بەکارهێنانی وشەی فارسی لە کوردی بە گشتی و لە شیعری کلاسیکی بە تایبەتی و لێرەش بۆ سەروا بە تایبەتی تر بۆ کاریگەری نێوان ئەو دوو زمانە دەگەڕێتەوە :

١- هەردوو زمانەکە لەیەك خێزانن و بەڕەچەڵەك دەچنەوە سەریەك سەرچاوە ، ٢- دراوسێتی ئەم دوو نەتەوەیە، چونکە پێکەوە ژیان دەبێ بەهۆی ئاڵوگۆڕی کەرستەی هۆی لەیەك گەیشتن کە زمانە . ٣- دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی فارسی بەسەر ناوچەیەکی زۆری کوردستان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژی مێژوویی جگە لەوەی بەکارهێنانی ئەم وشانە بۆ سەروا بۆ کاریگەری ئەدەبیش دەچێتەوە ، کە شاعیرانی کورد کەوتبوونە ژێر کاریگەری فارسی لە زۆر لایەنی کێش و سەروا و وشە و دەستەواژە و بابەتی شیعر چاویان لەوان دەکردەوە . ئەم وشانەی بۆ سەروای کوردی خوازراونەتەوە زیاتر پەیوەندییان بە وەسفی یار و ئازاری شاعیر و مەی و مەیخواری و مەیخانە و دەربەدەری دڵ و گڵەوگازاندە و شتی لەم جۆرە یەکە ڕەنگدانەوەی بابەتی غەزەلە .

لە تورکیدا ، لەبەسەر کردنەوەیەکی گشتی وشەی سەروای شیعری کلاسیکی دەردەکەوێ تورکی بەقەد عەرەبی و فارسی دەوری نەبوە . ئەگەرچی شاعیرە کلاسیکییەکانمان تورکیشیان وەکو عەرەبی و فارسییە کە زانیوە چونکە زمانی دەسەڵاتی عوسمانی بوە و لە حوجرەدا خوێنراوە ، لەگەڵ ئەوەشدا وشەی تورکی تا ڕادەیەك لە شیعری کوردیدا کراوە بە سەروا ، نالی دەڵێ :

تیپی شکۆفە، خەیمەیی هەڵدا لە هەر تەرەف

پاشاهی ئەو بەهارە ، هەڵیداوە هۆردوێ[٢٠٩ : ١٣٢] .

(هۆردوێ) کە وشەی سەروایە ، تورکییە (اوردو) ، واتە لەشکرگاە . ئەمەش هەندێ لەو وشە تورکییانەی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بوونەتە سەروا : (سالووس ، عەفار ، قەنارە ، هۆردوو ، چایەر ، جان ، قرمزی ، تابوور ، یەلغار ، دونبار ، ئاق دنگز ، سۆفار ، یەساغ ، وەجاغ، یاغش ، ...) .

ئەمە نموونەی هۆنراوەیەکە کە یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەو کراوە و وشەی کوردی و زمانە دراوسێکان جێگەی سەروایان پڕ کردۆتەوە ، سالم دەڵێ :

غەبغەب و خاڵ و لەب و تورڕەیی یار

سونبول و سیب و بنەفشە و گوڵنار[١٠١ : ٥٧] .

لەم هۆنراوەیەدا ، سالم ئەم وشانەی کردوە بە سەروا (یار ، گوڵنار ، بێدار ، بەهار ، مار ، قومار ، مشار ، چنار) قومار و مشار عەرەبین ، یار و بەهار و مار لە کوردی و فارسیدا هاوبەشن. چنار کوردییە ، گوڵنار تورکییە و لە فارسیشدا هاتوە.

جـ- لە ڕووی ڕستە سازییەوە : ئەرك و شوێنی هەر وشەیەك ، وەك چوارچێوەی گشتی و

لەزماندا تا رادەیەك چەسپاوە ، بەلام لە كاتی قسەكردن و دوان (خیتاب)دا ، بە پێی هەلوێستەكە كە باری گوێگر و نیازی قسەكەری تێدا رەچاو دەكرێ ، دەشێ ئەركی وشەكانی رستە بگۆڕێ و شوێنیان بەرەو پێش و بەرەو پاش بخزێ و لەگەڵ ئاوازی دەنگدا مانای ترو مەبەستی تر بگەیەنن. وەك دەزانین داڕشتنی شیعر داڕشتنێكی سینتاكسی ئاسایی نییە چونكە دەكەوێتە ژێر كاریگەری كێش و سەروا ، واتە شاعیر لە ژێر پاڵەپەستۆی ئاواز و كێش و هێنانەوەی سەروا ناچارە ریزی ئاسایی وشەكان تێك بدات. جگە لەوەی زۆر جار مانا و جەخت كردنیش جێگای وشەكان دەگۆڕێ. نالی لەم دێرە شیعرەدا ، یارییەكی سەیری بە شوێنی وشەكان كردوە ، هەر بۆ ئەوەی كێشەكەی تۆكمە و تەكوزبێ و ئیقاع و ئاوازی كاریگەر بێ ، دەڵێ :

لەجگەر گۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خەراپ

بێ خەتا ، كەس نییە ڕازی ، كە لە ئەولادی درێ [٢٠٩ : ١٣٢].

لە لەتی یەكەمدا ، ئەگەر بە ڕستەیەكی ئاسایی ماناكە دەربڕین دەڵێین (مەعنای خراپ لە جگەر گۆشەی شیعرم مەدە) ، پاش و پێش كردنی ئەم لەتە لە ژێر حوكمی كێش دا هاتوە ، لە داڕشتنەوەی ڕێزمانی لەتەكە ، بێ ئەوەی هیچی لێ زیاد و كەم بكەی ، كێشەكەی نامێنێ و ئیقاعەكەی لەدەست دەدا . خۆ ئەگەر لەتی دوەم بە ڕستەی ئاسایی دابڕێژینەوە ، شوێنی وشەكان بەم جۆرە دەگۆڕێ : (كەس ڕازی نییە كە بێ خەتا لە ئەولادی درێ) لێرەش كێش شوێنی وشەكانی گۆڕیوە و ئیقاعەكەی بەو گۆڕانە دەستە بەر كردوە . دەوری سەروایش لە ڕاكێشانی وشە بۆ دواوە و تێكدانی ڕیزی وشەكانی ڕستە ، لەم دێرە شیعرەی مەحویدا باش خۆی دەنوێنێ :

دەم و زارێ تیا مابێتەوە ڕەنگاری ڕیق ئەمما

پیاڵێكی عەقیقە ، پڕ لە بادێكی عەقیق ئەمما [١٨٠ : ٣٠].

(ئەمما) پاش سەروایە و وشەكانی (ڕیق ، عەقیق) وشەی سەروان . شاعیر ڕیزی ئاسایی ڕێزمانیی وشەكانی تێكداوە هەر بۆ ئەوەی (ئەمما) بچێتە دواوە و ببێ بە پاش سەروای هەموو دێرەكان ، كە هەرگیز لە ڕستەی ئاساییدا ئەمما لە دواوە نایە ، وشەكانی (ڕیق و عەقیق) سەروا بۆ ئەو شوێنە بە كێشی كردوون ئەگەر نا شوێنی ئەسلیان ئەوێ نییە. داڕشتنەوەی ئەم دوولەتە بە پێی دەستووری ڕێزمانیی ئاسایی بەم جۆرەیە : (ئەمما دەم و زارێ ڕەنگاری ڕیقی تیا مابێتەوە پیاڵێكی عەقیقە ئەمما پڕ لە بادێكی عەقیق) . ئەو شوێنەی لە شیعرەكەدا بە وشەی پاش سەروا و وشەی سەروا دراوە ، لە بنچینەدا هی ئەو وشانە نییە ، وشەكان لە شوێنی تری لەتەكانەوە گوێزراونەتەوە ئەوێ تا لەگەڵ كێش و لەگەڵ سەروا و پاش سەروای دێرەكانی تردا بگونجێن .

سالم لە شیعرێكدا دەڵێ :

هەوای سێوی زەنەخ، ئەی دڵ نەكەی قەت

موهەییایە لە ڕێتا چاهی هارووت [١٠١ : ٥٠].

لەتی یەکەم ، لەم شیعرەدا پێویستی بەسەروا نییە ، ئەو گۆڕانەی بەسەر ڕیزی وشەکاندا هاتوە ، پێویستی کێش سەپاندوویەتی ، لەئەسلدا بەم جۆرە بوە (ئەی دل ، قەت هەوای سێوی زەنەخ نەکەی !) کەچی لە دوومیاندا کێش و سەروایشی لەگەڵ ، سەپاندوویانە کە بەشی نیهادی ڕستەکە بخزێنە دواوە تا دەرخەری بکەرەکەی ببێ بە سەروا و لەنگەر بۆ سەروای دێرەکانی تر ڕابگرێ ، ئەگینا داڕشتنی ئاسایی ڕستەکە بەم جۆرە دەبێ (چاهی هارووت لە ڕێنا موهەییایە) .

لە ڕستەی ئاساییدا تەواوکەری بەشی گوزارە ، لە فەرمانی تێپەڕدا پێش فەرمانەکە دەکەوێ، بەتایبەتیش ئەگەر هۆ (وسیلە) بێ ، کەچی کێش و بەتایبەتی سەروا وای لەنالی کردوە لەم دێرە شیعرەدا (نووک) بباتە دواوە تا ببێ بەسەروا ، دەڵێ :

ئەی شۆخی بێ نیاز و گران ناز و غەمزە سووک
تیری موژەت نیشانەی دڵ کون دەکا بە نووک [٢٠٩ : ٧٠] .

داڕشتنەوەی لەتی دوەم بە پێی ڕیزی ئەسلی ڕستە سازی بەم جۆرەیە (تیری موژەت ، نیشانەی دڵ بە نووک کون دەکا) یان (تیری موژەت ، بە نووک نیشانەی دڵ کون دەکا) . لە هەردوو باردا (نووک) دەکەوێتە ناوەوە و (کون دەکا) کە فەرمانە دواوە دەگرێ ، بەلأم سەروا نالی ناچار کردوە نووک بباتە دواوە تا لەگەڵ وشەکانی تری سەروا ڕێك بکەوێ (سووك ، سولووك ، چوورووك ، گولووك ، مولووك، بووك ، نووك ، مەکووك ، تووك ، پووك ، بچووك) .

هەژار لە مەم و زیندا دەڵێ :

ئەو زینی بە داوی دڵ گرفتار
ئارامی لە لا نەما بە یەکجار [٣ : ٢٢٦] .

لەتی یەکەم داڕشتنەکەی ئاساییە بەلأم لە لەتی دوەمدا ئاوەڵکاری (بەیەکجار) لە شوێنی خۆی نەهاتوە ، بۆیە گوازراوەتەوە دواوە تا لەگەڵ وشەی (گرفتار)ی لەتی پێشەوە ببێ بە هاوسەروا. ئەو شوێنەی کۆتاییە لە ئەسلدا هی فەرمانی (نەما)یە وەك لەم داڕشتنەوەیەدا دەردەکەوێ : (بەیەکجاری ئارامی لەدلا نەما) .

د- لە ڕووی واتا سازییەوە : ئەو وشانەی دەبن بەسەروا ، جگە لەوەی بە پەیوەندی واتا سازییەوە بە وشەکانی تری لەت یا دێرەکە دەبەسرێنەوە (پەیوەندی ئاسۆیی) ، لەهەمان کاتدا لەگەڵ یەکتر جۆرە پەیوەندییەکی واتا سازی دروست دەکەن (پەیوەندی ستوونی) ، ئەمە بە زۆری لە غەزەل و قەسیدەدا باش دەردەکەوێ کە یەکێتی سەروایان تێدا پەیڕەو دەکرێ و بەدەوری یەك لەنگەر دەگرێ ، بۆیە نزیکترین وشە لەمەبەست و لەکارگەری دێر یان لەت وشەی سەروایە. ئەگەر وشەکانی سەروای هەموو دێرەکان کۆبکەینەوە بەشێکی زۆر و بنچینەیی واتای هەموو

دێرەکانت بۆ دەردەکەوێ . لە هۆنراوەیەکدا هەموو وشەکانی سەروا دەربێنە و بەڕیزیان بە تێکەڵاوی لەبەرچەمی خۆت بڵاویان بکەوە و بیانخوێنەوە ، بۆت دەردەکەوێ کە هۆنراوەکە بە گشتی باس لە چی دەکا و چ هەست و سۆزێك دەردەبڕێ چونکە سەرەداوێکی واتایی وەهمی هەیە هەموویان بەیەکەوە دەبەستێتەوە ، سێبەرو ئیحایان یەك دەخا و هەست و بیر بۆ لای مەبەستی شاعیر دەبا . با بۆ نموونە هۆنراوەکەی نالی وەربگرین کە سەرەتاکەی بەم دێرە دەکاتەوە :

قوربان مەحاڵە پێکەوە بێ سەبرو ئیشتییاق

خاریج لە نەسسی ئایەتە ، تەکلیفی لایوتاق [٢٠٩ : ٦٨] .

وشەی سەروای دێرەکانی ئەمانەن ( ئیشتیاق ، لایوتاق ، فیراق ، نیفاق ، تەلاق، سماق ، فاق ، مەحاق ، سوقاق ) . چ بەڕیزو چ بێ بەیڕەو کردنی ڕیزی وشەکان ، هەریەکە شتێکت لە مێشکتدا دەبزوێنێ و هەموو شتە ورووژاوەکانی زوورەوەت بخەیتە چوار چێوەیەکی لۆجیکیەوە ناوەڕۆکێکت دەستیگیر دەبێ زۆر لە بیری گشتی شیعرەکەی نالی نزیکە : ( ئیشتیاق کە پەرۆشیە بیرت بۆ پەرۆشی عاشیق دەبا بۆ یارەکەی ، پەرۆشی لە ئەنجامی لێك دوورکەوتنەوە پەیدا دەبێ، ئەگەر ئەو پەرۆشیە درێژە بکێشێ ، وای لێ دێ بەرگەی ناگیرێ ( لایوتاق ) ، ئەو پەرۆشییە هێزبڕەش دیارە لە ئەنجامی ( فیراق ) - لێك دابڕانەوە پەیدابوە ، دوور نییە ئەم لێك دابڕانە ئەنجامی نیفاق ( دوو زمانی و دووڕوویی )ی بەدکارو ڕەقیب و ناحەزانەوە بێ ، کە دەبێ بە هۆی تەلاق ( دەست لێك بەربان ) ، یان دەست لە یار بەربان کە ئەمە لەیاسای دڵدارانیدا نییە ، یان دەست لەکەسێك و شتێکی تر بەربانە بۆ خاتری یار کە ئەمەیان زیاتر ڕێی تێ دەچێ. ئەو جەفاو ناخۆشییەی عاشیق لە دووری یارەوە دەیکێشی و بۆی بە پەرۆشەو قوربانی بۆ دەدا ، لەباری تەندروستی ڕەنگدەداتەوە کزو بێ هێزو لاوازی دەکا وەکو ( مانگی مەحاق )ی لێ دێ کە لە دوا پرزەدایە و هاکا بەیەکجاری تواپەوە و نەما ، وەکو فاقەی لێ دێ لە لەرو لاوازی ، یان لەسەد لاوە فاقەی بۆ دادەنرێتەوە تا دەستگیر بکرێ چونکە ( سەبارەت بە چاوی یار دەکەوێتە بن باری لۆمان ) و هەموو کەس بە ڕوویەکی ترشی وەك ( سماق ) و بە مرووموچی سەیری دەکەن یان یارەکەی هێشتا لەگەڵ ئەمەشدا لێی ڕازی نییە و بە ڕوویەکی ترشی وەکو سماق تێی دەڕوانی ، ئەم عیشق و دەردی دووری یارە و ئەم بێ مرووەتی خەڵکە لەگەڵیا ، وای لێ دەکەن بکەوێتە کووچەو سوقاقان و بێ خان و مان و بێ حاڵ و ماڵ بمێنێتەوە ) . مەرج نییە ئەم لێکدانەوەی لێرە ، بۆ وشەکانمان کرد لەسەدا سەد وەکو شیعرەکەی نالی دەربچێ بەمانا و زمان و خوازە و داڕشتنەوە بەڵام زۆر لێیەوە نزیکە . ئاخر قسەی ئاسایی و ڕوون کردنەوەی لۆجیکی و لێکدانەوەی خیتابانە چۆن وەکو دەربڕینی ئەدەبی و شیعری دەبێ بەتایبەتی ئەگەر لە پێنووسی شاعیرێکی وەکو نالی کەوتبێتەوە . فەرموو ئەو بۆچوونەی سەرەوە ، کە بۆچوونی خوێنەرێکی وشەکانی سەروای شیعرەکەیە ، لەگەڵ پەرەفرێزی هەڵوەشاندنەوەی شیعرەکە بەراورد بکە کە بەم جۆرەیە : شاعیر ڕوو لەیارەکەی دەکات و دەڵێ:

قوربان ، مەحاڵە یەکێ سۆزو پەرۆشی تۆی لەدڵدا بێ بتوانێ ئارام بگرێ و خۆی بێ ڕابگیرێ ، ئەمە لە توانای کەس دا نییە ، ئەرکێکە بەکەس هەڵناگیرێ . ڕووی گەش و زولفی ڕەشی تۆو بەتۆ شادبوون کە بۆ من وەکو ڕۆژەو لێت دوورکەوتنەوە کە وەکو شەو وایە ، ئەمە هەمووی مانای ڕووناکی و تاریکی ، کە یەکەمیان سەرچاوەی ئاین و خواپەرستییەو دوەمیان سەرچاوەی گومڕایی و نابەدڵییە ، و مانای بڵاوکردنەوەی ژیان و مردنە . ئەوەی خۆی وا پێشان بدا کە دەتوانێ لە ئاستی دەردی دووریت دان بە خۆیدا بگرێ ، ئەم لاف و خۆپێشاندانەی ڕاست نییە ، یان فێڵە ، یان پلانە ، یان درۆیە یان دوو ڕوویە . تۆ کە وەکو حووری بەهەشت تازە کچێکی پاکیزەی ، جێی خۆیەتی بۆ خاتری گەیشتن بەتۆ دەست لە دونیا هەڵبگرم کە وەکو پیرە ژنێکی فەرتووت وایە . تۆ خۆت شیرینیت ، بەڵام ڕووت پڕ گلە و گازاندەی ترش و تاڵە و لەبەر ئەو ڕوو ترشیەت خاڵی سەر هەنیەت وەکو دانەی سماقی ترشی لێ هاتوە . سۆفی لەبەر نەبوونی و هەژاری وەکو فاق لە ڕیوو بەسەر یەکدا چەمایەوە ، ئەمەش لەبەر تەڵە کەبازی خۆیەتی چونکە ئەو تەسبێحەی هەڵی گرتوە ، بۆ فریودانی خەڵکە وەکو دان و داو وایە ، خەڵکەکە بە دوای دانەکە دێن و دەکەونە داوی فێڵەکانییەوە ، ڕیشە دو فلیقانەیشی هەر بۆ ڕیایە و وەکو فاق خەڵك دەگرێ و دەیان کا بە نێچیری نیازەکانی خۆی . ئەی یاری وەکو خۆر ، ئەی دڵ پڕ بەزەو میهرەبان ، سبەینان وەرە سەریان بۆ ئەوەی کە تۆ دەرکەوتی هەموو ئەوانەی ڕوویان وەکو مانگە لەبەر دەرکەوتنی شەوقی تۆ ببن بە مانگی کۆتایی مانگو بتوێنەوە . نالی کە کاتی خۆی لەسەری کۆڕو مەجلیسان پاڵی دەدایەوە ئێستا بۆ تۆ دەربەدەری کوچەو کۆڵانان بوو[٢٠٨ : ٢٤٨-٢٥٤].

هـ- <u>لە ڕووی شێوازەوە</u> : شێواز ناسی لە هەموو ئاستەکاندا ( دەنگ، وشە ، ڕستە ) کار دەکات و تایبەتێتی جۆرە شێوازێك و شێوازی نووسەرێك لە شێوازەکانی ترو نووسەرەکانی تر جیا دەکاتەوە . لێرەدا کە باسەکەمان بابەتی وشەی سەروایە ، لە هەندێ پەیوەندی شێواز ناسی وشەکانی سەروا دەکۆڵینەوە .

- هاوتایی (الترادف) ، وشەی سەروا بۆی هەیە بە پەیوەندی هاوتایی لەگەڵ وشەی تری دێرە شیعرەکە یان وشەکانی تری سەروا ببەسرێتەوە ، تایەر بەگ دەڵێ:

زاهیدی خود بین کە حەیوانە لە وادی عیشقدا
ڕیشەکەی پان و درێژی ڕەشمە و هەوساریە [٤٨ : ١٦] .

ڕەشمە و هەوسار هاوتایی یەکن یان لەیەکەوە نزیکن .

- دژیەك (التضاد) ، وا دەبێ پەیوەندی دژیەك وشەی سەروا بە وشەکانی ترەوە گرێ بدا ، سالم دەڵێ :

ڕەببەنا دڵ کون کونن سا چ غولام و چ ئەمیر
وەکو یەك ئەهلی نیازن چ غەنی و چ فەقیر[١٠١ : ٦٥] .

لەلەتی یەکەم (ئەمیر × فەقیر) و لەلەتی دووەم (فەقیر × غەنی) دژیەکن. هەموو وشەکانی سەروای ئەم هۆنراوەیە لەگەڵ وشەی پێشە خۆیان لەم پەیوەندییە ناکۆکەدان (ئەمیر × گەدا ، ئەسیر × تەویل ، کەسیر × قەلیل ، کەبیر × سەغیر ، پیر × بورنا ، حەسیر × حەریر).

- جووتبەندی (اللازمیە و الملزومیە) ، ئەو جووتە وشەو چەمکانە دەگرێتەوە کە بەیەکەوە بەستراونەتەوە. یەکێ هەبێ ئەوەی تریش دەبێ وەکو ساقی و مەی ، بووك و زاوا ، رۆژ و ڕووناکی ، مامۆستا و قوتابی ... حەمدی دەڵێ:

فەلسەفەی لوقمان لەکن ئەم زالە ناکا فلووس
چی لەئەسبابی دەکا ، لایق بەزاوا بێ عەرووس [٦ : ٢٤١] .

(عەرووس - بووك ، زاوا) جووتبەندن ، یەکێ هەبێ ئەوەی تریش دەبێ ، بۆیە سەروای عەرووس جگە لە سەدای دەنگی سەروا و جەختی شوێنەکە ، زایەڵەیەکی زاوایشی تێدایە ، ئەم زایەڵەیە ئیقاعی دێرەکە قووڵتر دەکاتەوە .

- تەناسوب ، ئەوەیە کۆمەڵێ شت لەیەك خانەی زمانەوانی - Field -دا کۆببنەوە، نالی دەڵێ:

قاروونە فەلەك موستەحەقی گرتن و خەسفە
زیوو زەڕی شەمس و قەمەرە، درهەمی کەوکەب [٢٠٩ : ٥٧] .

(کەوکەب) کە وشەی سەروایە لەگەڵ (شەمس و قەمەر) لەتەناسوبدایە ، ئەو تەناسوبەی لەوانەوە هاتوە تەناسوبێکی تریشی دروست کردوە لە نێوان (درهەم ، زیو ، زەڕ) . کە هەر دووڵا بە پەیوەندی لێکچوون بەیەکەوە بەستراون .

- دووبارەکردنەوە (التکرار) ، شاعیر زۆرجار پەنا دەباتە بەر دووبارە کردنەوەی وشەی سەروا. ئەم دووبارەکردنەوەیە چ لە ئاستی ستووندا بێ و چ ئاسۆیی ، جەخت کردنە لەسەر ئیقاع و چەمك و مۆسیقای شیعرەکە ، نالی لە شیعری (بیحەمدیللا ـ)دا ، هەموو عەجزەکانی ، کە بەسەروا کۆتاییان دێ ، کردوە بە دووبارەکردنەوە و لەهەر یەکێکدا دوو سێ جار وشەکانی هێناوەتەوە ، هۆنراوەکە حەوت دێرە و لە دێری کۆتاییدا دەڵێ:

گوتی (نالی) ئەتۆ بمرە ئەمن دێم
خودا کەی بێ؟ خودا کەی بێ؟ خودا کەی؟ [٢٠٩ : ١٢٦] .

سالم خاوەنی شێوازێکی ترەو بە جۆرێکی تر وشەی سەروا دووبارە دەکاتەوە ، هەر وشەیەك دووجار دێنێ ، وەکو لەسەرەتای هۆنراوەیەکدا دەڵێ:

لازمی عەرزی حالە ، کاغەزی زەر تەبەق تەبەق
شەرحی میحەن بەخوێنی دڵ سەبتی دەکەم وەرەق وەرەق [١٠١ : ٧٦] .

لەسەرلپای هۆنراوەکەدا ، هەموو سەرواکان بەم جۆرە دووبارە بوونەتەوە (شەبەق شەبەق ، سەبەق سەبەق ، حەق بە حەق ، دەق بە دەق ، فیرەق فیرەق) . ئەم شێوازە لای حەمدیش هاتووە[٦ : ٢٩٣] .

- لاساکردنەوە : شێوازێك کە چەسپا لای زۆربەی شاعیرانی سەریەو شێوازە پەیرەو دەکرێ ، واتە هەموویان لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی شێوازەکە لاسای یەکتر دەکەنەوە. وشە و دەستەواژە و لێکچواندن و شێوەی داڕشتنی یەکتر دووبارە دەکەنەوە . شاعیرانی کلاسیکی کورد ، کە لە بەکارهێنانی وشەی بیانی نەپرینگاونەتەوە ، زۆر جار وشەی سەروایان ، بەهەرجی زمانێ بێ، دووبارە دەبێتەوە . دا سەیری وشەکانی سەروای هەندێ هۆنراوەی چەند شاعیرێك بکەین ، بزانین چۆن لە هەڵبژاردنی وشەی سەروادا شوێن پێی یەکتریان هەڵگرتوە.

- نالی لە هۆنراوەی لاپەڕە (٤٥)دا ، ئەم وشانەی کردوە بە سەروا : (قەمەر ، سەر ، تەڕ ، نەزەر ، بەر ، بەشەر ، کەمەر ، بەسەر ، سەحەر) .

- کوردی بۆ هەمان سەرواو ڕەوی ، لە لاپەڕە (٣٧)دا ئەم وشانەی بەکارهێناوە: (دلبەر ، سەر ، خەنجەر ، بەر ، پەیکەر ، ئەفسەر) .

- سالم (ل٣٠) : (بەدەر ، زەبەر ، سەر ، سەفەر ، خەتەر ، گوزەر ، کەمەر ، قەمەر ، لەبەر ، هەدەر ، گوڵشەکەر) .

- ناری (ل٥٨) : (هونەر ، موعتەبەر ، بەشەر ، قەمەر ، کەدەر ، نەزەر ، شوعلەگەر ، گوهەر ، سەفەر ، نەیشەکەر ، سەقەر ، دەر ، بەر ، سەر ، زەرەر ، خەبەر، ئەسەر ، خەتەر ، بەسەر ، سەمەر) .

- حەمدی (ل٩٠) : (شەرەر ، شەڕ ، زەبەر ، زەرەر ، خەتەر ، هەدەر ، کەمەر ، قەمەر ، پدەر ، دەر ، بەشەر ، سەر ، زەڕ ، گوهەر ، نەزەر ، قەدەر ، موختەسەر) .

- مەحوی (ل١٣٠) : (گەر ، پێغەمبەر ، وەروەر ، دەر ، کەڕ ، تەڕ ، عەنبەر ، خەنجەر ، دەفتەر) .

- خادیم (ب١ ، ل١٣٠) : (دەر ، سەحەر ، ئەسەر ، خەبەر ، تەڕ ، جیلوەگەر ، نەزەر ، سەر) .

- قانیع (ل٩٢) : (جەوهەر ، گەوهەر ، دەفتەر ، بەر ، سێبەر ، نەشتەر ، مورتەڕ، پەروەر، کەر) .

- ئەحمەد موختار (ل٥٢) : (بەر ، قەمەر ، جگەر ، سەحەر ، سەر ، گوزەر) .

- وەفایی (ل٤١) : (بەسەر ، قەمەر ، گوڵشەکەر ، نیلوفەڕ ، خەبەر ، دەر ، جگەر، سەحەر ، نەزەر ، سەر ، بەر ، کەمەر) .

لەسەرنجێکی خێرای ئەم وشانەدا ، کە ئەم دە شاعیرە بۆ سەروای (-ەر) هێناویانە بۆمان دەردەکەوێ کە هەندێ وشە لای زۆریان دووبارە بۆتەوە و هەندێکیشیان کەمتر دووبارە بوونەتەوە ، بۆ بەدەست خستنی ئەنجامی وردتری بەراوردەکە و ڕادەی لاساکردنەوەی بەکارهێنانی وشەی سەروا لە لایەن ئەو شاعیرانەوە ، ئەم خشتەیەی خوارەوە گەلێ ڕاستیمان بۆ دەردەخاو ئەنجامی ڕاستی وردمان دەداتێ :

| وشەی سەروا | قەمەر | سەر | تەڕ | نەزەر | بەر | کەمەر | بەسەر | سەحەر | دلبەر | خەنجەر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی دووبارە بوونەوە | ٦ | ٨ | ٣ | ٥ | ٦ | ٤ | ٣ | ٤ | ١ | ٢ |

| پەیکەر | ئەفسەر | دەر | زەبەر | سەفەر | خەتەر | گوزەر | لەبەر | هەدەر | گوڵشەکەر | هونەر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ١ | ٦ | ٢ | ٢ | ٣ | ٢ | ١ | ٢ | ٢ | ١ |

| موعتەبەر | بەشەر | کەدەر | شوعلەگەر | گەوهەر | نەیشەکەر | سەقەر | زەرەر | خەبەر | ئەسەر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٥ | ١ | ١ | ٤ | ١ | ١ | ٢ | ٢ | ٢ |

| سەمەر | شەرەر | شەڕ | پدەر | زەڕ | قەدەر | موختەسەر | گەر | پێغەمبەر | وەروەر | کەڕ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ |

| عەنبەر | دەفتەر | جیلوەگەر | سێبەر | نەشتەر | موزتەڕر | پەروەر | کەر | جگەر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٢ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ | ٢ |

دە شاعیر ، لە دە هۆنراوەدا ، (٥١) وشەیان کردوە بەسەروا . ئەم وشانەی لەلایەن یەك شاعیرەوە بەکارهاتوون ، واتە لاسا نەکراونەتەوە ، ٢٨ وشەن : ( دلبەر ، پەیکەر ، ئەفسەر ، لەبەر ، هونەر ، موعتەبەر ، کەدەر ، شوعلەگەر ، نەیشەکەر ، سەقەر ، سەمەر ، شەرەر ، پدەر ، زەڕ ، شەڕ ،

قەدەر، موختەسەر، گەر، پێغەمبەر، وەروەر، کەڕ، عەنبەر، جیلوەگەر، سێبەر، نەشتەر، مورتەڕڕ، پەروەر، کەر) دەکاتە ٩، ٥٣٪ی هەموو وشەکان.

ئەو وشانەی لە لایەن دوو شاعیرەوە بەکارهاتوون، واتە لاساکراونەتەوە بەڵام زۆرنا، ژمارەیان (١١) وشەیە: (خەنجەر، زەبەر، سەقەر، گوزەر، هەدەر، گوڵشەکەر، زەرەر، خەبەر، ئەسەر، دەفتەر، جگەر)، دەکاتە ڕێژەی ١، ٢٣٪ی هەموو وشەکان.

ئەو وشانەی لە لایەن سێ شاعیرەوە بەکارهاتوون، واتە لاساکردنەوەیان زیاترە لەوەی پێشەوە، ژمارەیان (٣) وشەیە: (تەڕ، بەسەر، خەتەر) دەکاتە ڕێژەی ٧، ٧٪ی هەموو وشەکان.

ئەو وشانەی لە لایەن چوار شاعیرەوە بەکارهاتوون، واتە لاساکردنەوەیان چالاکە ژمارەیان (٣) وشەیە: (کەمەر، سەحەر، گوهەر (گەوهەر))، ڕێژەی ٨، ٥٪ی هەموو وشەکان.

ئەو وشانەی لەلایەن پێنج شاعیرەوە بەکارهاتوون دوو وشەن: (نەزەر، بەشەر) و دەکاتە ڕێژەی ١، ٩٪ی هەموو وشەکان.

ئەو وشانەی لە لایەن شەش شاعیرەوە بەکارهاتوون ژمارەیان سێیە: (قەمەر، بەر، دەر)، بە ڕێژەی ٨، ٥٪.

ئەو وشانەی لەلایەن هەشت شاعیرەوە بەکارهاتوون تەنیا یەك وشەیە (سەر)، بەڕێژەی ١، ٩٪. ئەم وشەیە لە هەموو وشەکان چالاکترە لە ڕووی لاساکرانەوەدا.

هەر بەم جۆرە کە شاعیرێك جۆرە سەروایەك بۆ بابەتی هۆنراوەیەك بەکاردێنێ، سروشتی بابەتەکە وای دەوێ لێبوەشاوەترین وشە بخاتە خانەی سەرواوە، جا شاعیرانی دوای خۆی کە مامەڵە لەگەڵ هەمان بابەت دەکەن هەمان وشە بۆ سەروا هەڵدەبژێرن، واتە لە هێنانەوەی وشەی سەروادا دەکەونە بەر کاریگەری لاساکردنەوەی ئەوەوە. ئەم ڕاستییە وای کردوە ئەوانەی سەروا بە کۆت دەزانن بڵێن یەکێ کە دەیەوێ شیعرێ بنووسێ و بابەتێك دەست نیشان دەکا کە یەکەم دێری دامەزراند و سەرواکەی چەسپاند، بێ ئەوەی هەست پێ بکا لە مێژووی شیعری نەتەوایەتیدا یەك تابووری دوور و درێژی شاعیرانی لە مێشکدا دەرووژێ کە بەو سەروایە شیعریان داناوە، ئیدی بیەوێ و نەیەوێ لە وشەکانی سەروای ئەوان سەروا بۆ شیعری خۆی هەڵدەبژێرێ. لێرەدا داهێنان لە هەڵبژاردنی وشەی سەروا بۆ شاعیرانی بەرایی دەمێنێتەوە و شاعیرانی دواتر، لەسەر لاساکردنەوە، بنەمای هەڵبژاردنی وشەی سەروا دادەڕێژن و لای خۆیانەوە شتی بۆ زیاد دەکەن. لێرەدا جیاوازییەکی تر لە نێوان شیعری کۆن و نوێ سەر هەڵدەدا. لە شیعری کۆندا، چونکە یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەو دەکرا، شاعیر پشتی بە فەرهەنگی سەروا دەبەست بۆ دەستە بەر کردنی ئەم هەموو سەروایە کەچی شاعیری نوێ لە هێنانی سەروادا، گوێ بە شاعیرانی پێشوو نادا

، چونکە پەیڕەوی یەکێتی سەروا ناکات و زۆر پێویستی بە گەڕانەوە سەر فەرهەنگی سەروا نییە . هێنانی سەروا لای شاعیری نوێ فەردیەت و تایبەتێتی خۆی تێدایە ، بۆیە شاعیری نوێ داهێنەرە لە سەروا هێناندا .

دوو- پاش سەروا (ڕەدیف) :

ئەگەرچی نەتەوە موسلمانە ناعەرەبەکان لەزۆر لاوە پەیڕەوی دەستوورەکانی غەزەل و قەسیدەی عەرەبییان کردوە ، بەڵام داهێنانی خۆیشیان تێدا کردوە . پاش سەروا یەکێکە لەو ڕەگەزە شیعرییانەی نەتەوەکانی تر بە زۆری بەکاریان هێناوەو بەرەیان پێداوە چونکە لەعەرەبیدا نەبوە ، یان زۆر دەگمەن بوە و ئەو بایەخەی پێ نەدراوە . ڕەشیدەددین وەتوات لەبارەی پاش سەروا لە شیعری عەرەبی ڕای وایە (عەرەب پاش سەروایان نەبوە ، تەنیا نوێکانیان - المحدثون - هەندێ جار بەزۆر لەخۆکردن دەیهێنن . من یەك پارچە شیعری فەخری خوارزەمم دیوە لەستایشی خوارزەمشاە کە نازناوەکەی لەسەر شێوەی شیعری عەجەم کردوە بە پاش سەروا . سەرەتای هۆنراوەکە ئەمەیە :

الفضل حصله علاء الدولة          والمجد ألله علاء الدولة

زۆربەی شیعری عەجەم بە پاش سەروایە، سروشتی بەرزی شاعیرو توانای لە قسەدا ، لە هێنانەوەی پاش سەروادا دەردەکەوێ) [٣٥٦ : ١٢٧] . تەها حوسێن و ئەوانی تر لەبارەی پاش سەرواوە دەڵێن : (شاعیرە فارسەکان لە زۆربەی هۆنراوەکانیاندا ، خۆیان بە دەستووری سەروای عارەبی بەستۆتەوە ، بەڵام لە پاڵ ئەمەشدا هونەری خۆیان تێدا نواندوە. هۆنراوەیان هەیە سەرواو پاش سەروای هەیە ، واتە : لە کۆتایی دێرە شیعردا ، وشەیەك وەکو خۆی دووبارە دەکەنەوە و پەیڕەوی سەروای وشەی پێش ئەویش دەکەن) [٢٠٤ : ٢١٥] . پاش سەروا مەرج نییە هەر تەنیا یەك وشە بێ ، دەشێ دەستەواژەیەك و بگرە ڕستەیەك بێ . کدکنی لە باسی پاش سەروا لای عەرەب دەڵێ : (سەکاکی لە - مفتاح العلوم - دا پارچە شیعرێکی بە پاش سەروای - ایها الزمن - هەیە ، بەم جۆرە دەڕوا :

حتام تنكر قدري ايها الزمن          بغيا ، وتوغر صدري ايها الزمن

لە چاخەکانی دواتریش لەم لاو لەولا نموونەی تری پاش سەروا لە شیعری عەرەبیدا دەست دەکەوێ بەڵام هیچێکیان لە نموونەی بەرزی ئەدەبی نین و زۆربەی ئەدەبناسان بڕوایان وایە پاش سەروا لە زمانی عەرەبیدا شوێنێکی سروشتی نییە) [٤٠٧ : ٢٢٢-٢٢٣] . لە فارسیدا ، هەر لەکۆنەوە پاش سەروا هەبوە و لە غەزەل و قەسیدەدا زۆر بە ڕێکی بەکارهاتوە . کدکنی بە زێدە ڕۆییەوە باسی پاش سەروای شیعری فارسی دەکات و دەڵێ : (پاش سەروا یەکێکە لە تایبەتێتییەکانی شیعری فارسی کە ئەوەندەی من ئاگادارییم لە ئەدەبی هیچ زمانێکدا بەو فراوانییە

نەهاتوە ) [٤٠٧ : ٢٢١] و کۆنترین نموونەی شیعری فارسی بۆ پاش سەروا ، ئەوەی داوە :

آبست و نیناست     و عصارات زبیب است
وسمیه رو سپیداست

خانلەری دەرهەق ئەم سێبینەیە دەڵێ : ( مێژووی هۆنینەوەی ئەم شیعرە ساڵی پەنجاوەکی کۆچییە ، بەم پێیە ئەم شیعرە کۆنترین نموونەیە کە پاش ئیسلام لە زمان و شیعری فارسی مابێتەوە ) [٣٩٠ : ٥٨] ، کدکنی نموونەیەکی کۆنی تریشی بۆ پاش سەروای فارسی هێناوە. ئەو چوارینەیەی گوایە ساڵی ١٨٠ی کۆچی خەڵکی خوراسان لە داشۆرینی ئەسەدی کوری عەبدوللای قەسریی والی خوراسان گوتویانە دوای شکانی بەرامبەر میری خەتلان و خاقانی تورك :

از ختلان آمدیه     برو تباه آمدیه
آبار باز آمدیه     خشك نزار آمدیه [٣٩٠ : ٥٨] .

کدکنی لای وایە کە پاش سەروا هەمیشە ڕەگەزێکی دیار و ئاشکرای شیعری فارسی بوە و لە ژێر کاریگەری شیعری فارسی کەوتۆتە ناو شیعری زمانانی تری وەکو عەرەبی و تورکی و ئوردو و... [٤٠٧ : ٢٢٢] . کدکنی چ لە نەشارەزایی بێ و چ لە دەمارگرژی هیچ ئاوڕی لە شیعری کوردی نەداوەتەوە ، ئەگەرنا بۆی دەردەکەوت شیعری کوردی چ لە ڕووی مێژووییەوە بێ و چ لە ڕووی فراوانییەوە بێ ئەوەندە لە فارسی کەمتر پابەندی پاش سەروا نەبوە . بابا تاهیری هەمەدانی (٩٣٥-١٠١٠) کە کۆنترین شاعیرە بەرهەمی زۆری مابێتەوە و پایەیەکی دیاری لە شیعری کوردیدا هەبێ ، لە ٢٩٤ چوارینەدا ، ١٨٣ چوارینەی بە پاش سەروایە [٣٠] کە دەکاتە ڕێژەی ٦٢،٣٪ی هەموو چوارینەکان . ئەمەش نموونەیەك بۆ پاش سەروا لەیەکێ لە چوارینەکانی بابا تاهیر :

مەگەر شێر و پلنگی ئەی دڵ ، ئەی دڵ
بە موودایم بە جەنگی ئەی دڵ، ئەی دڵ
ئەگەر دەستم ڕەسەد خونت بریجەم
بوینە تا چ ڕەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ [٣٠ : ٦٣] .

پاش ئەویش جزیری لە (١٠٦) هۆنراوەدا ، کە غەزەل و قەسیدە سەرەکییەکانن، ٤٢ هۆنراوەی بە پاش سەروای هەیە کە دەکاتە ڕێژەی ٣٩،٦٪ی سەرجەمی شیعرەکان .

أ- پاش سەروا چییە ؟ قەیسی ڕازی بەم جۆرە پێناسەی پاش سەروا دەکا : ( پاش سەروا وشەیەکی سەربەخۆیە ، جیایە لە سەروا ، دوای تەواو بوونی سەروا دێ چونکە شیعرەکە لەبارەی کێش و ماناوە پێویستی پێ هەیە . پاش سەروا بەهەمان مانا لە کۆتایی هەموو دێرەکاندا دووبارە دەبێتەوە ) [٤٠٢ : ٢٣٥] . پاش سەروا مەرج نییە هەریەك وشە بێ ، د.محەمەد نورەددین دەڵێ ( پاش سەروا بریتییە لە وشەیەك یان زیاتر ، دوای سەروا ، لە کۆتایی هەموو دێرەکان دووبارە

دەیهێنێتەوە و ئەو شیعرەی پاش سەرەوای هەبێ پێی دەگوترێ - موردەدەف-[٣٥٦ : ١٢٥]. لە کوردیدا یەکەم کەس باسی پاش قافیەی کردبێ ، د.مارفە ، دەڵێ : (پاش قافیە یاخود ئەتوانین قافیەی دووەمی پێ بڵێین ، ئەمە بریتییە لە وشەیەك یاخود ڕستەیەك، لە دوایی هەموو دێرە شیعرێکدا وەکو خۆی دووبارە ئەکرێتەوە ، بەمەرجێك پێش ئەم قافیەی دووەمە دیسانەوە دێرە شیعرەکان قافیەی تایبەتییان بێ ) [١٨٤ : ٥٩] . کەچی محەمەد سەعیدی ئیبراهیمی پاش سەروا بە وشەیەك دادەنێ (لە ئاخیری میسراع ولنگدا خودی خۆی لە پاش قافیە دوویات دەبێتەوە ) [١٩٢ ، ل١٠٤] . لەم بۆچوونانەی سەرەوە دەگەینە ئەوە کە : پاش سەروا ئەو وشە یان دەستەواژە یان ڕستەیەیە کە دوای وشەی سەروا لە کۆتایی لەت یان دێرە شیعر بە هەمان مانا دووبارە دەبێتەوە . لەهەر کوێ سەروا هەبێ دەشێ پاش سەروای بە دوادا بێ ، لە مەسنەوی و سێینە و چوارینە و پێنجینە و ... غەزەل و قەسیدە ، تەنانەت جاری وا هەیە پاش سەروا لەگەڵ سەروای ناوەوەیش دێ .

هێنانەوەی پاش سەروا لە کۆتایی هەموو لەت یان دێرە شیعرێکدا کۆتێکی ترە لە ملی شاعیر چونکە شاعیر دەبێ پاش سەروایەکی وا هەڵبژێرێ لەگەڵ مانای سەراپای دێرەکانی هۆنراوەکەدا بگونجێ . ئەگەر سەروا لای هەندێ کەس وەکو کۆت وابێ ، کۆتەکە لە وشەکاندا نییە ، بەڵکو لە دەنگەکانی دواوەی وشەکاندایە . وشەکان دەگۆڕێن تەنیا پەیڕەوی وەك یەکیی دەنگەکانی دواوە دەکرێ ، ئەمە ئازادی بای ئەوەندە تێدایە کە شاعیر لەسەدان وشەی هاوسەرواوە ئەوە هەڵبژێرێ کە بۆ دەربڕینی مەبەستەکەی دەگونجێ ، بەڵام لە حاڵەتی پاش سەروادا وا نییە . شاعیر لەیەکەم لەت یان دێرە شیعرەوە ، کە پاش سەروایەکی هێنا ، هیچ سەربەستی هەڵبژاردنی پاش سەروای تری بۆ نامێنێتەوە. دەبێ هەر دەست بەو پاش سەروایەوە بگرێ تا هۆنراوەکە کۆتایی دێ و لە هەموو دێرەکانیشدا دەبێ مانای دێرەکە بە جۆرێ دابڕێژێ لەگەڵ پاش سەرواکە یەك بگرێتەوە ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا پاش سەروا هێنانەوە نیشانەی باڵا دەستی شاعیرە لە شیعردا (ئەگەر دیوانی شاعیرێك لە ڕووی بوون و نەبوونی پاش سەرواوە هەڵسەنگێنین دەبینین توانای داهێنانی شاعیر لە شیعرە پاش سەرواکان زیاترە ) [٤٠٧ : ٢٢٦] . پاش سەروا وەکو چەقێك وا دەبێ ئەو سەروایانە بۆ خۆی ڕادەکێشێ کە لە ڕووی ماناوە لە گەڵیدا دەگونجێن و ئەوانەی تر وەلادەنێ . پاش سەروا ئەگەر داهێنانی شاعیری تێدابێ هێزێکی زیادەکی بە هۆنراوەکە دەدا بەڵام پاش ئەویش هەر زوو دەبێ بەبابەتی لاساکردنەوە و شاعیران پاش سەروای یەکتر وەردەگرن و لەگەڵ ناوەرۆکی بابەتی خۆیانی دەگونجێنن .

ب- هۆی پەیدابوونی پاش سەروا : پاش سەروا یەکێکە لەو ڕەگەزە شیعرییانەی نەتەوەکانی غەیری عەرەب (فارس ، کورد ، تورك ، ئۆردوو ... ) غەزەل و قەسیدەی عەرەبییان پێ موتوربە کردوە. هۆی چییە پاش سەروا ، کە لە عەرەبیدا نەبوە ، لە زمانەکانی تر بۆی زیاد کراوە ؟ کدکنی بوونی

پاش سەروا لە فارسی و نەبوونی لە عەرەبیدا بۆ سێ هۆ دەباتەوە : (١- هەبوونی فەرمانی -بوون tobe- کە لە تایبەتییەکانی زمانە ئارییەکانەو لە عەرەبیدا نییە . ٢- فارسی زیاتر پێویستی بە مۆسیقییەتی سەروا هەیە چونکە لەعەرەبیدا سەروا بەهۆی ئیعراب و حەرەکەی کۆتاییەوە توانای کشان و درێژ بوونەوەی زیاترە ، بەلام لە فارسیدا چونکە کۆتایی وشەی سەروا بە زۆری وەستاوە ، دوا دەنگی کۆتایی توانای کشانی نییە . ٣- شوێنی وشە لە ڕستەدا ،لە زمانی فارسی ، تایبەتێتی خۆی هەیە . ئەو فراوانی و بلاوییەی فارسی لەم ڕووەوە هەیەتی لەکەم زماندا هەیە ) [٤٠٧ : ٢٢٥] . ئەمە لە فارسیدا ، بەلام لە کوردیدا ،لەئەنجامی ئەو سەرژمێرییە نەختێ فراوانەی بۆ شیعری کوردی کردوومانە ، دەرکەوتوە کە هۆی زۆری پاش سەروا لە کوردیدا بۆ ئەم خالانە دەگەڕێتەوە :

- هەبوونی (فەرمانی بوون tobe ) لە کوردیدا کە لە زمانە هیند و ئەورووپییەکاندا هەیە ، لەگەل فەرمانی (هەبوون to have ) و (فەرمانی کردن -todo ) کە دەوری زۆر چالاکانە دەگێڕن لە دروست کردنی دەستەواژەی تر . لە سەر ژمێری گشتی هۆنراوەی کلاسیکی دەرکەوتوە کە ئەم سێ فەرمانە ، بە هەموو جۆرە گەریان و کاتێك ،لە پێشەوەی هەموو پاش سەرواکان دێن . لە (٦٤) دیوانی کلاسیکی کە (٤٦٨٠ ) هۆنراوەیە ، (١٥٢٠ ) هۆنراوەیان بە پاش سەروایە کە دەکاتە ڕێژەی ٣٤،٥٪ . لەمانەش ٩٣٦ هۆنراوە پاش سەروایان فەرمانە کە دەکاتە ١٩،٨٪ی هەموو هۆنراوەکان و ٦١،٦٪ی هۆنراوە بەپاش سەرواکان ، لەمانەش (٧٠٩ ) هۆنراوە پاش سەرواکانیان فەرمانی (بوون – هەبوون – کردن )ە ، کە دەکاتە ڕێژەی ١٥،٢٪ی هەموو هۆنراوەکان و ٤٦،٧٪ی هۆنراوە بە پاش سەرواکان و ٧٥،٨٪ی بە پاش سەروافیعلییەکان .

- سروشتی زمانی کوردی کە بە زۆری فەرمان لە کۆتایی ڕستەوە دێ ، دووبارە بوونەوەی یەك فەرمان بۆ زۆر حالەتی جیاجیا ، چ ئەوانەی سەرەوە و چ فەرمانی تر ، وای کردوە پاش سەروا لە کوردیدا زۆر بێ .

- مەیلی شاعیرانی کورد بۆ بەکارهێنانی کێشی درێژ ئەو درێژییە ماوە بە شاعیر دەدا پاش سەروا لە کۆتایی دێر بەکاربێنێ . یەکێ لە جیاوازییەکانی عەرووزی عەرەبی و کوردی ئەوەیە زۆربەی کێشە شەش تەفعیلەکانی عەرەبی لە کوردیدا ، جگە لە شەشی ، قالبی هەشتیشیان لێ دروست کراوە کە ئەمە لە عەرەبیدا نییە ، بۆ نموونە ڕەمەل و هەزەج و ڕەجەز و موزاریع و موجتەس لە عەرەبیدا هەر بە شەشی یان بە مەجزووئی بەکاردێن کەچی لە کوردیدا دەشێ بە هەشتیش بەکاربێن . ئەم درێژ کردنەوەی کێشانە دەرفەت بە شاعیر دەدەن وشەیەك یان دەستەواژەیەك و بگرە ڕستەیەك لە کۆتایی دووبارە بکاتەوە .

- ناوەرۆکی بابەتی شیعریش دەوری هەیە لەبەکارهێنانی پاش سەروادا ، کەشێن بێ (ڕۆ)ی تێدا دووبارە دەبێتەوە ، کە نائومێدی بێ (چ بکەم ) و ...

ج- شیکردنەوەی پاش سەروا لە کوردیدا : پاش سەروا دەشێ وشەیەك یان زیاتر بێ تا دەگاتە نیوەی لەتی دووەمی دێرە شیعر. واتە دەگاتە دەستەواژە و ڕستە و بۆی هەیە لە ڕستەیەکیش زیاتر بێ. لەم ڕوانگەیەوە پاش سەروا دەکرێتە چوار جۆر :

١- یەك وشە : ئەم وشەیە بۆی هەیە :

- ناوێ : حەمدی (شاخ)ی کردوە بە پاش سەروای ئەم هۆنراوەیە :

وا بە گوڵ ئارایشیدا گۆشەیی دەستاری شاخ
خۆشە بۆ سەیرانی ڕۆژی حەزرەتی دڵداری شاخ[٦ : ٢١٠].

- ئاوەڵناو : دیسان حەمدی ئاوەڵناوی (ساغ)ی کردوە بە پاش سەروا :

حەرفی ناساغی بەجێم لاچاکە نەك بێجایی ساغ
کاسەیی گڵ بێ لە مەی پڕ، خاڵی نەك مینایی ساغ[٦ : ٢٦٠].

- کار : سافی (دەکا)ی کردوە بە پاش سەروا :

چاوەکەم، چاوم بە دائیم ئینتیزاری تۆ دەکـــا
شەو بەیادی عاریزت، یادی گوڵی شەو بۆ دەکا[١٠٠ : ١٩].

ئاوەڵکار : شێخ نووری (شەو)ی بە پاش سەروا داناوە :

خۆت بپارێزە لە ئاهی دڵ بریندارانی شـــەو
نەك خودا ناکەردە گیرابێ، دوعای نالانی شەو[٩٢ : ٢٢٧].

- ڕاناوی جوێی کەسی : وەفایی دەڵێ :

لەو ڕۆژەوە کە دوور بۆتەوە سایەت لەسەری من
سووتاوە لە ئاوت هەموو جان و جگەری من[٢١٤ : ٩١].

وشەی پرسیاری (بۆچ)، حەمدی دەڵێ :

مەستی سورمەی نازە چاوت نێرگسی شەهلایە بۆچ؟
زوڵفی ئەفشانت نموونەی تورڕەیی لەیلایە بۆچ ؟[٦ : ٢٠٣].

٢- دەستەواژە : واتە لەیەك وشە زیاتر بێ و ڕستەی تەواو نەبێ ، جا دەستەواژەکە ناوی بێ یان کاری :

- دەستەواژەی ناوی : ئەحمەد موختار بەگی جاف (ئەو چاوە)ی کردۆتە پاش سەروا :

غەزالەی چینە یا خۆ پیالەیی سەهبایە ئەو چاوە
شەرابی نابە یا خۆ نێرگسی شەهلایە ئەو چاوە[١٠ : ١٥٢].

- دەستەواژەی کاری : سالم دەستەواژەی (بم) کە فەرمانی بوون لە ڕێژەی ئینشائی لەگەڵ ڕاناوی لکاوی (م) کە ئەرکی بکەری فەرمانەکە دەبینێ بەکار هێناوە :

لە مەحشەردا ئەگەر بێ ڕووی تۆ مائیل بە جەننەت بم

لەلای یارانی ئەهلی دڵ سەر ئەفگەندەی خەجاڵەت بم [١٠١ : ٧٩].

٣- ڕستەیەک : حەمدی ڕستەی (ناکەم)ی کردوە بە پاش سەروا ، دەڵێ :

لە ڕووی تۆدا نەبێ ، شەرتە وجودی خۆم تەلەف ناکەم

کە ڕووحم عائیدی تۆیە فیدای تۆ بێ ئەسەف ناکەم [٦ : ٢٠١].

٤- لە ڕستەیەک زیاتر : بە تایبەتی لەو شیعرانەی کە نیوەی لەتی دووەم لە هەموو دێڕەکان وەکو خۆی دووبارە دەبێتەوە ، جزیری دەڵێ :

شۆخ و شەنگی زوهرە ڕەنگی دڵ ژ من بر دڵ ژ من

ئاورێن هەیبەت پلەنگی دڵ ژ من بر دڵ ژ من [٥٨ : ٣٩٩].

پاش سەروا لە ڕستەی (دڵ ژ من بر) و دووپات کردنەوەی دەستەواژەی (دڵ ژ من) پێک هاتوە کە لێرەدا دووپات کردنەوەی بەشێکی ڕستەکە بۆ جەخت کردنە . هەمان پاش سەروا لای پرتەوی هەکاریش هەیە [٤٠ : ١٧٦]. حەمدی پاش سەروایەکی هێناوە لە ڕستەیەک زیاترە و دووپات کردنەوەیش نییە و ناگاتە ئاستی نیو لەت ، دەڵێ :

یا محەمەد ڕوو ڕەشی دەرگا نەکەی تۆم ، تۆ بەبێ

هەرچی هەم بێ شك سەگی ئاسانەکەی تۆم، تۆ بەبێ [٦ : ٢٩٢].

(تۆ بە بێ) ڕستەیەکی تەواوە ، جگە لەم ڕستەیە دەستەواژەی (تۆم)ی لەگەڵ کردوە بە پاش سەروا (-تۆم ، تۆ بە بێ) . وایش دەبێ پاش سەروا دوو ڕستە بێ ، مەحوی دەڵێ :

بەدەم مەوجی خوێنی ئەشکەوەم ، بڕوانە چۆنم بۆت

دەروونم کەیلی زووخی دەردوغەم ، بڕوانە چۆنم بۆت [١٨٠ : ٧٦].

(بڕوانە چۆنم بۆت) کە پاش سەروایە لە دوو ڕستە پێك هاتوە (بڕوانە - چۆنم بۆت) .

د- پاش سەروا لە ڕووی ڕەسەنێتییەوە : لەبەر ئەوەی شیعری کلاسیکیمان کاتی خۆی وشەی زمانەکانی دەروبەری کردوە بە کەرەستەی دەربڕین ، زۆرجار ئەو وشە بێگانانە بوون بە پاش سەروا ، بۆیە لە ڕوانگەی ڕەسەنێتی پاش سەروا ، دەتوانین بیکەین بەم جۆرانەی خوارەوە :

- پاش سەروای یەك زمان : ئەوەیە کە وشە یان وشەکانی پاش سەروا سەربەیەك زمان بن .

• پاش سەروای کوردی : عەونی ڕستەی (دەیزانم)ی کردوە بە پاش سەروا ، کە کوردییە ، دەڵێ :

لە شوێنی چی دەچی ، ئەی دڵ ، خەیاڵت خاوە دەیزانم

ئەوەی تۆ بۆی خەریکی ئەو لە تۆ تۆراوە دەیزانم [١٤٥ : ٣٦].

• وا دەبێ پاش سەروا عەرەبی بێ ، جزیری دەڵێ :

تو سەحەر گەهـ ب تەماشا وەرە بازاری حدوث

لێ تەبێ فائیدە ئازار نەدەت خاری حدوث [٥٨ : ١٥٥].

یان وا دەبێ ڕستەیەکی عەرەبی بکرێتە پاش سەروا ، ویسالی دەڵێ :

غەریقی بەحری عیسیانم (أغثنی یا رسول الله)
حەریقی ناری نسیانم (أغثنی یا رسول الله) [٢١٦ : ١٣٦].

ئەو وشە و دەستەواژە عەرەبییانەی کراون بە پاش سەروا ، بە زۆری ئەمانەن : عیشق ، غەلەت (غلط) ، خەت (خط) ، فەرز (فرض) ، غەرەز (غرض) ، زایع (ضائع) ، قەت (قط) ، خوسووس (خصوص) ، مەخلووق (مخلوق) ، ئەلوستەغاس (المستغاث) ، لەزیز (للید) ، فیراق (فراق) ، عاقیبەت (عاقبه) ، عەبەس (عبث) ، ئەلویداع (الوداع) ، موبارەك (مبارك) ، میرات (میراث) ، غەوس (غوث) ، واعیز (واعظ) ، حەز (حظ) ، خەلاس (خلاص) ، وەتەن (وطن) .. کاتی خۆی شاعیران بۆ سەلماندنی توانای شاعیریەتی خۆیان هەوڵیان دەدا بە هەموو دەنگەکان سەروا بێننەوە، جا لەبەر ئەوەی ئەو دەنگانەی لە عەرەبی هەن و لە کوردیدا نین وشەکانیان بە گرانی کۆدەکرێنەوە و تێگەیشتنیان گرانترە . پەنایان دەبردە بەر یەك وشە و دەیانکرد بە پاش سەروا تا کۆتایی دێرەکان بەو دەنگە بێنن کە مەبەستیانە وەکو (خلاص ، غرض ، خط ، حظ ، عبث ، للید) .

- وا دەبێ پاش سەروا فارسی بێ : بێخود دەڵێ :

سەحەر سیباوی ڕووی سامانی (خورشید)
شەفەق سووراوی گۆنەی ئاڵی (خورشید) [٣٦ : ٣٣].

(خورشید - ڕۆژ) وشەیەکی فارسییە و بۆتە پاش سەروای شیعرێکی کوردی . وشەی فارسی بەقەد عەرەبی لە شیعری کوردیدا نەبۆتە پاش سەروا ، ڕێژەیان کەمترە . گرنگترین وشەی فارسی لە پاش سەروا هاتبێ ئەمانەن : (خورشید ، باد، شما ، جا ، چراغ ، خود ، دیگەر ، فریاد ، اوست ، ئاشکار ، جان /جانان ، دریغ ، ماهی نەو ، پەشمە ، ماهرِوو) ، وشەیەکی ڕووسی وەکو (سەماوەر)یش یەك جار بۆتە پاش سەروا [٢١٦ : ٢٨٣].

- پاش سەروای فرە زمان : ئەوەیە دەستەواژەکەیان ڕستەکەی پاش سەروا وشەکانی لە دوو زمان یان زیاتر بێ ، ئەسعەد مەحوی دەڵێ :

کون بە کون دەوران ئەکەم هادی نەماوە ئەی دریغ
هەر مەکانێ بۆی ئەچی شادی نەماوە ئەی دریغ [١٦ : ٣٩].

(نەماوە ئەی دریغ) ، لە کوردی و فارسی پێك هاتوە (نەماوە ئەی - دریغ) . پڕتەوی هەکاری پاش سەروای لە کوردی و عەرەبی داڕشتوە ، دەڵێ :

کافرێ بوتخانە گەڕیام عاقیبەت
ساکینی وێرانە گەڕیام عاقیبەت [٤٠ : ١٠٢].

(گەڕیام عاقیبەت) پاش سەروایە . (گەڕیام) کوردی و (عاقیبەت) عەرەبییە .

ھ- مەودای پاش سەروا : پاش سەروا بە پێی هۆنراوە و دێرەکە دەگۆڕێ ، بۆی هەیە یەك مۆرفیمی کورت بێ وەکو (کە - بکە) و بۆیشی هەیە لە رستەیەك تێپەڕێ . بۆ نموونە لە فارسیدا دەشێ پاش سەروا (است - tobe) بێ و دەشێ جگە لەوشەی سەروا ، سەراپای دێریان لەت بگرێتەوە ، وەکو ئەم چوارینەیە :

با من بودی منت نمی دانستم
یا من بودی منت نمی دانستم
چون من زمیان شدم ترادانستم
تا من بودی منت نمی دانستم [٤٠٧ : ٢٢٥] .

ئەم چوارینەیە، لە رووی سەرواوە لەوانەیەکە لەتی یەکەم و دووەم و چوارەمی هاوسەروان و لەتی سێیەمیان ئازادە. ئەمە لە عەرەبیدا چوارینی خەساوو لە ئینگلیزیدا چوارینی خەیامی پێ دەگوترێ . لەم سێ لەتە هاوسەروایەدا ، تەنیا وشە دوو فۆنیمییەکانی (با ، یا ، تا ، وشەی سەروان و ئەوەی دوای ئەمانە کە لە هەر سێ لەت وەکو خۆی دووبارە بۆتەوە پاش سەروایە (من بودی منت نمی دانستم) . وشەکانی سەروایش کە هەریەکە دوو دەنگە ، لە دەنگی کۆتایی هاوبەشن کە رەوی چوارینەکەیە (ا) و تەنیا دەنگی یەکەمیان جیایە (ب ، ي ، ت) کە ئەرکی دروست کردن و جیاکردنەوەی مانای سێ لەتەکەیان کەوتۆتە سەر. لەلەتە ئازادەکەشدا تێبینی ئەوە کراوە کە وشەی کۆتایی (دانستم) لە رەگەزێکی چەبکە وشەی سەروا بێ . لە کوردیدا ، وا دەبێ تەنیا یەك دەنگدوو لەتە دێر لێك جیا بکاتەوە ، دەنگو وشەکانی تر هەمووی یەك بن ، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم نموونەیەی لێرە وەری دەگرین هەموو وشە دووبارەبوەکان هەر پاش سەروانین ، یەکێ لە وشەکانیان پێش سەروایە ، مەولەوی دەڵێ :

ئەو ئانەیەی دڵ ئەو نەبۆیەی چێش
ئەو لانەیەی دڵ ئەو نەبۆ یەی چێش [١٨٦ : ١٤٣] .

هەموو وشەکانی دوولەتەکە یەکن ، وشەیەکیان پێش سەروایە (ئەو) ، ئەوانی تریش پاش سەروان (یەی دڵ ئەونە بۆیەی چێش) ، تەنیا جیاوازییان لە وشەی (ئانە ، لانە) دایە ، کە تەنیا دەنگی یەکەمیان جیایە . (ء ، ل) . گۆڕانی مانای لەتەکانی دەکەوێتە سەر یەك دەنگو بەس .

- وا دەبێ نیولەت دەبێ بە پاش سەروا و لە هەموو دێرەکان دووبارە دەبێتەوە ، ویسالی دەڵێ:

ئەسیری چەرخی دەورانم ، غەریبم ساخوبا رەحمێك
دەلیلی مولکی بەلخوانم ، غەریبم ساخوبا رەحمێك [٢١٦ : ٢٠١] .
(غەریبم ساخوبا رەحمێك) پاش سەروایە و لە کۆتایی هەموو دێرەکان دووبارە دەبێتەوە .

و- دەوری پاش سەروا لە رووی واتاوە : ئەگەر وشەی سەروا لە هەموو وشەکانی لەت یان دێڕ

شیعر قورسایی مۆسیقاو مانای زیاتر بکەوێتە سەر، ئەوا پاش سەروا لەهەموو وشەکانی سەروا زیاتر ئەو ئەرکە دەبینێ، چونکە پاش سەروا وەك پێتی چەق گرتن مانای هەموو دێڕەکان کۆدەکاتەوە. پاش سەروا وەکو بستەی ئاش هەموو هۆنراوەکەی لەسەر دەسووڕێ. پاش سەروا دەبێ بەو خاڵە سەرەکییەکەی بیری سەرەکی سەراپای هۆنراوەکە هەڵدەگرێ و لەوێوە بەسەر وشەکانی سەرواو ئینجا وشەکانی ناو دێڕە شیعردا بڵاو دەبێتەوە. لە پاش سەرواوە دەردەکەوێ بیری سەرەکی هۆنراوەکە لە چ بابەتێك دەدوێ، بۆ نموونە تۆ کە لە شیعرێکی ویسالی پاش سەروای (کێـچ)[٣٥] ببینی [٢١٦ : ٢٤٨]. یەکسەر دەزانی سەراپای شیعرەکە بە دەوری کێچ دا دەسووڕێتەوە و زیانی کێچ و بێزاری مرۆڤ لەدەست کێچ دەردەبڕێ وەکو ئەوە وابێ، پاش سەروا ناونیشان بێ بۆ هۆنراوەکە. یان کە لە شیعرە ناو دارەکەی مەحوی پاش سەروای (نەکەم چ بکەم) [١٨٠ : ٢٣] دەبینین یەکسەر دەزانین شاعیر لە هەڵوێستی هەڵبژاردنێکی ناچاری دایە و هەموو دێڕەکان حاڵات و نموونەی ئەم هەڵوێستە ناچارییەن. یان کە حەمدی وشەی (واعیز) دەکا بە پاش سەروا [٦ : ٢٢٥] دیارە شیعرەکە لە بارەی واعیزە، گلەو گازاندەیە، ڕەت کردنەوەی قسەو ئامۆژگارییەکانیەتی. وەك نموونە لە شیعری کلاسیکیدا کە ئەم پاش سەروایانەی خوارەوە دەبینین، یەکسەر دەرگای هۆنراوەکەمان بۆ دەکرێتەوە و لە هێلی سەرەکی هۆنراوەکەدا حاڵی دەبین: حەمدی (ماچ) [٦ : ٢٠٤]، سافی (کەس بە دەردی من نەزانی) [١٠٠ : ٩٣]، جزیری (ئەبرۆ) [٥٨ : ٤٠٣]، مەحوی (نیمە مەلاز) [١٨ : ١١٦]، زیوەر (درۆیە) [٩٧ : ٢٥]، بێخود (پێغەمبەر) [٣٦ : ٣٥]، پرتە و (دەردێ ئینتیزار) [٤٠ : ١٢٤]، ئەسیری (سەی تەها) [١٧ : ١١]، سالم (ئەلویداع) [١٠١ : ٧٥]، خادیم (بولبول) [٧٥ : ١٦٣] ... هتد.

چۆن وشەی سەروا لە ئەنجامی زۆر بەکارهاتنەوە کەوتۆتە بەر کاریگەری لاسا کردنەوە لای شاعیرانی کلاسیك، هەر بەو جۆرەش پاش سەروا، زۆر جار دەبێ بەمایەی لاساکردنەوە. پاش سەروا هەیە چەند شاعیرێك لە هۆنراوەدا بەکاریان هێناوە. بۆ نموونە پاش سەروای (نەکەم چ بکەم)ی مەحوی، لای زۆر شاعیری دوای خۆی سەری هەڵداوەتەوە، وەکو خادیم [٧٦ : ١١٠، ١٧٠، ٣٠٢] عەونی [١٤٥ : ٢٦] کردوویە بە (نەکا چ بکا)، میرزا غەفوور [٢٠٤ : ١٣٣] ناری [٢٠٦ : ٧١]، سافی [١٠٠ : ٢٢] تەنیا (چ بکا)ی بەکارهێناوە. وەك دیارە هەر لەم چەند نموونەیەدا، (٦) شاعیر هەمان پاش سەروایان هێناوە.

ز- پاش سەروا و هونەرەکانی شیعر: پاش سەروا ئەگەرچی لە هۆنراوەی خاوەن یەکێتی سەروا (قیتعە و غەزەل و قەسیدە)دا ئاشکراتر دەردەکەوێ، بەڵام لە هەموو هونەرەکانی شیعردا هاتوە، لە کوێ سەروا هەبێ دەگونجێ سەرواکان پاش سەروایان هەبێ. ئەگەر شیعرێ مەسنەوی

---

[35] لە ئەدەبی ئەورووپیدا، وابوە کێچ کراوە بە جێی ژوانی بەیەك گەیشتنی خوێنی دوو دڵدار، چونکە کێچ خوێنی هەردووکیان دەمژێ و خوێنەکان لەناولەشی کێچەکە تێکەڵ دەبن و یەك دەگرن.

بێ ، پاش سەروا لەگەڵ لەتەکانی دێ ، هەروەها بە گوێرەی سێینە و چوارینە و پێنج خشتەکی و .... بۆ نموونە لە چوارینەدا بەهەر جۆرێ سەرواکەی دابەش بوو بێ ، پاش سەروا لەگەڵ سەروا وەکو یەکەکان دەڕوا . لە (٢٨) شاعیری کلاسیکیمان[٣٦] کە چوارینەیان بەکارهێناوە ، ژمارەی هەموو چوارینەکانیان گەیشتۆتە (١٠٨٢) ولەمانە (٣٠٨) یان بە پاش سەروان کە دەکاتە ڕێژەی (٢٨,٥٪) . ئەوەی لە پێنج خشتەکیدا پێویستە، بە ڕوون کردنەوەیە، ئەوەیە ئەو چوار لەتەی سەروای سەربەخۆیان هەیە دەشێ پاش سەروایان هەبێ یان نەبێ ، بۆیە لە زۆر پارچەی پێنج خشتەکیدا ئەگەر پاش سەروا هەبوو ، پاش سەرواکان بە زۆری جیا دەبن ، تەنیا لەتە پێنجەمەکان ئەگەر پاش سەروایان هەبێ دەبێ لە هەموویان وەکو یەك بێ . ئەوەی شایەنی سەرنجە ، نەك هەر لە دێڕ و لەتە شیعر بگرە لەگەڵ سەروای ناوەوەش جاری وا هەیە پاش سەروا دێ .

سێ- پێش سەروا (حاجیب) : پێش سەروا ، ئەو وشە یان دەستەواژە یان ڕستەیە کە لە پێش وشەی سەروادا بەهەمان مانا دووبارە دەبێتەوە. ئەم دیاردەیە لە شیعری عەرەبیدا نەکەوتۆتە بەرچاو و لە لێکۆڵینەوەکانی سەرواناسی باسی نەکراوە . ئەمەیش لە داهێنانی نەتەوە موسلمانە نا عەرەبەکانە ، بەتایبەتی فارس کە لە زووەوە کەوتنە خۆ و دەستیان دایە زیندوو کردنەوەی زمان و ئەدەبیاتی خۆیان پاش ئیسلام و داهێنانی خۆیان لە جۆرو هونەرەکانی ئەدەبی عەرەبی کرد . وادیارە لەسەرەتادا ، لە فارسی ، حاجیب و ڕەدیف وەکو دوو زاراوە تێکەڵ کراون ، بۆیە قەیسی ڕازی بەرپەرچی ئەو جۆرە کەسانە دەداتەوە و دەڵێ : ( هەندێ لە پێشینان بە ڕەدیفیان گوتوە حاجیب ) [٤٠٢ : ٢٣٥] ئینجا بۆ ڕون کردنەوەی مەبەست دەڵێ : ( بینای شیعر لەسەر سەروای دروست هاتوە ، بۆیە مرۆڤ یەکەم جار بیری بۆ سەروا دەچێ . وشەی ڕەدیف دوای تەواو بوونی سەروا دێ ، بۆیە وا چاکە زاراوەی ڕەدیفی بۆ بچەسپێنرێ ، کەچی حاجیب لای شاعیرە گەورەکان ئەو وشەیەیە کە لە پێش سەروا دووبـــارە دەبێتـــەوە )[٤٠٢ : ٢٣٥] پاش ئەم ڕون کردنەوەیە نموونەی شیعرێکی مەسعوود سەعدی داوە کە لەبارەی سولتان مەلیکی کوڕی سولتان مەسعوود گوتوویەتی و وشەی سولتانی تێدا کردوە بە پێش سەروا . لەبارەی حاجیبەوە سەدرەدین زەمانیان دەڵێ : ( حاجیب ئەو وشەیەیە کە پێش سەروای ئەسلی بەهەمان مانا دووبارە دەبێتەوە ) [٤٠٢ : ١٦٢] ، لێرەدا جەخت لەسەر دووبارە کردنەوەی ڕووت کراوە ، واتە بەهەمان مانا نەك بە ڕەگەز دۆزی ، لەم بارەیەوە وەکو پاش سەروا وایە . لە کوردیدا ئەوانەی باسی سەروایان کردوە ، چ وەکو لێکۆڵینەوەی سەروا و چ لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەی هۆنراوەدا ، هیچێکیان بەلای پێش سەروادا نەچوون . ڕەنگە هۆکەیشی ئەوە بێ ، پێش سەروا ئەگەرچی لە مەسنەویدا زۆرە ، بەڵام لەغەزەل و

---

[36] شاعیرەکان ئەمانەن : بابا تاهیر ، حەمدی ، شێخ ڕەزا ، ئەحمەد موختار ، بێخود ، خادیم ، حاجی ، کمالی ، ئەسعەد مەحوی ، سەفوەت ، ناری ، شاهۆ ، لوتفی ، تایەر فوئاد ، هەردی ، زیوەر ، جاهید ، گۆران ، ئەختۆل ، میرزا غەفوور ، میهری ، مەلا وەسمان ، شاری ، خانی ، عەونی ، شێخ نوری ، حیلمی ، هەژار

قەسیدە بەرچاو ناکەوێ کە یەکێتی سەروایان تێدایە و دەبێ لەسەرەتا تا کۆتایی پێش سەروا وەکو خۆی دووبارە بێتەوە . نموونەیەك بۆ پێش سەروا ، مەولەوی دەڵێ :

ئیسە تەن وەی زام دڵ وەی خەریکی

دیدار وەی دووری مەرگ وەی نزیکی [١٨٦ : ١٩٦] .

لەم دێرە شیعرە مەسنەوییەدا ، (خەریکی ، نزیکی) وشەی سەروان . پێش ئەم دوو وشەیە لە هەردوولەتدا وشەی (وەی) وەکو خۆی ، بە هەمان مانا دووبارە بۆتەوە . ئەمە پێش سەروایە (حاجیبە) . جاری وا هەیە دێرە شیعرێك پاش سەرواو پێش سەروای هەیە ، هەژار دەڵێ :

ژیان خۆشە لەگەڵ ئەوین برا بێ

گیان خۆشە بەهۆی ئەوین جیا بێ [٢ : ٣١٥] .

(برا ، جیا) وشەی سەروان . کەوتۆتەتە نێوان دوو وشە (بێ) پاش سەروایە و (ئەوین) پێش سەروایە . ئەم دێرە جگە لەم سێ وشەیە کە سەرواکەیان دەوڵەمەند کردوە ، دوو وشەکەی بەرایش جۆرە سەروایەك بەیەکەوە دەبانبەستێتەوە ، (ژیان) و (گیان) سەروای سەرەتایان پێك هێناوە ، (خۆشە) بۆتە پاش سەروایان . واتە لەهەر لەتە دێرێك تەنیا یەك وشە لە پەیوەندی سەروا چۆتە دەرەوە ، لەیەکەم (لەگەڵ) و لە دووەم (بەهۆی) ، ئەوانەی تر هەموو وشەکان هەریەکە بە جۆرێ دەچێتە ناو چوارچێوەی سەرواوە .

بۆی هەیە پێش سەروا بکەوێتە نێوان دوو سەرواوە ، سەروای کۆتایی و سەروایەکی ناوەوە ، خانی دەڵێ :

سەحرا و وچەمەن دکرنە مەسکەن

بەیدا و دەمـــەن دکرنە گوڵشەن [٣ : ٤٤] .

لەم دێرەدا (مەسکەن ، گوڵشەن) وشەی سەروان . (دکرنە) پێش سەروایە . ئەم پێش سەروایە لە لەتی یەکەمدا کەوتۆتە نێوان (چەمەن) و (مەسکەن) کە سەروای ناوەوەیان لەنێودا هەیە ، لەلەتی دوەمیش لە نێوان (دەمەن ، گوڵشەن) هاتوە کە ئەوانیش بەسەروای ناوەوە پێکەوە بەستراون . سەروای ئەسلی لەتەکان (مەسکەن ، گوڵشەن) و سەروای سانەوی (چەمەن و دەمەن) . واتە (دکرنە) بۆ سەروای ئەسلی بۆتە پێش سەروا و بۆ سەروای سانەوی بۆتە پاش سەروا.

وا دەبێ دێرەکە سێ سەروای هەبێ ، پێش سەروا لە پێش وشەی کۆتایی نەبێ بەڵکو لە پێش وشەی سەروای ناوەڕاست بێ ، خانی دەڵێ :

خوەش ڕەنگی تەدا گیایێ سۆر گوڵ

خوەش دەنگی تەدا نەوایێ بولبول [٣ : ٨] .

(سورگوڵ ، بولبول ) وشەی سەروای کۆتایین ، (گیایێ ، نەوایێ ) وشەی سەروای دووەمن ، (خوەش ڕەنگی ، خوەش دەنگی ) وشەی سەروای یەکەمینن . پێش سەروا (ئەدا ) نەکەوتۆتە پێش سەروای کۆتایی ، کەوتۆتە پێش سەروای ناوەڕاست و بۆ سەروای یەکەم بۆتە پاش سەروا . لێرەش هەموو وشەکانی لەتەکان کەوتوونەتە بەر چەمکی سەروا .

دەشێ هەر لەتێکی دێڕە شیعرەکە لە دوو سەرواو دوو پێش سەروا پێك هاتبێ ، خانی دەڵێ :

ئەف ڕەنگە فەلەك هەمی موعەززەم
ئەف چەندە مەلەك هەمی موکەررەم [٣ : ٥] .

ئەم دێڕە لەسەر دوو سەروا بنیات نراوە ، لە لەتی یەکەمدا (فەلەك ، موعەززەم ) لەلەتی دووەمدا (مەلەك ) بەرامبەر (فەلەك ) و ، (موکەررەم ) بەرامبەر (موعەززەم ) ، هەردوو سەرواش پێش سەروایان هەیە ، سەروای کۆتایی پێش سەرواکەی (هەمی ) یەو سەروای ناوەوە پێش سەرواکەی (ئەف )ە بەڵام پلەیەك خزیوەتە پێش و وشەیەکی تر هاتۆتە بەینیانەوە (ڕەنگە ) ، (چەندە ) .

أ- <u>مەودای پێش سەروا</u> : پێش سەروا لە هەموو دێڕە شیعرێکدا وەکو یەك نییە ، کورت و درێژی لە نێوان وشەو ڕستەدا دەردەکەوێ ، ئەمەش چەند جۆرێك لە مەودای پێش سەروا :

١- وا دەبێ پێش سەروا یەك وشە بێ (ناو ، ئاوەڵناو ، کار ، ئاوەڵکار ، ڕاناو ... ) خانی دەڵێ :

گۆیا هەمی جیسمەکن تو جانی
گۆیا هەمی شەهرەکن تو خانی [٣ : ٧] .

(جانی ، خانی ) وشەی سەروان و (تو ) پێش سەروایە ، یەك وشەیە ، ڕاناوە .

٢- وا دەبێ پێش سەروا دەستەواژەیەك بێ ، خانی دەڵێ :

مەعلوولە ل باگەلەك عەلیمان
مەقبوولە ل باگەلەك حەکیمان [٢ : ٢٦] .

ئەم دێڕە شیعرە سەراپا وشەکانی لە مۆسیقای سەروا بەشدارن (عەلیمان ، حەکیمان ) وشەی سەروان . سەروای کۆتایی . (مەعلوولە ، مەقبوولە ) سەروای سەرەتایین . (ل باگەلەك ) پێش سەروایە . لە هەمان کاتدا بۆ سەروای سەرەتا دەبێتە پاش سەروا .

٣- وا دەبێ پێش سەروا ڕستە بێ ، خانی دەڵێ :

وەللاهی یەکێ نەمایە ڕاحەت
بیللاهی یەکێ نەمایە تاقەت [٢ : ٥٦] .

(نەمایە ) یان (یەکێ نەمایە ) ، ڕستەیە بۆتە پێش سەروا بۆ (ڕاحەت ، تاقەت ) .

ب- پێش سەروا ، وشەی سەروا ، پاش سەروا : لەم سێیانە وشەی سەروا ، بنچینەیەو بۆ دروست بوونی سەروای دێرە شیعر ، دەبێ هەر هەبێ ، بەلأم دوەکەی تر بوونیان مەرج نییە ، ئەگەر چی هاتنی یەکێکیان یان هەردووکیان ئیقاعی شیعرەکە بەهێزتر دەکا . زۆرجار کە ئەم سێیانە لە دێرە شیعرێکدا کۆببنەوە ، سەراپای وشەکانی دێرەکە گوێی سەروایان بەبەردا دەچێ و دەکەونە ناو کارلێکی ئاوازی دەنگی شیعرەکە و هەریەکە بە جۆرێ بە وشەی سەرواوە دەبەسرێتەوە . ئەم شیعرەی خانی :

مەم بۆ من و هەیبەتەت ژ بۆتە
غەم بۆ من و سەلتەنەت ژ بۆتە [٢ : ١٧٢] .

هەر هەموو وشەکان بەشداری دروست کردنی ئاوازی دێرە شیعرەکە دەکەن و لەگەڵ سەروای کۆتایی تێك دەکەنەوە . وشەکانی سەروای کۆتایی بریتین لە ( هەیبەتەت ، سەلتەنەت ) وشەکانی سەروای سەرەتایی بریتین لە ( مەم ، غەم ). وشەکانی ترکە دووبارەن دەوری دەنگدانەوەی دوو سەرواکە و بەیەك گەیاندنی هێلی ئیقاعی نێوانیانە ، ( ژ بۆتە ) پاش سەروایە . ( بۆ من و ) پێش سەروایە و لەهەمان کاتیشدا بۆ سەروای سەرەتایی ، دەبێ بە پاش سەروا . واتە ( بۆ من و ) هەردوو دەور دەگێرێ ، دەوری پێش سەروا و پاش سەروا ، بەمەوە وەکو ئەڵقەی پێوەندی جەمسەری دوو سەرواکە بەیەك دەگەیەنێ .

وا دەبێ دێرە شیعرێك لەسەر دوو سەروا ڕۆنرابێ ، سەروای کۆتایی و سەروای سەرەتا . لە نێوان ئەم دوو سەروایەدا وشەیەك دووبارە بووبێتەوە ، جارێك بۆ سەروای کۆتایی بووبێ بە پێش سەرواو جارێك بۆ سەروای سەرەتا بووبێ بە پاش سەروا ، وەکو خانی دەڵێ :

گوینده هنەك] ، [هنەك دخاموش
پوینده هنەك] ، [هنەك دمەدهوش [٢ : ٤٨] .

( هنەك ) لە هەر لەتێکدا دووجار هاتوە ، جارێك بۆتە پێش سەروا و جارێك بۆتە پاش سەروا .

- وا دەبێ دێرە شیعرێك لەسەر سێ سەروا ڕۆنرابێ ، لەو حاڵەتەدا دەشێ پێش سەروا لە پێش هەر کامەیان بێ ، ئەگەرچی شوێنی خۆی پێش سەروای کۆتاییە ، وەکو خانی دەڵێ :

قەلبێ دزەغەل دکەت بلووری
پولێ د دەغەل دکەت فلووری [٢ : ٢٧] .

وا دەبێ هەرلەم جۆرە دێرەدا کە سێ سەروای هەیە ، پێش سەروا نەقلێکی تر خۆی بۆ پێشەوە هەڵکوتێ و بکەوێتە پێش سەروای ناوەڕاست ، خانی دەڵێ :

مەوجوودە دوێ شەهادەت و غەیب
مەشهوودە دوێ سەیادەت و عەیب [٢ : ٤ ].

وا دەبێ زیاتر خۆی ڕەپێش دەکات و دەکەوێتە پێش سەروای سەرەتا ، خانی دەڵێ :

هەریەك ب کەماڵ بەدری ماهەك
هەریەك ب جەماڵ سەدری شاهەك [٢ : ٤١].

بەم جۆرە پێش سەروا بە پێی جۆری سەروای دێرە شیعر شوێنی جیاجیا دەگرێ و بە زۆریش بەرەو پێشەوە دەڕوا .




سنوورو ڕەگەزەکانی سەروا بە هێلکاری :

باسی سێیەم : تێکەڵ بوونی کۆتاییەکان :

بە پێی ئەو دوو باسەی لە پێشەوە بۆ دەنگەکانی سەرواو وشەکانی سەروا کرا ، دەردەکەوێ کە لە هەر یەکێکیان دوو کۆتایی جیاواز دەردەکەوێ و بۆی هەیە ئەو دوو کۆتاییە لە هەندێ باردا تێکەڵ بن ، واتە ئەو سنوورەی لە نێوان کۆتاییەکان دانراوە هەڵبگیرێ و جۆرە تێکەڵییەک بێتە ئاراوە .

یەک- تێکەڵبوونی دەنگەکانی کۆتایی سەروا : دوا دەنگی ڕەسەنی وشەی سەروا ڕەوییە :

ئەگەر وشەیەکی سەروا کۆتایی بە ڕەوی هاتبوو ، دەبێ هەموو وشەکانی تری سەروا کۆتاییان بە ڕەوی بێ ، خۆ ئەگەر کۆتایی بە پاش ڕەوییەکی تایبەتی هاتبوو دەبێ هەموو وشەکانی سەروا ئەو پاش ڕەوییە یان هەبێ ، وەکو (جاران ، باران) هەردووکیان پاش ڕەوی (ان) یان وەرگرتوە و کۆتایی وشەکانی سەروا (ن)ە . یان وشەکانی (چاوەکەم ، ناوەکەم ، خاوەکەم) ڕەوییان (و)ەو (ەکەم) پاش ڕەوییە ولە دوو مۆرفیمی ڕێزمانی پێک هاتوە و کۆتایی بە دەنگی (م) هاتوە . لە وشەی سەروادا ، بە شێوەیەکی ئاسایی ، دەبێ ڕەوی لەگەڵ ڕەوی بێت و پاش ڕەوی لەگەڵ پاش ڕەوی ، بەلام ئەم وردییە لای هەموو شاعیران بەیەک ڕادە پەیڕەو نەکراوە ، هەیانە ئەم دوو کۆتاییەی تێکەڵ کردوە . ڕەوی و پاش ڕەوی لە کۆتایی وشەکانی سەروا هێناوە . ئەمەش هەندێ لەو حاڵەتانە :

١- وا دەبێ وشەیەکی سەروا کۆتایی ڕەوی بێ و وشەکەی تر یا وشەکانی تر خاوەن پاش ڕەوی بن و ڕەوی و پاش ڕەوی هاودەنگبن ، وەکو حاجی دەڵێ :

ئێستەکەش فرسەتە گەلی یاران
کەپەنک بۆ چییە لە پاشی باران [٦٠ : ٢٢٧] .

وشەکانی سەروا (یاران ، باران) ، کۆتاییان بە (ن) هاتوە ، بەلام لە وشەی یەکەم ئەم (ن)ە لە پاش ڕەوی (ان) دایە کە نیشانەی کۆیە و چۆتە سەر وشەی (یار) ، کەچی لە دوەمیاندا (ن)ەکە ڕەوییە چونکە بەشێکە لە ئەسلی وشەی (باران) و زیادەی ڕێزمانی نییە . لێرەدا یەکبوونی دەنگی کۆتایی دوو وشەکەی سەروا ، لە دوو حاڵەتی جیاوازەوە پەیدا بوە ، ڕەوی و پاش ڕەوی کە هەردووکیان تێکەڵ بوون ئینجا یەکێتی دوا دەنگیان دەستە بەرکردوە فارس بەم جۆرە سەروایە دەڵێن قافیەی جەعلی.

٢- وا دەبێ دەنگی یەکگرتووی کۆتاییەکان ڕەوی تێدا نەبێ ، لە پاش ڕەوییەوە هاتبێ بەلام پاش ڕەوییەکان جیابن ، حاجی دەڵێ :

شکڵی تەکیە و خانە قاهی شێخەکان
واقیعا ڕەنگینە ، ئەمما بۆ ڕییـــان [٦٠ : ٢٠١].

( شێخەکان ، ڕێیان ) وشەی سەروان ، هیچیان کۆتایی بە ڕەوی نەهاتوە ، ئەو دەنگە کۆتاییەی کۆیان دەکاتەوە ( ن ) لە پاش ڕەوی دایە کە لە یەکەمیان مۆرفیمی ناسین و کۆ ( ەك +ان ) و لە دوەمیان مۆرفیمی ڕاناوی کەسی سێیەمی کۆیە ( ن ) . ئەگەر دوا دەنگی ڕەسەنی وشەکان وەربگرین بۆ گەڕان بە دوای ڕەویدا ، دەبینین یەکەم کۆتایی بە ( خ ) و دوەم بە ( ا ) دێ، ئەمانە وەکو یەك نین و ڕەوییان دروست نەکردوە ، پاش ڕەوییەکان بە دەنگی کۆتایی ئەم ئەرکەیان هەڵگرتوە . ئەوەی جێی سەرنجە ، بۆ تەواو کردنی مەرجی سەروا کە دەبێ ناوك و پەراوێزی کۆتایی یەك بن ، لە وشەی یەکەمدا ( ان )ی کۆ دەگرێتەوە کە مۆرفیمێکی ڕێزمانی سەربەخۆیە کەچی لە دوەمدا ( ان )ەکە بەسەر دوو مۆرفیم دابەش بوە ، بزوێنەکە دوا دەنگی ئەسلی وشەی سەروایە و ( ن )ەکە بەتەنیا مۆرفیمێکی ڕێزمانییە .

هەژار دەڵێ :

ڕووناکی دڵ و بینایی چـــاوان
گەرتۆ نەبی کێ ئەوینی دا وان [٣ : ٢٣٩] .

لێك کردنەوەی ڕەوی و پاش ڕەوی لەم دێرەدا نەختێ ئاڵۆزی تێدایە. وشەی سەروا (وشەی کۆتایی کە بەهەمان مانا دووبارە نەبووبێتەوە ) لەیەکەم ( چاوان )و لە دوەم ( وان )ە ، یەکەمیان لە ( چاو+ان ) پێك هاتوە ، واتە (و) ڕەوییەو (ان ) پاش ڕەوییە. دوەمیان ڕاناوێکی سەربەخۆیە (وان)، سواو و سوکراوەی ( ئەوان ) ە . ئەگەر ( ئەوان ) وەربگیرێ دەشێ ( ئەو) بە ڕاناوی کەسی سێیەمی تاك و(ان ) بەکۆ دابنرێ .ئەوسا ڕەوی دەبێ بە (و) لە (ئەو) دا ، بەم بۆچوونە ڕەوی هەردوو وشەکە ( چاو - ئەو) یەك دەبێ بەڵام سەرواکە دروست نییە چونکە ناوکی دوا برگە لە وشەکاندا یەك نییە ( ا،ە ) . لەم دێرە شیعرەدا وەك وشەو دەنگەکانی سەروا ( چاوان ) و ( دا وان ) بەرامبەر یەك ڕاگیراون ، یەکەمیان یەك وشەی دوو مۆرفیمیە و دوەمیان دوو وشەیە : فەرمانێك ( دا ) و ڕاناوێك (وان )، ئەگەر (وان ) حسێبی کۆی بۆ بکرێ (ان )ی لێ لابدرێ تەنیا (و) دەمێنێتەوە ، ئەم (و)ە لەگەڵ (ا )ی (دا ) سەروا دروست دەکا و (و) دەبێ بە ڕەوی ، بەڵام لەبەر ئەوەی بەم کارە (و) پاش سواوی هیچ مانا نادا (داو) مانای (دا ئەو) ناگەیەنێ ، بۆیە ( ن )ی کۆتایی بە جێگری ڕەوی دادەنرێ و ڕەوی وشەکانی سەروا توانای هەڵگرتنی باری ئیقاعی و دەلالی شوێنەکەی خۆیان نییە .

دوو- تێکەڵ بوونی وشەکانی سەروا : سەروا تا سێ وشە حسێبی بۆ دەکرێ ، وشەی سەروا، پێش سەرواو پاش سەروا. پێش سەروا چەسپاوە و ناگۆڕێ ، ئەوەی تێکەڵییەکە دروست بکا پاش سەروایە ، زۆر جار لە سەراپای هۆنراوەیەکی بە یەکێتی سەروادا ، پاش سەروا لە زۆریەی وشەکان وەکو خۆی دووبارە دەبێتەوە کەچی لە پڕ لەیەك دوا تێکیان مانای دەگۆڕێ و لەگەڵ وشەی سەروادا خۆی لێك دەداتەوە ، بۆ نموونە ، نالی دەڵێ :

بەزستان دڵ شکستەی بەر دو سەر مام
بەهاوین جەستە خەستەی دەردو گەرمام [٢٠٩ : ٧١].

لەم دێڕەدا پاش سەروا نییە ، (سەرمام ، گەرمام) وشەی سەروان (ا) ڕەوییە ڕاناوی (م) پاش ڕەوییە . بەلام کە دێینە سەر وشەی سەروای دێڕەکانی تری ئەم هۆنراوەیە ، ئەم کۆتاییانە دەخوێنینەوە (دەربەدەر مام ، بێ‌باڵ و پەڕمام ، سەفەر مام ، هەر مام ، من بێ پەدەر مام ، دەربەدەر مام ، بێ بەسەر مام) ، لە هەموویاندا (مام) پاش سەروایە ، لە فەرمانێك (ما) و ڕاناوێك (م) پێك هاتوە . وشەکانی پێشوو بوونەتە وشەی سەروا و مانایان سەربەخۆیە (دەربەدەر ، بێ پاڵ و پەڕ ، سەفەر...) لە هەموویان دەنگی سەروا (ەر) و ڕەوی (ر)ە ، ئەوەندە هەیە چەند جارێك (ر-ڕ) کە فۆنیمی جیان بەرامبەر یەك هاتوون. ئەم دیاردەیە لە شیعری کلاسیکی زۆر دووبارە دەبێتەوە . لە هیچێکیان تێکەڵی دروست نەبوە ، ئەو تێکەڵبوونەی مەبەستمانە لە دوو لەتەکەی دێری یەکەمدایە (سەرمام ، گەرمام). ئەگەر وەکو دێرەکانی دواوە (مام) بۆ پاش سەروا جیا بکرێتەوە ، ڕاستە ئەو وشانەی دەمێننەوە (سەر ، گەر) هەم مانای سەربەخۆیان هەیە و هەم سەرواو ڕەویشیان لەگەڵ دێرەکانی تر یەکە ، بەلام (سەر ، گەر) لەم دوو لەتەدا بە مانای سەربەخۆ لەگەڵ مانای لەتەکان ناڕۆن . مانای لەتەکان وا دەخوازێ بە (سەرما) و (گەرما) مانایان لێك بدرێتەوە ، چونکە پەیوەندییان بە زستان و هاوینەوە هەیە ، لەم حاڵەتەدا (ا) دەبێ بە ڕەوی (م) دەبێ بە پاش ڕەوی . وەك دیارە تێکەڵبوونی پاش سەروا و سەروا ، بۆتە هۆی تێکەڵ بوون و لێك جیابوونەوەی (ڕەوی) و پاش ڕەویش . بەم جۆرە لە دوولەتی یەکەمدا پاش سەروا نامێنێ و لەتەکان بە وشەی سەروا کۆتاییان دێ ، کەچی لە دێرەکانی تر بە پاش سەروا کۆتاییان دێ . نالی لە شیعرێکی تریشدا ئەم دیاردەی دووبارەکردۆتەوە ، لە شیعری لاپەڕە (٩٢)دا (ساقی بەمەیی کوهنە ...) ، دێرەکان کۆتاییان بەم وشانە هاتوە (نەوبە ، تەوبە ، ئەوبە ، جدەوبە ، قەلەوبە ، جلەوبە ، خەوبە ، نەوبە) . (نەوبە) دووجار هاتوە ، شوێنی هاتنەکەیان حسێبی تایبەتی بۆ کراوە ، کۆتایی لەتی یەکەم و کۆتایی دوا لەتی هۆنراوەکە ، ئەمە کۆکردنەوەو بەیەکەوە گرێدانی سەرەتا و کۆتایی هۆنراوەیە ، هەریەکەیان بەمانایەك هاتوە ، یەکەمیان لە دوو بەش پێك هاتوە (نەو/بە) یەکەمیان ئاوەڵناوە (عادەتی نەو) ، دوەمیان فەرمانی داخوازییە بۆ کەسی دوەمی تاك و لە (بوون) داڕژاوە (بە، ببە) .

لە هەموو کۆتاییەکان (تەنیا دوو نەبێ) (بە) پاش سەروایە و لە (بوون)ەوە داتاشراوە ، وشەکانی پێش ئەمە دەبن بە وشەی سەروا (نەو ، ئەو ، جدەو ، قەڵەو، جلەو ، خەو) کە ڕەوی (و)ە . کەچی لە (تەوبە)ی کۆتایی دێری یەکەم و (نەوبە)ی کۆتایی دێری کۆتایی ، (بە) بەشێکی ڕەسەنە لە وشەکان و سەربەخۆ نییە . بۆیە نابێ بە پاش سەروا ، ئەگەر لەمانەدا بکرێ بە پاش سەروا ، ئەو بەشەیەی لە پێشەوە دەمێننەوە (نەو ، تەو) لەدێرەکان مانا تەواو ناکەن . ئەگەر چی

لە ناوەڕاستی ئەم دوو وشەیەدا (ەو) هاتوە ، دەنگەکانی سەرواو ڕەوی لەگەڵ ڕەوی وشەکانی پێشوو یەك دەگرێتەوە بەلام (بە)ی کۆتاییان سەربەخۆ نییە، ڕەوی وشەکانی تری خستۆتە ناو ئەم دوو وشەیە یان پاش سەروای ئەوانی لەم دوو وشەیەدا تواندۆتەوە .. قەیسی ڕازی دەڵێ پێشینان (تێکەڵ کردنی ڕەدیف و قافیە یان بە پەسند نەزانیوە)[٤٠٢ : ٢٣٦] بەلام من وای بۆ دەچم نالی کە ئەمەی کردوە ،لەم دوو هۆنراوەیەدا لەبەر بێ دەسەلاتی شیعری نەبوە تا لێی پەسند نەکرێ. بەڵکو بۆ هونەر و جوانکاری و وردەکاری بوە ،لەوانەیە ئەمە یەکێ بێ لەو سەد داوەی بۆ (ئەو کەسە کە شاعیرە) بە (داوە شیعری دەقیقی خەیالی شیعر) ناویەتەوە . قەیسی ڕازی کە ئەم جۆرە کارە لای پێشینان بە پەسند نازانی ، نموونەیەکی بۆ ڕون کردنەوە داوە ، کە چوارینەیەکی معزییە دەڵێ :

بهاری کز دو رخسارش همی شمس و قمر خیزد
نیگاری کز دو یاقوتش همی شهدو شکر خیزد
خروش از شهر بنشاند هر آن گاهی که بنشیند
هزار آتش برانگیزد هر آن گاهی که بر خیزد[٤٠٢ : ٢٣٦].

لە دوولەتی یەکەمدا (قمر، شکر) بوونەتە وشەی سەرواو (خیزد) سەربەخۆیە و بۆتە پاش سەروا ،کەچی لە لەتی چوارەمدا (بر خیزد) وشەیەکی سەربەخۆیە ،لە دوو بەش پێك هاتوە (بر- خیزد) ، خیزەد وەکو پاش سەروا خۆی دەنوێنێ و (بر) لەگەڵ قمر و شکر هاوسەروایە ، بەلام لەم لەتەدا (برخیزد) وەك یەك وشە حیسابی بۆ دەکرێ ، بۆیە دەبێ بە وشەی سەروا .

ئەم تێکەڵ بوونەی لە کۆتاییەکان سەرهەڵدەدا ، چ لە ئاستی دەنگدا بێ و چ لە ئاستی وشە ، یان بۆ بێ دەسەلاتی شاعیر دەگەڕێتەوە ، ئەوسا دەبێ بە عەیب ، یان بۆ زەبر بەدەستی شاعیر دەچێتەوە ئەوسا دەبێ بە وردکارییەکی زیادەو قووڵیەکی تر بە ئیقاع و دەلالەت و یاری بە وشە کردن دەدا .

بەشی سێیەم

# دابەشبوونی سەروای شیعری کوردی

**باسی یەکەم :** چەمك و جۆرو پێکهاتنی پارچە هۆنراوە

یەکەم: چەمکی پارچە هۆنراوە

دوەم : ناونانی پارچە هۆنراوە

سێیەم: دابەش کردنی پارچە هۆنراوە

١- لە روانگەی کێشی لەتەکانەوە

٢- لە روانگەی کێش و ژمارەی لەتەکانەوە

٣- لە روانگەی سەروای لەتەکانەوە

چوارەم : کردنەوە و داخستنی هۆنراوەی پارچەدار

**باسی دوەم :** پارچەی گشتی

یەکەم : تاك

دوەم: سێینە

سێیەم: چوارینە

چوارەم: پێنجینە

پێنجەم : شەشینە

شەشەم: حەوتینە

حەوتەم: هەشتینە

هەشتەم: نۆیینە

نۆیەم: دەیینە

دەیەم: پارچەی یازدە برگەیی

**باسی سێیەم :** پارچەی تایبەتی

یەکەم : قیتعە و غەزەل و قەسیدە

دوەم: تەسمیت و تەرجیع بەند و تەرکیب بەند

سێیەم: موستەزاد و قالبە سەرواکانی

چوارەم: سۆنێتە

پێنجەم: موەششەح

شەشەم: شیعری ئازاد

### باسی یەکەم : چەمك و جۆرو پێکهاتنی پارچە هۆنراوە :

**یەکەم – چەمکی پارچە هۆنراوە – stroph , stanza :**

وشەی (stroph) کە بۆ پارچە شیعر بەکارهاتوە لە بنچینەدا (وشەیەکی گریکییە بەمانای – بادانەوە – هاتوە. لە درامای گریکیدا بۆ پارچەی یەکەمی کۆرِس بەکار دەهات لەکاتی ڕۆیشتنیدا لە سەرێکی شانۆوە بۆ سەرەکەی تر دەیانچڕی ، ئینجا – anti - stroph – پەیدا بوو. ئەو پارچەیە بوو کە کۆرِس لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ شوێنی بەرایی دەیانچڕی ، دواتریش –epode– هاتە ئاراوە ، ئەو پارچە بوو کە لەتەکانی کێشیان وەکو یەك نەبوو ، کۆرِس لەکاتی وەستاندا دەیانچڕی . وردە وردە ڕاراوەکە وای لێ هات بوو بە هاوتای stanza بەتایبەتی لە سرروودا ، دواتریش بۆ پارچەی شیعری ئازاد بەکاردەهات ) [٥٠٢ : ٦٦٢] ، کەچی (stanza) بەم جۆرە ڕون کراوەتەوە (وشەکە بەمانای – شوێنی وەستان – دێ ، بریتییە لە کۆمەڵێك لەتە دێر ، ژمارەیان هەر چەندەی هەبێت ... ستانزا یەکەی بونیاتی هۆنراوەی پارچەدارە ) [٥٠٢ : ٦٥٧] . ڤانسان بەم جۆرە پێناسەی پارچە شیعر دەکات (پارچە شیعر ، کۆمەڵە لەتێکە بە هۆی سیستەمی تایبەتییەوە کۆبوونەتەوە سەریەك. هەر شیعرێك یان پارچە یان چەند پارچەیەکە کە لە ڕووی شکلی شیعری و لە ڕووی واتاوە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە . لەتە دێرەکانی پارچەکانی یەك هۆنراوە هەندێ جار یەکسانن و هەندێ جار یەکسان نین . سەروایان یان مەسنەوییە یان موتەناوبە یان ئازادە . هەندێ جار سەروای مەسنەوی و موتەناوب لەیەك پارچەدا کۆ دەبنەوە . پارچەکان هەندێ جار بەڕێکی دووبارە دەبنەوە و هەندێ جار یاسای دووبارە بوونەوەیان دەگۆڕێ ، پارچە هەیە ٣،٢ دێـــرە ، پارچەیـــش هەیە ١٠،٨،٦،٥ دێـــرە )[٢٣٠ : ٨٤] . ئەبرامز دووبارەبوونەوەی سیستەمی سەرواو یەکێتی ژمارەی لەتەکان و درێژییان لەهەر پارچەیەکدا بەمەرجی سەرەکی دەزانێ [٥٠٠ : ١٦٤] .

پارچە هۆنراوە وا دەبێ سەربەخۆ بێ ، واتە بەهیچ پارچەی تـرەوە نەبەسرابێتەوە بەلام سیستەمی سەروای تایبەتی وادەکا حسێبێکی تایبەتی بۆ بکرێ و بەجۆرە پارچەیەکی دیاریکراو دابنرێ . وایش دەبێ پارچە هۆنراوە بەتەنیا نەبێ ، لەگەڵ چەند پارچەیەکی تر هۆنراوەیەك دروست بکەن . کاتێ هۆنراوەیەك دابەش چەند پارچەیەك دەکرێ (پارچەکان هەر جۆرێك بن) ، بەزۆری یەکسان دەبن بەلام وا دەبێ جیایش بن (لەزۆربەی هۆنراوەی پارچە داردا پارچەکان ناگۆڕێن بەلام جارویار گۆڕانیشیان تێ دەکەوێ) [٥٠٢ : ٦٥٧] . بۆ نموونە چوارینەو پێنجینە و شەشینە، پارچەکانیان ناگۆڕێ ، بەلام لای شاعیرێکی وەکو خدر مەحموود مەندەلاوی لە دیوانی (بڕوەخوێن) ، هەندێ هۆنراوە پارچەکانیان (٥،٤) یان (٦،٥) یان (٦،٥،٤) لەتین .

لەبارەی دیارکردنی ڕادەی هەرە کەم و هەرە زۆری ژمارەی لەتەکانی هەر پارچەیەك ڕای جۆراو

جۆر هەیە . کەمترین ژمارەی لەتی پارچە شیعر ( چ بەتەنیا و چ لە چوارچێوەی هۆنراوەدا ) ، لای فرانسواز یەك لەت ( نیو دێر -mono stiche- ) بەسە بۆ دروست بوونی پارچە شیعر بەلام لەهەمان کاتدا ئەم جۆرەیان بە دیاردەیەکی زۆر دەگمەن دەزانێ و لەتێکی سەربەخۆی ( ئەپولینێر ) بە نموونە دێنێتەوە کە دەڵێ :

Et l’anique cordeau des trompettes marine . [٢٠ : ٤٨٢]

لە کوردیدا ، ئێمە چوار لەتی سەربەخۆمان لای میهری دیوە ، کە لە دەستنووسەکەی خۆیدا لەسەری نووسیوە ( مصراع ) ، لە یەکێکیاندا دەڵێ :

دەست لە دەستی یارە عالەم گەردشی سەیران ئەکەن [٢١٠ : ٨٩].

لەو چوار لەتەی میهری یەکێکیان ( ٥ )پێیە کە ئەمە لە کوردیدا دیاردەیەکی زۆر دەگمەنە . هەر لە فەرەنسیدا ، بەلام مۆریس گرامۆن، نەك یەك لەت بگرە مەسنەوی و سێینەی هاوسەرواو چوارینەی هاوسەرواو چوارینەی دوو مەسنەویش بە پارچە نازانێ. لای ئەو پارچە لە سێینەی سەروا جیاواز و چوارینەی فرە سەرواوە دەست پێ دەکات [٤٨٤ : ٩١] . لە ئینگلیزیدا ، بەلای جۆرج وودز پارچە لە مەسنەوییەوە دەست پێ دەکا . دەڵێ ( پارچە شیعر بریتیە لە دوو لەتە شیعر یان زیاتر کە بە پێی نەخشەی تایبەتییەوە بەیەکەوە بەستراون و بەشێك لە هۆنراوە پێك دێنن ) [٤٦٧ : ١٤] . ج.ئەی. کودۆن کەمترین ژمارەی دیار نەکردوە هەر دەڵێ پارچە بریتیە لە ( کۆمەڵە لەتە شیعرێك ، دەشێ ژمارەیان هەرچەندی هەبێ ) [٥٠٢ : ٦٥٧] بێ ئەوەی ژمارەی هەرە کەمی لەتەکان دیاربکا . لەئەسپانیدا ، ئەنتۆنیۆ کیلیس کەمترین ژمارەی لەتەکانی پارچە شیعر بە دوو لەت دادەنێ ، بچووکترین پارچە بە مەسنەوی ( pareado ) ناو دەبا و دەڵێ ( سادەترین پارچە شیعرە ، لە دوو لەت پێك دێ کە هاوسەروای یەکترن . مەسنەوی بۆ خۆی پارچەیەك پێك دێنێ کە بۆ لازمە و بۆ دەربڕینی بیروڕای فەلسەفی بەکار دێ ، ئەم دوو لەتەی مەسنەوی پێك دێنن دەشێ لە ڕووی کێشەوە یەکسان بن هەروەکو بۆی هەیە جیاواز بن )[٤٨٦ : ٩١] . لە کوردیدا ، وەکو باس کرا یەك لەت سەربەخۆمان هەیە بەلام زۆر کەم و دەگمەنە ، پاش یەك لەتی ( تاك )مان هەیە کە یەك دێرە شیعری سەربەخۆیە و مانای تەواوی هەیە . ئەم دوە کە سەربەخۆ بێن حسێبی پارچەی هەرە کورتیان بۆ دەکرێ ، لەوە بترازێ پارچە لە سێ لەت دەست پێ دەکات چ سەربەخۆیی و چ لەناو هۆنراوەدا .

ئەمە لەبارەی ڕادەی هەرە کەمی لەتەکان، لەبارەی ڕادەی هەرە زۆریش، جگە لە سۆنێتە کە ( ١٤ ) لەتە، فرانسواز لە فەرەنسیدا درێژترین پارچەیە ( ١٢ ) لەت دادەنێ، لای ئەو پارچە ( stroph ) لەیەك لەت دەست پێ دەکات و تا ( ١٢ ) لەتی دەڕوا بەلام ( ١١ ) لەتی لەفەرەنسیدا

بەرچاو ناکەوێ لە ئینگلیزیدا، لای جۆرج وەز پارچە لە دوولەت (couplet) دەست پێ دەکات و تا (٩) لەت دەڕوا، جگە لە پارچەی تایبەتی کە ژمارەی تایبەتی خۆیان هەیە (سۆنێتە)[٤٦٧ : ١٤]. وکوێن دەڵێ دەشێ ژمارەی لەتەکانی دێڕ هەر چەندی هەبێ بەڵام لە دوازدە لەت زیاتر باو نییە ولە هەمووی باوتر پارچەی چوار لەتییە [٥٠٢ : ٦٥٧]. لە ئەسپانیدا وەکو ئەنتۆنیۆ کیلیس بۆی دەچێ پارچە تا (١٠) دەڕوا [٤٨٦ : ١١٠]. لە کوردیدا ، پارچەی چوار لەتی و پێنج لەتی و شەش لەتی لە هەمووی باوترە و بەتایبەتی چوار و پێنجی ، بەڵام تا یازدە لەتیش بەرچاو دەکەوێ ، جگە لە سۆنێتەی (١٤) لەتی کە ضوونەی لای گۆران هەیە وەك پاشتر باسی دەکەین .

دووەم : ناونانی پارچە هۆنراوە :

لە ڕووی ناونانەوە پارچە (stanza - stroph) ، دەکرێ بە دوو جۆر :

١- ئەوانەی کە شێوەیان چەسپاوە (fixed forms) و هەر شێوەیەکیان ناوێکی تایبەتی بۆ داندراوە وەکو سۆنێتە کە بە ئەسل ئیتالییە و لە هەموو زمانە ئەوروپییەکاندا هەیە، بگرە پەڕیوەتە ڕۆژهەڵاتیش ، لە تورکی و کوردیشدا ضوونەی هەیە . یان لە فەرەنسیدا وەکو : (لێ ، فیرولێ، ڤیانێل، تریۆلێت، ڕۆندێل، ڕۆندۆ، گلۆز، بەلاد ، شانت رۆیال ، پانتۆم) [٤٨٤ : ٩٠-١٠٣]. یان وەکو سەروای شاهانە (rhyme royal) کە لە ئینگلیزیدا پارچەیەکی ئایبەتییە و مەرجی تایبەتی خۆی هەیە . لە ئەسپانیشدا هەندێ پارچەی تایبەتی هەیە وەکو : (سێگێدییا ، لیرا ، سێرڤێنتێسیۆ ، رۆدێندییا ، ئۆیێنخۆ) [٤٨٦ : ٩١-١١٣] . لە ئیتالیدا جگە لە سۆنێتە (تیرزا ریما) پارچەیەکی زۆر باوە لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتدا ، لە عەرەبی موەششەح و زەجەل و لە فارسی و کوردیدا ، تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و موسەممەت ضوونەی پارچەی شێوە چەسپاون . ئەم جۆرە پارچە شێوە چەسپاوانە بە گوێرەی ژمارەی لەت و کێشی لەتەکان و هەندێ جار بابەتەکەش قالبی خۆیان وەرگرتوە و گۆڕان هەڵناگرن .

٢- ئەوانەن کە بە گوێرەی ژمارەی لەتەکانەوە ناو دەبرێن ، وەکو :

(دوولەتی (مەسنەوی) complet و سێینە و tercet و چوارینە quatrain و پێنجینەو - quintain) و شەشینە (sextain) و حەوتینە (septain) و هەشتینە (octava) و نۆیینە ... )

ئەمانە هەر یەکە بە پێی نابەشبوونی سەروا و کێش و ناوەڕۆکەوە جۆری جیا جیایان هەیە .

بەم جۆرە قالبی پارچە شیعر ، چ شێوە چەسپاو بێ کە ناوی تایبەتی هەیە و چ بەناوی ژمارەی لەتەوە کرابێ ، بەپێی ئەم هۆکارانە دیار دەکرێ :

أ- سیستەمی سەروا .

ب- کورتی و درێژی لەتەکان.

ج- جۆری کێش.

د- ناوەرۆك.

ئەمانە هەریەکە بەدەوری خۆیەوە کاریگەری تایبەتی دەکاتە سەر پارچەکە (لەتی کورت بۆ چڕکردنەوە و خەست کردنەوەی مانا و هەست و سۆز بەکاردێ کەچی لەتە درێژەکان خاوبوونەوە و هێور بوونەوەیان لەگەڵدایە. بەدوای یەکدا هاتنی سەرواکان کەوتنە پاڵ یەکتر و توندی و گرژی و پێکەوە لکانیان لە گەڵدایە کەچی سەروا لێك دوورەکان ئازادی و خاوبوونەوەی پتریان بەدەمەوەیە. گۆڕانی سەروای لەتەکان چێژێکی تایبەتی تێدایە و وەڕسی دوور دەخاتەوە، لەهەمان کاتدا شێوەی پارچە شیعر دەبێ لەگەڵ بابەتەکەدا بگونجێ یان سروشتی بابەتەکە ڕەنگبداتەوە) [٤٦٧ : ١٤]. پارچە شیعر بە هەموو بەشەکانییەوە وەکو هونەرێکی تایبەتی خۆی دەنوێنێ.

سێیەم: دابەش کردنی پارچە هۆنراوە:

پارچە هۆنراوە بە گوێرەی قەبارەی پارچەکە و کێش و سەروای لەتەکان لە سێ ڕوانگەوە دابەش جۆری جیا جیا دەکرێ:

١- لە ڕوانگەی کێشی لەتەکانەوە: لەبارەی کێشی لەتەکانەوە دوو جۆرە پارچە هەن:

أ- پارچەی یەك کێشی (isometrique)، ئەوەیە هەموو لەتەکانی هەر پارچەیەك کێشیان یەك بێ، واتە ژمارەی بڕگەیان یان ئەگەر عەروزی بوو کێشە عەروزییەکەیان یەك بێ، وەکو چوارین و پێنجینە و... کە بە دەگمەن کێشی لەتەکانیان دەگۆڕێ.

ب- پارچەی فرە کێش -Heterometrique- ئەوەیە کە پارچەکانی هەموو لەسەریەك کێش نەبن، وەکو (سووری کوڵم و نووری چاوت)ی زەکی هەناری کە چوار پارچەی شەشینەیە و هەر شەشینەیەك لەتەکانی (١،٢،٤،٥)ی (٨) بڕگەییە و لەتەکانی (٣،٦)ی (٥) بڕگەییە. شەشینەی یەکەمی ئەمەیە:

| | |
|---|---|
| سووری کوڵم و نووری چاو | (٨ بڕگە) |
| بە بڕۆیان و زوڵفی خاوت | (٨ بڕگە) |
| ئەی ماهی چاردە | (٥ بڕگە) |
| بەڵەنجەو نەشئەو پێکەنین | (٨ بڕگە) |
| بێ ئەژمار عاشقی کوژراوت | (٨ بڕگە) |
| دڵ پڕلە دەردە | (٥ بڕگە) [٤٧ : ١١١]. |

جگە لە کێش لەتە جیاوازەکان سەروایشیان جیایە . ئەم جیاوازییەی سەرواو کێشی لەتەکان جۆرە گۆڕانێك (تنوع) بە پارچەکە دەدات .

٢- لە ڕوانگەی کێش و ژمارەی لەتەکانی هەر پارچەیەك کە شکلی ئەندازەیی پارچەکە دیار دەکات ، سێ جۆرە پارچە هەن :

أ- پارچەی چوار گۆشەیی : ئەوەیە ژمارەی لەتەکانی لەگەڵ ژمارەی بڕگەکانی هەر لەتێکی یەکسان بێت ، وەکو پیرەمێرد لە هۆنراوەی (سبەی)دا شەش پارچەی هێناوە هەر پارچەیەکی لە دە لەت پێك هاتوە و هەر لەتێکی دە بڕگەیە ، ئەمەش نموونەی پارچەی یەکەم .

سبەی بە زەبری پایزی دڵڕەق
ئەوەرێ گەلای نەمامی شەنگت
لالەی سواوت بەڕەنگی شەبەق
سیس ئەبێ لەسەرگردی ڕەنگڕەنگت
لەژێر چناران کەدێ قەقبەقەق
ئەنالێنێ بۆ ونەی قەشەنگت
وەیشوومەی ئاکام بەرەو دەشتی زەق
ڕاوەئەنێ سوپای بەپۆلەو هەنگت
بێ بەشت ئەکا لەو جەوانی
ئەتخاتە گەرووی خەمی شەوانی[٤٦ : ١١٩]

ب- پارچەی ئاسۆیی : ئەوەیە ژمارەی لەتەکانی لە ژمارەی بڕگەکانی هەر لەتێکی کەمتر بێت [٤٨٢ : ٢٠] و لەکاتی نووسین و چاپ کردنیا وەکو لاکێشێکی ئاسۆیی خۆی بنوێنێ ، وەکو زۆربەی چوارینە و پێنجینەکانی شیعری کوردی، بۆ نموونە (ئەدەب) لەسەرەتای پێنجینە بەناو بانگەکەیا دەڵێ :

دوێ شەو شەوی شەممە کە لە شەمعی مەهـ و ئەختەر
ئاراستە بوو سەتحی سەراپەردەیی ئەخزەر
من بەندە لە کاشانەی تاریك و موحەققەر
دوو دیدەی عیبرەت بەبەر ئەو سەقفی موجەددەر
گەهـ غەرقی خەیالات و گەهێ والیە و موزتەر[١٤ : ٣٦]

ئەمە پێنجینەی یەکەمە لە هۆنراوەیەکی (٤١) پارچەیی . هەمووی لەسەر کێشی هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووفە ، هەر لەتێکی (١٤) بڕگەیە و هەر پارچەیەکی (٥) لەتە . لەبەر ئەوەی ژمارەی بڕگەکانی هەر لەتێك لە ژمارەی لەتەکان زۆر زیاترە شکلە هەندە سیبەکەی

هەر پارچەیەك بەلاكێشێكی ئاسۆیی دەكەوێتە بەرچاو.

ج- پارچەی ستوونی : ئەوەیە ژمارەی لەتەكان لە ژمارەی برگەكان زیاتر بێ [٤٨٤ : ٢٠] ولە كاتی نووسین و چاپ كردندا وەك لاكێشێكی ستوونی دەر بكەوێ. بەختیار زێوەر (بۆ گوڵەكەم)ی كردوە بە سێ پارچە. هەر پارچەیەكی (١٠) لەتەو هەر لەتێكی (٨) برگەیە، بۆیە بە شێوەی ستوونی دەكەوێتە بەرچاو، لە پارچەی یەكەمدا دەڵێ :

| | |
|---|---|
| گوڵــەكــەم نــازەنینــەكــەم | ......... A |
| ئەی گوڵی باخی نیشتمـــان | ......... B |
| وەرە بنــوارە ژینــەكـــەم | ............ A |
| چۆن لە دووریت بوە بەژان | ............ B |
| بـرژە بـرژی برینـــە كـــەم | ............ A |
| ڕاستگـۆییـم ئــەدا نیشـان | ......... B |
| هەر منم سینە كـون كونـم | ......... C |
| جەرگ و دڵ ئەنجن ئەنجنـم | ......... C |
| وا بــەرەو ڕۆژی مـردنـــم | ......... C |
| وەرە نـزیـك سەرینــەكــەم | ......... A |

[٣٢ : ١٧٣].

پارچەكە (١٠) لەتییە، شەش لەتی یەكەم سەروایان موتەناوبیە، واتە بە دوو سەروای جیاواز هاتوون. ئینجا سێینەیەكی هاوسەروا دێ و دوا لەت بە سەروای سەرەتا داخراوە. ئەم جیاوازی سەروایە شكڵێكی تایبەتی جگە لە شكڵە هەندەسییە ستوونییەكە بە پارچەكان داوە ولەیەك ئاوازەیی كەوەرێی هاوسەروایی دووری خستۆتەوە.

٢- لە ڕوانگەی سەروای لەتەكانەوە : دوو جۆرە پارچە هەن :

أ- پارچەی هاوسەروا : ئەو پارچانەی هەموو لەتـەكانیان هاوسـەروان، جـا ژمارەیـان هـەر چەندی هەبێت، جاری وا هەیە هۆنراوەیەك دابەشی پارچەی چوارینە یان پێنجینە یان شەشینە دەگرێ و هەموو لەتەكان یەك سەروایان هەیە و سەروا كە تەنیا لە پارچەیەكەوە بۆ پارچەیەكی تر دەگۆڕێ، بۆ نموونە پیرەمێرد لە هۆنراوەی (بیدی مەجنوونی) كە بەناوی بێسارانییەوە گوتوویەتی، پێنج پارچەی چوارینەی هێناوە و هەر چوارینەیەك یەك سەروای سەربەخۆ و جیا لە سەروای چوارینەكانی تری هەیە، لە چوارینەی یەكەمدا دەڵێ :

بیدی مەجنوونی بیدی مەجنوونی
باڵا بەرزو نەرم، زارو زەبوونی

بەلار و لەنجە   لەیلا   نموونی
بەڵام لەناخی گوڵ سەرەنگونی [٤٤ : ٢٩٤].

ب- پارچەی فرەسەروا ئەو پارچانەی لەتەکانیان زیاتر لەیەك سەروایان هەیە ، ئەمە لە دوو سەرواوە و تا چوار پێنج سەروا دەڕوا ، بۆ نموونە زۆر چوارینە و پێنجینە جگە لە پارچەی سەرەتا کە وەکو تەسریعی دێری یەکەمی غەزەل هەموو لەتەکانی هاوسەروان ، پارچەکانی تر لەتەکانی پێشەوەیان هاوسەروایە و دوا لەتی هەموویان سەروایەکی ترە ، واتە پارچەکانی تر هەر یەکە دوو سەروای هەیە، شەشینە بەزۆری چوار لەتی پێشەوەی یەك سەروا و دوو لەتی دواوەی سەروایەکی ترە ، نموونە بۆ پارچەی فرە سەروا ، کە لە دوو سەروایش زیاتر بێ وەکو شیعری (بۆ بەهاری ٩٤٦)ی بەختیار زێوەر کە چوار پارچەیە و هەر پارچەیەکی (١١) لەتە و هەموویان بەسەروای دوو لەتی دواوە بەیەکەوە بەستراون (ار). هەر پارچەی (٤) سەروای جیاوازی هەیە و سیستەمی نابەشبوونیان بەم جۆرە (AB AB AB CCC DD)، ئەمە پارچەی یەکەمە :

ئەرێ لەتەختی بەندنا ............................ A
بوە بە میرغوزار ...................................... B
لە دۆڵ و شیو و چەمەنا ......................... A
ڕەوانە جۆیبار ........................................ B
لە مێرگ و دەشت و گوڵشەنا .................... A
شەماڵی بێ قەرار .................................... B
چییە ؟ چ باسە ؟ گوڵڕوان ........................ C
بەدەستە چەشنی ئاهوان .......................... C
بە ڕاز و عیشوەو دوان .............................. C
هەموو لەدەوری شار ............................... D
ئەڕۆن بەکەیف و بێ جەخار ................. D  [٣٢ : ١٨٥].

ئەم سیستەمە وەکو خۆی بە سەروا و کێشی لەتەکانەوە لە هەموو پارچەکان دووبارە بۆتەوە.

چوارەم : کردنەوەو ناخستنی هۆنراوەی پارچەدار :

یەکێ لە ئەرکەکانی سەروا ئەوەیە شکڵێکی هەندەسی بەهۆنراوە دەدا و چوارچێوەی بڵاوبوونەوەی - outline - دەکێشێ و مەدای هاتنە دەرەوە و بەناوەوە ناچوونی دیارەکا و شوێن و چۆنیەتی نابران و بێکەوە لکانی لابڵەکان دەست نیشان دەکات و پەیوەندی لەت و پارچەکانی دەکێشێ و شکڵی کۆتایی پێ دەدا کە لەخوێندنەوەدا خۆی لە ئیقاع و بڵاوبوونەوەی سەرواکان و وەستانی

کورت و درێژی لەت و پارچەکان دا دەبینێتەوە و لە نووسین و چاپیشدا لە ڕاکشانی بەسەر لاپەڕەدا و پەیوەندی بە فەزای گشتی و بەناویەکدا چوونی نووسین و شیرازەی لاپەڕەدا دەردەکەوێ . ئەم ئەرکەی سەروا زیاتر لە شیعری پارچەداردا (strophic) دەردەکەوێ کە هەر پارچەیەك بەجیا شکلێکی تایبەتی وەردەگرێ و هەمووشیان بەیەکەوە شکلێکی گشتی و فراوانتر دروست دەکەن . ئەو پارچانەی کە بەشێکی هۆنراوە پێك دێنن ، بە زۆری هاوشکلییان لەنێودا هەیە کە خۆی لە کورت و درێژی دێرەکان و لە دابەشبوونی سەرواو لە ژمارەی لەتەکانیان دا دەنوێنێ . پارچەکان بە زۆری ژمارەی لەتەکانیان بەقەدەر یەکە ، بەڵام ئەمە مەرج نییە ، چونکە هۆنراوە هەیە ژمارەی پارچەکانی وەکو یەك نییە . لەو حاڵەتەدا ڕەگەزەکانی تر دەوری سەرەکی دیار کردنی شکڵی پارچەکان دەگێڕن . لەم ڕوانگەیەوە دوو جۆرە هۆنراوەی پارچەدار هەن:

أ- ئەو هۆنراوانەی پارچەکانیان بەقەد یەکە ، وەکو چوارینە و پێنج خشتەکی و پێنجینە و شەشینە و حەوتینە و ... کە ناویان بە ژمارەی لەتەکانەوەیە .

ب- هەندێ شیعری پارچەدار هەن ، ژمارەی لەتی پارچەکانیان بەقەد یەك نییە ، بۆ نموونە شێخ نووری شێخ سالح (لە ئێیەرێتی دلاوەران)دا [٢١٢ : ٦١] کە (٧) پارچەیە ژمارەی پارچەکانی وەکو یەك نەهێناوە ، یەکەم پارچە (١٠) لەت و دووەم (١٨) و سێیەم (١٢) و چوارەم (١١) و پێنجەم (٨) و شەشەم (٧) و هەشتەم (١٠) لەتە. وەك دیارە لەتەکان لە نێوان (٧-١٨) دان . لە شیعری ڕۆح دا [٢١٢ : ٦٨] کەسێ پارچەیە ، دوو پارچەی (٢،١) (٥) لەتییە و پارچەی کۆتایی شەش لەتییە . لە گریەی خوسران دا [٢١٢ : ٢١٦] کە (٦) پارچەیە ، بە حوکمی ئەو هونەرەی تێیدا نواندوە لە دابەش کردنی سەروا و کۆکردنەوەیان لەپارچەیەکدا دوا پارچەی لەباتی چوار لەتی بە پێنج لەتی هێناوە شیعری (ئانەمیزاد) [٢١٢ : ٢٢٩] کە چوار پارچەیە، (٣) پارچەی پێنج لەتییە و دوا پارچەی شەش لەتییە. لە دیوانی شێخ نووریدا ئەم جیاوازییەی ژمارەی لەتی پارچەکان لە هۆنراوەی تریشدا هەیە، بەڵام ئەوەندە بۆ ئێرە بەسە. گۆرانیش ئەم گۆڕانەی لە پارچەکانی هەندێ شیعردا کردوە، بۆ نموونە لەشیعری (بەستەی دڵدار)[١٧٣ : ٢٨] کە (٧) پارچەیە . ژمارەی لەتی پارچەکان لە نێوان (١٢،٤) دایە. شیعری دەروێش عەبدوڵلا[١٧٣ : ١١٩] کە (٧) پارچە، پارچەکانی لەنێوان (٦،٤)دایە. (شەونکی بەهار) [١٧٣ : ١٧١] شەش پارچەیە، ژمارەی لەتەکانیان (٦،٤)ە . (یار) [١٧٣ : ٢٠٤] سێ پارچەیە و لەتەکانیان لەنێوان (٨-١١) دایە . (نەوروزی ٦١) [١٧٣ : ٣١٧] نۆ پارچەیەو ژمارەی لەتەکانیان لە نێوان (١٠،٤) دایە . ئەمە لە زۆر هۆنراوەی تری گۆران دووبارە بۆتەوە پیرەمێردیش (گورگانە شەوێ)ی[٤٤ : ٤٣٢] کە (٥ پارچە)یە بە دوو جۆرە پارچەی جیا (چوارینە و پێنجینە) هۆنیوەتەوە .

هۆنراوەی پارچە دار، بە هەردوو جۆرەکانییەوە، زۆرجار کردنەوەو داخستنی تایبەتی دەبێ، وەکو لێرە بەدواوە ڕوونی دەکەینەوە.

١- کردنەوەی هۆنراوەی پارچەدار:

یەکەم شت لە هۆنراوەدا، دوای ناونیشان دەست پێ کردن و سەرەتایە. سەرەتا وەکو دەرگای چوونە ناو هۆنراوە وایە، یەکەم هەنگاوی مامەڵە کردنی خوێنەرە لەگەڵ کیانی هۆنراوەکە بەهەموو ڕەگەزەکانییەوە، بۆیە دەبێ بایەخێکی تایبەتی پێ بدرێ و قورساییەکی زیادەی هونەر نواندنی بخرێتە سەر بۆ ئەوەی خوێنەر بۆ خۆی ڕابکێشێ. لە شیعری پارچە داردا هەر پارچەیەک قەوارەیەکی تایبەتی هەیە کە چوار چێوەیەکی دیارو جۆرە دارشتنێکی تایبەتی هەیە. کردنەوەی سەرەتای ئەم جۆرە شیعرە، بە گشتی بە دوو شێوە دەبێ:

أ- وا دەبێ سەرەتای هۆنراوەکە بەپارچەیەک دەکرێتەوە کە وەکو پارچەکانی تر وایە لەقەبارە (ژمارەی لەتەکان) و دابەشبوونی سەرواوە. وەکو ئەو چوارینە و پێنجینە و شەشینانەی کە هەموو پارچەکانیان وەکو یەک وایە، پارچەی یەکەم دابەشبوونی سەروای هیچ جیاوازییەکی وەکو تەسریع و تەقفیەی لەگەڵ پارچەکانی تردا نییە، یان لە ڕووی ژمارەی لەتەکان هیچی لەپارچەکانی تر کەمتر و زیاتر نییە. هەر بۆ نموونە وەکو هۆنراوەی (ئاواتی دووری گۆران) [١٧٣ : ١٢] کە هەموو پارچەکان لە ڕووی ژمارەی لەت و کێش و سەرواوە وەکو یەک وان و پارچەی یەکەم هیچ لایەنێکی سەرنج کێشی تێدا پەیڕەونەکراوە کە لە پارچەکانی تری جیابکاتەوە. گۆران زۆر هۆنراوەی پارچەداری تریشی هەیە کە لە سەرەتا هیچ هونەرێکی نائاسایی تێدا نەنواندراوە وەکو هۆنراوەی (حوزنی پەچە) [١٧٣ : ١٩] و (ژن) [١٧٣ : ٧٤] و (چوارەدەی تەمووز) [١٧٣ : ٤١٤] و زۆری تر. شێخ نووری شێخ سالحیش کۆمەڵێ هۆنراوەی پارچەداری وای هەیە کە پارچەی سەرەتا و پارچەکانی تر جیاوازیان نییە. هەر بۆ نموونە (تەفەکور) [٢١٢ : ٧٢] و (ئەمشەو من لەخەوا) [٢١٢ : ٣٢]، بەختیار زێوەر کە زۆر شیعری پارچەداری هەیە و لەزۆربەی هۆنراوەکانیدا وەستایەییەکی بەرزی لە سەروابەندی پارچەکان نواندوە، لە (گۆرانی پیرەمەگرون) [٣٠ : ٥٥] و (شارەکەم) [٣٢ : ٩٩] و (ئەرێ بەپوولە) [٣٢ : ١٥٠] و (جەژنی قوربان) [٣٢ : ١٦٥] و زۆری دیکەشدا گۆڕینی لە ژمارەی لەت و سیستەمی سەروای پارچەکانی سەرەتا نەکردوە.

ب- بۆی هەیە شاعیر لە ڕوانگەی بایەخدانی زیاد لە پێویست بە کردنەوەی سەرەتای هۆنراوەکە و ڕاکێشانی خوێنەر، گۆڕانێک لە ژمارەی لەت و سیستەمی سەروای پارچەی یەکەم بکات، یان پێشەکییەک باوێ کە وەکو ڕۆناکییەک بێ بۆ سەر سەروای پارچەکانی تر و ڕاڕەوێک بێ بۆ چوونە ناو هەیکەلی پارچەکانەوە. ئەمە لە هۆنراوەی پارچەداری کوردیدا بەزۆر شێوە ئەنجام



Scanned with CamScanner

دراوه ، گرنگترینیان ئەمانەن :

• گۆرینی سیستەمی سەرواى پارچەى یەکەم :

- ئەگەر هۆنراوەکە تەخمیس بێ و لەسەر غەزەل یان قەسیدەیەکی موسەرڕەع کرابێ ، بە حوکمی تەسریع هۆنراوەی پارچەی یەکەم، تەخمیسە کە لە رووی سەرواوە لە پارچەکانی تر جیا دەبێ. لە پارچەی یەکەم هەر پێنج لەت هاوسەروا دەبن کەچی هەموو پارچەکانی تر ، چوار لەتی پێشەوەیان هاوسەروان و لەتی پێنجەمی هەموویان وەکو سەرواى پارچەی یەکەمە . لەبەر ئەوەی (تەخمیس) لە کوردیدا زۆرە پێویست بەنموونە هێنانەوە ناکات .

- هۆنراوەکە ئەگەر شاعیرەکە خۆی نووسیبی و ژمارەی لەتی پارچەکانی هەرچەندە بێ (چوارینە ، پێنجینە ، شەشینە) ، ئەگەر سستەمی سەرواى بەو جۆرە بێ کە دوا لەتی هەموو پارچەکانی هاوسەروابن و لەهەر پارچەیەکیشدا لەتەکانی پێشەوە (جگە لە لەتی کۆتایی) هاوسەروابن ، زۆر جار وا دەبێ شاعیرەکە هەموو لەتەکانی پارچەی یەکەم تەسریع دەکا ، واتە وەکو سەرواى لەتی کۆتایی پارچەکانیان لێ دەکات کە سەرواى گشتی هۆنراوەکەیە. بۆ نموونە چوارینە ئاوبارەکەی بێخود (لەو رۆژەوە رۆیشتوە) [٣٦ : ٦٦] و پێنجینەی (ساوای ئاشتیخواز)ی گۆران [١٧٣ : ٤٢١] و شەشینەی (دڵی من)ی شێخ نووری [٢١٢ : ١٦٧] .. هتد . بەم جۆرە سەروا بەندییەی پارچەی یەکەم کراونەتەوە . ئەمەیان لە رووی دابەشبوونی سەرواو تەسریعی هەموو لەتەکانی پارچەی یەکەم دەڵێ وەکو تەخمیس وایە ، ئەوەندە هەیە لە تەخمیس هۆنراوەکە زادەی بیری دوو شاعیرە کەچی ئەوانی تر هی یەك شاعیرە و بەس .

- شێخ نووری لە شیعری (ئیستیقبال بۆ تازە پێگەیشتوەکان) [٢١٢ : ١٦٣] (٨ پێنجینەیە) جۆرە سیستەمێکی تری سەرواى بەکارهێناوە و پارچەی یەکەمی بە جۆرێکی تر تەسریع کردوە . هەموو پارچەکان سەرواى لەتی پێنجەمیان یەکە ، لەهەموشیاندا چوار لەتی پێشەوە سەرواى پتراركیبان هەیە (ABBA C). بۆ پارچەی یەکەم تەنیا لەتی یەکەم و چوارەمی لەگەڵ سەروا گشتیەکە گونجاندوە نەك هەر چوار لەت ، بۆ ئەوەی سیفەتی پترارکی لەسەر چوارینەی یەکەم هەر بمێنێ بەڵام بەگونجاندنی لەگەڵ سەرواى گشتی ، دابەشبوونی سەرواى پارچەکان و جۆری تەسریعەکە لەم قاڵبەندییەدا دەردەکەوێ :

ABBAA CDDCA EFFEA

- کاکەی فەللاح لە هۆنراوەی (تێبینی) [١٥٨ : ١٧] [٨ چوارینەیە] ، لەهەموو چوارینەکاندا سەرواى لەتی (٢، ٤)ی وەکو خۆی دووبارە کردۆتەوە و هەموو پارچەکانی بەم دوو سەروایە گرێ

دراوە . قالبی چوارینەکان بەم جۆرەیە . (YBXB) جا بۆ تەسریعی چوارینی یەکەم هەر تەنیا لەتی یەکەمی لەگەڵ سەروای گشتی چوارینەکان یەك خستوە و بەمەوەش چوارینەی یەکەم لە رووی سەروا بەندی وەکو چوارینەی خەیامی خۆی دەنوێنێ (AAYA) ولە چوارینەکانی دی جیا دەبێتەوە ، سەروای دەوڵەمەندتر دەبێ و زیاتر خوێنەر رادەکێشێ . تەسریعەکە بەم قالب بەندییە رووتر دەبێتەوە :

AAYA XAZA

وا دەبێ شاعیر سیستەمی سەروای پارچەی یەکەم بگۆڕێ ، بێ ئەوەی سەرواکەی زیاد بکات یان ژمارەی لەتەکانی بگۆڕێ ، هەر بۆ ئەوەی گۆڕانی سیستەمی سەروا خوێنەر لەبارێکەوە بباتە سەر بارێکی تر ، بۆ نموونە گۆران لە شیعری (بۆ سالم)دا [١٧٣ : ١١٧] چوار چوارینەی هێناوە و بەشەشینەیەك هۆنراوەکەی داخستوە ، چوارینەکانی بە سستەمی موتەناویب (ABAB) هاتوون ، هەریەکە لەسەر دوو سەروا هاتوە ، چوارینەی یەکەمیش هەر بەدوو سەروا هاتوە بەڵام سستەمەکەی لە موتەناویب گۆڕاوە بۆ پترارکی (ABBA) ئەم گۆڕانە جیاوازی دەخاتە نێوان سەرەتا و هەیکەلی گشتی هۆنراوەکە .

• <u>بچووك کردنەوەی پارچەی یەکەم و تێرکردنی سەرواکەی :</u>

- دەشێ کە هۆنراوەکە دابەش کۆمەڵێ پارچەی (٤،٥،٦) لەتی کرا بێ ، لەتی کۆتایی هەموو پارچەکان هەمان شت بێ و سەراپای هۆنراوەکەی لەسەر رۆنرابێ و لەتەکانی تری پارچەکان هاوسەروابن ، ئینجا شاعیر وەك سەرەتا و دەرگا کردنەوەیەك یەك مەسنەوی بەسەروای لەتی کۆتایی دێرەکان لە پێشەوە بێنێ وەك رێ خۆشکردنێك بۆ دامەزراندنی سەروای گشتی هۆنراوەکە ، وەکو هۆنراوەی (دانە .... دانە)ی گۆران [٢٧٣ : ٢٩٧]. یان هۆنراوەی یەکەمی مەلا خدری مەندەلاوی [٨٤ : ٥] ، زۆربەی هەرە زۆری هۆنراوەی دیوانەکەی مەلا خدر بەم دیاردەیە دەست پێ دەکەن .

- وا دەبێ لەباتی مەسنەوی سێینەك لەسەرەتاوە بێ بۆ دامەزراندنی سەروای گشتی هۆنراوەکە کە لەتی کۆتایی پارچەکان پێکی دێنن ، سەروای سێینەی سەرەتا دوو لەتی لەگەڵ سەروای گشتی هۆنراوەکە یەك دەگرێتەوە، جا ئەو دوو لەتە ، لەتی یەکەم و سێیەم بێ وەکو هۆنراوەی ژمارەی دووی دیوانی (پروە خوێن)ی مەلا خدری مەندەلاوی [٨٤ : ٨] ، یان لەتی دوەم و سێیەم بێ ، وەکو هۆنراوەی ژمارە (١٦)ی هەمان دیوان [٨٤ : ٦٣].

## ٢- داخستنی هۆنراوەی پارچەدار :

ئەگەر کردنەوەی سەرەتای هۆنراوە دەوری هەبێ لە ڕاکێشانی خوێنەر ، ئەوا داخستن و کۆتاییەکەی دەوری هەیە لە بەجێ هێشتنی کاریگەرییەکی زۆر لای خوێنەر و بەستنەوەی بەکەش و هەوای هۆنراوەکە و بەرەو ڕووکردنەوەی بەرامبەر بە دیاردەیەکی ڕەچاو نەکراوی وا کە خۆشییەکی زیادەکی پێ دەبەخشێ . تا شاعیر ئەدیبانە و هونەرمەندانە و وەستایانە هۆنراوەکەی دا بخات هۆنراوەکەی سەرکەوتووتر و بەهێزوکاریگەرتر دەبێ ، بۆیە دەبێ کۆتایی هۆنراوە بایەخێکی تایبەتی پێ بدرێ . لەهۆنراوەی پارچەداردا شاعیران بەزۆر شێوەی جۆراوجۆر توانیویانە ئەم داخستن و دەرچوونە پەیڕەو بکەن ، گرنگترینیان ئەمانەن :

- وا دەبێ شاعیر ، یەك لەت بۆ کۆتایی پارچەکان زیاد بکات ، بۆ ئەوەی لەنگەر بۆ سەرەوای یەکێ لە لەتەکانی پارچەی کۆتایی ڕابگرێ . بۆ نموونە گۆران لە هۆنراوەی (بێشکەی منال)[١٧٣ : ٣٢٦] پێنج پارچەی سێینەی هێناوە ولە کۆتایشدا یەك لەتی بۆ زیاد کردوە . سێینەکان دوو دوو سەرەوای یەکتر تەواو دەکەن و هەریەکە لەتی یەکەم و سێیەمی هاوسەروان ولەتی دووەمی هەردووکیشیان پێکەوە سەروا دروست دەکەن و دوو سێینەکە لێك دەبەستنەوە و بەرەو پایەی شەشینە بەرزی دەکەنەوە ، بەم سیستەمە (ABACBC) ، لە کۆتاییدا یەك سێینە بەتەنیا دەمێنێتەوە ، ئەویش لەتی یەکەم و سێیەمی هاوسەروا دەبن بەلاَم لەتی دووەمی ڕەهاو بێ سەروا دەبێ ، جا بۆ ئەوەی ئەولەتە هاوسەرەوای بۆ پەیدا ببێ ، لەکۆتایی هۆنراوەکە یەك لەتی بەو سەروایە زیاد کردوە ، سەرەوای پارچەی کۆتایی ولەتە تاکەکە بەم جۆرە بەیەکەوە دەبەسرێنەوە (ABA / B) ، ئەم دیاردەیە بۆ کۆمێدیای دانتی دەگەڕێتەوە [٤٨٩] . شاعیرانی تورك ئەم دیاردەیەیان لە ئەوروپا وەرگرت ولەزۆر شیعری سێینە و چوارینەدا چەسپاندیان ، وەکو جناب شەهابەدین لە هۆنراوەی (تماشای لیال)[٤٣١ : ٣٤٦] و هۆنراوەی (نوروز اشتیاق)[٤٣٦ : ٣٤٤] وهۆنراوەی (تماشای احزان)[٤٣٨ : ١٣٤] بەکاری هێناوە. تۆفیق فیکرەت لە (عشق و شباب)[٤٢٢ : ٣٥٤] و (زواللی خستە)[٤٢٠ : ٣٠٧] و (یاشادقچە)[٤٢١ : ٢٣٨] لەنگەری سەرەوای دوو پارچەی چوارینەی پێ ڕاگرتوە .

- بۆی هەیە هۆنراوەکە پارچەکانی چوارینە و هەورازتر بن و کۆتایی بەمەسنەوییەك بێ، گۆران چەند هۆنراوەیەکی پارچەداری خۆی بەم جۆرە داخستوە ، وەکو (گوڵی کەم خایەن)[١٧٣ : ٩٥] (٥ چوارینە) و (دوا سرنج)[٧٣ : ٢٠٦] (١٣ چوارینە) و (شەهید)[١٧٣ : ٢٦٥] (١٠ چوارینە).

- دەشێ شاعیر سەراپای پارچەی یەکەم یا پێش بەندی پارچەی یەکەم ، بەدەقی خۆی لە

کۆتایی هۆنراوەکە دووبارە بکاتەوە ، دوو جەمسەری سەرەتا و کۆتایی لە شێوەی بازنەیەکی داخراو بەیەکەوە گرێ بدا و خوێنەر بخاتە ناو چوارچێوەی ئەو چەماوە داخراوە کە بنیاتی شیعرەکەی بەخۆوە گرتوە و بواری دەرباز بوون و جێهێشتنی هۆنراوەکەی نادا ... گۆران لە هۆنراوەی (مارشی ئاشتی خوازان)دا [١٧٣ : ٤١٥] کە (٤) پارچەیە ئەم هونەرەی بەکارهێناوە . لە ڕاستیدا هۆنراوەکە (٤) پارچە نییە (٣) پارچەیە ، پارچەی یەکەم و چوارەم هەمان شتە ، گۆران سەروبنی هۆنراوەکەی پێ لەیەک شەتەک داوە. وەك داخستنی هۆنراوە بە زیادکردنی یەك لەت یان مەسنەویەك یان بە دووبارە کردنەوەی پارچەی یەکەم دەبێ ، بە پێچەوانەوە بە پچڕاندن و کورت کردنەوەی پارچەی کۆتایشی دەبێ. لەم حاڵەتەدا مفاجەئەیەك بۆ خوێنەر پەیدا دەبێ ، وەك بڕینی کت و بڕی فیلمێك بەرەو ڕووی کۆتاییەکی چاوەڕوان نەکراو دەبێتەوە. ئەمە خۆی لەخۆیەوە جۆرە تاسانێك و داخوریان و هوشیار کردنەوەیەکی خوێنەرە. گۆران ئەم جۆرە کۆتایی بڕینەی لە هۆنراوەی (مەدەنییەت) [١٧٣ : ٧١] خستۆتەکار کە چوار پارچەیە سێ پارچەکەی پێشەوە هەریەکە شەشینەیە (چوارینەیەکی پترارکی + مەسنەوییەك) کەچی پارچەی چوارەم لەپڕ مەسنەوییەکی دەکرتێنرێ و تەنیا چوارینەکە دەمێنێ ، ئەم کۆتاییە زەخم و سەرسامی و موچڕکێك بە خوێنەر دەدا .

باسی دووەم : پارچەی گشتی :

پارچەی گشتی ئەو پارچانە دەگرێتەوە کە ناوی تایبەتییان بۆ دانەنراوە بەڵکو بەناوی ژمارەی لەتەکانەوە ناو دەبرێن و هەریەکە بەپێی سەروای لەتەکانی چەند جۆرێکی هەیە. پارچە شیعر (ستانزا) لە ئەدەبی جیهانیدا (شێوەی ئەوەندە زۆرە نزیکەی کۆتایی بۆ نییە ، لەدوو لەتییەوە تا هەژدە لەتی -senpirhalomions سپنسەر- و زیاتر دەروا) [٤٦٧ : ١٧] ، بەڵام لە کوردیدا گرنگترین پارچەی گشتی لەیەک تاکی (دوو لەتی)یەوە دەست پێ دەکات و تا (١١) لەتی . یەک لەتیمان بە پارچە دانەناوە چونکە هەم زۆرو دەگمەنە و هەم بەتەنیا ناکەوێتە ناو هیچ پەیوەندییەکی سەرواییەوە . بۆی هەیە سەروای گشتی لە (١١) لەتیش زیاتر بێ بەڵام لە لایەکەوە ئەوەندە زۆر نییە و لەلایەکی ترەوە بەزەقی لەپارچە بچووکەکان پێک هاتوە ، بۆیە وەک پارچەی سەربەخۆ باسمان نەکردوە .

یەکەم : تاک :

(تاک) بریتییە لەیەک دێرە شیعری سەربەخۆ کە مانایەکی تەواو دەگەیەنێ . لە کوردیدا یەک تاکی [١٣٧ : ١٧١] و تەک بەیت و [١٩٢ : ١٠٩] و تاک [٢٣٦ : ١١]ی بۆ بەکار هاتوە ، جگە لە (مفرد) و (مفردات) کە لە زۆر دیوانیدا لە ژێر ئەم ناوەدا کۆکراونەتەوە . لە بارەی پێناسەی تاکەوە ، سجادی ، دەڵێ : (ئەوەیە کە هونەر هەندێ جار هەندە بیرێکی بۆ پەیدا ئەبێ و ئەیخاتە ناو هۆنراوێکی تەنهاو ئەم هۆنراوە ئاشنایەتی لەگەڵ هیچ شتێکی تردا نییە . خۆی بۆ خۆی سەربەخۆیە) [١٣٧ : ١٧١] . محەمەد ئیبراهیمی بەم جۆرە لێکدانەوەیە (تەک بەیت) هەڵدەسەنگێنێ : (جاری وا هەیە شاعیر مەبەستی خۆی لەیەک هۆنراوەدا دەڵێ و لە زاراوەی شیعردا تەک بەیت یا مفردی پێ دەڵێن) [١٩٢ : ١٠٩] . د.مارف خەزنەدار بە شێوەیەکی فراوانتر مانا و مەبەست و شکڵی (تاک)ی ڕوون کردۆتەوە ، دەڵێ : (بریتییە لە دێرە شیعرێکی عەرووزی لە دوو نیوە دێر شیعر پێک هاتوە ، هەردوو نیوە دێرەکە دەبێ لەسەر یەک قافیە بێ(AA) . ئەم جۆرە شیعرە بۆ پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ووتەیەکی کورتی دانایانە و بیرێکی ژیری فەلسەفییانە دادەنرێ) [٢٣٦ : ١١] . ئەم بۆچوونانە هەموویان لەوە یەک دەگرنەوە کە (تاک) یەک دێری (دوو لەت) سەربەخۆیە ، لە ڕووی ماناوە پەیوەندی بە هیچ شتی ترەوە نییە . لەبارەی کێشی تاکیشەوە دەشێ بەهەر کێشێک بێ و لە ڕووی سەرواوە دەشێ وەکو مەسنەوی لەتەکان هاوسەروا بن و دەشێ کۆتاییان وەکو یەک نەبێ . لەفارسیدا ، زەینولعابدین بەم جۆرە لە (تاک) دەدوێ : (بەو دێرە سەربەخۆ تاکانە دەڵێن کەبێ چاوانە موسەڕڕەع لە هەستی شاعیرەوە چکاون ، بۆی هەیە ڕۆژێ بێ و ئەو تاکە دێرە بێ بە بناغەی غەزەل یان قەسیدە یان هەر جۆرێکی تری

شیعر یان شاعیرەکە بیخاتە ناو شیعرێکی گونجاوی خۆیەوە . ئەم دێرە تاکانە ، بەهۆی تەسکی بابەت یان تەنگبی سەروا ، یان بەردەوام نەبوونی شاعیر لە تاقی کردنەوە و حاڵەتی شیعری خۆی، دەمێنێتەوە . ئەمە یان لە بەشێکی سەربەخۆی دیوانی شاعیرەکەدا بەناوی مفردات بڵاو دەکرێتەوە یان بە جیاجیا لێرە و لەوێ ، بەناو دیوانەکەدا بڵاو دەبنەوە ) [٣٩٦ : ١١١] . ئەو دێرە شیعرە تاك و سەربەخۆیانەی هەندێ جار شاعیر لەکاتی نووسینی بەرهەمێکی پەخشاندا دەیهۆنێتەوە و پەخشانەکەی پێ دەڕازێنێتەوە هەر بە (تاك) دادەنرێ . عەرەبیش ئەم هونەرەیان هەیە و بە دێری تەنیا و سەربەخۆ دەڵێن (هەتیو-البیت الیتیم) ، وەکو فیراء دەڵێ : (عەرەب بەتاکە دێری سەربەخۆ دەڵێن دێری هەتیو) [٢٤٧ : ١٣٢] چونکە لە هەموو پەیوەندییەکی تر بڕاوە و بەتاقی تەنێ ماوەتەوە .

(تاك) لە دوولەت پێك دێ ، لەبارەی سەروای ئەم دوولەتە ، دوو جۆرە (تاك) هەن :

١- وا دەبێ هەر دوولەت یەك سەروایان هەبێ ، وەکو نالی دەڵێ :

سەوتی نەغمەی بولبولە ، یا چەهچەهەی خڕخاڵییە
دەنگی سۆلە ، یا لە زێربێی ناڵە ناڵی ناڵییە [٢٠٩ : ١٦٩] .

وشەکانی سەروا (خڕخاڵییە ، ناڵییە) سەروایان (الییە)یە . (ی) ڕەوییە و (ە) پاش ڕەوییە . دەبێ تێبینی ئەوە بکرێ (ی) لەیەکەمدا پاش ڕەوییە و لە دووەمدا ئەسڵییە ، بەلام بەیەکەوە سەروایان دروست کردوە .

٢- وا دەبێ لەتەکان کۆتاییان وەکو یەك نەبێ ، واتە سەروایان لە نێودا دروست نەبووبێ ، مەحوی دەڵێ :

درۆیە مەنعی جەمعی زێد، نەزەر کەن
لە بەزمی ئەم شەوە ڕۆژێ دیارە [١٨٠ : ٣٦٤] .

وشەی کۆتایی لەتەکان بریتین لە : (نەزەرکەن ، دیارە) ، لە ڕووی دەنگەکانی کۆتاییەوە هیچ شتێ کۆیان ناکاتەوە ، واتە سەروایان لە نێوان دا نییە .

ئەم دوو جۆرە (تاکە) جیاوازیان تەنیا لە سەروادایە . یەکەمیان وەکو دێرێکی هۆنراوەی مەسنەوی یان وەکو دێری یەکەمی موسەڕڕەع و موقەففای غەزەل و قەسیدە خۆی دەنوێنێ . ئەم جۆرەیان نەك هەر لە شیعری شاعیران ، بگرە لە شیعری زارگۆتنیشدا زۆرە. ئەو کۆمەڵە هۆنراوانەی کۆکراونەتەوە ، بڕیانە لە (تاك) (بۆنی هەلالان دێ) [١٩٩] کە (١٣٢) لاپەرەیە،(١٠٠١) (تاك)ی مەسنەوی گرتۆتە خۆی . کەچی جۆری دووەمیان وەکو ئەوە وایە کە دێرێك بێ لەغەزەل یان قەسیدە دەرهێنرابێ ، چونکە هیچ سەروایەك دوولەتەکەی پێکەوە نابەستێتەوە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا

وەکو دێری سەرەتای قیتعەیە کە (موسەڕڕەع و موقەففا) نییە ، خوێنەر لەگەڵ خوێندنەوەیدا ئەو هەستەی لا دروست دەبێ کە دێرەکانی پاشتر لەسەر هەمان سەروای لەتی دووەم بێن . بۆیە لە یەک تاکیشدا وا هەست دەکا کە کۆتاییەکەی سەروا بێ، بەڵام سەروا دووبارە بوونەوەی تێدا نەبێ دروست نابێ ، بۆیە ناشێ دەنگەکانی کۆتایی ئەم جۆرە تاکە بەسەروا دابنێین .

(تاک) زۆر جار وەکو دێری تەرجیع و تەرکیب بەکاردێ و لە سروودەکاندا وەکو لازمە دووبارە دەبێتەوە . (تاک) بابەتێکی گرنگی فیکری یان فەلسەفی یان عیرفانی یان حاڵەتێکی دەروونی تایبەتی دەربڕێ . لەوە دەکا سەرەتای قیتعە یان غەزەل و قەسیدە بێ ، شاعیر سەرەتاکەی دانابێ ئیتر لەبەر هەرچی هۆیەک بێ وازی لێ هێنابێ و تەواوی نەکردبێ . یان دەشێ شابەیتی ( بیت القصید )ی هۆنراوەیەک بێ ، شاعیر هەستی کردبێ مادام هەست و بیری سەرەکی هەموو هۆنراوەکە بەیەک دێر دەربڕێ ، دێرەکانی تری بۆچییە؟. ئیتر بە شابەیتەکە وازی هێناوە و کردوویە بە (تاک).

لە کوردیدا هەردوو جۆرەکە هاتوون ، بەڵام بە ڕادە و ڕێژەی جیاجیا . لە شاعیرانی کلاسیکی(٢٨) شاعیرمان بەنموونە وەرگرتوە[٣٧] ، بە هەموویان (٣٠٩) (تاک)یان هەیە . لەمانە(٨١) دێریان بێ سەروایە و (٢٢٨) یان سەروادارن . ڕێژەی سەدی سەروادارەکان دەکاتە (٧٣،٨٪) و ڕێژەی سەدی بێ سەرواکان (٢٦،٢٪)ە . لەم شاعیرانە ، شێخ ڕەزا تاکی لە هەموویان زیاترە ، (١٠٢) تاکی هەیە کە دەکاتە ٣٣٪ی سەرجەم تاکەکان. لەم (١٠٢) دێرە(٨٨)یان لەتی هاوسەروان دەکاتە ٨٦،٣٪ی هەموو تاکەکانی خۆی و ٢٨،٥٪ی سەرجەم تاکە باس کراوەکان . کەمترینیشیان سەیدی و نالی و زێوەر و ئەسعەد مەحوی و بێوەیە کە یەکەو تاکیان هەیە ، ئەویش دەکاتە ٠،٣٢٪ی سەرجەم تاکەکان . تاکەکەی نالی و زێوەر و ئەسعەد مەحوی و لوتفی سەروادارن ، ئەوەی سەیدی و بێوەی (زاری گۆران) بێ سەروان . لەوەوە دیارە تاکی شاعیران زیاتر لادەکا بەلای سەرواداری وەکو مەسنەوی و کەمتر بەبێ سەروا هاتوە . لە زۆربەی زمانە ئەوروپییەکان (distique - distich) وەکو (زاراوەیەکی تەکنیکی بۆ پارچەی دوو لەتی بەکارهاتوە. لە ئەسپانیدا (pareada) بۆ (تاک) بەکاردێ (یەک تاکی خۆی لە خۆیەوە پارچەیەکی سەربەخۆ دروست دەکا) [٤٨٦ : ٩١] ، ئەوەی لەتاکی ئەسپانی گرنگبێ کێش نییە ، چونکە دەشێ دوو لەتەکە کێشیان جیابێ ، بەڵکو سەروایە (ئەوەی گرنگبێ ئەوەیە یەک تاکی یەک سەروای هەبێ) [٤٨٦ : ٩١] .

---

(37) شاعیرەکان ئەمانەن : سەیدێ ، نالی ، مەحوی ، زێوەر ، ئەسعەد مەحوی ، شاهۆ ، شێخ نووری ، عارف بەرزنجی ، مەلا وەسمان ، میهری ، بێخود ، ناری ، عەونی ، سەلام ، میرزا غەفوور ، مەولەوی ، شێخ ڕەزا ، حاجی ، جاهید ، بێوەی ، سەفوەت ، کەمالی ، تایەر فوئاد ، کانی ، قانیع ، ئەخۆل ، حیلمی ، لوتفی .

(تاك) دەمانیاتەوە سەر مەسنەوی کە ئەویش تایبەتێتی خۆی هەیە. مەسنەوی بە دوولەت دەگوترێ کە یەك سەروا بەیەکەوە دەیانبەستێتەوە [٤٦٧ : ١٤] جا چ بیرێکی سەربەخۆ بگەیەنن و پارچەیەکی سەربەخۆ پێك بێنن کە ئەوسا دەبێ بە (تاك) و چ دێرێك بێ لە هۆنراوەیەکی دەورو درێژ: سجادی لە پێناسەی مەسنەوی (دووتاکی)دا دەڵێ: (ئەوەیە کە هەر هۆنراوێك بەتەنها، دوایی هەردوو نیوە هۆنراوەکەی یەك سەروای هەبێ. وە بەم جۆرە داستانی کۆمەڵە هۆنراوەکە بپرێتەوە) [١٣٧ : ١٦٧]. کەچی محەمەدی ئیبراهیمی لە باسی مەسنەویدا دەڵێ: (مەنسووب بە مەسنەوییە یانی دووتایی لە (اصطلاح - زاراوە)دا هۆنراوێکە کە هەردوو مەسرەعەکە یەك قافیەیان ببێ و قافیەی هەر هۆنراوەیەك بە ئازادی بگۆڕدرێ، زۆر حیکایەت و داستان و مەبەستی مێژوویی پێ بەیان دەکرێ [١٩٣ : ١٢٤]. هەندێ تۆژەرەوە ڕایان وایە کە مەسنەوی هونەرێکی فارسیە (هەندێك وای بۆ دەچن کە ئەم جۆرەیان لە بنچینەدا فارسییە. براون دەڵێ: ئەم جۆرە لە ئەدەبی فارسییەوە دروست بوە و لە شیعری کۆنی عەرەبیدا نەبوە .. ئێرانییەکان زۆر بایەخیان پێ داوە چونکە هۆیەکی لەبار بوە بۆ هۆنینەوەی شیعری درێژ)[٢٦٦ : ١١٩-١٢٠]. پاش فارس ئینجا عەرەب وەریان گرتوە و بەکاریان هێناوە، لەعەرەبیدا زیاتر بە (مزدوج) ناسراوە کە (شاعیر هەموو دێرەکان تەسریع دەکا، سەروای لەتی یەکەم و لەتی دوەم یەك شتە. هەندێ شاعیری عەباسی ئەم جۆرە هۆنینەوەیان لەلاوە ئاسان و بێ ماندوو بوون بوە و یەکێتی سەروا بەسەر بیرو مانا و هەستی دەروونیاندا زاڵ نەبوە، یەکەم کەس بەشاری بن برد و ئەبو عەتاهیە بەکاریان هێناوە. ئەم جۆرەیان بە قاڵبێکی لەبار زانیوە بۆ داڕشتنی چیرۆکی درێژ و پەند و ئامۆژگاری ...) [٢٤٣، ل٣٠٠-٣٠١]. وەك دیارە شاعیرە عەرەبە ئەسل فارسییەکان بۆ یەکەم جار لەعەرەبیدا بەکاریان هێناوە، یان هێناویانەتە ناو ئەدەبی عەرەبی کە زۆر ئورجوزەی دیداکتیکی وەکو الفیە (ئەلفییەی) ڕێزمانی عەرەبی و زانستەکانی تری پێ هۆنراوەتەوە. لە کوردیدا هەر لەکۆنەوە زۆربەی شیعری زارگۆتن و زۆربەی هەرە زۆری شیعری زاری گۆران بەمەسنەوی هۆنراوەتەوە. هەر لە مەلا پەرێشانەوە (سەدەی چواردەم) تا نزیکەی داهێنانی ئەو زارە لای مەولەوی و تا ئێستایش. لە زاری کرمانجی خوارووشدا چمکێکی نوێ کردنەوەی شیعری کوردی دانە دواوەی یەکێتی سەروا بوو، کە سەرەتا بە مەسنەوی و ئینجا پاشان بە شیعری ئازاد گۆڕا. پیرەمێرد کە وردە وردە وازی لە عەرووز و یەکێتی سەروا هێنا، کەوتە هۆنینەوەی شیعری مەسنەوی ئەوەبە کوردی لە زنجیری قافیەی بێگانە دەرکا) [١٤٢ : ١٦]. لە کوردیدا، مەسنەوی دوورو درێژ بۆ ، عەلی کەمال باپیر لە گولدەستەدا ئەمە بەگەڕانەوە بۆ ڕەسەنایەتی دادەنێ (پیرەمێرد خەریکی زۆربابەتی جیا جیا بەکارهاتوە، وەکو:

١- بۆبابەتی دیداکتیکی (فێرکردن): وەکو نەوبەهاری ئەحمەدی خانی [٩٩] و

ئەحمەدی [١٧٩] شێخ مەلا مارفی نۆدەیی و دوو پشتەی مەلا عەبدولکەریمی مدرس [١٣٢] کە هەموویان فەرهەنگن ، هەروەها بەشێکی زۆری بەدیع وعەرووزی نالی [١٣١] ، کە بەشیعرو پەخشان زانستی جوانکاری و عەرووز شی دەکاتەوە .

٢- بۆ بابەتی ئایینی ، وەکو عەقیدەی مەولەوی [١٨٧] و عەقیدەی مەرزیە [١٨٨]ی مەولەوی لە زانستی کەلام و باوەڕی ئایینی [١١٠] شێخ سەمیعی بانەیی و قەسیدەی بوردیەی تاهیر بەحەرکەیی [٥٠] و سەفوەت [١٠٨] و حسین سەعدی [٧٢] .

٣- چیرۆکی شیعری دوور و درێژ : وەکو مەم و زینی ئەحمەدی خانی و وەرگێڕانەکەی هەژار [٣] و شیرین و خوسرەوی خانای قوبادی [٧٧] و لەیلاو مەجنوونی حاریس بدلیسی [٦١] و یوسف و زلیخای سلیمی بن سلیمان [١١٣] و هەموو چیرۆکە شیعرییە سادەکانی مێژوویی ئیسلام وەکو : فەتحی قەلای خەیبەر و بەدر و حونەین و غەزەواتی محەمەد حەنیفە و چیرۆکە ڕۆژهەڵاتییەکانی وەکو ڕۆستەم و زۆراب و ڕۆستەم و جیهانگیر و خورشیدی خاوەر و ئیسماعیل نامە و ناگەهان و باغەبان و بیاباو دو نان و ماست و سەنگتراش [٢٨]و شیرین و فەرهاد و زۆر چیرۆکی شیعری خۆماڵی وەکو داستانی سورمەخانی رازی [٨٩] و ...

٤- ژینامە و ڕووداوەکانی پێغەمبەر (ص) : وەکو مەولوودنامەکان [٣١] ، [٧٣] ، [٨٣] ، ... ، وەفاتنامەی ڕەسوولی نازدار و میعراجنامە .

٥- وتووێژ (مناظرة) : وەکو وتووێژەی نێوان سەماو زەمینی میرزا ئەبولقاسم [٢٠٣] .

٦- چیرۆکی منداڵان : وەکو خۆشی و ترشی حوزنی [٨٦] و شێری ساختە [١٥٧] و چرۆ [١٥٦]ی کاکەی فەللاح .

<u>بەکورتی</u> : مەسنەوی لە کوردیدا جێگەیەکی فراوانی داگرتوە و لەبەر سووکی سەروا و زوو گۆڕانی ، بۆ بەرهەمی دوور و درێژ بەکار هاتوە بەڵام هەرکاتێ یەك دێر (دوولەت)ی مەسنەوی بەتەنیا هاتبێ و مانای سەربەخۆی دابێ کەوتۆتە ژێر حوکمی (تاك) ، (تاك) لە کوردیدا دوو قالبە سەروای هەیە :

1- A B

2- A A

دووەم : <u>سێینە</u>

سێینە (triplet - tercet) بریتییە لە پارچەیەکی بچووك. لەسێ لەتە دێر پێك دێ. دەکەوێتە قالبە سەروای جۆراوجۆرەوە . سێینە دەشێ بەتەنیا بێ و مانای سەربەخۆی هەبێ و دەشێ لە هۆنراوەیەکی پارچەدار بێ ، پارچەکانی یەکسان بن (هەموو سێینە بن) یان جیا بن . لە کوردیدا

زۆربەی ئەو توێژەرەوانەی باسی جۆرەکانی شیعریان کردوە ، لە (دوو تاکی - تاك - مەسنەوی) یەوە یەکسەر بازیان داوە بۆ چوارینە و باسی سێینەیان نەکردوە . سێینە لە بنچینەدا ئیتالییە ، لە سونێتاکانی پترارك هاتوە کە دوو بەشە ، بەشی یەکەم (٨) لەتەو بەشی دوەم (٦) لەتە. شەش لەتەکەی کۆتایی کراون بە دوو سێینە و بەم جۆرە دابەش کراون (cdc cdc) یان (cdc dcd) ویان هەر دابەشبوونێکی سیانەی تر . بێرتن لەدوای باس کردنی ئەم جۆرەیان دەڵێ: (ئەمانەیان هەر جۆرە دابەشبوونێکی تری سەرواکان کە لای پترارك هەبوە) [٤٥٦ : ٥٧] . کودن لە پێناسەی سێینەدا دەڵێ : (بریتییە لە سێ لەتی دوای یەك لەناویەك پارچەدا ،وەکو ستانزا یان هۆنراوەی سەربەخۆ ، یان لە شیعرێکدا کە قالبە سەروای سەرەکی جیا بێ بەتایبەتی بەسێ لەتی هاوسەروای دوای یەك دەگوترێ کە لە کۆتایی هۆنراوەی مەسنەویدا دێ) [٥٠٣ : ٧٢٣] . لە ئینگلیزیدا (دۆن) و (شیلی) و (ویلیام کارلۆس) لەشیعردا بەکاریان هێناوە [٥٠٣ : ٧٢٤] . وودز دەڵێ سێینە (پارچەیەکی سێ لەتییە بەیەك سەروا دادەڕێژێ .. بەڵام کە لەگەڵ قالبە سەروای (تیرزا ریما) بەکاربێ کاریگەری زیاترە . ئەم تیرزا ریمایە لە ئیتالییەوە هاتوە و کۆمێدیای دانتی باشترین نموونەیە بۆ ئەم جۆرە سەروایە) [٤٦٧ : ١٥] . تێرزا ریما لە هەموو قالبە سەرواکانی سێینە باوترو پەسندترە لە ئەوروپا ، چونکە هەموو پارچەکانی وەستایانە تێك هەڵدەکشێن و بەردەوامی و بێ گرێی نێوان پارچەکان دەستەبەر دەکات . لەم جۆرە سێینەدا کەلەسەر دوو سەروا دادەڕێژێ (ABA) سەروای ناوەڕاست بۆ سێینەی پاشی دەبێ بەسەروای سەرەتا و کۆتایی (BCB). بەم جۆرە بەردەوام دەبێ . تێرزا ریما لە داهێنانی دانتی ئیتالییە کە لە کۆمێدیا بەکاری هێناوە و هەر سروودێکی بریتییە لە کۆمەڵێ سێینەی تێك هەڵکشاو ، لەهەر یەکێکیاندا لەتی دوەم لەگەڵ لەتی یەکەم و سێیەمی پارچەی دواوەی هاوسەروا دەبن : (ABABCB) لە کۆتایی هەر سرودێکیشدا تاکە دێرێك زیاد دەکرێ کە لەگەڵ لەتی ناوەڕاستی سێینەی کۆتایی هاوسەروا دەبێ (wxwx) [٥٠٣ : ٦٨٩] . لە ئیتالیا دانتی و پترارك و بۆکاشیۆ ، لە ئینگلیزیدا چۆسەر و سیرتۆماس و یات و لە ئەسپانیدا بوسکان بەکاریان هێناوە . لەبەر ئەوەی ئەم قالبەی سەروای سێینە گرانە کەم شاعیری ئیتالی توانیویانە سەرکەوتوانە بەکاری بێنن. لەدەرەوەی ئیتالیاش کەم بەکارهاتوە هەندێ شاعیری سەدەی نۆزدەم و بیستەمی ئیتالیا شیعریان بێ هۆنیوەتەوە ، لەفەرەنسا گۆتیێ Gautier و لەئینگلتەرا بایرۆن و شیللی و براونینگ و ئۆدن بەکاریان هێناوە . لەئەسپانیدا سێینە بە زۆری قالبەکەی بەم جۆرەیە (ABA) و تێرزا ریما لەهەموو قالبەکانی باوترە بەڵام قالبی (ABB) و (AAA) یشی تێدا بەکار دێ. پارچەی سێینە لە ئەسپانیدا بەتەنیا بەکار نایە بەڵکو لەگەڵ پارچەی تردا بەکاردێ سێینە بێ یا جۆرەکانی تر [٤٨٦ : ٩٢-٩٣] . لە فارسیدا توێژەرەوەکان باسی سێینەیان نەکردوە ، وەك ئەوەی بایەخێکی ئەو توێ

نەبێ بێتە ڕیزی مفردات و رباعی و ... لەعەرەبیدا ، سێینە پارچە شیعرێکی ڕەسەن نییە ئیبراهیم ئەنیس بەم جۆرە باسی سێینە دەکا لەعەرەبی : (ئەو هۆنراوەیەی دابەشی پارچەی سێ لەتی دەکرێ ، هەر پارچەیەك لەتەکانی هاوسەروان و سەرواکەیان لەپارچەکانی تردا دووبارە نابێتەوە ، هونەرێکی بێگانەیە بە شیعری عەرەبی. بۆی هەیە نەتوانین یەك نموونەی لە شیعری کۆن و نوێمان بدۆزینەوە ، بەلأم هەندێ لەشاعیرەکانمان جۆرە سێینەیەکیان بەکارهێناوە کە سەروای لەتی سێیەمی هەموو سێینەکان وەکو یەکە و هەر پارچەیەك سەروای دوو لەتی پێشەوەی دەگۆڕێ و بەس) [٢٤٣ : ٢٠٢-٢٠٣] . لە تورکیدا بەتایبەتی پاش جوولانەوە نوێخوازییەکانی نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم ئەم جۆرە قالبە سەروایە (سێینە) زۆر بەرچاو دەکەوێ بەتایبەتی لە سۆنیتەدا . جەناب شەهابەددین لە سۆنیتەی (ایلك محبت)دا ، شەشینەی کۆتایی بەم جۆرە دابەش دوو سێینە کردوە (AAB-CCB) [٤٢٤ : ٧]، کەچی تۆفیق فیکرەت لە سۆنیتەی عیشقدا ، دوو سێینەی کۆتایی بەم جۆرە هێناوە (ABA-CBA) [٤٢٤ : ٩] ولە سۆنیتەی (نن شعر)دا سەروای سێینەکانی بەم جۆرە داڕشتوە (ABC, ACB) [٤٢٧ : ٩] ، حسین دانش لە (آلبومی قاریشدر بوردم)دا ، سێینەکانی بەم جۆرە نووسیوە (ABB CDD) [٤٤١ : ١٢] واتە هیچ پەیوەندیان بەیەکەوە نییە . ئەوە نەبێ سیستەمەکەیان یەکە چسامی لە (امتحان قورقوس) سێینەکانی وا لێ کردوە (ABB BBA) [٤٤٤ : ٢٠٨] . وەك دیارە ، لەتورکیدا سێینە بەزۆر سیستەمی سەروای جیاواز بەکارهاتوە و گەلێ هونەری داهێنەرانی تێدا نواندراوە . لە کوردیدا ، سێینە لەڕارگۆتندا زۆر بەکارهاتوە ، هەر کۆمەڵە شیعرێکی فۆلکلۆری کۆکراوە سەیر بکەی بەدەیان نموونەی سێینەی تێدایە ، بەتایبەتی (ترانەهای کوردی) محەمەد موکری [١٩٨] کۆمەڵێ سێینەی بەخۆوە گرتوەو (کەلامێ دەکورمانجی)ی کانیمال هەمووی بریتییە لە سێینە و (٢٠٢) [٤٠٦] سێینەی هەشت برگەیی تێدایە وتێکستە فۆلکلۆریەکەی مەم و زین (محبت مم و زین) زۆریەی پارچەکانی سێینەن [١٧٨ : ٢٨٠،٢٥١] . سێینە لە کوردیدا چ بەتەنیا هاتبێ وچ وەك پارچەیەکی ناو هۆنراوەیەك بەزۆر قالبە سەروای جیاجیا هاتوە ، گرنگترینیان ئەمانەن :

١- سێینەی هاوسەروا : ئەوەیە هەر سێ لەتەکە یەك سەروایان هەبێ . ئەمە لە هەموو قالبەکانی سێینە باوترە بەتایبەتی لە شیعری ڕارگۆتندا ، هەر ئەمەیان باوە و بەدەگمەن جۆرەکانی تر دەکەونە بەرچاو . وەکو ئەم سێینەیە :

خۆم لەسەر گردی شام لەکن بووکێ
بەژنی شامۆکێم داری مێکووکێ
شامێ هەر دەگرم دەچمە کەرکووکێ

ئەم سێ سەروایە کە لە ڕارگۆتندا باوە ولە لاوك و حەیرانیشدا هەیە ، ڕەنگە بنەماکەی بۆ

ژمارەی چیرۆك و بیر و خەرافاتی میللی بچێتەوە کە ژمارە سێ یەکێکە لەو چەند ژمارانەی بەزۆری دووبارە دەبنەوە . ئەوەی ئەو بۆچوونە پتەوتر دەکا بەتایبەتی لە کوردیدا زۆریی ئەم قالبەیە لە فۆلکلۆردا ، نەك هەر شیعر بگرە حەیران و لاوکیش بەزۆری لەسەر سێ سەروا دادەڕێژێن (جگە لە پێش بەند و پاش بەند - ئەگەر هەبن) ، ئەگەرچی لە حەیران و لە لاوکی بەبەندا ، هەموو بەندەکان لەتی یەکەمیان کورت و دووەمیان ناوەنجی و سێیەمیان درێژە و دەشێ سەروای ناوەوەی تێ بکەوێ. ئەمە نموونەیەکە بۆ ئەم جۆرە حەیرانە :

(حەیران ماروێران ، چەندی گازدەکەم ، دەرێم ئاخێ لەسەر کەسەرێ ،

ئەنگۆوەرن زەینێ خۆبدەنە تاقمێ کیژۆران ، لە گێبێ من خۆش دێ ڕەنگەی بازنان وەکی دەکەن خلتان و خڕنووکان لەگەر قەسەرێ ،

کیژدەرێ : کوڕە حەیران ، هەردوو چاوەکەم ، ئەو سارەکە بەوێ بوارێ ، یانەکە بم خوازە بە ماری دنیایێ ، یان بە خوشکەکەی لەداك و بابی ، یان لۆ خۆم دەریینە بە زەبری خەنجەرێ)[١٩٧ :٨٦] .

هەر سێ لەتی هاوسەروان ، وشەکانی سەروا (کەسەرێ ، قەسەرێ ، خەنجەرێ) ، ڕەوییان (ر) و پاش ڕەوییان (ێ)یە . ئەم قالبە سەروایە بەم جۆرەیە AAA BBB .

٢- وا دەبێ سێینەکە سەربەخۆ نەبێ ، کۆمەڵێ سێینە لە هۆنراوەیەکدا کۆ بووینەوە و لەهەر سێینەیەکدا دوولەتی پێشەوە هاوسەروا بن و سەروای سێیەم لە هەموو سێینەیەکان یەك بێ . وەکو هۆنراوەی (ئەبین بەیەك گیان)ی پیریال مەحموود کە (١٠) سێینەیە و لە شێوەی (دایلۆج) دایە ، لە سێینەی یەکەم دەڵێ:

چی بڵێم ئەگەر گەڕایەوە ماڵ ............................ A
ڕوانییە دەورەی تۆی نەدی لە پاڵ ........................ A
بڵێ لەبەر تۆ تێژرا لە ژێر خاك ........................ B
ئەگەر کلاڤەی هەوری خەمناکی ........................ C
ئالأیە ئاسۆی چاوی ڕوناکی ........................ C
ڵێ بدەوە وەك خوشکی دڵ پاك ........................ B [٤٦ : ٤٨] .

بەم جۆرە هەموو سێینەیەکان لەتی سێیەمیان بەسەروای (اك) هاتوە ، لەتی یەکەم و دووەمیش لەهەر سێینەیەکدا سەرواکەیان بە جۆرێ دێ. یەکبوونی سەروای لەتە سێیەمەکان ئەرکی بەیەك بەستنەوەی پارچەکان دەبینێ. ئەم بەیەکەوە بەستنەوەی پارچەکان بەهۆی سەرواوەوە لە قالبی یەکەمدا نەبوو. ئەوەی لەم هۆنراوەیەی پیریال سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە هۆنراوەکە لەسەر دیالۆگ

- گفتوگۆ - بارزاوە و هەمیشە دەنگی یەکەم دوولەتی پێشەوەی بەردەکەوێ کە وەکو مەسنەوی وان و لە سێینەکان دەگۆڕێن ، دەنگی دووەمیش لەتی سێیەم دەڵێ کە لە هەموویان یەك شتە . سیستەمی دووبارە بوونەوەی سەروای ئەم قالبە بەم جۆرەیە :

AAB CCB DDB ....

٣- وا دەبێ سێینەکان هاوسەروابن ، تەنیا لەتی دووەمیان جیا بێ و ئەوانیش لەناو خۆیاندا سەروایان وەکو یەك وا بێ ، وەکو مەلا خدری مەندەلاوی لە شیتێکدا دەڵێ :

ئەمشەو دونیا گشتی حەزینە ............................... A
ملایکەت و جان ، زەمین و ئاسمان ...................... B
گشتی عەزادار ئیمام حوسینە ............................. A
وەناو کەربەلا قەومیل کینە ............................... A
وەناو مەیدان شەمەر بێ ویجدان ......................... B
بەتیم کرد ئەمرۆ حەزرەت سکینە ......................... A [١١١ : ٨٤] .

قالبی ئەم سەروایە بەم جۆرەیە : ABA ABA

٤- لەقالبێکی تردا نەك هەر تەنیا لەتی ناوەڕاستی سێینەکان هاوسەروان ، لەتی یەکەم و سێیەمی هەر سێینەیەك هاوسەروان و مەرج نییە ئەم دوولەتە لە هەموو سێینەکان یەك سەروایان هەبێ . گۆران لە (دەرویش عەبدوللا)دا (٥) چوارینە و دوو سێینەی هێناوە[١٧٢ : ١١٩]. لەتەکانی ناوەڕاستیان هاوسەروان و لەتی یەکەم و سێیەمی هەریەکێکیشیان سەروای تایبەتی خۆی هەیە . ئەمەی لە کۆتایی (شەوێکی بەهار)[١٧٢ : ١٧١] و لە کۆتایی (هەستێم) [١٧٢ : ٢٢٥]یش هێناوە (بێشکەی منداڵ)ی[١٧٢ : ٢٢٦] بەهەمان قالبە سەروا دارشتوە کە (٥) سێینەیە و لەتێکیان بەدوادا دێ، هەردوو دوو بەسەروای لەتی ناوەڕاستەوە بەیەکەوە دەبەسرێنەوە، ئەوەی پێنجەمیش سەروای لەتی زیادەی کۆتایی لەنگەر بۆ سەروای ناوەڕاستی ڕادەگرێ. ئەمە تا ڕادەیەکی زۆر لە شیعری (تماشای لیالی)[٤٣١ : ١١٥] جەناب شەهابەدین دەکات کە بریتییە لە مەسنەوییەکی سەرەتا و (١٥) سێینە و لەتێکی کۆتایی . ئەوەندە هەیە لای جەناب هەموو سێینەکان ، دوو دوو بە سەروای لەتی یەکەم نەك دووەم بەیەکەوە بەستراون ، سێینەی کۆتاییش لەتە تاکەکەی دواوە لەنگەری بۆ سەروای لەتی یەکەمی ڕاگرتوە. بەم جۆرە : (A / ABB) . نموونەی ئەم جۆرە سێینەیە لە کوردیدا وەکو گۆران لە (بێشکەی منداڵ)دا دەڵێ :

بایك دای ڕەنج بۆ منداڵ بای ........................ A
بۆ بزەی ناو بێشکەی ئارام ........................ B
بۆ شیرینی گروگاڵ بای ........................ A

باوك هەج ئارەقێكی ڕشت ............................ C
بۆ ئەوەی ڕشت من بلێنیام ............................ B
ئەمری كات : بڕیڕەی پشت ........................ C [١٧٣ : ٣٢٦].

قاڵبە سەروای ئەم سێینەیە بەم جۆرە هاتوە : ABA CBC

٥- وا دەبێ سێینەكان دوو دوو بە سەروای هەر سێ لەتەوە بەیەكەوە ببەسترێنەوە ، لەم حاڵەتەدا سێینەكان تەن بە تەن هیچ هاوسەروایيان لە نێوان لەتەكاندا نییە ، هەر لەتێك لەگەڵ لەتی هاوجێی خۆی لە سێینەكەی تردا سەروایان یەكە ، واتە پەیوەندیەكی سەروایی هاوجێ لەتەكان و ئنجا سێینەكان بەیەكەوە گرێ دەدا . گرێدانی دوو سێینەیەكە زۆر پتەو دەردەچێ چونكە نەك بەیەك لەت بەڵكو بەهەر سێ لەت بەیەكەوە دەبەسترێنەوە . گۆران لە پارچەیەكی هۆنراوەی (نەورۆزی ٩٦١) ئەم سیستەمەی بەكارهێناوە ، دەڵێ :

تێرگژی بەر هەتاوی گەرم ................................ A
مژدەی پێ بوو بۆ وەنەوشە ................................ B
وتی : خوشكێ ................................................ C
خوشكی جوانی چاو پڕ لەشەرم ........................ A
خڕ دا خراو دەرگای حەوشە ............................ B
فرمێسك لە چاوت بۆ ئەتكێ ............................ C [١٧٣ : ٣١٧].

لەهەردوو سێینەدا ، لەتەكانی یەكەم سەروایان (-ەرم) و لەتەكانی دوەم سەروایان(-ەوشە) و سێیەمەكان (كێ)یە . هەر دوو سێینە بەهەر سێ لەت كەوتوونەتە ناو پەیوەندی هاوسەروای توند وپتەوەوە . د. ئیبراهیم شوانیش هەر لە بابەتی نەورۆزدا (نەورۆزی من)[٥١٠](١٠) سێینەی هێناوە هەر دوو دوو ، لەشەشینەیەكدا كەوتۆنەتە ئەم پەیوەندیە سەرواییەیەوە .

ئەم قاڵبە سەروایە لە توركیدا لای تۆفیق فیكرەت ، لە كۆتایی سۆنیتەی (پری خزان) داهاتوە[٤٢٩ : ١٥٠] . قاڵبی ئەم جۆرەیان بەم شێوەیەیە : ABC ABC

٦- وا دەبێ سێینەكە سەروای لەتی یەكەمی ئازاد بێ و دوو لەتی كۆتایی هاوسەروابن . مارف بەرزنجی لە هۆنراوەیەكدا (....) چوار سێینەی هێناوە بە سیستەمی سەروای جیاجیا سێینەی دوەم بە قاڵبی (ABA) و سێنەی سێیەم بە سیستەمی (AAA) و دوو سێینەكەی سەرەتا و كۆتایی بەم قاڵبەیە كە باس دەكەین ، لەیەكەمیاندا دەڵێ :

ئەی دڵ بەچی ئەكرێیتەوە ........................ A
كام كۆشك كام تەلاری جوان .................... B
كام جل كام خشل و كام سەیران ............. B [٤٢ : ١٣٠].

ئەم قالبە سەروایە لە تورکیدا زۆر بەکارهاتوە ، ئەحمەد کەمال لە (بولکدە) [٤١٢ : ٢٧٥]، (٨) سێینەی بەم سستەمە سەروایە هێناوە . تۆفیق فیکرەت لە کۆتایی سۆنیتەی (تصادف)[٤٢٣ : ٤٠٦] و جەناب لە سۆنیتەی (نوروز اشتیاق) [٤٣٦ : ٨٥] و (تماشای احزان)[٤٢٨ : ١٢٤] بەکاریان هێناوە .

سیستەمی سەروای ئەم قالبە بەم جۆرەیە : ABB CDD

<u>پوختەی ئەم پارچەیە</u> : پارچەی سێینە لە کوردیدا بە زۆری ئەم قالبە سەروا باوانەی وەرگرتوە:

1- AAA , BBB
2- AAB , CCB
3- ABA , ABA
4- ABA , CBA
5- ABC , ABC
6- ABB , CDD

سێیەم : <u>چوارینە</u>

چوارینە پارچەیەکی چوارلەتییە کێش و سەروای تایبەتی خۆی هەیە، پارچەیەکی تەنیاو مەبەستێکی تایبەتی دەربڕی وەکو (سۆفیزم و دڵداری و فەلسەفە و مەی و مەیخانە و پەند و قسەی نەستەق و دانایی و شتی تر..) [٢٣٦ : ١١] . زۆر جاریش پارچەیەکە لە هۆنراوەیەکی دوور و درێژ کە بەسەر چوارینەدا دابەش بوە ، هەر چوارینەیەکی بیرێکی بچووك دەگەیەنێ لە چوار چێوەی بیری گشتی و سەرەکی هەموو هۆنراوەکە. ئەمەیان بە چوار خشتەکی ناویراوە. چوارین یان روباعی چۆن پەیدا بوە و یەکەم جار لە چ زمانێکەوە چەکەرەی کردوە و بە چ کێشێك نووسراوە ؟ ئەوە لە شوێنی تر باس کراوە [٤٩٤ : ٢٧٦-٢٩٠] ، دووبارەی ناکەینەوە . ئەوەی لێرە مەبەست بێ قالبەکانی سەروای چوارینەیە . بەڵام پێش چوونە سەر پۆلین کردنی قالبەکان ، هەندێ جۆری چوارینە هەن دەبێ لێکیان جیا بکەینەوە چونکە ئەمەیش هەر پەیوەندی بە شکڵ و سەروای جۆرەکانەوە هەیە . لەم بارەیە ئەم جۆرە چوارینانە هەن :

١ - چوارینە یان چوار خشتەکی : ئەوەیە چوارینەکە یان چوارینەکان سەراپا هی شاعیرەکە خۆی بێ و بەپێی قالبە سەروای تایبەتی هۆنیبێتەوە . لە کوردیدا زۆربەی چوارینەکان لەم جۆرەن ، بۆیە پێویست بە نموونە هێنانەوە ناکات .

٢ - وا دەبێ چوارینەکە (تەربیع) بێ ، واتە شاعیر هۆنراوەی شاعیرێکی تر وەریگرێ (چوارینە بێ یان غەزەل و قەسیدە) و بۆ هەر دێرێك یان لەتە دێرێك، چەند لەتێکی خۆی زیاد بکا بەڵام بەهەمان کێش و بەپێی سیستەمێکی تایبەتی سەرواوە . لە کوردیدا ، ئەگەرچی (تربیع) کەمە ، بەقەد تەخمیس نابێ ، لەگەڵ ئەوەشدا بەچەند جۆرێکی جیاواز هاتوە ، گرنگترینیان ئەمانەن :

أ- وا دەبێ شاعیر هۆنراوەیەکی شاعیرێکی تر وەربگرێ و بۆ هەر دێرێکی شیعرە کە دێرێك (دوو لەت) لەپێشەوە زیاد بکا کە لەسەر هەمان کێش بێ و سەروای هەردوو لەتە زیاد کراوە کە لەگەڵ سەروای لەتی یەکەمی شیعرە ئەسلیەکە یەك بگرێتەوە. ئەگەر هۆنراوەکە موسەڕڕەع بێ، یەکەم پارچە هەر چوار لەتی هاوسەروا دەربەچێ و پارچەکانی تر سێ لەتی پێشەوەیان یەك سەروایان دەبێ و لەتی چوارەمی هەموو پارچەکان سەروایان وەکو یەك دەبێ کە سەروای شیعرە ئەسلەکەیە . بۆ نموونە کاتی خۆی شێخ نووری شیعرێکی چوار دێری بۆ (ئومێدی ئیستیقلال) نووسیوە ، ڕەفیق حیلمی شیعرەکەی تەربیع کردوە . پارچەی یەکەم و دوەمی تەربیعەکە بەم جۆرەیە :

لە دنیادا چ قەومێکە بکا میللەتی ئیهمال .......................................... A

جیهانی پڕ جیداڵە ، ئێستە بۆ تەئمینی ئیستیقلال .............................. A

(خودایا ، بەسیە ئێتر لابەری دەیجووری ئیزمیحلال .......................... A

تلووعی پێ بکەی خورشیدی ڕۆژی پاکی ئیستیقبال) ...................... A

* * *

لە ڕێی حورریەتا شەرت بێ بگاتە ئاسمان شینم ................................ B

هەر ئیستیقلالە مەقسووم هەتاکو باقییە ژینم .................................. B

(لەگەڵ خاکپایی هیجرەتدا بەسەرچوو عومری شیرینم ......... ............B

دەسا نۆبەی ویسالە ، ئاه ، ئەی ئومێدی ئیستیقلال) ...................... A [٢١٢ : ٢٩٠].

ئەم هۆنراوەیە لەسەر کێشی هەزەجی هەشتی تەواوە بەڵام دێری یەکەمی لەنگە. ئەگەر لەنێوان وشەی (میللەت) و (ئیهمال) وشەی (خۆی) هەبێ کێشەکە تەواو دەربەچێ . دوور نییە ئەم وشەیە یان هەر وشەیەکی تری لەسەر ئەم کێشە هەبووبێ بەڵام لەچاپکردن پەڕیبێ . چوار خشتەکییەکان هەموویان لەتی چوارەمیان یەك سەروایە (اڵ) ، چوارینەی یەکەم موسەڕڕەعە (هەر چوار لەتی هاوسەروان -اڵ-) و چوارینەکانی تر سێ لەتی پێشەوەیان (دووی شاعیری دوەم و یەکی شاعیری یەکەم) هاوسەروان .

ب- وا دەبێ دیسان شاعیرێك شیعری شاعیرێکی تر وەربگرێ و بیکا بە (تەربیع) بەڵام ئەو دوو لەتەی زیادی دەکا لە پێشەوە نەبن ، لە دواوە بن . واتە دێرە شیعری شاعیرە ئەسلەکە بنووسێتەوە ئینجا خۆی دێرێك (دوو لەت)ی بۆ زیاد بکا . ئەمە نموونەی لە مەسنەوی کەوتۆتە بەرچاو ، سەروای دوو لەتە زیادەکە بەجۆرێ دەبێ کە لەتی دوەم لەگەڵ دوو لەتە ئەسلیەکە هاوسەروا بێ و لەتی یەکەمی زیادەکە سەروای جیابێ و لە هەموو چوار خشتەکییەکان دووبارە بێتەوە. لێرەدا هەر پارچەیەکی دەبێ بە چوارینەیەك کە سەرواکەی خەبامی (AABA) یەو هەموو چوارینەکانیش بە سەروای لەتی سێیەم (کە لە هەموویان وەکو یەکە) بەیەکەوە دەبەسرێنەوە .

سابیر ڕێبوار سەرایای هۆنراوەی (ئەی مانگ)ی بیکەسی بەم جۆرە (تربیع) کردوە ، لە چوارینەی یەکەم و دوەمدا دەڵێ :

ئەی مانگمن و تۆ هەردوو هاو دەردین ............................ A
هەردوو گرفتار یەك ئاهی سەردین ............................ A
(تۆ لە ئاسمانی بێگەرد و زیوین ............................ B
منیش وا لەسەر خڕۆکەی زەمین ) ............................ A

* * *

تۆ وێل و ڕەنگزەرد بە ئاسمانەوە ............................ C
منیش دەربەدەر بە شارا ئەوە ............................ C
(گرتوومەتە بەر ڕێی ئەمرو ئەژین ............................ B
تۆش قەت ناسرەوی لە سووڕانەوە ) ............................ C [٥١٢].

بەم جۆرە لە هەموو چوارینەکان لەتی (٤،٢،١) هاوسەروان و لەتی (٣) جیایە بەلام لەتی سێیەمی هەموو چوارینەکان یەك سەروایان هەیە (ین) . کە لەم وشانەدا دەردەکەوێ : (ئەوین، پێکەنین ، شیرین ، برین ، بەتین ، دڵڕین ، بژین ، دوورین ، زین ، خاوین ، خائین ، بێ دین ، ڕەنگین، خوێنین ، بژین ، خۆرنشین ، زەمین ) . ئێمە لە کوردیدا چوار خشتەکی وامان زۆرە کە چوارینەکان بە سەروای لەتی چوارەم بەیەکەوە ببەسرێنەوە ، بەلام نموونەی سەرەوە دەگمەنەو کەم کەس لای لێ کردۆتەوە . لەتورکیدا توفیق فیکرەت دوو هۆنراوەی چوار خشتەکی هەیە، هەر چوارینەیەکی لەتەکانی (٤،٣،١) هاوسەروان و هەموو چوارینەکان بەسەروای لەتی دوەم (نەك سێیەم وەکو کوردییەکە) بەیەکەوە بەسراون، هۆنراوەی (عیشق و شباب)[٤٢٢ : ٣٥٤] کە سێ چوارینەیە و لەکۆتاییدا لەتێك سەروا بۆلەتی دوەمی چوارینەکان ڕادەگرێ و (زواللی خستە)[٤٢٠ : ٣١٧] کە ئەویش دەق وەکو عیشق و شبابەکەیە . جیاوازی شیعرە کوردییەکە و تورکیەکان ئەوەیە ، یەکەم کوردییەکە تەربیعە ، تورکییەکان نووسینی یەك شاعیرە ، دوەم لە کوردییەکەدا سەروای لەتی سێیەم لەهەر چوارینەیەك جیایە ولە هەموو چوارینەکان وەکو یەکە کەچی لە تورکییەکاندا لەتی دوەم ئەو دەورە دەبینێ .

جـ- وا دەبێ ،لە (تەربیع)دا ، شاعیرێك تەنیا لەتی دوەمی شیعری شاعیرێك (عجز) وەربگرێ و خۆی بەپێی سیستەمێکی سەروای تایبەتییەوە ، بەلام لەسەر هەمان کێش سێ لەتی بۆ زیاد بکات . جزیری ، شیعرە بەناو بانگەکەی حافیزی شیرازی (ألا یا أیها الساقی) بەم سیستەمە کردوە بە تەربیع . بۆ هەرلەتێکی (عجز)ی شیعرەکەی حافیز ، سێ لەتی خۆی زیاد کردوە ، دوولەتی پێشەوە هاوسەروان (مەسنەوین) و لەتی سێیەم ئازادە و هیچ پەیوەندی بەسەروای لەتەکانی چوارینەکەی خۆی و هیچ چوارینەی ترەوە نییە ، سەروای چوارەمی هەموو چوارینەکانیش یەك شتە کە سەروای شیعرە ئەسلییەکەیە . ئەمەیش دوو چوارینەی سەرەتای تەربیعەکەی جزیری لەسەر شیعری حافیز کە هەمووی (٨) چوارینەیە :

نەوایا موتریب و چەنگێ فغان ئاوێتە خەرچەنگێ
وەرە ساقی حەتا کەنگێ نەشۆیین دل ' ژقێ ژەنگێ
حەیاتا دلٚ مەیا باقی بنۆشین دا بە موشتاقی
(الا یا ایها الساقی أدر کأسا و ناولها)

* * *

کو کاتب دیمێ جەدوەل کەت ، شکستە خەت موسەلسەل کەت
ژ یەك حەرفان موفەسسەل کەت، کیبە وێ موشکیلی حەل کەت
دزانی ڕووت و عووت ئەووەل، چنا ڤینێ سرووت ئەووەل
(کە عشق آسان نمود اول ولی افتاد مشکلها) [٥٨ : ٢].

هەموو چوارینەکان بەم قالبە داڕژاون ، لەتی یەکەم و دوەم هاوسەروان ، لەتی چوارەم لەگەڵ لەتی چوارەمی هەموو چوارینەکان یەك دەگرنەوە ، لەتی سێیەم سەروای ڕەهایە ، بەکورتی بەم سیستەمە سەروایە داڕژاوە : AA BC , DD EC FF G C

لەم چوار خشتەکییانەدا ، جزیری لە داڕشتنی سەروادا هونەری تریشی نواندوە. دوو لەتەکەی خۆی هەریەکە لەسەر دوو سەروا (سەروای لێونین) دامەزراندوە و بەهەردوو لەتەکە چوار سەروای وەکو یەکیان هەیە. لە چوارینی یەکەمدا وشەکانی سەروا ئەمانەن : (چەنگێ ، خەرچەنگێ - کەنگێ ، ژەنگێ) ، لە چوارینەی دوەمیش وشەکانی سەروا ئەمانەن : (جەدوەل ، موسەلسەل - موفەسسەل ، حەل) . جێی سەرنجە لە چوارینەی دوەمدا دوو لەتەکەی شاعیر ، سەروای دەرەوەو ناوەوەو پاش سەروایان هەیە (کەت) . لەدوو لەتەکەی کۆتایی هەر چوارینەیەکیشدا دیسان هەر لەتی دابەش دوو کەرت بوە و سێ کەرتیان (دوو کەرتی لەتی سێیەمی جزیری و کەرتی یەکەمی لەتە دێرە وەرگێڕاوەکەی حافیز) لەسەر یەك سەروا دەڕۆن و کەرتی کۆتایی لەتەکەی حافیز یەك سەروای سەربەخۆی هەیە ، ئەویش لەگەڵ لەتی کۆتایی چوارینەکانی تر یەك دەگرنەوە... بەمەوەش لەتی سێیەم ، ئەگەرچی لە ڕوانگەی سەروای کۆتاییەوە کە لەگەڵ کۆتایی لەتەکانی تر دەخرێتە بەراوردەوە ، ئازادە ، بەلام لە ڕاستیدا ئەویش لەگەڵ کەرتی یەکەمی پێش خۆی و کەرتی یەکەمی لەتی پاش خۆی هاوسەروایە . شاعیر لێ نەگەڕاوە ئەم لەتە بەرەڵلا بێ ، بەسەروای ناوەوەی گرێ داوە . هەر چوارینەیەك هەشت سەروای هەیە و بەسەر سێ سەروای جیاواز دابەش بووین . بەم سیستەمەی خوارەوە :

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| AA | AA | BB | BC | DD | DD | EE | EC , ……… |
| 1 | 2 | 3 | 4 | 1 | 2 | 3 | 4 |

جزیری کە سەروەستای داڕشتنی سەروایە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا ، هەر بەوەندەش ناوەستێ ، لە زۆر شوێنێدا لە کەرتەوە دەچێتە سەر پێ و سەروای زیادەکی دێنێ ، وەکو لە چوارینەی چوارەم ، لەسەرەتادا دەڵێ :
(دقێ تاقێ ، دقێ خانێ) و لە چوارینەی پێنجەمدا دیسان هەر لەسەرەتادا دەڵێ : (ب تورلانێ، ب ئاپانێ) ، ئەم دوو لەتە لەباتی دوو سەروا دەبن بە سێ سەروایی .

**قالبەکانی سەروای چوارین :**

چوارینە ،لە کوردیدا ،لە ڕووی دابەشبوونی سەروای لەتەکانییەوە چەند جۆرێکی هەیە ، گرنگترینیان ئەمانەن :

١- وا دەبێ هەر چوار لەتی چوارینەکە یەك سەروایان هەبێ (AAAA)و ئەگەر هۆنراوەکە چوار خشتەکی بوو و بەسەر چەند چوارینەیەك دابەش بوویوو، دیسان چوارینەکان لەتەکانیان هاوسەروان و هیچ پەیوەندیەکی سەروا بەندی لەنێوان چوارینەکاندا نییە. د.مارف دەڵێ چوارینەیەك کەهەر چوار لەتی هاوسەروابێ (چوارینی تەواوی پێ دەوترێ) [٢٣٦ : ١١] لەعەرەبیدا د.ئیسعاد ئەم جۆرە چوارینەی بە(کامل) ناو دەبات [٢٦٦ : ١٦٧]و د.داود سلوم السامرائی[٢٨٧ : ٢٣٠]و د.ئیبراهیم ئەنیس [٢٤٣ : ٣٠٢] بە(دوبیت) ناوی دەبەن، ئەگەرچی (دوبیت) لەفارسیدا بەکێش دەست نیشان دەکرێ نەك بەسەرواو لەوێ ئەم جۆرە سەروایە پەیوەندی بەناوی (دوبیت)ەوە نییە [٤٩٤ : ٢٧٦-٢٩٠]. ئەم جۆرەیان لەئینگلیزیدا کەم بەکار هاتووە، هەندێ تۆژەرەوە هەر باسیان نەکردوە [٥٠٣ : ٥٤٥] ئەوەی باسیشی کردبێ خستوویە هەرە دواوەو جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە جاروبار بەکار دێ [٤٦٧ : ١٦]. لەفەرەنسیدا بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە، لەئەسپانیدا ئەم قالبە سەروایە لەسەدەی (١٣-١٤)ی زاینیدا بەکار هاتووە بەناوی (endemovia). لەکوردیدا کۆنترین کەس ئەم جۆرە سەروایەی بۆ چوارینە بەکار هێنا بێ جزیرییە کە سێ (چارین)ی نووسیوەو لەیەکەمیاندا دەڵێ:

قەوسی دهیلالی بەلالی کەشها
بەژناتە ژ شەنگی بدرەنگی مەشها
ماری ژ حەریری دعەبیری خوشها
ماوەر بۆ ژوان زولفی درەنگی وەشها [٥٨ : ٥٥٨]

لەسەردەمی نوێشدا ، شێخ نووریو گۆران و پیرەمێردو بێکەس و بەختیار زێوەرو خادیم و کامەران و شاعیرانی تر بەکاریان هێناوە. جگە لەوەی لەچوار خشتەکیدا ، بەزۆری چوارینەی یەکەم موسەڕڕەع دەبێ و هەر چوار لەتی هاوسەروا دەبن، ئینجا چوارینەکانی تر بەپێی سیستەمی تایبەتی خۆیان دەکەونە ناو پەیوەندی سەروابەندی تایبەتییەوە. قالبە سەروا لەم جۆرە چوارینەیە بەم شێوەیە: AAAA , BBBB , CCCC

٢- وا دەبێ چوارینەکە لەتی یەکەم و دووەم و چوارەمی هاوسەروا بێ و لەتی سێیەمی ئازاد بێ، بەم قالبە: (AA X A). شکڵەکەی زیاتر لەوە دەچێ کە دوو دێری سەرەتای غەزەل یان قەسیدەی موسەڕڕەع بێ. کۆنترین شاعیری کورد چوارینەی بەم قالبە دارشتبێ باباتاهیرە، هەر هەموو وەرگێڕەکانی چوارینەکانی خەیامیش بۆ کوردی ئەم قالبە یان لەکوردییەکە بەکار هێناوە وەکو سەلام [٧٩]و هەژار [٨٠]و عەبدوسەلام نەبی [٨٢]و عەونی [١٤٥ : ٢٣١-٢٤٨]و لەپەراوێزی چاپی

یەکەمی خەیامی سەلامدا سجادی هەندێ چوارینی وەرگێڕاوی بڵاو کردوەتەوە کە (فازل) ناوێك کردوونی بەکوردی، ئەم قالبە سەروایەی چوارین لەکوردیو فارسیدا لەهەموو قالبەکانی تر باوترە. لەتورکیدا بەکار هاتووە بەڵام کەم [٤١٤ : ٧]، لەعەرەبیدا ناوی تایبەتی بۆ دانراوە. داود سلوم [٢٨٧ : ٢٣٠]و احمد الهاشمی [٢٥٨ : ١٤٦] ناویان ناوە (الرباعي الاعرج- چوارینی شەلە]، وەك ئەوەی چوارلەتەکە چوارپەلی ولاغ بێ‌و لەتی سێیەمی ئازاد پەلێکی یەك کەوتوو بێ.. لەفارسیشدا، لەو عەرەبانەی لەشیعری فارسییان کۆڵیوەتەوە، د.محەمەد نورەدین عەبدولمونعیم [٣٥٦ : ٢٣٦]و د.ئیسعاد قەندیل [٢٦٦ : ١٦٧] چوارینی خەساو (الرباعي الخصي)یان بۆ داناوە، کەچی لای خۆمان د.مارف ئەم جۆرە چوارینەی کردوە بەچوارینی... (گونك)[٢٣٦ : ١١]. ئەم جۆرە قالبەی سەروا لەئەوروپادا باوی نەبوو، تا لەسەدەی ڕابردوودا فیتزگرالد چوارینەکانی خەیامی بەهەمان قالبە سەروای خۆیەوە کرد بەئینگلیزی. ئیدی لەوە بەدواوە بەکارهێنانی ئەم قالبە لەئەوروپا گوری سەندو لەبەر ئەوەی لەژێر کاریگەری چوارینەکانی خەیام کەوتبوە ئەوروپا ئێستایش (بەچوارینی خەیامی ناو دەبرێ) [٥٠٢ : ٥٤٦]. وودز لەم بارەیەوە دەڵێ: (پارچەی چوارلەتی کە سێ لەتی هاوسەروا بن (AABA) قالبێکی دەگمەنە، بەڵام فیتزاگرالد زۆر سەرکەوتوانە لەوەرگێڕانی روباعیاتی خەیام بەکاری هێناوە) [٤٦٧ : ١٦]. لەکوردیدا بۆ نموونەی ئەم قالبە، ئەم چوارینەیەی باباتاهیر دێنین کە دەڵێ:

تن محنت کشی دیرم خدایا | دل حسرت کشی دیرم خدایا
زشوق مسکن وباد غریبی | بسینه آتشی دیرم خدایه [٣٠ : ١٠]

لەم قالبەدا هەر چوارینەیەك لەسەروا بەندیدا سەربەخۆیە و چوارینەکان ئەگەر لە یەك هۆنراوەشدابن هیچ سەروایەکی گشتی بەیەکەوە نایانبەستێتەوە . قالبی ئەم جۆرە چوارینەیە بەم شێوەیە AABA , CCDC

٢- وا دەبێ لەچوارینەدا ، سەروای لەتی یەکەم و دوەم و سەروای لەتی سێیەم و چوارەم وەك یەك بێ ئەم جۆرە چوارینەیە قالبەکەی وەکو دوو دێڕی مەسنەوی (مزدوج) دەکەوێتە بەرچاو. د.مارف بۆ ئەم جۆرە چوارینەیە زاراوەی (دووبەیت)ی بەکارهێناوە [٢٣٦ : ١١] ئەگەرچی دووبەیت لەفارسیدا لەگەڵ روباعی بەکێش لەیەك جیا دەکرێنەوە نەك بەسەروا، چونکە سەروای هەردووکیان (AABA)یە، هەر بۆیەش هەمیشە بۆ چوارینەکانی بابا تاهیر دەنووسرێ دوبیتهایان ترانەهای بابا تاهیرو بۆ خەیام دەنووسرێ روباعیاتی خەیام. د.مارف لەبارەی ئەم قالبەی چوارینەوە دەڵێ: (زاراوەی دوو بەیت لەگەڵ چوارین لەئەدەبی کوردیدا هاوسەرن لەباتی یەکتری بەکار دەهێنرێن، چونکە لەزۆر ڕووەوە لەیەکتری دەکەن. دوو بەیت واتە دوو دێڕە شیعر) [٢٣٦ : ١١] . هەموو چوارینەکانی مەولەوی بەم قالبە نووسراون، وەکو لەچوارینەیەکدا دەڵێ:

سەرلەتەرەی خەم خول ئاوەردەوە
تای گرژ مەینەت دووبادکەردەوە
موفەددیەی خەم تاڵی مەژاقەن
دەی وەخەیر نەبۆ وادەی فیراقەن [١٨٦ : ٢٩٤].

ئەم جۆرە قالبە سەروایە لەتورکیدا بەکارهاتوە، بەلاّم زۆرنا [٤٣٥ : ٢٩٠]. لەئینگلیزیدا بەکارهاتوە. وودز دەڵێ: (زۆر چوارینە بەدوو مەسنەوی داڕژاون) [٤٦٧ : ١٦] و پاشان چوارینەیەکی شبلی بەنموونە داوە. ئەگەر ئەم چوارینانە ببن بەیەك هۆنراوەش (چوارخشتەکی) هەر چوارینەیەك سەربەخۆیەو پەیوەندی سەروا بەندی بەهیچ چوارینەیەکی تری نابەستێتەوە، ئەوسا هۆنراوەکە وەکو مەسنەوییەکی درێژی لێ دێ ئەوەندە هەیە لەڕووی ناوەرۆکەوە دابەش چەند چوارینەیەکی دوو مەسنەوی دەکرێ. وایش دەبێ وەك لەقالبی دادێ ڕوون دەبێتەوە چوارینەکان بەسەروا بەندی بەیەکەوە گرێ بدرێن، بۆ نموونە پیریال مەحموود لە(کاتێ) [٤٦ : ٢٣] ئەم قالبەی بەکارهێناوە. قالبەکە بەم جۆرەیە AABB CCDD EEFF.

٤- وا دەبێ لەهۆنراوەی چوار خشتەکیدا، چوارینەکان هەریەکە دوو مەسنەوی بێ، بەلاّم لەهەر چوارینەیەکدا مەسنەوی یەکەم سەربەخۆ بێ و جیابێ لەمەسنەوی یەکەمی چوارینەکانی تر، بەلاّم مەسنەوی دوەمی هەرهەموو چوارینەکان یەك سەروایان هەبێ. وەکو (شەوگاری دڵداری) بەختیار زێوەر کە پێنج چوارینەیە، یەکەمیان موسەڕڕەعە (هەموو لەتەکان هاوسەروان- چوارینی تەواوە) مەسنەوی دوەمیان یەك سەروایان هەیە، وا بۆ ڕوون کردنەوە چوارینەی (٣،٢) وەردەگرین:

هەرچەندە وەك ئەستێرە شوناسێکی جیهانی ....... A
ئەڕوانمە ئاسمانی هیوای پڕلەنیهانی ................ A
لێم دیار نییە ئەستێرەیی بەختی منی بیمار......... B
هەی هەی کەمنی زار، بەدبەختم و بێدار ............... B

*　　*　　*

شەوگار، دەبڕۆ! پەردەیی ڕەش لادە لەچاوم ......... C
من خۆم بە گەڵێ دەردەوە باش تێوە گلاوم ............ C
تۆش هەر وەکو مێملّ مەبەرە ڕێگری دیدار ............ B
بەس بمخەرە هاوار، دڵپەستم و دووچار ................ B [٣٢ : ١٩٧].

لەسەروای ئەم هۆنراوەیەدا دوو شت سەرنج ڕادەکێشێ، یەکەم چوارینەی یەکەم لەتەکانی هاوسەروایە (AAAA)، دوەم لەهەر چوارینەیەکدا لەتی چوارەم دابەشی دوو کەرت کراوەو کەرتی یەکەمیش وەکو کەرتی دوەم ولەتی پێش کۆتایی یەك سەروای هەیە. بەکورتی مەسنەوی دوەمی هەموو چوارینەکان لەباتی دوو سەروا، سێ سەروای هەیە، سەروای لەتی سێیەم و دوو سەروای

لەتی چوارەم (سەرواى ناوەوە). ئەم قالبە سەروايە بەم جۆرەيە :

AAAA BBAA CCAA DDAA

ە- وا دەبێ لەهۆنراوەى چوار خشتەكيدا، چوارينەكان سێ لەتى پێشەوەيان هاوسەروا بێ و لەتى چوارەمى هەموو چوارينەكان يەك سەروايان هەبێ كە چوارينەكان بەيەكەوە دەبەستێتەوە. بەزۆرى چوارينەى يەكەم موسەرڕەع دەبێ، واتە هەر چوار لەتى هاوسەروا دەبێ. ئەم جۆرەيان لە چوار خشتەكى كورديدا زۆر باوە، قالبە سەرواكەى ئەم جۆرە چوار خشتەكيبە بەم شێوەيەيە :

AAAA , BBBA , CCCA , DDDA

بۆ نموونە چوار خشتەكيبە ناودارەكەى بێخود (لەو رۆژەوە رۆيشتوە)، بەم قالبە سەروايە نووسراوە، كە چوارينەى سەرەتاى موسەرڕەعەو ئەمەش نموونەى چوارينەى دوەم و سێيەم :

ئەو هەمدەمى غەمخوارو نەديمى منە يارەب
ئەو مەحرەمى ئەسرارو قەديمى منە يارەب
ئەو گەوهەرى شەهدارو يەتيمى منە يارەب
كەوتۆتە چ بەحرێكەوە خنكاوە دڵى من

* * *

مەجنوونى دوگێسوويى چ لەيلايەكە ئاخۆ
ياوامبقى جادوويى چ عەزرايەكە ئاخۆ
دێوانەيى ئاهوويى چ سەحرايەكە ئاخۆ
كام چەهرەپەرى ديوە كەتر ساوە دڵى من؟ [٣٦ : ٦٦].

چوارينەى يەكەم لەسەر دوو سەروا رۆنراوە، سێ لەتى پێشەوەى سەروايان (يمى)يەو پاش سەرواى (منە يارەب) يان لەگەڵ هاتوە. لەتى چوارەميش سەرواكەى (-اوە)يەو پاش سەرواى (دڵى من)ى بەدوادا هاتوە. چوارينەى دوەميش هەر لەسەر دوو سەروا هاتوە، سەرواى سێ لەتى بەرايى (ايەكە)يەو پاش سەرواى (ئاخۆ)ى بەدەمەوەيە، لەتى چوارەميش هەمان سەرواو پاش سەرواى لەتى چوارەمى چوارينەكانى ترە (اوە - دڵى من). ئەم قالبە لەكورديدا، لەچوارينەى سەربەخۆدا نەكەوتۆتە بەرچاو، هەميشە لەچوار خشتەكيدا هاتوە. زۆر شاعيرى كورد سەركەوتوانە ئەم قالبەيان بەكارهێناوە، وەكو گۆران لە(جوانى لادێ) [١٧٢ : ٣٢] و شێخ نوورى شێخ سالح لەوەرگێڕانى شيعرێكى (ئيليا ئەبوو مازى) [٢١٢: ٦٥] ئەم قالبەى چوارين و چوار خشتەكى بەكارهێناوە، بەڵام دوو خاڵى تێدا تێبينى دەكرێ: يەكەم چوارينەى يەكەم موسەرڕەع نييە، وەكو هەموو چوارينەكانى تر سێ لەتى پێشەوەى يەك سەرواى تايبەتييەو لەتى چوارەم لەگەڵ لەتى چوارەمى چوارينەكانى تر هاوسەروايە. دوەم : لە لەتى چوارەمى هەموو چوارينەكان كە ژمارەيان پێنجە، يەك وشە بەدەقە خۆى، بەشكڵ و ماناوە، دووبارە بۆتەوە (تێناگەم)، بێ ئەوەى وشەى پێش

ئەمەیان لەچوارینەکاندا سەروادارین. پیرەمێرد کۆمەڵێ چوار خشتەکی بەم قالبە داناوە [٤٤ : ٢٨٩، ٣٤٩] پیریال مەحمووديش چەند هۆنراوەیەکی بەم قالبە سەروایە داناوە [٤٦ : ٤٦، ٦٣، ١٣٢، ١٥٢]...

٦- وا دەبێ لەهۆنراوەیەکی چوار خشتەکیدا، چوارینەکان هەریەکە دوو سەروای هەبێ. لەتی یەکەم و دوەم و چوارەم هاوسەروابن و سەروای لەتی سێیەم لەهەموو چوارینەکان هاوبەش بێ و پێکەوە بیانبەستێتەوە. ئەمە هەمان چوارینەی خەیامییە، بەڵام چوارینەکان بەتەنیا نین. لەهۆنراوەیەکی درێژدان و لەتە ئازادەکەی سێیەمیان، چوارینەکان پێکەوە گرێ دەدا، بۆ نموونەی ئەم جۆرە، هۆنراوەی تەربیعە کە سابیر ڕێبوار لەسەر ئەی مانگی بێکەس دایناوە کە قالبەکەی بەم جۆرەیە:

AA BA , CC BC , DD BD ....

٧- وا دەبێ لەچوارینەدا، هەر چوار لەت بەنۆرە سەروایان بچێتەوە سەریەك، واتە لەتی یەکەم و سێیەم لەلایەك و لەتی دوەم و چوارەم لەلایەکی ترەوە هاوسەروابن. بەمەوە چوارینەکە دەکەوێتە سەر دوو سەروای جیاواز. ئەم جۆرە سەروایە لەڕێی ئەدەبی فارسی و بەتایبەتیش تورکییەوە هاتۆتە ناو ئەدەبی کوردی. نموونەی ئەم جۆرە چوارینەیە وەکو شێخ نووری دەڵێ:

دەردی دڵی خۆم جوملەیلکی بێنمە تەقریر ......... A
ئینس و مەلەك و جینن و پەری دێنمە گریان ...... B
بێ شك موتەحەییر دەبێ، دێوانە لەزنجیر .......... A
سەد عاقیل و هوشیار ئەخەمە کێو و بیابان ........ B [٢١٢ : ١٨٤].

ئەم جۆرە چوارینەیە لەئینگلیزیدا پێی دەگوترێ چوارینەی پاڵەوانێتی (heroic) یان پارچەی شین و چەپەر (elegiac). زۆر جاریش بەچوارینەی شەکسپیری ناوی هاتوە، چونکە شەکسپیر لەسۆنێتەکانیدا چوارینەکانی هەشتینەی پێشەوەی بەزۆری بەم سەروایە داڕشتوە. لەفەرەنسیدا بەسەروای لێك تێپەڕیو (croisee) ناوبراوە و عەرەبیش کە وەریانگرتوە وشەی (متناوب)یان بۆ داناوە. ئەم سەروایە بەلاسایی کردنەوەی ئەوروپا، هاتۆتە ناو شیعری فارسی و تورکی. زەینولعابدین لەبارەی وەرگرتنی ئەم جۆرە سەروایە و پەیرەو کردنی لەفارسیدا لەسەردەمی مەشرووتیەت، دەڵێ: (لەسەردەمی مەشرووتیەتدا، لەئەنجامی پەیوەندی و ئاگاداربوونی وڵاتە ئەورووپییەکان و ئەدەبی ئەورووپی، جۆرە شیعرێکی نوێ هاتە کایەوە، چ لەڕووی ژمارەی دێرو لەت و دابەش کردنی هۆنراوە و چ لەڕووی ڕیزی سەروای شیعر. هەندێ لەم جۆرە شیعرانە لەناو زۆربەی شاعیرە نوێخوازەکان برەوی باشی سەند. باوترینی ئەو جۆرانە ئەوەیە کە وەکو موسەممەت دابەشی پارچەی بچووك بچووك دەکرێ و بەزۆری هەر پارچەیەکی چوار لەتە و هەر چوارینەیەك لەتی (١-٣) و (٢-٤)ی هاوسەروان، وەکو (وداع)ی دکتۆر حەمیدی شاعیری هاوچەرخ ..) [٢٩٦ : ١٢٦]. لەتورکیدا زۆر شاعیر ئەم قالبە سەروایەی چوارینەیان بەکارهێناوە وەکو جناب شەهابەدین

لە(ایلك محبت)[٤٢٤ : ٣٩٨]و(سكا دائر)[٤٣٧ : ١٠٢]و حسنین لە(گزرگاە بخت)[٤٤٠ : ٢١٦]. قالبی ئەم جۆرە چوارینەیە بەم شێوەیە: .... ABAB , CDCD , EFEF

٨- وا دەبێ لەچوارینەدا، سەروای یەکەم و چوارەم یەك بێ‌و سەروای دوو لەتەکەی ناوەڕاست (٣،٢) وەکو مەسنەوی یەك شت بێ. وەکو ئەوە دەکەوێتە بەرچاو سەروای دوو لەتەکەی سەرەتاو کۆتایی باوەشیان بەسەروای دوو لەتەکەی ناوەوە کردبێ، هەر بۆیەش لەفەرەنسی پێی دەگوترێ (embrassees)و لەئەسپانیدا بوە بە(abrazadas)و عەرەب کردوویانە بە(موتەعانیق). ئەم جۆرە قالبە سەروایە لەبنچینەدا لەئیتالیەوە هاتوە، پترارك لەسۆنێتەکانیدا دوو چوارینەی پێشەوەی بەم قالبە سەروایە داڕشتوە، بۆیە زۆرجار هەر بەناوی ئەوەوە ناو دەبرێ (سەروای پترارکی) ئینجا لەوێوە چۆتە ناو شیعری نەتەوە ئەوروپیەکانی ترو پەڕیوەتە ناو زمانی تورکی‌و فارسی‌و لەوانەشەوە گەیشتۆتە ناو شیعری کوردی. لەتورکیدا حسین دانش لە(آلبومی قاریشدر بوردم)[٤٤١ : ٣٠٩]و ئیسماعیل سەفا لە(خاطرە‌ٔ مقدسە)[٤١٦ : ٣٧٤]و محەمەد ڕوشدی لە(تسلیت خیال)[٤٥٠ : ٥٤]و جەناب شەهابەدین لە(مست و متفکر)[٤٣٢ : ٢٩٠]...و هی تر بەکاریان هێناوە. لەکوردیدا بەزۆری گۆران لەچوارینەدا پەیڕەوی ئەم قالبەی کردوە، وەکو لەشیعری (کەنیشکە جوانەکە)[١٧٣ : ٧٠] کە لەژێر ناوی (لاسایی ئەدەبی عوسمانی)دا نووسیویەتی، هەروەها لەشیعری (مەدەنیەت)[١٧٣ : ٧١]و (گوڵی کەم خایەن)[١٧٣ : ٩٥]و چەند چوارینەیەکی (جیلوەی شانۆ)[١٧٣ : ١١٠]و چوارینەیەکی شیعری (بۆ سالم)[١٧٣ : ١١٧]... ڕەفیق حیلمی لە(پاش تەموز)دا چەند چوارینەیەکی بەم جۆرە سەروایە نووسیوە [٩٤ : ٤٥-٥٤]. ئەمەیش نموونەیەك بۆ ئەم قالبە چوارینەیە لەکوردیدا، گۆران دەڵێ:

کەنیشکە جوانەکە! بۆچی فریبی حوسن و جەمال .......... A
هەڵت ئەداتە سەمایی تەکەبور و عەزەمەت .................. B
ئیلە لئەبەد نییە بۆکەس مەلاحەت و شەوکەت ............... B
هەموو بەهارێ مروری سەریعە بەرق میسال ..................... A[١٧٣ : ٧٠].

سیستەمی سەروای ئەم قالبە بەم جۆرەیە : .... ABBA CDDC EFFE

٩- وا دەبێ لەچوارینەیەکدا تەنیا لەتی (٤،٢) هاوسەروا بن، لەتی (٣،١) هیچ پەیوەندی سەروایان نەبێ، نە لەنێو خۆیاندا و نە لەگەڵ لەتەکانی چوارینەکانی تری چوار خشتەکییە (ئەگەر لەچوار خشتەکی دابوو). ئەم جۆرە سیستەمە سەروایە لەئینگلیزیدا هەیە بەڵام زۆر باو نییە، وەکو شیعری (ژیانی شاعیر)ی چارلز کۆزلی [٥٠٣ : ٥٤٥]، لەئەسپانیدا لەهەندێ چوارینەی (ئاوازی قەرەج Seguidilla gitane) دەردەکەوێ[٤٨٦ : ٩٧]. نموونەی ئەم قالبە سەروایە، شێخ نووری دەڵێ:

خویا گەر بەدڵما تێپەڕێ هەر خەیاڵتێ .................... X
لەعەزرەت ئێشی سەخت و کڵپەی دڵمەوا پەشێواوم ... B
بەلوتفی خۆت مەگەر بڕوانیتە کرداری نارێکم .............. Y
لە سجلی نا ئومێدی بسڕی تۆ کردەوە و ناوم ................ B[٢١٢ : ٣٢٧].

لەتی یەکەم و سێیەم هیچ پەیوەندییەکی سەروایی لەوشەی کۆتاییاندا نییە (خەیاڵتێ، نارێکم) سەروا لە لەتی دووەم و چوارەمدایە (شێواوم، ناوم) کە ڕەوی (و) و پاش ڕەوی (م)ە، سیستەمی ئەم قاڵبە سەروایە بەم جۆرەیە: XBYB,.......

ئەم جۆرە سەروایە لەشیعری ئەورووپیدا لەبەلاد (ballad) بەرچاو دەکەوێ کە گۆرانییەکی چیرۆکئامێزەو بەدەم سەماوە دەگوترێ (باوترین پارچەی بالاد چوارینەیەو بەزۆری تەنیا لەتی (٢،٤)ی هاوسەروان) [٥٠٠ : ١٢]، بالاد هەر ئەم قاڵبە سەروایەی نییە، ئەگەرچی ئەمە یان زۆر باوە، قاڵبی تریشی هەیە وەکو (ABAB) (AABB) [٤٦٧ : ١٥].

١٠- وا دەبێ لەچوارخشتەکیدا، لەتی (٢،٣،٤)ی چوارینەکان هاوسەروابن، لەتی یەکەم کۆتاییەکەی وەکو ئەوان نەبێ، بەڵام هەموو چوارینەکان لەتی یەکەمیان هاوسەروا بێ و بەسەروای ئەو لەتەوە بەیەکەوە ببەسرێنەوە. شێخ نووری شێخ سالح هۆنراوەیەکی لەم جۆرەی هەیە (گریەی خوسران) کە پێنج چوارینەیەو کۆتایی بەپێنجینەیەك هاتوە، چوارینەکان هەموو بەم سیستە سەروایە نووسراون کە باس کرا، پێنجینەکەیش بریتییە لەکۆکردنەوەی لەتی یەکەمی هەر پێنج چوارینەکەی پێشوو، بۆ نموونە لەچوارینەی یەکەمدا دەڵێ:

بگری ئەی شاعیری ئاتەوان بگری .................. A
مرد لە ڕۆحی منا هەموو ئامال ..................... B
بێخوبانە کفن بدوش ملال ........................... B
ئەگەڕێ سەر سەری پەری خەیال .................. B [٢١٢، ل٢١٦].

سەروای ئەم قاڵبە بەم جۆرەیە:

ABBB ACCC ADDD AEEE AFFF AAAAA

**پوختەی چوارینە :**

چوارینە یەکێکە لەپارچە هەرە باوو بڵاوەکانی ئەدەبی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەڵام ئەوەندە هەیە ڕادەی باوی قاڵبەکان لای هەموو نەتەوەکان وەکو یەك نییە، بۆ نموونە لەئینگلیزیدا قاڵبی هەرە باوی چوارینە ئەمانەن: (ABAB , XBYB , AABB , ABBA) [٥٠٢ : ٥٤٥-٥٤٦]. لەفەرەنسیدا قاڵبە هەرە باوەکان ئەمانەن: (AABB , ABBA , ABAB) [٤٨٢ : ٢٧]، لەئەسپانیدا قاڵبە هەرە باوەکان ئەمانەن: (ABBA , ABAB) [٤٨٦ : ٩٤]، لەتورکیدا بەزۆری (ABAB , ABAA , ABBA) بەکارهاتوە، لەفارسی و کوردیشدا (AABA , AAAB) هەرە زۆرەکەیانە. هەندێ لەو

•

ئەلبە چوارینانە بەناوی ئەو شاعیرانەوە کراون کە سەرەتا دەوریان لەبەکارهێنان و چەسپاندنی هەبوە، وەکو چوارینەی پترارکی و شکسپیری و سپنسەری و خەیامی. لەکوردیدا ئەم قالبانەی چوارینە دەکەونە بەرچاو:

1- AAAA , BBBB , CCCC ......
2- AABA , CCDC , EEFE .......
3- AABB , CCDD , EEFF ........
4- AAAA , BBAA , CCAA ......
5- AAAA , BBBA , CCCA ......
6- AABA , CCBC , DDBD ......
7- ABAB , CDCD , EFEF ......
8- ABBA , CDDC , EFFE ......
9- XBYB .... . ..........................
10- ABBB , ACCC , ADDD ...

چوارەم : <u>پێنجینە</u>

پێنجینە پارچە هۆنراوەیەکی پێنج لەتییە کە بەپێی سیستەمی تایبەتی سەرواوە دادەڕێژێ. جا ئەو پێنج لەتە چ بەتەنیا پارچەیەکی سەربەخۆ پێك بێنن و چ پارچەیەك بن لەناو هۆنراوەیەکی دوورودرێژ کە بەزۆری دابەشی پارچەی پێنج لەتی دەکرێ. لەئینگلیزیدا زاراوەی (quintain)ی بۆ دانراوە کە بەگشتی (پارچەیەکی پێنج لەتییە چ سەربەخۆ بێ و چ لەناو هۆنراوەیەکی درێژ دابێ) [٥٠٣ : ٥٤٨]، دوو جۆری جیاوازی هەیە، یەکێکیان (quintet) کە بریتییە لە(پارچەیەکی پێنج لەتی کە سیستەمی سەرواو درێژی لەتەکانی جیان، سیستەمی سەروای ئەمەیە (ABA BB) کە شێلی لەشیعری (بۆ کلاو کورە)[(٣٨)] بەکاری هێناوە) [٥٠٣ : ٤٥٨]، ئەوەی تریش پێی دەگوترێ (quintille) کە بەئەسپانی مانای (پێنجۆکە) دەگەیەنێ بریتییە لە(پەرچەیەکی پێنج لەتی هەشت بڕگەیی، لەسەر دوو سەروا دەڕوا یان هەرپارچەیەکی (٥) لەتییە کە دوو سەروای هەبێ) [٥٠٣ : ٥٤٨]. ئەم جۆرەیان لەئەسپانیدا پارچەی هەشت بڕگەی هەرە باوە لەکاستیانا لەسەدەی (١٥) سەری هەڵداو لای ئەوان ئەم جۆرە پێنجینەیە لەسەر دوو سەروا دروست بوە کە (هەرگیز سێ سەروای بەدوای یەکدا نایەن و دوو لەتی کۆتاییش مەسنەوی پێك ناهێنن) [٤٨٦ : ٩٩]. قالبەکەی بەم جۆرەیە: (AABAB)، لەفەرەنسیدا، دەشێ (Quintil) دوو سەرواکەی بەم جۆرە دابەش ببێ (AABBA) [٤٨٢ : ٢١] و بەزۆری لەڕوانگەی سەروای کۆتاییەوە حسێبی بۆ دەکرێ: پێنجینە کە لەسەر دوو سەروا دروست دەبێ. دەشێ خوێنەر پێش ئەوەی بگاتە لەتی پێنجەم بزانێ سەرواکەی دەبێ چی بێ، چونکە ئەگەر لەلەتەکانی پێشوو یەکێکیان بەتەنێ مابێتەوە دەبێ پێنجەم بۆی تەواو بکا. قالبەکەی بەم جۆرەیە (ABAAB)، و دەشێ خوێنەر نەزانێ داخۆ لەتی پێنجەم سەروای چۆن دەبێ چونکە چوارەکەی پێشوو هەموو مەرجێکی هەردوو سەرواکەیان هێناوەتە دی - تێبینی لەفەرەنسیدا وەکو ئەسپانی نییە، مەسنەوی لەکۆتایی هەڵدەگرێ [٤٨٤ : ٨٢]. قالبەکە بەم جۆرەیە (ABABA). لەڕۆژهەڵاتدا، پێنجینە لەڕووی دارشتن و دابەشبوونی

---

(٣٨) گۆران ئەم شیعرەی بەناوی (بۆ بلبل) کردوە بەکوردی [١٧٢ : ١٠٢].

سەرواوە تایبەتێتی خۆی هەیە. لەعەرەبیدا ئەگەر چی زۆر بەکار نەهاتوە بەلام هەر لەزووەوە ئاماژەی بۆ کراوە. ئیبن ڕەشیق دەڵێ: (جۆرێکی تر هەیە پێی دەگوترێ پێنجینە، ئەوەیە پێنج لەت سەروایان یەك بێ، ئینجا پێنج لەتی تر لەسەر هەمان کێش بن بەلام سەروایان جیا بێ، بەم جۆرە تا هۆنراوەکە تەواو دەبێ) [٢٤٦ : ١٨٠] د.ئیسعاد لەباسی پێنج خشتەکی لەشیعری عەرەبیدا دەڵێ (شاعیرە عەرەبەکانی دوایی زۆر مەراقیان ئەم جۆرە بوەو بۆ نموونە هۆنراوەی (البردە) و (بانت سعاد) و زۆر هۆنراوەی تری بەناوبانگیان کردوە بەپێنج خشتەکی) [٢٦٦ : ٣١٥]، د.ئیبراهیم ئەنیس دەڵێ پێنجینەی ڕاستەقینە ئەوەیە شاعیر هۆنراوەکەی لەسەر پارچەی پێنج لەتی دابمەزرێنێ، هەر پارچەیەکی لەتەکانی لەسەر یەك سەروا بڕوا -AAAAA- وەکو -الیاس فرحات- لەشیعری -بین الطفولة و الشباب- [٢٤٣ : ٣٠٨-٣٠٩] ئینجا دەڵێ بەلام ئەم جۆرەیان لای شاعیرە تازەکان ئەوەندە زۆر نییە (ئەو پێنجینەی کە ئەوان پەسندیان کردوەو مۆسیقاکەیان لێ خۆش هاتوە، ئەوەیە کە سەروای لەتی پێنجەمی هەموو پارچەکان یەك شتە. شاعیرە تازەکان زۆر شیعریان بەم قالبە هۆنیوەتەوەو گەلێ بابەتیان پێ نووسیوە کە پێشینان بۆی نەچوون، وەکو شیعرەکەی (حافظ ابراهیم) لەلاواندنەوەی فیکتۆریا) [٢٤٣ : ٣٠٩]. لەکوردیدا، د.مارف لەباسی (پێنجین و پێنج خشتەکی)دا دەڵێ: (پێنجین و پێنج خشتەکی هونەرێکی شیعری باوو بڵاوە لەئەدەبی کلاسیکی نەتەوە موسڵمانەکان. قەسیدەی پێنجینە تەنیا لەناو ئەدەبی نەتەوە موسڵمانەکان نەماوەتەوە، بەڵکو چوەتە ناو ئەدەبی نەتەوە ناموسڵمانەکانیش لەو دیو قەفقاس) [١٧٨ : ١٨٤]. د.مارف پێنجین یان پێنجینە بەندو پێنج خشتەکی لەیەك جیا دەکاتەوە کە یەکەمیان هی یەك شاعیرەو دوەمیان دوو شاعیر بەشداری تێدا دەکەن ، جا شاعیری یەکەمیان چ کورد بێ و چ غەیری کورد ، ئەگەر شاعیری یەکەم کورد نەبێ و شیعرە ئەسلییەکە بەزمانێکی تربێ (فارسی یان تورکی) ئەوا (بەدیەن وەکو مولەممەع دێتە پێش چاو) [١٧٨ : ١٨٩]. لەبارەی کێشی پێنج خشتەکییەوە د.مارف لە[١٧٨]و[٢٣٦]داو عەبدوللا تاهیر لە[٢٣١]دا جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە کێشی پێنج خشتەکی عەرووزییە. ئەمە بەشێوەیەکی گشتی ڕاستە، بەلام ئەگەر بچینە ناو جەردو سەرژمێری وردی پێنج خشتەکییەوە بۆمان دەردەکەوێ کە پێنج خشتەکی بەکێشی خۆماڵیش کراوە، وەکو پێنج خشتەکی ڕازی لەسەر دوو شیعری مەولەوی (خاڵۆ خاڵۆتەن) [٨٨ : ١٠٥] و (دەخیلە گەردوون) [٨٨ : ١٠٨]. لەبەر ئەوەی شیعرەکانی مەولەوی بەکێشی خۆماڵی نووسراون، ئەم دوو پێنج خشتەکییە، هەر پارچەیەکیان بگرە لەتەکانیان هەموو هاوسەروان و پەیوەندی سەروا بەندی لەنێوان پارچەکاندا نییە. لەمەش زیاتر جەعفەر شێخ حوسێن بەرزنجی سێ هۆنراوەی فۆلکلۆری کردوە بەپێنج خشتەکی کە بێگومان کێشەکەیان خۆماڵییەو عەرووزی نییە، بەلام لەهەر سێ هۆنراوە (بەسم لێ بگرە، ماڵمان ماڵاوسێ، چنارو لاولاوە) [٤٧ : ٢١٧-٢٢٢]، لەهەر یەکێکدا یەك دێڕی فۆلکلۆری وەرگرتوەو چەند پارچەیە ئەوەندە جارە سێ لەتی بۆ زیاد کردوە، یەکەمیان (٧) پارچەو دوەمیان (٥) پارچەو سێیەمیان (٦) پارچەیە، بۆیە لەم سێ پێنج خشتەکییەدا (کە جۆرێکی تایبەتین) هەموو لەت و پارچەکان لەسەرەتا تا کۆتایی یەك

سەروایان هەیە، سەروای هۆنراوەی یەکەم (انی)و هی دوەم (ایە)و هی سێیەم (بیر)ە. جگە لەوەش تێکەڵ کردنێکی شیعری عەرووزی و خۆماڵی لەشکڵی پێنج خشتەکیدا لەهۆنراوەی یان گۆرانی (دەسا چ بکەم نیمە چارە)ی تایەر تۆفیق [٤٧ : ٢١٣] خۆی دەنوێنێ کە هونەرێکی تایبەتی تێدا خەرج کراوە. تێبینیەکی تر لەبارەی پێنج خشتەکی ئەوەیە کە مەرج نییە موڵکی تەنیا دوو شاعیر بێ، شاعیرە ئەسڵەکەو ئەوەی زیادەکانی بۆ نووسیوە، جاری وا هەیە موڵکی سێ شاعیرە، ئەمەیش دوو جۆرە:

١- وا دەبێ دوو شاعیر بەیەکەوە دانیشتبن و بەدوو قۆڵی شیعرێکیان نووسیبێ، پاشان شاعیرێکی تر هاتبێ شیعرەکەی کردبێ بەپێنج خشتەکی، وەکو شیعری (بەغەمزەی چاوی مەخمووری) کە ناری و تاهیر بەگ بەیەکەوە دایانناوە(٣٩) [٤٨ : ٣٤] هەروەها [٢٠٦ : ٧٨]. ئینجا سافی هاتوە شیعرەکەی کردوە بەپێنج خشتەکی بەمەوەش سێ شاعیر (ناری، تاهیر بەگ، سافی) دەبن بەخاوەنی پێنج خشتەکییەکە.

٢- وا دەبێ شاعیرێك شیعرێکی نووسیبێ وەکو شیعرە بەناو بانگەکەی حافیزی شیرازی (آلا یا ایها الساقی)، یەکێ بێ ئەم شیعرە تێهەڵکێشی شیعری خۆی بکا، لەتی یەکەمی هەموو دێرەکان لابدا و لەتێکی خۆیان بخاتە شوێن، وەکو سالم لەشیعری (بەدەل کەین) [١٠١ : ٣٦] وای لەشیعرەکەی حافیز کردوە. لەبەر ئەوەی لەتی دووەمی شیعرەکەی حافیز وەکو خۆیان ماونەتەوە هەر ئەوانن بۆ هۆنراوە نوێکەی سالم و حافیز دەبن بەسەروا. ئینجا شاعیرێکی تر دێ ئەم شیعرە تێهەڵکێشە دەکا بەپێنج خشتەکی، بۆ هەر دێرێك (لەتێکی سالم و یەکی حافیز)، سێ لەتی خۆی زیاد دەکا، وەکو کەمالی هاتوە ئەمەی کردوە [١٧١ : ١٥٠](٤٠) بەمەوە پێنج خشتەکییەکە دەبێ بەهی سێ شاعیر: یەکەم حافیز، دوەم سالم، سێیەم کەمالی.

---

(39) کاکەی فەلاح گومانی لەوە هەیە ئەم شیعرە بەدوو قۆڵی لەلایەن ناری و تاهیر بەگەوە دانرابێ. ئەو لای وایە شیعرەکە تەنیا هی ناری یەو مافی تاهیر بەگی بەسەرەوە نییەو دەڵێ: (ناری وتوویەتی بەناهەق ئەم غەزەلەیان کردوە بەدانانی تایەر بەگ، ڕاستییەکەی ئەوە هەمووی هی خۆمە. بەڵێ وایە چونکە دارشتنەکەی لەهی یەك شاعیر ئەچێ. ئەم ڕاستییە لەحاجی مەلا ئەحمەدی قازی بیستراوە) [٢٠٦ : ٧٨]. ئێمە لەو باوەڕە داین شیعرەکە هەر تەنیا ناری نووسیبێتی، چونکە: یەکەم زۆر جار وابوە دوو شاعیر بەیەکەوە شیعرێکیان نووسیوە، وەکو دلدار و جاهید بەیەکەوە شیعری (شاهبازی یا شەهێن)یان داناوە [١٢٥ : ١٧٧]، دوەم شیعرەکە بەزمانی کۆ-جمع- قسە دەکا (مەستی مەی کردین، مەزەی کردین)، سێیەم لە لەتی یەکەمی دێری کۆتایی ناوی هەردوو شاعیرەکە ئاشکرا هاتوە:

عیلاجی دەردی دڵ (ناری)، لە(تاهیر بەگ) تەمەنناکە
بڵێ: ئەمرۆ گوڵە ندامێ بەتیرێ جەرگی بەی کردین

(40) بەشداری کردنی دوو شاعیر یان زیاتر لەئەنجامدانی یەك هۆنراوە، بیرمان بۆ لای هونەرێکی شیعری یابانی دەبا کە پێی دەگوترێ (هۆنراوەی لێك بەسراو linked poem). ئەمە لەیابانیدا زۆر کۆنە لە(٨١-١١٢)ز نموونەی هەیە کە شیعرێکی کورتەو دوو شاعیر تەواوی دەکەن، یەکێکیان لەتێکی (٥/٧/٥) بڕگەیی دەنووسێ و ئەوەی تر دێ لەتێکی (٧/٧) بڕگەیی بۆ زیاد دەکا.. لەسەدەی هەشتەم و نۆیەم هۆنراوەی درێژی پەنجا، سەد، بگرە هەزار لەتی نووسراوە کە بەزنجیرەی (٥٧٥/٧٧/٥٧٥/٧٧/٠٠٠٠) دەنووسرا. یەکێ لەتی

ئەوەی جێی سەرنجە، هونەری پێنج خشتەکی کردن (تخمیس) لەشیعری کوردیدا ئەوەندە کۆن نییە، لەپێش سەدەی نۆزدەم نموونەی تەخمیسمان دیار نییە. جا یا هەر نییە، یا هەبوەو نەماوە یان هێشتا نەدۆزراوەتەوە. کۆنترین پێنج خشتەکی ئەوەی سالە لەسەر شیعری نالی. دووریش نییە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیو شیعری ئاینی، پێنج خشتەکی کردنی لەوە کۆنترمان بۆ بدۆزێتەوە.

کەواتە لەکوردیدا ئەو هۆنراوانەی بەپارچەی پێنج لەتی دادەڕێژن، چەند جۆرێکیان هەیە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- بۆی هەیە پێنجینەکە سەربەخۆ بێ، پەیوەندی بەهیچ پارچەو شیعری ترەوە نەبێ. لەم حاڵەتەدا پێنجینەکە وەك هۆنراوەیەکی سەربەخۆ بیرێکی تایبەتی دەگەیەنێ. ئەمە لەکوردیدا زۆر کەم و دەگمەنەو رەواجی چوارینەی سەربەخۆی نییە.

٢- وا دەبێ هەموو شیعرەکە هی یەك شاعیر بێ (پێنجینە)، جا داپەشبوونی سەروای پارچەکان بەهەر سیستەمێك بێ.

٣- وا دەبێ شیعرەکە هی یەك شاعیر نەبێ، هی دوو سێ شاعیر یان زیاتر بێ (پێنج خشتەکی). ئەو شیعرە ئەسلیەی دەکرێتە پێنج خشتەکی، وا دەبێ کوردی بێ کە ئەمە هەرە زۆرو باوەکەیە و وا دەبێ هی شاعیرێکی فارس بێ. لەو حاڵەتەدا پێنج خشتەکییەکە بەدوو زمان دەبێ. دوو لەتی ئەسلی بەفارسیو سێ لەتە زیادەکە بەکوردی دەبن. بەزۆری شیعری حافیزی شیرازی لەکوردیدا کراوەتە پێنج خشتەکی (تێهەڵکێش کراوە) وەکو ئەمە هەیە، ئەوەیش هەیە کە شاعیرێکی کورد یەك لەتی شاعیرێکی فارس وەردەگرێو لەهەر پارچەیەکدا چوار لەتی کوردی خۆی بۆ زیاد دەکا. لەم جۆرەیاندا، لەهەموو پارچە پێنجینەکاندا لەتی پێنجەم هەمان لەتەو دووبارە دەبێتەوە. تەنیا ئەم لەتە هی شاعیرە ئەسلەکەیەو شاعیری کورد چوار لەتی بۆ زیاد دەکا. ئەمە بەزۆری بەتێهەڵکێش ناوبراوە. حەمدی دوو پێنج خشتەکی لەو جۆرەی هەیە. کە لەیەکێکیان دا لەتە شیعری (تا خوا جەمی خورد بغزلهای بهلوی)ی حافیزی وەرگرتوەو لەهەر پارچەیەکدا چوار لەتی خۆی بۆ زیاد کردوەو لەپێنجینەی یەکەمدا سەرواکەی تەسریع کردوە [٦ : ٧٧] لەشیعرەکەی تریشدا لەتی (این همه ازپی آنست کەزر میخواهد)ی حافیزی تێهەڵکێش کردوە [٦ : ٧٥].

---

یەکەمی دەنووسیو هەرچی دەهات لەتێکی بۆ زیاد دەکرد، لەتەکانیش بەنۆرە حەڤدە بڕگەییو چوارە بڕگەیین. لەسەردەمی نوێشدا ئەم هونەرە پاوی هەر ماوە، بەڵام لەباتی زیاد کردنی یەك لەت، بەنۆرە لە نووسینو زیادکردنی سێ لەت و دوولەتدایە بۆ نموونە لە ١٩٦٠ چوار شاعیری گەورەی یابانی: (باشۆ، کیۆاری، بۆنچۆ، شیهۆ) بەهاوکاری شیعرێکیان لەبارەی (یەکەم بارانی زستان) نووسیوە. شیعرەکە (٣٦) پارچەیە. پارچەی یەکەم سێ لەتەو دووەم دوولەتە، شیعرەکە بەم جۆرە بەردەوام دەبێ بەڵام مەرج نییە هەر چوار شاعیرەکە بەنۆرە یەك لەدوای یەك پارچە زیادەکان بنووسن، وا دەبێ دەوریان پاش و پێش ببێ. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە [٥٥ : ١٢٣-١٣٨].

٤- نموونەی پێنج خشتەکی گۆرانیش هەیە کە گۆرانی بێژ شیعری شاعیرێك وەردەگرێ و لە دوای (نەك لەپێش) هەر دێڕێك (دوولەت)، سێ لەتی فۆلکلۆری بۆ زیاد دەکا. وەکو گۆرانی (دەسا چ بکەم)ی تایەر تۆفیق [٤٧ : ٢١٢]. شیعرەکە هی کوردییە [١٧٦ : ٤٣] و یەکێتی سەرەوای تیا پەیڕەو کراوەو هیچ پەیوەندی بەسەرەوای لەتە فۆلکلۆرییەکانەوە نییە. کە لەم نموونەیەدا لەهەموو پارچەکاندا (هەمووی چوار پارچەیە) یەك سەروایان هەیە. لەم پێنج خشتەکییەدا چەند جیاوازییەك تێبینی دەکرێ لەگەڵ پێنج خشتەکییەکانی تر یەکەم: ئەوەی پێنج خشتەکییەکەی ئەنجام داوە، خۆی شاعیر نییەو لەخۆیەوە لەتەکان زیاد ناکا، بەڵکو لە فۆلکلۆر لەتەکان دێنێ و دەیانخاتە سەر شیعرە ئەسلییەکە، دووەم: ئەو لەتانەی زیاد دەکرێن ناکەونە پێشەوەی دێڕەکانی شیعرە ئەسلییەکە بەڵکو دەکەونە دواوە. سێیەم: سەرواپای پێنج خشتەکییەکە، پارچەکانی، لەباتی یەك سەروا بەدوو سەروا بەیەکەوە بەسراوەتەوە: سەروای شیعرە ئەسلییەکە کە دەکەوێتە لەتی دووەمی هەموو پارچەکان و سەروای لەتەزیادەکان کە لەهەر سێ لەتەکەدا دەردەکەوێ.

## قالبەکانی سەروای پێنجینە :

پارچەی پێنجینە، جا هەر جۆرێك بێ، زۆر قالبی جیاجیای هەیە. گرنگترینیان ئەمانەن (تێبینی زۆر جار پێنج خشتەکی بەهەموو جۆرەکانییەوە پارچەی یەکەمی موسەررەع دەبێ):

١- بۆی هەیە هۆنراوەکە کە لە شێوەی پێنج خشتەکیدایە، لەسەرەتا تا کۆتایی هەموو لەتەکانی هاوسەروابێ، وەکو پێنج خشتەکی (یارەکەم لەسەفرە) [٨ : ٤٩] و (کچی بێ حەیا بۆ پیاوبەلایە) [٨ : ٥٠]. قالبەکەی بەم جۆرەیە :

AAAAA , AAAAA, ..........

٢- بۆی هەیە پێنج خشتەکییەکە هەر پارچەیەکی بەتەنیا لەسەریەك سەروا بڕواو هیچ پەیوەندی سەروا بەندی لەنێوان پارچەکاندا نەبێ، وەکو پێنج خشتەکی ڕازی لەسەر هەڵبەستی مەولەوی کە لەپێنجینەی یەکەمدا دەڵێ:

بەئێش و ئۆف و سزاو ڕەنگی‌ی زەرد ............ A
بەناڵەی گەرم و بەهەناسەی سەرد ............ A
وابە دوادا هات دێوانەکەی هەرد ............ A
(دەخیلە گەردوون بلووری بێ گەرد ............ A
ئامانەتی تۆو دڵەی پڕ لە دەرد) ..... ............A [٨٨ : ١٠٨]

قالبەکەی بەم جۆرەیە: ........... , AAAAA , BBBBB , CCCCC

٣- وا دەبێ لەپێنجینەکەدا، چوار لەتی پێشەوە لە سەریەك سەروا بن و لەتی پێنجەم سەروای جیابێ، بەڵام لەگەڵ سەروای لەتی پێنجەمی هەموو پێنجینەکانی تری پێنج خشتەکییەکە یەك

شب بێ، وەکو زۆربەی هەرە زۆری ئەو پێنج خشتەکییانەی شاعیرێك لەسەر غەزەل و قەسیدەی شاعیرێکی تر کردوویەتی، یان ئەو پێنج خشتەکییانەی خۆیان نووسیویانە. بۆ نموونە ئەمە پێنجینەی دوەمە لەپێنج خشتەکی سالم لەسەر شیعرێکی نالی:

گاهێ بەدوعا ڕوودەکەیە قیبلەیی حاجات ........ A

گاهێ لەڕەعیبەت دەبی بە مەرگی موجافات ..... A

ناکەی لە دلاّ قەت بەئەبەد فیکری موکافات ...... A

(ئەی جامیعی دونیا و قیامەت بەخەیالات ........ A

ئەو ڕۆژە کە مردی نەئەوت بوو نەئەمت بوو) ..... B [١٧٨ : ١٩٢].

لەم جۆرەدا بەزۆری پارچەی یەکەم موسەڕڕەع دەبێ. قالبە سەرواى ئەم جۆرەیان بەم شێوەیە داڕژاوە :

AAAAAA, AAAAB, CCCCB, ……

٤- وا دەبێ لەپێنج خشتەکیدا، هەر پێنجینەیەك سیستەمی سەرواى تایبەتی خۆی هەبێ و هیچ سەروا بەندییەك لەنێوان پارچەکاندا نەبێ بەگشتی، بەلاّم لەهەر پارچەیەکدا بەیەك دەستوور سەرواکان دابەش بێن، لەتی یەکەم و دوەم و سێیەم و پێنجەم هاوسەروابن و کۆتایی لەتی چوارەم ئازاد بێ و بەهیچ سەروایەکەوە نەبەسرابێتەوە. وەکو هۆنراوەی (بەبۆنـەی لادانی تارا لەسەر پەیکەری شاعیری مەزن، حاجی قادری کۆیی)ی حەسیب قەرەداغی کە (١٠) پارچەیەو هەموویان بەم سیستەمە داڕژاون، ئەمەیش پێنجینەی یەکەم:

حەرفی کوردی ، گیانەکەی بوو پێش ئەوەی تۆ دەرکەوی ...... A

تۆ بەپرچی ڕۆژی ڕوونا بۆ نیگای بیر سەرکەوی ..............… A

قۆلی مەردی هەڵبکەیت و پێشەوا بی و بەرکەوی ................ A

مامە حاجی ئەو نەوژمەی دات بەحەرف و بیری کورد ........... B

وای شەپۆل داتۆ ئەمێستا پێشی سەد ڕەهبەرکەوی ................ A [٦٨ : ٢٠٥].

قالبەکەی بەم جۆرەیە:

AAABA , CCCDC , EEEFE , ……..

٥- وا دەبێ پێنجینەکە کۆتایی لەتی یەکەمی ئازاد بێ، لەتی دوەم و پێنجەم یەك سەروایان هەبێ و لەتی سێیەم و چوارەم یەك سەروایان هەبێ. حەسیب قەرەداغی لەپێنجینەیەکدا دەڵێ:

لەمیانی من و تۆ، خۆزگە ، پردە ................ X

لەسەرپایەی ورکی دڵم دامەزراوە ............... A

هەرچی لافاو هەیە هەستێ ........................ B

پردی شاعیرنا پسێنێ .............................. B

چونکە بەخەم دارێژراوە ............................ A [٦٨ : ٩٦].

قالبە سەرواکەی ئەم پێنجینەیە بەم جۆرەیە: XABBA .

٦- هەر حەسیب قەرەداغی سەروای پێنجینەیەکی تری بەجۆرێکی تر دارشتوە. لەتی ناوەراست (لەتی ٣) کۆتاییەکەی ئازادە، هەر چوار لەتەکەی تر هاوسەروان و دوو دوو وەکو مەسنەوی دەکەونە بەرچاو، دەڵێ:

شیعرێکم هەڵکرد بۆ دارێ ................ A

مەلێکی جوانم بۆ بگرێ ................... A

کە دەستم برد بیهێنمەوە ، ............... X

لادیوارێ ، ........................................ A

بەسەر سەرما هاتە خوارێ ............ A [٨٨ : ٣١].

لەتی دووەم هەر چەندە کۆتاییەکەی (رێ) وەکو لەتی (٥،٤،١) وایە بەلاَم مەرجی سەروای پەتەواوی تێدا نییە، چونکە (ێ) لەهەموویان پاش رەوییە. رەوی دەنگی (ر)ە، دەبێ بزوێنی پێش (ر) لە هەموو لەتە هاوسەرواکان یەك بێ کەچی لەمەیاندا گۆڕاوە. ئەم قالبە بەم شێوەیەی سەرەوە، ئاوا دەردەچێ : AABAA .

٧- وا دەبێ لەپێنج خشتەکیدا ، پێنجینەکان لەرووی سەرواوە سەربەخۆبن، پەیوەندیان بەیەکەوە نەبێ، هەر پێنجینەیەکیش دوولەتی پێشەوەی یەك سەرواو سێ لەتی پاشەوەی سەروایەکی تریان هەبێ، رازی لەپێنج خشتەکی (دڵی شکاوم)دا کە سێ پێنجینەیە و بە مەسنەوییەك داخراوە، لە پێنجینەی یەکەمدا دەڵێ:

ئەی دڵ شکاو خۆم ، ئەی دڵ شکاو خۆم ....... A

دەروون پڕ ئاگر ، چاو پڕلەئاو خۆم ................ A

پەروەردەم کردی وێنەی داری گوڵ .................. B

جێم کردیتەوە لەناو ناخی دڵ ......................... B

ئەمخوێند لەدەورت بەوێنەی بولبول ................ B[٨٨ : ١٠٤]

ئەم جۆرە پێنج خشتەکییە قالبەکەی بەم چەشنەیە:

AA BBB, CC DDD, EE FFF, ......

٨. پێنج خشتەکی هەیە، لەهەر پارچەیەکدا لەتی (٣،٢،١) هاوسەروان و لەتی (٥،٤) هاوسەروان ولەهەموو پارچەکاندا دووبارە دەبنەوەو پارچەکان بەیەکەوە دەبەستنەوە، وەکو شیعری (شین بۆ سێ هاوڕێی لەسێدارە دراو)ی مارف بەرزنجی (پشکۆ)، کە لەپێنجینەی یەکەمدا دەڵێ:

چۆن دڵ نەتەقێ و مێشك نەبڕێ ............ A
چۆن دەستی حەسرەت ئەمشەو نەمکوژێ ..... A
چۆن لەدوو دیدە هەر خوێن نەڕژێ ............ A
هەتا ئیستیعمار نەکەین سەنگەسار ........... B
لەتۆڵەی خوێنی رەفیقی سەربار ................ B [٤٢ : ٩٢].

سەرەوای دوو لەتی دوایی (ار) لەدوو لەتی کۆتایی هەموو پێنجینەکاندا دووبارە دەبێتەوە. زنجیرەی سەرەوای ئەم قاڵبە بەم شێوەیە دەڕوا:

AAA BB , CCC BB , DDD BB

٩- وا دەبێ هەمان قاڵبی پێنجینەکانی پێشوو (ژمارە ٨) (AAA BB) لەپێنج خشتەکییەکدا دابڕژێ بەڵام هەر پێنجینەیەك لەڕووی سەرواوە سەربەخۆیێ و پەیوەندی بەسەرەوای پارچەکانی ترەوە نەبێ وەکو قاڵبی پێشوو. وەکو (گوڵی سەریەستی) بەختیار زێوەر، لەپێنجینەی یەکەمدا دەڵێ:

گوڵێك شیرینتر لەخونچەی بەهار ............ A
نازکتر جوانتر لەشەوبۆی ئازدار ............ A
گەشتر لەدیدەی وەنەوشەی نزار .............. A
گوڵێکە ناوی گوڵی سەریەستی ............. B
مەردە ئەوگەلەی بگاتە دەستی ............. B[٣٢ : ٢١٥]

شیعرەکە (٦) پارچەیە، هەر پارچەیەك سەرەوای سەربەخۆی هەیە، بەڵام قاڵبی هەموویان وەکو یەك وایە، بەم جۆرەیە:

AAA BB CCC DD EEE FF

١٠- وا دەبێ هۆنراوەکە دابەش پارچەی پێنجی بوویێ و لەهەر پێنجینەیەکدا، لەتی یەکەم کۆتاییەکەی ئازاد بێ و (جگە لەتەسریع) هیچ پەیوەندیەکی سەروایی نەبێ نەلەناو پێنجینەی خۆیدا و نەلەگەڵ پێنجینەکانی تری هۆنراوەکەدا، لەتی دووەمیش لەناو پێنجینەی خۆیدا ئازاد بێ، بەڵام لەگەڵ لەتی دووەمی هەموو پێنجینەکانی تر هاوسەروا بێ، هەر سێ لەتی کۆتایی هەموو پێنجینەکانیش هاوسەروا بن. ئەم قاڵبە لەتێهەڵکێش کردنی شیعرەکەی کوردی و شیعرە فۆلکلۆریەکەی گۆرانی (چاوەکەم)دا دەردەکەوێ، ئەمە پێنجینەی دووەم و سێیەمی هۆنراوەکە(٤١):

وێڵ و سەرگەردان و خوارو، عاجزو ئاشفتە حاڵ ..... X

(41) بۆیە لێرەدا دوو پێنجینەمان وەرگرت تا سەروابەندیی لەتی دووەم و ئازادیی لەتی یەکەم باشتر دەربکەوێ.

دڵ بەتالان چووی سوپای کاکۆڵی تێك ئاڵاوی تۆم ... A
وەرن وەرن نیمە چارە ........... B
دڵ عاشیقەو بێ قەرارە ......... B
یار دەڵێن لێمان بێزارە ........... B
گەر دەپرسی  بادو گریان و فیغانم بۆ  چییە ..... Y
ڕاستە باوك مردەنیم ئەمما جگەر سووتاوی تۆم ... A
وەرن وەرن بمکەن چارە ........... B
دڵ عاشیقەو بێ قەرارە ............ B
دەرمانم نییە لەم شارە ............ B[٤٧ : ٢١٣]

قالبی ئەم هۆنراوەیە بەم جۆرەیە:

X A BBB , Y A BBB, Z A BBB, ......

١١- وا دەبێ پێنج خشتەکییەك، هەر پێنجینەیەکی لەسەر دوو سەروا دامەزرابێ. لەتی (١، ٢، ٥) یەك سەروایان هەبێ‌و لەتی (٢، ٤) یەك سەروایان هەبێ. هیچ پەیوەندییەك لەنێوان سەروای پێنجینەکاندا نەبێ. وەکو هۆنراوەی (ئادەمیزاد)ی شێخ نووری شێخ سالح کە (٣) پێنجینەو شەشینەیەکە، لەپێنجینەی یەکەمدا دەڵێ:

لەناو شەپۆلی خەما، سەر نگوون و بێ ئارام ...... A
بەکێوی سەختی ژیانا بەبێ‌و چنگەڕنێ ........... B
خەریکی هەڵمەتی سەرکەوتنە. بگاتە مەرام....... A
لەپڕنشێوی کڵۆڵی بواری لێ ئەتەنێ ................. B
بەداوی جەورو خەفەت، تارو پۆی لە ئێش و زام .... A[٢١٢ : ٢٢٩]

قالبی ئەم جۆرە پێنجینەیە بەم شێوەیە دەڕوا:

A B A B A, C D C D C, E F E F E, ......

١٢- وا دەبێ لەپێنج خشتەکیدا، هەموو پێنجینەکان لەتی پێنجەمیان هاوسەروا بێ، بەڵام لەتاکە تاکی پێنجینەکان ئەم پێنجەمین لەتە هیچ پەیوەندی سەروایی نەبێ‌و بەئازادی بمێنێتەوە، چوار لەتەکەی بەراییش بەقالبە سەروای چوارینی بڕاکی (ABBA) بەیەکەوە بیەسرێنەوە. شێخ نووری، لە(ئیستیقبال بۆ تازە پێگەیشتووەکان)، (٧) پێنجینەی هێناوە هەر هەموویان بەم قالبە دارژاون. پارچەی یەکەمی موسەڕڕەعە بەوەی کە سەروای لەتی پێنجەمی وەکو سەروای لەتی (١-٤) هێناوە، لەپارچەی دووەمدا دەڵێ:

ئەی فەجری بێ غوبارو کەدەر، عاڵەمی ئەمەل ...... A

چاوی لەتۆیە، تۆ کە ئومێدی هەموو کەسی .......... B
ئەلحەق عیلاجی دەردی دەوایێکی نەورەسی .......... B
هێندە چاوەڕێ بوو چاوی هەتا پێ گەیی سوبەل ..... A
فەرموو دەرەنگە، وەختی تلووعێکە بێ حیجاب ....... C [٢١٢ : ١٦٣]

قالبی سەروای ئەم پێنج خشتەکییە بەم جۆرەیە:

ABBA C, DEED C, FGGF C, ......

١٢. وا دەبێ پارچەکانی پێنج خشتەکی، بەپێی دەستوورێکی تایبەتی لەسەر دوو سەروا دامەزرا بن، بەلام هیچ پەیوەندی سەروایی لەنێوان پێنجینەکاندا نەبێ. هەر پێنجینەیەک لەتی (١، ٢، ٥)ی هاوسەروابن و لەتی (٣، ٤)ی هاوسەروابن، وەکو هۆنراوەی (ئەگەر گەرەکتە)ی دڵزار کە سێ پارچەیەو هەموویان بەو دەستوورەی سەرەوە سەروایان دامەزراوە، ئەوەندە هەیە لەهەموو پارچەکاندا لەتی (٢-٤) کورتن و لەئەکانی تر (١، ٣، ٥) درێژن، بەمەوەش لەموستەزاد نزیک دەبێتەوە ئەگەرچی موستەزادیش نییە چونکە پارچەکان بەلەتی درێژ کۆتاییان هاتووە لەپێنجینەی بەراییدا دەڵێ:

ئەگەر گەرەکتە شادو تێروتەژی .............. A
تۆبژی ........................................
a ..............................................
ڕێگەی نەفرراستی رەها بوونی گەل ........ B
ڕێی عەمەل .................................
b ..............................................
بگرە هەتا دەرچی لەچنگخوێنمژی ..... A [٨٧، ل٦٥]

قالبە سەروای ئەم جۆرە پێنجینەیە ئاوهایە:

A a B b A, C c D d C, E e F f E, ....

<u>پوختەی سەروای پێنجینە:</u>

هونەری یان پارچەی پێنجینە لەزمانە ئەوروپیەکان لەبارەی سەرواوە لەپێنجینەی ڕۆژهەلات بەگشتی و کوردی بەتایبەتی جیایە. جیاییەکە لەم خالانەدا دەردەکەوی: یەکەم هەموو پێنجینەی زمانە ئەوروپیەکان (ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەسپانی) لەسەر دوو سەروا دادەمەزرێ کە بەشێوەی جۆراوجۆر دووبارە دەبنەوە، واتە لەو پێنج لەتە، دوویان یەک سەرواو سێیان سەروایەکی تریان دەبێ، بەلام نابەشبوونی ئەو دوو سەروایە لەناو لەتەکان لەپێنجینەیەکەوە بۆ پێنجینەیەکی تر دەگۆرێ. کەچی لە پێنجینەی کوردیدا، دەشێ پێنجینە لەسەر یەک یان دوو یان سێ سەروا بێ. دووەم: لەزمانە ئەوروپیەکان پێنجینەکانی ناو یەک هۆنراوە بەسەروای هیچ لەتێکی پارچەکان بەیەکەوە نابەسترێنەوە چونکە ئەو هەناسە درێژەیان نییە لەسەروا هێنانەوە، کەچی لەپێنج خشتەکی کوردیدا ئەمە هەر زۆر باوە کە پێنج خشتەکی هەیە بگاتە هەرچەند پارچە، هەموو

پارچەکان بەسەرواى یەکێ لەلەتەکانەوە پێکەوە دەبەسرێنەوە. لەزمانە ئەورووپییەکاندا، ئەوەی گران و ناپەسەند بێ لەدابەشبوونی دوو سەرواکەی پێنجینە ئەوەیە: یەکەم سەرواکان هەموویان بەدوای یەکدانەیەن وەکو (AAABB) یان (AABBB)، دووەم کۆتایی پێنجینە مەسنەوی بێ پەسند نییە، وەکو (ABABB) یان (ABBAA)، لەمانە بترازێ هەموو جۆرە دابەشکردنەکانی تر پەسەندن ئەگەرچی لەئینگلیزی (AABAB)و لەفەرەنسی (AABBA)و لەئەسپانی (AABAB) لەهەموویان باوترن. بەش بەحاڵی کوردیش، باووترین قاڵبە سەروای پێنجینە پێنج خشتەکی و پێنجینەیە کە سەروای لەتی پێنجەم لەسەرەتا تاکۆتایی هۆنراوەکە لەهەموو پارچەکان دووبارە دەبێتەوە. لەم دوانەش پێنجینە باوو بڵاوترە لەپێنج خشتەکی. باوترین قاڵبە سەروای پێنجینە ئەمانەن:

1- AAAAA , AAAAA , AAAAA , .....
2- AAAAA , BBBBB , CCCCC , ......
3- AAAAA , BBBBA , CCCCA , ......
4- AAABA , CCCDC , EEEFE , .....
5- XABBA ,
6- AAXBB ,
7- AABBB , CCDDD , EEFFF, ....
8- AAABB , CCCBB , DDDBB , .....
9- AAABB , CCCDD , EEEFF , ......
10- XABBB , YABBB , ZABBB , .....
11- ABABA . CDCDC . EFEFE , .....
12- ABBAC , DEEDC , FGGFC , .....
13- AaAbA , CcDdC , EeFfE , ......

پێنجەم : شەشینە

شەشینە (sextain) پارچەیەکی شەش لەتییە، چ سەربەخۆ مانایەکی تەواو بدات چ پارچەیەك بێ لەهۆنراوەیەکی پارچەدار کە بەزۆر کێش و سیستەمی سەروای جیاواز دروست دەبێ. شەشینە لەهەرزمانێکدا بەجۆرێ گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لەبنچینەدا ئیتالییە، لە (٦) لەتی (١١) برگەیی پێك دێ و پێی دەگوترێ sextina (یەکەم جار ترۆبادۆری پرۆڤنسالی [ئارنۆ دانێیل] ئەم شەشینە ئاڵۆزەی داهێناوە. لەکۆتایی سەدەی (١٢). دانتی سوودی لێ وەرگرتووەو شکڵی تایبەتی داوەتێ بەڵام لەسەر دەستی پترارك بوو بەپارچەیەکی هەرە باوی لیریکای ئیتالی)[٤٨٦ : ١٢٩].

ئاڵۆزیو قورسی ئەم جۆرە شەشینەیە لەوە دایە کە لەشەش پارچە پێك دێ، هەر پارچەی شەش لەتەو هۆنراوەکە بەکۆتاییەکی ٣ لەتی دوایی دێت. سەروای ئەم جۆرە شەشینەیە لەدووبارە بوونەوەی وشەکانی کۆتایی دایە. کە بەم جۆرە جێگایان دەگۆڕێ:

/ECBFAD /CFDABE /FAEBDC /ABCDEF/ AB-DE-CF/ BDFDCA) (DEACFB)[٢١٦ : ٧١]. ئەم جۆرە شەشینەیە لەسەر دەستی سێرفلیپ سدنی لەشیعری (ئەرکادیا) کەوتۆتە ناو شیعری ئینگلیزی، لەو بەو لاوە وردە وردە بەکار هاتووە، نموونەی هەرە باوی

ئەم جۆرە لەشیعری ئینگلیزیدا (سکالای لیزا)ی (سوینبێرن)ە. کیپلینگ و پاوەندو ئیلیۆت و ئۆدنیش بەکاریان هێناوە [٥٠٣ : ٦٢٠]. لەفەرەنسیدا کە پێی دەگوترێ (sixain) نموونەی هەرە باوی بەم جۆرەیە (AABCCB) [٤٨٢ : ٢١]. لەفەرەنسیدا بەزۆری شەشینە بە دوو یان سێ سەروا دەبێ. ئەگەر چوار لەتی بەیەك سەروا بێ جوان نییەو شاعیران خۆیانی لێ لادەدەن. لەئینگلیزیدا، یەکێ لە شەشینە باوو پەسندەکان ئەوەیە کە پێی دەگوترێ (کلکە سەروا tail - rhyme) کە لەدوو بەش پێك دێ. بەشی یەکەم سێ لەتی درێژولەتێکی کورتە (کلکە)، بەشی دووەمیش لەتێکی درێژولەتێکی کورتە، لەتە کورتەکان (کلکەکانی) سەروایان یەکەو لەتە درێژەکانیش سەروایان یەکە (AAA bAb). [لەبەر ئەوەی (بێرنز) زۆری ئەم قالبە بەکار هێناوە، بەزۆری پێی دەگوترێ شەشینەی (بێرنز)ی] [٤٦٧ : ١٦]. شەشینە لەسەدەی (١٤) چۆتە ناو ئەدەبی ئەسپانی و جۆری جیاوازی لێ دەرکەوتوە وەکو (AAB AA B/ABC ABC/ABA BA CCB/B AAB) [٤٨٦ : ١٠٣ - ١٠٤]. لەئەدەبی تورکیدا، لەکۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم لەئەنجامی کاریگەری ئەوروپییەوە پەیدا بوە. بەزۆری لەبەشی دووەمی سۆنێتای پێزارکی کە شەشینەیەو بەشێوەی جیا جیا هاتوە، وەکو بەرهەمەکانی جەناب و تۆفیق فیکرەت و حسێن دانش و سیرت... بۆ نموونە محەمەد ڕوشیدی لەسۆنێتەی (تسلیت خیال) شەشینەکەی بەم جۆرە (ABB ACC) [٤٥٠ : ٥٤] هێناوەو تۆفیق فیکرەت لەسۆنێتەی (فنار)دا، شەشینەکەی بەم جۆرە هێناوە (ABA, CBC) [٤٢٨ : ١٣٥] و ج. سامی لەسۆنێتەی (امتحان قور قوس) سەروای شەشینەکەی بەم جۆرە داڕشتوە (ABBAB B) [٤٤٤ : ٣٠٧]. لەفارسیدا شەشینە لەژێر ناوی (موسەممەت) و (تەسمیت) باس کراوە. قەیسی رازی بەم جۆرە قالبە سەروای شەشینە ڕوون دەکاتەوە: (ئەوەیە هۆنراوەکە دابەشی پارچەی شەش لەتی بکرێ، لەهەر پارچەیەکدا پێنج لەتی پێشەوە یەك سەروایان هەبێ و لەتی شەشەم سەروای جیا بێ) [٤٠٢ : ٣٣٥]، بەم پێیە قالبە سەرواکەی شەشینە بەم جۆرە دەبێ (AAAAA B)، زەینولعابدین لەباسی شەشینەدا وەکو جۆرێکی موسەممەت دەڵێ: (لەم ماوەی دواییەدا، لەبەشەکانی شیعر بایەخی زۆر بە موسەممەت دراوەو شاعیران جۆری جیا جیای ئەم ژانرەیان تاقی کردۆتەوە. پەیوەندی موسەممەتی ئەم دواییەو موسەممەتی کلاسیکی لەدووبارە بوونەوەی لەتێکە بەشێوەی تەرجیع لەکۆتایی هەموو پارچەکاندا، بەزۆریش سەروای لەتی پێش کۆتایی وەکو سەروای کۆتایی دەبێ. بەپێی ڕای مامۆستایانی پێشوو ژمارەی لەتەکانی هەر بەندێکی موسەممەت لەنێوان چوار و شەش دایە) [٢٩٦ : ١١٤] و ئینجا نموونەیەکی لەشەش خشتەکی (بهار) نووسیوە کە قالبە سەرواکەی بەم جۆرەیە: (AAAABB , CCCCBB .....). لەکوردیدا، عەلائەدین سجادی لە(ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لەئەدەبی کوردی)دا باسی (داچنراو - موسەممەت - مسمط) دەکات وچوار بۆ چوونی جیاجیا دەخاتە ڕوو لەدوەمیان دا دەڵێ: (بەلای کوردەوە هۆنراوەی داچنراو ئەوەیە کە شەش بڕ بێ. دوو نیوە هۆنراوەی دوایی خاوەنی سەروایەك بێ کە جیا بێ لەسەروای چوار

نیوەکەی پێشووی ) [١٣٧ : ١٧٥] و نموونەیەکی بەختیار زێوەری داوە. دڵشاد عەلی لە(بنیاتی هەڵبەست لەهۆنراوەی کوردیدا ) کە دێتە سەر باسی موسەممەت، قسە لە( موسەممەتی شەشی )ش دەکات. بۆ چوونەکەی سجادی وەردەگرێو نموونەیەکی شێخ نووری شێخ سالح دێنێتەوە کە لەسەر هەمان ئەو قالبە سەروایەیە کە سجادی باسی کردوە بەلام لەتی کۆتایی لە هەموو پارچەکانی هەمان شتەو دووبارە بۆتەوە (تەرجیعە) [٤٩٢ : ١١٦]. ئەو قالبە سەروایەی کە باسیان کردوە بەم جۆرەیە (AAAABB). لەڕاستیدا شەشینە لەکوردیدا، هونەرێکی شیعری نوێیە، لەم سەدەیەداو لەژێر کاریگەری شیعری تورکیو فارسیو لەڕەوتی تازەکردنەوەی شکلی شیعری کوردیو بەرەسەندنی سروودو گۆرانی سەری هەڵداوەو زۆر قاڵبی جۆراو جۆری هەیە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- باوترین قالبی سەروای شەشینە لەکوردیدا، ئەوەیە کە چوار لەتی پێشەوەی لەسەر یەك سەرواو دوولەتی دواوەی لەسەر سەروایەکی تر بڕوا، ئەمە چەند لقێکی لێ دەبێتەوە:

أ- وا دەبێ هەر شەشینەیەك سەربەخۆبێو پەیوەندی سەروایی بەشەشینەکانی تری هۆنراوەکەوە نەبێ، وەکو سەلام دەڵێ:

دنیا هەموو      چاووڕاوە      فڕو فێڵ و بەند و باوە
ڕاستە ڕاستی   هەڵگێراوە      درۆ خۆشە بەڵێشاوە
من   لە   درۆ گوێ ناگرم
ڕاستیم ئەوێ هەتا ئەمرم [١٠٩ : ٣٦].

لێرەدا دوو سەرواکە (-اوە )و (-رم )ن، لەشەشینەی دوەمدا دوو سەرواکە دەبن بە(-ەم )و (یرە). لەسێیەمدا دەبن بە(-ارە )و (-ردن ).. بەم جۆرە هیچ سەروایەك نییە هەموو شەشینەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە. قالبی ئەم سیستەمە سەروایە بەم شێوەیە خۆی دەنوێنێ: AAAABB, CCCCDD , EEEEFF.

ب- وا دەبێ سەروای دوولەتی دوایی (تەنیا سەروا ) لەهەموو شەشینەکان دووبارە بێتەوە و بەیەکەوە بیانبەستێتەوە، وەکو ئەم شەشینەی (لەسەر لووتکەی پیرە مەگروون )ی بەختیار زێوەر، کە لە پارچەی یەکەمدا دەڵێ:

لەسەر لوتکەی بڵندی پیرەمەگروون      کە لای من بۆتە شاخی زیوو ئاڵتوون
شەوێك دیم دوویەری پرسۆزو مەحزوون      ئەیان وت تێ بگە ئەی چەرخی گەردوون
ئەگەر چی ڕۆژ هەلاتین و کەساسین
لە ڕۆژ ئاوایی جوانتر دوور شوناسین [٣٢ : ١٩٠].

لەم هۆنراوەیەدا کە (٩) شەشینەیە، لە هەموو شەشینەکاندا سەروای لەتی (٦،٥) یەکە(-اسین )و سەروای چوار لەتەکەی پێشەوە لەپارچەیەکەوە بۆ پارچەیەکی تر دەگۆڕێ، قالبە سەروای

ئەم جۆرەیان بەم شێوەیەیە:

AAAA BB , CCCC BB , DDDD BB ..........

ج- وا دەبێ هۆنراوەکە هەموو شەشینەکانی بەهەمان سەروای ژمارە (١-ب) دارِژابێ بەڵام دوو لەتەکەی کۆتایی هەموو شەشینەکان یەك شت بێ، وەکو خۆی دووبارە بووبێتەوە، واتە تەرجیع بێ، ئەم قالبەیان زیاتر بەموسەممەتی تەرجیعی شەشی ناسراوە، وەکو هۆنراوە بەناو بانگەکەی بێکەس (سەدەی بیستەمە) کە (٨) پارچەیەو لەهەر پارچەیەکدا چوار لەتی پێشەوە هاوسەروان و دوولەتی کۆتایی بەدەقە خۆیان دووبارە بوونەتەوە، ئەمەیش پارچەی سەرەتای هۆنراوەکە:

سەدەی بیستەمە کوردە غیرەتێ لە خەو راپەرە هەوڵێ هیمەتێ
بەسییە نەزانی ، عیلم و سەنعەتێ سووکی هەتا کەی؟ ناوێ، حورمەتێ
هۆش و بیرت بێ، پیاوی ژیرت بێ
لەجێی سەربەستی بۆچ زنجیرت بێ [٣٨ : ١٧].

قالبی سەروای ئەم جۆرەیان وەکو ئەوەی پێشەوەی خۆی وایە، جیاوازییەکە تەنیا لەخودی دوو لەتی کۆتایی پارچەکاندایە، لە هەموویاندا هەمان شتەو دووبارە دەبێتەوە.

٢- وا دەبێ لەسەراپای هۆنراوەیەکدا، شەشینەکان هەریەکە هەموو لەتەکانی هاوسەروا بێ و پەیوەندی سەروایەندی لەنێوان پارچەکاندا نەبێ. بۆ نموونە پیرەمێرد لەهۆنراوەی (گۆرانی نەسرین)، (٦) پارچەی شەشینەی هێناوە، هەر پارچەیەك لەرووی سەرواوە سەربەخۆیەو لەسەر یەك تاکە سەروا بنیات نراوە، لە پارچەی یەکەمدا دەڵێ:

نەسرین گوڵی نەسرینە چووزەرەی یاسەمینە
خنجیلە و خوێن شیرینە دەمی بە پێکەنینە
کەیفی لە هەڵپەرینە شنە شنی ببینە [٤٤ : ٢٥٦].

هەر شەش پارچە بەرێز سەروایان ئەمانەن: (-ینە، -ارە، -ینە، -یزە، -انە، -رد). ئەم جۆرە شەشینەیە لەفارسیدا زۆر کەمە، زەینولعابیدین دەڵێ: (مەنوچەهری یەك موسەممەتی (٦) لەتی هەیە کە لەتەکانی هەر پارچەیەك هاوسەروان و پارچەکان پەیوەندی سەروایان لەنێودا نیە، تەنیا پەیوەندی ماناو کێش لەنێو پارچەکاندا هەیە) [٣٩٦ : ٢٠]. قالبەکە بەم جۆرەیە:

AAAAAA , BBBBBB , CCCCCC

٣- وا دەبێ هۆنراوەیەك لەچەند شەشینەیەك دروست ببێ، شەشینەی یەکەم (موسەررەع) بێ و ئەوانەی تر هەموویان پێنج لەتی پێشەوەیان هاوسەروابێ و لەتی شەشەمیان جیا بێ، بەڵام هەموو لەتە شەشەمەکانی پارچەکان هاوسەروابن، واتە پارچەکانی هۆنراوەکە بەلەتی سەروای شەشەم بەیەکەوە بەسرابن، وەکو قەسیدەی (دڵی من)ی شێخ نووری کە (لەسەر شێوەی

قەسیدەیەکی مامۆستا بێخود )ەو لەشەشینەی دوەمدا دەڵێ :

هەرچەندە بەدوویا ئەگەڕێم شارو وڵاتان .................. A

دەشت و کەژو سەحراو و چیا ، چۆل و بیابان ........... A

نایدۆزمەوە ، بێ سەرو شوێن ڕۆییوە دیسان .............. A

شێتانە ئەبێ ڕوویی لە چ لاکرد بێ یاران ................ A

وەك بلبلەکەی وێلی گولستان بەبەهاران ................ A

ئاخۆ لە چ گوڵزارێ ، غەزەلخوانە دڵی من ................ B

هۆنراوەکە پازدە پارچەیەو هەر هەموویان سەروای لەتی کۆتاییان (انە )و پاش سەروایان ( دڵی من )ە. وا دەبێ ئەم جۆرەیان لەباتی شەشینە (شەش خشتەکی ) بێ، واتە شاعیرێك غەزەلی شاعیرێکی تر وەربگرێ و هەر دێرێکی ( دوولەت ) دوو دێری (چوارلەت ) بەهەمان کێش و بەسەروای لەتی یەکەمی شیعرە ئەسڵەکە بۆزیاد بکا. واتە هەرپارچەیەکی شەش لەتە، چوار لەتی پێشەوە هی شاعیری دوەمە و دوولەتی دواوەی هی شاعیری یەکەمە. ئەمە لە کوردیدا زۆر کەمە، بەڵام لانی کەم نموونەیەکی هەیە : شەش خشتەکی (تسدیس ) شێخ ڕەمەزان بوتی لەسەر غەزەلی مەلای جزیری وەك لە دیوانی جزیری چاپی سادق بەهائەدینا هاتوە. پارچەی یەکەمی موسەڕەعە، هەر شەش لەتی لەسەر یەك سەروا دەڕوا کە سەروای غەزەلەکەی جزیریە (ـەرێ)، لە پارچەکانی تر پێنج لەتی پێشەوە هاوسەروان ولەتی شەشەمی هەموو پارچەکان (ـەرێ)یە. لە پارچەی دوەمدا دەڵێ :

برو ئەی بادی سەبا دەغدەغە بەردل تو مەدار.......... A

گەر نزانی وەتەنێ شۆخێ قەدا لالە عوزار................ A

تو بتێرکی دەرە ئەنوار ئەوە ئەیوانی نیگار............. A

دا نەبێژی تە چ تشتێ قەوی شوبهەت قەدی یار........ A

[تێرگژا نازك و تەڕ، نەیشەکە رامەست و خومار ........ A

دێم دوڕو لەعلی لەب و موحتەشەم و موعتەبەرێ] ..... B[٢٥٨ : ٥٢٩]

سیستەمی دایەشبوونی ئەم قالبە سەروایە بەم جۆرەیە :

AAAAAA, BBBBBA , CCCCCA , ........

٤- وا دەبێ شەشینەکانی هۆنراوەکە لەتەکانیان دوو دوو لەشێوەی مەسنەویدا هاوسەروابن و سەروای دوولەتی کۆتایی هەموو پارچەکانیش وەکو یەك وا بێ، بەو سەروایەی مەسنەوی کۆتایی پارچەکان پێکەوە گرێ بدرێن، بەختیار زێوەر هۆنراوەی (پێشکەشی نیشتمان )ی کردوە بە(٨) پارچە، لەهەموویاندا ئەو یاسایە پەیڕەو کراوە ، لەپارچەی یەکەمدا دەڵێ :

فیدات بم خاکی کوردستان    نموونەی جەننەتی عەدنان

لەسەرتا خوار
گوڵ و گوڵزار
دڵی غەمبار ئەکا دەرمان     فیدات بم خاکی کوردستان [٣٢ : ١٤٧].

لێرەدا سەروای سێ مەسنەوییەکە بەم جۆرەن: (-ان، -ار، -ان)، لەپارچەی دووەمدا دەبن بە(-انت، -انە، -ان)و لەسێیەمدا دەگۆڕێن بۆ (-ین، -وش، -ان)... قالبی ئەم سستەمە سەروایە بەم جۆرە دارژاوە :

AAbbCC , DDeeCC , FFggCC , ..........

٥- وا دەبێ هۆنراوەیەك شەشینەکانی هەریەکە لەسەر چوار سەروا دارژابێ، لەهەر پارچەیەکدا چوار لەتی پێشەوە دوو مەسنەوی بن و دوو لەتی کۆتایی یەکەو سەروای سەربەخۆیان هەبێ و نە هیچ پەیوەندییان بەیەکترەوە هەبێ و نە بە سەروای مەسنەوییەکانی پێشەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە، لەتی پێنجەمی هەموو لەتەکان یەك سەروایان هەبێ و لەتی شەشەمیشیان سەروایەکی تر، واتە پارچەکان لەدوو تەوەرەوە ، بەدوو سەروای جیاواز بەیەکەوە بەسرابنەوە، ئەمە پەیوەندی سەروا بەندی نێوان پارچەکان تۆکمەو پتەوتر دەکات . هەردی لە(پەیامی یار)دا ئەم وەستاکارییەی کردوە، ئەمەش پارچەی یەکەم و دووەم:

لەیارەوە ..............................................
a ..............................................
لەشۆخ و شەنگی پارەوە ...................
A ...................
لەڕازی پڕ نیهانیا .........................
B .........................
لەتەك شنەی بەیانیا .......................
B .......................
پەیام لەیاری جوانەوە ......................
C ......................
گەیشتە لام ...................................
d ...................................

* * *

بەرامەکەی ..................................
e ..................................
گوڵاوی باخی نامەکەی ....................
E ....................
کە ئاوی زیندەگانییە ......................
F ......................
شەرابی کامەرانییە .........................
F .........................
گوڵی هیوای ژیانەوە .......................
C .......................
گوڵی هیوام ..................................
d .................................. [٥ : ٨٥].

هەموو پارچەکان یەکەم لەت و دوا لەتیان کورتە، ئەم دیاردەیە زیاتر سەربەخۆیی و یەکگرتنی پارچەکان دەستەبەر دەکا، کە بەرامبەر دوو ڕەگەزی سەروابەندی نێوان پارچەکان دەوەستێ. پارچەکان بەسەروای لەتی پێنجەم (-انەوە)و سەروای لەتی شەشەم (-ام) پێکەوە بەسراون.

ئەم سەروا بەندییە بەم شێوەیە دانراوە: aA BB C d . cE FF Cd . gG HH Cd,....

٦-وا دەبێ هۆنراوەیەك شەشینەكانی سەربەخۆبن و هەر پارچەیەك لەنەكانی بەنۆرە بەسەر دوو سەروا دابەش بووبن (سەروای موتەناویب)، كە ئەگەر دوو لەت دوولەت بەرامبەر یەك بنووسرێن بەشێوەیەكی ئەندازەیی جوان دەكەوێتە بەرچاو، هەر دەڵێی لەتە تاكەكان (٥،٣،١) لەژێر یەك بەیەك سەروا دێنە خوارێ و لەتە جووتەكانیش (٦،٤،٢) لەژێر یەك بەسەروای دوەم ڕێز دەبن (وتووێژی مەلا و میرعیمادەدینی جزیری) كە (٣٨) پارچەیە هەمووی بەم قالبە سەروایە نووسراوە، لەپارچەی یەكەمدا مەلا دەست پێ دەكاو دەڵێ:

سەلامامن سەناخوانی سەحەرگە گەوهەر ئەفشان بت
بسوورەت ئەمری سویحانی سەر ئەلقاب و زەر ئەفشان بت
بخدمەت عەرزی سولتانی عەبیرو عەنبەر ئەفشان بت[٥٨ : ٥٦٢]

سەروای (ـان)و(ەر-) لەگەڵ پاش سەروای (ئەفشان بت) بەنۆرە دووبارە دەبنەوە. (وە لام و ورامی فەقێ تەیران و جزیری) [٥٨ : ٥٧٤] كە (٥٠) پارچەیەو (خبتابا مەلا مەنسووری مەلایێ بتەیی) [٤٠، ل٢٢٠] كە (١٨) پارچەیەو (تلكره العوام یان بەیتی ئەووەل و ئاخر)ی مەلا محەمەدی سیرچی [١٩٤] كە (١٢٧) پارچەیەو دوو هۆنراوەی درێژی ئەحمەدێ نالبەند (من حەبفا موسلمانا) [١١ : ٥٦]و (بیك و خەسی) [١١ : ١٢٠] هەموویان بەم قالبە سەروایە هاتوون. ئەمەیش سستەمی دوبارەبوونەوەی سەروای ئەم قالبە:

ABABAB , CDCDCD , EFEFEF , .......

٧-وا دەبێ لەهۆنراوەیەكدا پارچە شەشینەكان بەشێوەی چوارینەیەكی پترارکی و مەسنەویەك سەروایان وەرگرتبێ، واتە هەر شەشینەیەكی لەسەر سێ سەروا بڕواو پەیوەندی سەروابەندی لەنێوان پارچەكاندا نەبێ، گۆران لەهۆنراوەی (مەدەنیەت) كە چوار پارچەیە، ئەم قالبەی بەكارهێناوە، لەپارچەی یەكەمدا دەڵێ:

مەدەنییەت : گوڵی بەهاری حەیات ........................ A
مەدەنییەت : هەوایی نەشئونوما ........................ B
مەدەنییەت وەسیلەیی ئیحیا ........................ B
بۆ هەموو میللەت و عومومی ولات ........................ A
مەدەنییەت ، ئەلكتریك ، قەمەر ........................ C
ئەی زیا بەخشی حاڵی نەوعی بەشەر ........................ C [٧١ : ١٧٣]

سیستەمی دابەشبوونی سەروای ئەم قالبە ، بەم جۆرەیە :

ABBACC , DEEDFF , GHHGII .

٨-وا دەبێ پارچەكانی هۆنراوەیەك دیسان وەكو چوارینەیەك و مەسنەوییەك خۆی بنوێنێ

بەڵام چوارینەکە چوارینەی موتەناویب (شەکسپیری) بێ، نەك پترارکی واتە هەر پارچەی بەسێ سەروا نووسرابێتەوە، بەڵام سەرجەمی پارچەکان هیچ سەروای هاوبەشیان نەبێ، هەریەکە سەربەخۆ بێ، وەکو شیعری (ئەفەککور)ی (ڕەجایی زادە ئەکرەم بەگ) کە شێخ نووری لەتورکییەوە کردوویە بەکوردی و لەپارچەی دووەمدا دەڵێ:

دەمێ کە شامی غەریبانە ڕوو پەڕەی ئافاق ........................ A
ئەسیری زولمەت و مەنزووری چەشمی ریققەت ئەکا ............ B
دەمێ کە بادی سەبا غونچەی گوڵ و ئەوراق ....................... A
بە ئاهی حوزنەوە مەئلووفی دەردی حەسرەت ئەکا ............ B
فەلەك کە نەجمی درەخشانی پڕنەو ئەفشانە ....................... C
تەفەککورا تم ئەوێ موتەسەللی خرۆشانە ........................... C [٧٢ : ٢١٢].
سیستەمی سەروای ئەم قالبە شەشینەیە بەم جۆرەیە:

ABABCC , DEDEFF, GHGHII .....

٩- وا دەبێ لەهۆنراوەکە هەر پارچەیەکی مەسنەوییەك و چوارینەیەکی تەواو (هاوسەروا) بێ، واتە لەنێ یەکەم و دووەم هاوسەروابن و چوار لەتەکەی دوایش هاوسەروابن و سەروایان لەمەسنەوییەکە جیابێ. بەمەوە هەر شەشینەیەك دوو سەروای جیاوازی دەبێ، بەڵام پارچەکان هیچ لەتیان هاوسەروا نابێ. هەر شەشینەیەك پارچەیەکی سەربەخۆیە لەڕووی سەرواوە. بەختیار زێوەر، هۆنراوەی (لەکوێی ئەی شادمانی) کردوە بە(٥) پارچەو هەر پارچەیەکی بەم شێوە سەروایە داڕشتوە ،لەپارچەی یەکەمدا دەڵێ:

لەکوێی ئەی شادمانی ، ئەی هیوای بەرزی ژیانی دڵ ! ....... A
لەکوێی ئەی ئاقە ئەستێرەی بەیانی کامەرانی دڵ ! ........... A
لەباخێکا هەتا چاو بڕ ئەکا گوڵ چەتری هەڵدابێ ............... B
لەناوەندی گوڵا چەند دولبەری عیشوە وەستا بێ ................. B
بەبەزم و ڕەزمەوە زۆر کەس لەوێدا مەست و شەیدا بێ ........ B
کە ئەڕوانم دڵم هەر پەستە نەشئەی تیا پەیدا نابێ ............. B [٣٢ : ١٦٠].
قالبە سەرواکەی ئەم جۆرە شەشینەیە ئاوهایە:

AABBBB , CCDDDD , EEFFFF .

١٠- وا دەبێ پارچەی شەشینە وەکو خۆلێکدان و تێك هەڵکشانی دوو سێینە وا بێ، ئەمە زیاتر لەشەشینەی sestet سۆنێتەی پترارکیدا دەردەکەوێ و لەشیعری ئەورووپییەوە، بەڕێگای شیعری تورکییەوە هاتۆتە ناو ئەدەبی کوردی بەتایبەتی گۆران لەژێر کاریگەری سۆنێتە نووسەکانی تورکی وەکو جەناب شەهابەدین و تۆفیق فیکرەت و سیرەت و ج سامی و حسێن دانش و. وەری گرتووە

لەهەندێ شیعردا بەکاری هێناوە. ئەمەش چەند جۆرێك لەو شەشینە پتراركییانە:

أ- وا دەبێ دوو سێینەکە بەسەروای لەتی ناوەڕاستەوە بەیەکەوە بەسرا بنەوە، واتە لەتی (٣،١) هاوسەراوبن و لەتی (٦،٤) هاوسەروابن و ئینجا لەتی (٥،٢)یش هاوسەروابن. گۆران لەهۆنراوەی (شەونکی بەهار)دا کە چوار لەتی یەکەمی وەکو سۆنیتەی پتراركی هاتوە،و دوا پارچەی شەشینەکە بەم قالبە سەروایەی باس کرا نووسراوە، دەڵێ:

ئەستێرەیەکی جوانی گەشی پرلەتەبەسسوم ...... A
دەرکەوت و گەیشت لێوە بەدڵ زەوقی تەماشا ..... B
بەحری هەوەس و شەوقم وەها هاتە تەلاتوم ......... A
بۆ سەیری جەمال کردنی دنیایی بەیانی ............ C
هێشتا شەوی زۆر مابوو کە من کەوتمە سەحرا ..... ..B
وەك شێت .. بەلام شێتی شیعر، شێتی جوانی ....... C [١٧٢ : ١٧٣].

ئەم شەشینەیە لەسەر سێ سەروای جیاواز هاتوە. هیچ جارێك دوویان بەشێوەی مەسنەوی نەکەوتوونەتە دوای یەك. ئەم جۆرە سەروایە لەشەشینەی سۆنیتەی (فەنار)ی تۆفیق فیکرەت و (دهان یار)ی جەناب شەهابەدین هەیە. قالبە سەرواکەی بەم جۆرەیە : ABACBC

ب- وا دەبێ دابەشبوونی سەروای شەش لەتەکە بەجۆری بێ کە ئەو لەتانەی هاوسەروان بەناویەکدا چووبن، لەم قالبەدا لەتی (٦،١)و لەتی (٥،٢)و لەتی (٤،٣) دوو دوو هاوسەروان، دوو لەتی ناوەڕاست وەکو مەسنەوی دەکەونە بەرچاو، چوار لەتی ناوەوە وەکو چوارینەی پتراركی (مونەعانیق) دەردەکەون و هەموو شەشینەکەیش وەکو سێ حەلقەی بەناو یەکچوودا خۆی دەنوێنێ. ئەم جۆرە دابەشبوونی سەروایە لەبنچینەدا لەشیعری تروو بادوری پرۆڤنسالییەوە هەستاوە. نموونەی ئەم قالبە سەروایە وەکو ئەم شەشینەیەی گۆران:

جار جار لەئوفق رائەوەشا شیری برووسکە ............. A
گرمەی غەزەبی گوێی کەڕ ئەکرد هەورە تریشقە ........ B
باران سەرەتای ریققەتی بوو: نم نم ئەگریا ............... C
وەستا بوو زەوی تینوو، زەلیلانە، لەبەریا! ................. C
ئەمجا بەخوڕەم باری، لەپاش یەك دوو دەقیقە ......... B
ئافاقی ئەمەل ڕەش بوو، ئەما پێوە ترووسکە .............. A

سیستەمی سەروای ئەم قالبە بەم جۆرەیە:A B C C B A

جـ- وا دەبێ شەشینەکە لەسەر سێ سەروا دابەزرێ و لەهیچ شوێنێکدا دوو لەتی هاوسەروا بەدوای یەکدا نەبەن، لەتی (٤،١)و (٦،٢)و (٥،٣) دوو دوو هاوسەروابن. گۆران پارچەیەکی هۆنراوەی (جیلوەی شانۆ)ی بەم قالبە داڕشتوە (هەموو لەتەکان لەدرێژیدا وەکو یەك نین، وەکو

موستەزادێکی هەڵگەڕاوە وایە؛ لەموستەزادا لەتە درێژەکان لەپێشەوەن و لەتە کورتەکانیان بەدوادادێ، لێرە لەتە کورتەکان پێش کەوتوون ) دەڵێ:

سەما، سەمای سەنعەت ............................ a
حەیاتی جوانی، جەمالی بزووتن و گیانی ....... B
وجوودی عیشوەوو ناز .............................. c
لەخواوە بەهرەیەکە پڕ بەپێستە بۆ ئافرەت ..... A
ئەویش بەسەد ئیعجاز ............................. c
زیای سروور ئەرژێنێتە ژینی ئینسانی ............ B[ ۱۷۳ : ۱۱۲- ۱۱۳].

وەك دیارە قالبە سەروای ئەم شەشینەیە بەم جۆرە هاتوە: a B c A c B

د- وا دەبێ شەشینەکە وەك دوو سێینیە وابێ کە لەتەکان بەپەیوەندی هاوجێیەتی (تـاظری) لەگەڵ یەك هاوسەروابن (٤،١)، (٥،٢)، (٦،٣)، ئەم قالبە لەسێینەی ژمارە (٥) باس کراوە.

١١- دەشێ پارچەی شەشینە لە سێ مەسنەوی پێك هاتبێ و شاعیر پارچەکانی بەئەستێرە یان بۆشایی زیادە لێك جیا کردبێتەوە. چونکە ئەگەر ئەم جیا کرانەوەی پارچەکان نەبێ شیعرەکە هەمووی بەسەریەکەوە دەبێ بەمەسنەوییەکی دوورو درێژ. جێی سەرنجە لەزمانە ئەوروپییەکان ئەو پارچانەی بەشێوەی مەسنەوی دابەش دەبن، پەسند نین. شێخ سەلام، شیعری (کەی کورد ئەجوولێ)ی، کە (٣) پارچەی شەشینەیە، بەم قالبە سەروایە نووسیوە، ئەمە پارچەی یەکەمی هۆنراوەکەیە:

وەکو قەومی تر کەی کورد راپەڕێ؟ لەحقووق هەڵچێ، لەتەماع گەڕێ؟
دەروونی بەکوڵ بۆ کورد بجۆشێ؟ خۆی فیداکا وەتەن نەفرۆشێ؟
بگری برێژێ فرمێسکی خوێنین هەتاکو وەتەن دێتە پێکەنین[۱۰۹: ٥٧].

ئەمەش قالبەکەیەتی:..... AA BB CC، DD EE FF

١٢- بۆی هەیە سەروای شەشینەکانی هۆنراوە بەشێوەی چوارینەی خەیامی و مەسنەوییەکی کۆتایی دابەش بووبن، وەکو سروودی (وریا بوونەوە)ی عەبدولواحید نووری، کە لەپارچەی دووەمدا دەڵێ:

ژیانێکی شێرانە خاکمان ئەکەین بەلانە
ئەی پارێزین لەمیکرۆب لە میکرۆبی بێگانە
ئەژی، ئەژی
دەردی ئەسارەت ئەژی[ ۱۳٦ : ۲۰۸].

لەهەموو شەشینەکاندا، کۆتایی لەتی سێیەم بەرەهاو ئازادی دەمێنێتەوەو ناکەوێتە ناو پەیوەندی سەروای پارچەکەیان سەراپای هۆنراوەکەوە، ئیتر هەر شەشینەیەك لەسەر سێ سەروا

بامەزراوە، بەم قالبە:

A A B A C C, D D E D F F, G G H G I I, .....

١٣- وا دەبێ شەشینەکە، وەکو دوو سێینەی هاوسەروا وابێ و دوو لەتی کۆتایی لەهەردوو پارچەکان وەکو خۆی دووبارە بێنەوە و لەهەموویان سێ لەتی کۆتایی یەك سەروایان هەبێ و هەموو لەتەکان پێکەوە ببەستێنەوە. لێرەدا، بەیەکەوە گرێدانی پارچەکان بەدوو هۆکار ئەنجامدراوە، دووبارە بوونەوەی سەروای سێ لەتی کۆتایی و دووبارە بوونەوەی دوو لەتی کۆتایی بەدەقە خۆی، شێخ نووری ئەم قالبەی لە(ساقیا نەوبەهارە رۆیی دەی) بەکار هێناوە، لەدووەم پارچەدا دەڵێ:

ساقیا بولبولان لەسەر لقی گوڵ .................. A
ناڵەیان دێنە گوێم بە سۆزو کوڵ .................. A
تۆش وەرە، هەڵسە بۆ فەراغەتی دڵ .................. A
بێنە گەردش پیاڵە پڕکە لەمەی .................. B
چونکە بیستوومە من لەناڵەی نەی .................. B
(ومن الماء کل شئ حي) .................. B [٢١٢ : ١٩٦].

لەهەموو پارچەکان، سێ لەتی کۆتایی سەرواکەیان (ەی)یەو دوو لەتی کۆتایی وەکو تەرجیع دووبارە دەبنەوە قالبە سەرواکەی ئەم شەشینەیە بەم جۆرەیە:

A A A B B B, C C C B B B, D D D B B B, .....

**پوختەی سەروای شەشینە:**

شەشینە لەئەدەبی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەکار هاتوە، بەڵام وەك دیارە ئەوەی رۆژهەڵات (تورکی، فارسی، کوردی) لەژێر کاریگەری رۆژئاواوە هاتوە. لەرۆژاوا شەشینە لەکۆنەوە هەندێ قالبی تایبەتی هەیە، کە جگە لەسەروا کێش و ناوەرۆکیش دەوری لەرۆنانی هەیە. شەشینە لەئەوروپا بۆ سەردەمی تروبادۆرەکانی پرۆڤنسالی خوارووی فەرەنسا دەگەڕێتەوە. گیومی نۆیەم کە بەدامەزرێنەرو چەسپێنەری تروبادور دادەنرێ، زۆربەی شیعرەکانی بەقالبە سەروای شەشینە نووسیوە، بەڵام بەداشبوونی جیاجیا، وەکو:

AAABAB (سەروای لەتی - ٦،٤ - لەهەموو پارچەکان هەمان شتە : ABBAABB, AABCBC )[٢٨٣ : ٧٨-١٠١]. لەئیتالیدا پترارك بەشی دووەمی سۆنێتەکانی AAABCB, بەشەشینەی جۆراوجۆر هێناوەتەوە، کە لەوێوە چۆتە ئینگلتەراو فەرەنساو ئەسپانیا، لەوانیشەوە بەتایبەتی لەفەرەنسییەوە بەرێوەتەوە رۆژهەڵات بۆ تورکیا. (شاعیرانی ثروت فنون)و بۆ ئێران (شاعیرانی سەردەمی مەشروتیەت)و لەرێی تورکیشەوە، شێخ نووری و گۆران و بێرەمێرد،

لەبیستەکانی ئەم سەدەیەو بەدواوە، لەڕەوتی نوێ کردنەوەی شیعری کوردیو قووڵ کردنەوەی لایەنی شکڵی، وەریان گرتوەو سەروای شیعری کوردییان پێ دەوڵەمەندو بەهێز کردوە. بەکار هێنانی سەروای جیاواز لەیەك پارچەی شەشینەدا، لەکوردی، لەنێوان یەك سەرواو چوار سەروا دایە، بەڵام لەهەموویان باوتر دوو سەروایە بەهەموو جۆرە دابەشبوونەکانییەوە.

ئەمەیش قالبە سەرواکانی شەشینەی کوردی:

1. a) AAAABB , CCCCDD , BBBBFF
   b) AAAABB , CCCCBB , DDDDBB , ......
2. AAAAAA , BBBBBB , CCCCCC , .......
3. AAAAAA , BBBBBA , CCCCCA , .......
4. AA bb CC, DD ee CC , FF gg CC , .....
5. aABBCd , eEFFCd , gGHHCd ,.....
6. ABABAB , CDCDCD , EFEFEF , .........
7. ABBACC , DEEDFF , GHHG GHGHI I, .....
8. ABABCC , DEDEFF , .........
9. AA BBBB , CC DDDD , EE FFFF , .....
10. a) A B A C B C , .....
    b) A B C C B A , .....
    c) a B c A c B , .......
11. AA BB CC , DD EE FF , GG HH I I , ....
12. AABACC , DDEDFF , GGHGII .......
13. AAA BBB , CCC BBB , DDD, BBB .....

شەشەم : <u>حەوتینە</u>

حەوتینە (septet) پارچەیەکی سەربەخۆیە یان پارچەیەکە لەهۆنراوەیەکی درێژی پارچەدار کە بەپێی کێشی جۆراوجۆرو سیستەمی سەروای جیاجیا دەنووسرێ. لەئینگلیزیدا بەناوبانگترین حەوتینە (پارچەی چۆسەری) یان (سەروای شاهانە Rhyme royal)یەو دابەشبوونی سەروای لەتەکانی بەم جۆرەیە (A B A BB CC). بۆیە پێی دەگوترێ (شاهانە) بەزۆری لەبەر ئەوەیە کە (جێمسی یەکەمی سکۆتلەندە لە(١٤٢٣) شیعری پارچەداری (Kingis Quair)ی پێ نووسیوە) [٥٠٢ : ٥٧٣] بەکێشی ئەیامبی پێنج پێی، دە بڕگەیی، بۆیەش پێی دەگوترێ چۆسەری چونکە (یەکەم کەس لەشیعری ئینگلیزی بەکاری هێنابێ چۆسەر بوە، هەر بۆیەش ئەم زاراوە بەزۆری پەسندترە بۆ ئەم قالبە سەروایەو سیستەمی سەروای پارچەکان بۆ بابەتی لیریکیو شیعری چیرۆکئامێز زۆر لەبارە [٤٦٧ : ١٧]. یەکەم شیعری چۆسەر بەم قالبە سەروایە شیعری (Complaint Unto Pity)یەو پاشان زۆر شیعری تریشی پێ نووسیوە [٥٠٢ : ٥٧٣]. لەفەڕەنسیدا (septain) دوو قالبی باوی هەیە، یان چوارینەیەکی پتارکییەو سێ لەتی بەدوادا دێ، لەتی کۆتایی لەگەڵ لەتی (٤،١)ی چوارینەکە یەك دەگرێتەوە، بەمەوە حەوتینەکە دەکەوێتە سەر سێ سەروا (A BB A CC A). ئەم پارچەیە چ لەسەرەوە بۆ خوارەوە بێ و چ لەخوارەوە بۆ سەرەوە هەمان شتە لەڕووی سیستەمی دابەشبوونەوە، چونکە سەروای سەرەتا (١)و کۆتایی (٧)و ناوەڕاستیش (٤) یەك شتەو لەتەکانی نێوان ئەمانەش بەدوو مەسنەوی هاتوون. یان ئەوەتە لەتی (٢،١) هاوسەروان ولەتی (٧،٣) هاوسەروان ولەتی (٦،٥،٤) هاوسەروان (AA B CCC B)، لەلای

مۆرپسەوە ئەم قالبە لەهەموو قالبە حەوتینەکانی فەرەنسی (باشترو پێکەوە لکاوترەو دایەش بوونی سەروای پتەوترە) [٤٨٤ : ٨٤]. بەلای ئەوەوە لەفەرەنسیدا ناپەسندترین قالب ئەوەیە کە سێ لەتی دواوەی هاوسەروابن چونکە کۆتاییەکەی وەکو سێینەیەکی دابڕاو دەکەوێتە بەر گوێ. ئەم جۆرەیان قالبەکەی چوارینەیەکی پتراركیو سێینەیەکی هاوسەروایە (A BB A CCC) [٤٨٤ : ٨٤]. لەئەسپانیدا (septima) کەم بەکار دێ (دابەشبوونی سەرواکەی بەپێی زەوقی شاعیرەکە دەبێ بەیەك تاکە مەرج کە سێ لەت بەهەمان سەرواوە بەدوای یەکدا دووبارە نەبنەوە) [٤٨٦ : ١٠٥]. بەگشتی لەشیعری رۆژاوادا حەوتینە بایەخی چوارینەو بگرە پێنجینەو شەشینەی نییە، بەکارهێنانی کەمەو قالبەکانیشی ئەوەندە زۆر نییەو لەو زمانانەی باس کران لەدوو سێ قالب تێناپەڕێ. لەکوردیدا، ئەوانەی باسی شیعرو بنیاتی شیعرو جۆرەکانیان کردوە هیچ ئاماژەیان بۆ حەوتینە نەکردوەو دارشتنەکەیان شێ نەکردۆتەوە، چ لەرووی کێش و چ لەرووی سەرواوە. لەپێدا چوونەوەی سەروای پارچە شیعری کوردی، چەند قالبێکی جیاوازی حەوتینەمان هاتۆتە پێش کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- وا دەبێ لەتی سێیەم کۆتاییەکەی ئازاد بێ (هاوسەروای نەبێ)، لەتەکانی تر هەموو مەسنەوی بن، حەسیب قەرەداغی لەحەوتینەیەکدا دەڵێ:

هۆ خەڵکینە، لێرە هەستان شیعرەکانم یەخسیر مەکەن ... A
وا بەتوانجی بێ سەروبەرو شەکانم ملگیر مەکەن ........... A
دایکەکانتان بەئێوەوە ژان گرتنی هەردوو سات بوو .... ......X
شاعیر هەموو عومری ژانە، ژان ئەیگرێت هەموو ساتێ..... B
بەڵکو تولفە شیعری ببێت دەنگی گریان بتانگاتێ .......... B
جێم مەهێڵن منی شاعیر تەوژم و تینی کاروانم ................. C
لەنوێژی گشت ئەورۆژێکا قەسیدە و تەکبیرو قورئانم .... C [٦٨ : ١٨٤].

ئەم پارچەیە لەسەر سێ سەروا دامەزراوە، چونکە لەتی سێیەم تەنیا بە (X) سەروا دروست ناکا، کۆتاییەکەی ئازادەو وەکو پشوو دانیك وایە، (دانیال دولاش و جاك فیلیۆلێ) ئەم جۆرە کۆتایی جێ هێشتنە، بەتێر بوونی گوێچکەیی دادەنێن (saturation occoustique)، [٢٧٩ : ٧٠] چونکە لەم لەتە ئازادەدا گوێچکە لەلێدانی سەروا دەحەسێتەوەو لەتەکە پەیوەندی سەروایی دەپسێنێ و تەنیا پەیوەندی بەتان و پۆی ماناوە دەمێنێ. قالبە سەروای ئەم جۆرە حەوتینەیە بەم شێوەیە: AA X BB CC

٢- وا دەبێ حەوتینەکە لەسەر دوو سەروا رۆنرابێ. لەتی یەکەم و سێیەم هاوسەروابن و هەموو لەتەکانی تریش یەك تاکە سەروایان هەبێ، لێرەدا چوار لەتی هاوسەروا لەکۆتاییدا بەدوای یەکدا ڕیز دەبن. ئەمە لەپارچەی تۆکمەدا زۆر پەسند نییە، چونکە لەپارچە شیعردا تا سەروا هاوجۆرەکان لەیەك بترازێن و لەگەڵ لەتی دوورتر بکەونە پەیوەندییەوە پەسند ترە، نموونەی ئەم قالبە وەکو:

تاویٚ بیٚ لام تو خواو کەلام بەلەنجە ......... A

وا بەرەو ماڵ هاتەوە .............................. b

بەدەستی خۆت تیمار کەزام بەلەنجە ...... A

وا بەرەو ماڵ هاتەوە .............................. b

بولبولی جوان ئەوا بەهار هاتەوە ............... B

جەژنە بولبول گوڵان دەم ئەکاتەوە ............ B

بەشەوو رۆژ دڵم وایەلاتەوە ........................ B[١٤٣ : ٢٣٢].

لەم حەوتینەیەدا ئەوە دیارە کە لەتی (٤،٢) کێشەکەیان کورتترە ، بۆیە چوار لەتی یەکەم وەکو موستەزاد دەکەونە بەرچاو ، جگە لەوەی کە لەتی دووەم و چوارەم نەك هاوسەروان ، بگرە وەکو خۆیان بێ گۆڕان دووبارە بوونەتەوە . لەلایەکی تریشەوە لەتی یەکەم و سێیەم جگە لەسەروای (-ام) پاش سەروایان بەدوادا هاتوە (بەلەنجە) . قالبە سەرواکەی ئاوهایە : AbAbBBB

٢- بۆی هەیە حەوتینەکە (٥) لەتی پێشەوەی هاوسەروابن و دوەکەی کۆتایی وەکو مەسنەوی وابن و لەهەموو بەندەکان وەکو خۆیان دووبارە ببنەوە. ئەم جۆرە قالبەکە وەکو تەرجیع وایە پێی دەگوترێ موسەممەتی حەوتی ، چونکە پێنج لەتەکەی پێشوو بەرێز سەروایان لەدوای یەکەوە هاتوە . لەلایەکی تریشەوە هەر حەوتینەیەك وەکو دوو پارچەی جیا خۆی دەنوێنێ (پێنجینە و مەسنەوی) چونکە ئەو سەروایەی حەوتینەکەی لەسەر داڕژاوە هەریەکە سەربەخۆ سووچێکی پارچەکەی گرتوە و تێك هەڵنەکشاون ، تێك هەڵکشانی سەرواکان رەگەزێکی گرنگە بۆ مسۆگەر کردنی تۆکمەیی پارچەکەو پتەو کردنی پەیوەندی نێوان لەتەکان و دوور خستنەوەی لێك ترازانی بەشەکان شێخ نووری لە هۆنراوەی (بۆ ساڵی ١٩٢٦)دا ، (٦) حەوتینەی هێناوە ، لەهەموویاندا دێری کۆتایی (ئەی ساڵی گوزەشتە ، جگەرت لەت لەتی غەم بێ نەتبینمەوە مەسکەنەکەت شاری عەدەم بێ)یە و لەپارچەی یەکەمدا دەڵێ :

ئەی ساڵی جیهان دیدە ، ئەیا سەحنەیی میحنەت
A .................

ئەی ساڵی گوزەشتە ، سەنەیی ماتەمی ئوممەت
A .....................

ئەی سەحنەیی گریان و فیغان ، شیوەن و زیللەت
A ...................

جەللادی جگەر ئاهنی بێ شەفقەت و ریققەت
A .........................

ئەی نازیری سەد مێشکی پژێنراوی بەقیمەت
A ..........................

ئەی ساڵی گوزەشتە ، جگەرت لەت لەتی غەم بێ
B ....................

نەتبینمەوە ، مەسکەنەکەت شاری عەدەم بێ ............ B[٢١٢ : ٣١٦]

قالبی ئەم حەوتینەیە بەم جۆرەیە :

AAAAABB , CCCCCBB , DDDDDBB ........

٤- وا دەبێ حەوتینەکە دیسان لەسەر دوو سەروا ڕۆنرابێ، پێنج لەتی پێشەوە سەروایەک و دوو لەتی دواوە سەروایەکی تریان هەبێ ، بەڵام لەم قالبەدا دوەکەی کۆتایی ، نەوەکو خۆیان نە سەرواکەشیان دووبارە نابنەوە ، بەڵکو سەرواکەیان لەپارچەیەکەوە بۆ پارچەیەکی تر دەگۆڕێ ، بەمەوەش ئەو پەیوەندییەی لە قالبی پێشوو لە نێوان پارچەکاندا هەبوو ، لێرە نامێنێ. هەر پارچەیەک بە شێوەیەکی سەربەخۆ دەکەوێتە بەرچاو ، تەنیا شکڵی دابەشبوونی سەروا یەکیان دەخات ، وەکو م.شاربازێڕی لە گۆڤاری هیوا (ژمارە ٧)ی ساڵی ٩٥٨ ، شیعرێکی نووسیوە بە ناوی (هیوا) ، (٤) پارچەیەو هەر پارچەیەکی حەوت لەتە و بە دوو سەروا داڕژاوە ، لە حەوتینەی یەکەمدا دەڵێ :

هیوا لە ژینا ڕێ پیشاندەرمە ............... A
وێڵ و ئاوارەم، هەر ئەو ڕابەرمە ............... A
بۆ لوونکەی بەرزی پاڵ پێوەنەرمە ............ A
بۆ شەڕی ژیان قەڵاو سوپەرمە ............... A
خۆراکی گیان و توێشوی سەفەرمە .......... A
بێ هیوا، ژیان زیندانی تەنگە ............... B
تاریک و نوتەک، وەک شەوە زەنگە ............ B

قالبی ئەم حەوتینەیە بەم جۆرەیە : ..... , AAAAABB , CCCCCDD , EEEEEFF

٥- دەشێ حەوتینەکە وەکو چوارینەیەکی تەواو و مەسنەوییەک و لەتێکی ئازاد بێ ، بەڵام لەتە ئازادەکەی حەوتەم لە هەموو پارچەکاندا یەک وشە بێ و دووبارە ببێتەوە و پارچەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە . ئەگەرچی ئەم جۆرە دابەشبوونەی سەروا ، لەتەکانی هەر پارچەیەک توند بەیەکەوە نابەستێتەوە ، چونکە سەروای لەتەکان تێک هەڵنەکشاون ، تەنیا ئەوەندە هەیە لەتی کۆتاییان دەوری سەرەداوی لێک گرێدانی پارچەکان دەبینێ. گۆران لە هۆنراوەی (گۆرانی گوڵە گەنم)دا کە (٩) پارچەیە ، هەرپارچەیەکی بەم قالبە سەروایە نووسیوە و هەموشیان لەتی حەوتەم (دەنکە گەنم) دووبارە دەبێتەوە ، لەپارچەی شەشەمدا دەڵێ :

بەهارێ قەف دەرئەکا ..................... A
گوڵ تا بەر سنگسەر ئەکا .................. A
قەلاس نووک نەشتەر ئەکا ................. A
درکی پاسی بەر ئەکا ........................ A
بەشنەی با ...................................... B
شەپۆل ئەدا ................................... B
دەنکە گەنم ................................. C[١٧٣ : ٤٢٨].

قالبەکەی بەم جۆرەیە :

AAAABBC , DDDDEEC , FFFFGGC

## پوختەی سەروای حەوتینە :

حەوتینە بە گشتی چ لە ڕۆژهەلاٗت بێ و چ لە ڕۆژئاوا ، بەقەد قالبەکانی تر بایەخی پێ نەدراوە ، چ لە ڕووی زۆری قالبەکانەوە بێ و چ لە ڕووی بەکارهێنانی لەئەدەبی بەرز و جیددی ، لە کوردیدا ئەم قالبانەی هەیە :

1- AAXBBCC
2- AbAbBBB
3- AAAAABB , CCCCCBB, DDDDDBB,
4- AAAAABB , CCCCCDD , EEEEEFF
5- AAAABBC , DDDDEEC , FFFFGGC

## حەوتەم : هەشتینە

هەشتینە (octave) یان (octate) بریتییە لە پارچەیەکی (٨) لەتی ، چ سەربەخۆ بێ و چ لەناو هۆنراوەیەکی پارچەداری درێژ بێ ، بەپێی کێش و سەروای تایبەتی دەنووسرێ . لە زمانە ئەو روپییەکان ، وا دەبێ هەشتینە سەربەخۆ بێ (ottavarima) و وا دەبێ یەکەم بەشی سۆنێتە بێ . لە سۆنێتەدا بەزۆری سیستەمی سەروای بەم جۆرەیە (ABBAABBA) ، کەچی (ottovarima) کە (زاراوەیەکی ئیتالییە، تایبەتە بە هەشتینەی ئەیامبی کە سیستەمی سەروای بەم جۆرە بێ (ABABABCC) ، بەئەسل لەئیتالیا لە سقلیە هاتوە ، هەندێ شاعیری ئیتالی سەدەکانی ناوەڕاست شیعریان پێ داناوە و چەسپاندوویانە ) [٥٠٢ : ٤٧٠] . لەو شاعیرە ئیتالییانەی بەکاریان هێناوە بۆکاچیۆ (١٣٤٠) چەند شیعرێکی پێ داناو کردی بە شکلی سەرەکی چیرۆکە شیعری ئیتالی، بۆیاردۆ و پولچی و پۆلیزیانۆش لەسەدەی پازدەدا شیعریان پێ نووسیوە ، تاسۆ شیعری Gernsasemmue liberara ی پێ نووسیوە . لە سەدەکانی ناوەڕاست لە گۆرانیدا بەقالبە سەروای (ABABBCCB) بەکار هاتوە [٤٨٦ : ١٠٨] . ئەم هەشتینە ئیتالییە لەسەردەمی کلاسیکی و ئینجا ڕۆمانتیکیدا بە قالبی سەروای (ABBCDEEC) سەری هەڵدا و برەوی سەند [٤٨٦ : ١٠٨] . هەشتینە بەتایبەتی (octava rima)ی ئیتالی بۆ یەکەم جار (لە سەدەی شازدەدا ، سێر تۆماس ویات لە ئینگلیزی بەکاری هێنا ، پاشان سپنسر و درایدن شیعریان پێ نووسی ، ئیدی ڕەواجی کەم بووەوە تا سەردەمی ڕۆمانتیکی کە شێلی و کیتس و بەتایبەتیش بایرون لە شیعرە چیرۆکامێزەکانیدا بەکاریان هێنا ) [٥٠٢ : ٤٧١]. لە فەرەنسیدا پەسندترین هەشتینە ئەوەیە کە لەسەر سێ سەروا دابمەزرێ ، چونکە دەشێ لەتەکان زۆر بە مکوومی بەیەکەوە ببەسترێنەوە. نموونەییترین قالبی ئەم جۆرە سەروایە ئەمەیە (AAABCCCB) بەلاٗم (ئەم جۆرەیان تەنیا بۆ شیعری زۆر کورت دەگونجێ، چونکە دوو سەروای یەکە و سێ جار دووبارە دەبنەوە، هەر زوو شاعیرەکە شەکەت دەکا ) [٤٨٤ : ٨٤] . هەشتینەی دوو سەروایی لە فەرەنسیدا پەسند نەکراوە

(هەشتینەی دوو سەروایی هەمیشە ناپەسندە، چونکە بۆ ئەوەی لەتەکان باش و توند لێک بەسترێنەوە دەبێ یەکێ لە دوو سەرواکە شەش جار دووبارە بێتەوە کە ئەمە بەهیچ جۆری پەسند نییە ، خۆ ئەگەر سەرواکان یەکەو چوار جار دووبارە ببنەوە ، هەشتینەکە کۆتاییەکەی بە شێوەی پاشکۆ دێ) [٤٨٤ : ٨٥]. چوار لەتی پێشەوە وەکو دوو مەسنەوی دەبن و چوار لەتی کۆتایی وەکو چوارینەیەکی موتەناویب بەلام بەهەمان سەروای دوو مەسنەوییەکەی پێشەوە ، هەر ئەمەیشە دەیکا بە پاشکۆ (AABBABBA). خۆ ئەوەی لەسەر چوار سەروا دادەمەزرێ، بەلام بەدوو چوارینەی پترارکی دادەڕێژێ، هەر پەسند نییە چونکە یەکێتی هەشتینەکە پتەو نابێ و زیاتر بە دوو چوارینە لێک دەدرێتەوە (ABBACDDC) . هەشتینە لەسەدەی شازدەوە لەلایەن (ئێرسیلا)وە کەوتە ناو شیعری ئەسپانی و لەسەدەی حەڤدەمدا کامۆئێنز زیاتر پەرەی پێ داو چەسپاندی [٥٠٣ : ٤٧٠] ، قالبی هەرە باوی هەشتینەی ئەسپانی ئەوەیە (ABBAACCA) و پێی دەگوترێ پارچەی یان کزیلەی (خوان دێ مێنا) چونکە یەکەم جار خوان دێ مێنا لە شیعری Laberinto de fortuna) بەکاری هێناوە [٤٨٦ : ١٠٦] . لەئەسپانیدا (octava--rima)ی ئیتالی (ABABABCC) بۆ یەکەم جار لەسەر دەستی (بۆسکان) گەیشتە ئەسپانیا کە شیعرێکی پێ نووسی سەد پارچە زیاتر بوو ، ئینجا شاعیرانی تری وەکو : بۆیاردۆ و پێمبوو ئەریۆستۆ بەکاریان هێنا و برەویان پێداو چەسپاندیان . جۆرە هەشتینەیەکی تر لە سەردەمی کلاسیکی نوێدا سەری هەڵدا بەلام لەسەردەمی ڕۆمانتیکیدا پەرەی سەند ، هەر چەندە (ئەویش هەر لە ئیتالییەوە وەرگیراوە بەلام زۆر جار پێی دەگوترێ (هەشتینەی تیژ) و لەسەر چوار سەروا دادەڕێژێ و قالبەکەی بەم جۆرەیە (ABBC DEEC) [٤٨٦ : ١٠٧] . لە تورکیدا ، هەشتینە زیاتر لە شیعری پارچەدار و سۆنێتەدا دەرکەوتوە کە شاعیرانی نوێخوازی تورک لە ئەوروپایان خواستۆتەوە و شیعری تورکییان پێ مونەوەر کردوە ، بۆ نموونە حسێن دانش لە شیعری (شانۆگرییولە)دا ، (دە) هەشتینەی هێناوە کە قالبەکەیان بەم جۆرەیە : (ABBACCDD) و لەهەموویاندا مەسنەوی کۆتایی (DD) دووبارە دەبێتەوە و هەشتینەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، شەش لەتەکەی پێشەوە وەکو دوو سێینە وان . سیرت لە سۆنێتەی (غرویدن صوکرە)دا ، هەشتینەکەی بە دوو چوارینەی پترارکی داڕشتوە (ABBA . CDDC) ، کەچی هەشتینەی (فنار)ی تۆفیق فیکرەت بەم جۆرە سەروای لەتەکانی دابەش بوە (ABABCDCD) و (قبل الغرام)ی جەناب هەشتینەکەی بەجۆرێکی ترە (ABAB CCDD) ، واتە چوارینەیەکی موتەناویب و دوو مەسنەوی . وەک دەردەکەوێ زۆربەی قالبە هەشتینەکان لە تورکیدا هەر ئەوانەن کە لە زمانە ئەوروپییەکان و بەتایبەتیش لە هونەری سۆنێتەدا پەیڕەو کراوە . لەفارسیدا ، هەشتینە لە ژێر ناوی (موسەممەت)دا باس کراوە ، ئەگەر چی لە فارسیدا موسەممەتی پێنجی و شەشی شێوەی هەرە باوە بەلام جارو بار هەشتیش بەکارهاتوە. بۆ نموونە خواجەی کرمانی موسەممەتێکی هەشتینەی هەیە کە چەند پارچەیەکەو لەهەریەکێکیاندا حەوت لەتی بەرایی هاوسەروان و لەتی هەشتەم کۆتایی جیایە، ئەم لەتی

هەشتەمە سەرواکەی لە هەموو پارچەکان دووبارە دەبێتەوە و بەیەکتریان دەگەیەنێ [٢٩٦ : ٣١] .
جۆرێکی تری موسەممەتی هەشتی فارسی ئەوەیە کە پارچەکان سەربەخۆن ، هیچ سەروایەك بەیەکەوە نایانبەستێتەوە ، هەر پارچەی لەسەر دوو سەروا دروست بوە. شەش لەتی یەکەم یەك سەروا و دوو لەتی دوەم سەروایەکی تریان هەیە. وەکو موسەممەتی هەشتی (وحشی) کە بە (ای گل تازە) دەست پێ دەکا [٢٩٦ : ٤١] . لە کوردیدا زۆر قالبی جیاوازی هەشتینە بەکار هاتوە ، هەیانە لاسای هەشتینەی سۆنێتەی رۆژئاوایی پێوە دیارە و هەیە لەسەر شێوازی موسەممەتی هەشتی فارسییەو هەشیانە لە داهێنانی شاعیرەکانی خۆمانە ، چۆنیان بەلاوە پەسند و دلگرو بەکاریگەر بوو بێ بەو چەشنە سەرواکانیان بەسەر لەتەکاندا بڵاو کردۆتەوە و ئیقاعی پارچەکەیان پێ چڕکردۆتەوە و لەتەکانیان لێك شەتەك داوە . گرنگترین قالبە سەروای هەشتینە لە شیعری کوردیدا ئەمانەن :

١- دەشێ هەر هەشت لەت لەسەر یەك سەروا بڕوا. ئەمە بۆ شاعیر ماندوو بوون و بۆ خوێنەر وەڕسی تێدایە ، ئەگەرچی لە زمانەکانی تر ئەم جۆرە هەشتینەیە بەکار نەهاتوە ، بەڵام لە کوردیدا ، (د.شۆ) دوو پارچەی پێ هۆنیوەتەوە ، هەردووکیان لەسەر داخوازی کچان و بۆ پەسن و پێ هەڵگوتنی ئەوانی گوتوە . لەیەکێکیان دەڵێ :

ئا رێژراوی وەك پایەی چیمەنتۆ — زۆر تونوتۆڵ و گورج و گۆڵی تۆ
وا لە باخەڵتا نارنج و لیمۆ — پێکەوە بڕۆین بەرەو (بەکرە جۆ)
لەوێشەوە بۆ چەمی تانجەرۆ — تکات لێ ئەکەم لەگەڵ کەس مەڕۆ
نەکا ئەم و ئەو بتکەن دەسخەرۆ — دەس بخەرە ناو دەسی د.شۆ [١١٨ : ٤٦]

قالبەکەی بەم جۆرەیە :
AAAAAAAA, BBBBBBBA.

٢- وا دەبێ هەشتینەکان وەکو هەشتینەکەی خواجە کرمانی ، حەوت لەتی پێشەوەیان لەسەر یەك سەروا بێ و هەشتەم لەت کۆتایی جیابێ و لەهەموو پارچەکاندا ئەم هەشتەم لەتە یەك سەروای هەبێ پارچەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە . ویسالی هۆنراوەیەکی هەیە (٨) هەشتینە بەناوی (سەختیی زستانی ئەم ساڵ) ، لەتی هەشتەمی هەموو پارچەکان سەروای (ین)ە و هەر هەشتینەیەکیش حەوت لەتی پێشەوەی هاوسەروان . ئەم شیعرەی ویسالی زۆر بە شڕو وێری و تێکەڵ و پێکەڵی نووسراوە ، بەڵام بەهۆی سەروا ناسییەوە خوێنەر دەتوانێ سنووری سێ پارچەی یەکەم و شوێنی ناو نیشانەکە ڕاست بکاتەوە . ساغ کەرەوەی دیوانەکە ، ناو نیشانی هۆنراوەکەی لەسەرەتادا نەهێناوە ، خستوویە پاش لەتی چواردەم ، بەمەوە سنووری پارچەی دوەم و سێیەم تێکەڵ بوە، دوو لەتی پاش شوێنی ناونیشانەکە دەبێ بدرێتەوە پارچەی پێشوو ئەوسا هەردووکیان (٨) دەربەچن و سەروای لەتی هەشتەمیشیان شوێنی خۆی دەگرێ ، چونکە بە دابەش کردنی ساغ کەرەوە ، پارچەی دوەم بۆتە (٦) لەت و سێیەم بۆتە (١٠) لەت ، سەروا جیاوازەکەی لەتی

هەشتەمی پارچەی دوەم کەوتوتە ناو پارچەی سێیەم لە پارچەی یەکەمدا دەڵێ :

لەئەووەل تاکو ئاخیر ئەم قاریەی جادووکار ........... ....A
نەیهێشتەوە غەیری سێ لە عالەما یەك دەییار ........... A
خاڵی نییە لەحیکمەت ئیشی خودایی قەهار ............. A
ئەو سێ کەسەش کەماون ئەلبەت تیا هەیە ئەسرار .... A
دنیاو نەفس وشەیتان ، هەرسێ وەکو سەگی هار ......... A
دوژمنی جینن و ئینسن هەتا ئاخیر بە ئاسار ............... A
تا ئینقیرازی عالەم هەر فیتنە جۆن و مەککار ............... A
خودا بمانپارێزێ لەشەڕی ئەو سێ لەعین ..................... B[٢١٦ : ٢٦٢]

قالبەکەی بەم جۆرەیە : AAAAAAAB , CCCCCCCB , DDDDDDDB

٣- وا دەبێ هەشتینەکان هەریەکە (٦) لەتی پێشەوەی یەك سەرواو دوو لەتی کۆتایی سەروایەکی تر بێ وەکو شەشینەیەکی هاوسەرواو مەسنەوییەك دەکەوێتە بەرچاو، لەبەر ئەوەی دوو سەرواکەی پارچەکە سەربەخۆن و لێك دابڕاون و هیچ بەناو یەکدا چوون و تێك هەڵکشانیان لەنێواندا نییە کە پارچەکە پتەومکوم بکات لێك ترازانیان ئاسانە ، کەریم شارەزا، هۆنراوەی (جوانی) بەم قالبە سەروایە نووسیوە کە (٥) پارچەیە ولە پارچەی یەکەمدا دەڵێ :

جوانی ئەی گۆرانی ژیان    جوانی ئەی بەهاری ژیان
گوڵ و لالەی گوڵستان    چیمەنی عەترو ڕەیحان
نازولەنجەی عاشقان    وەی شۆخی ئەرزو ئاسمان
جوانی ئەی مایەی خۆشی
تۆ بزوێنەری هۆشی [١٦٨ : ٣٤]

قالبەکە بەم جۆرەیە :

AAAAAABB , CCCCCCDD , EEEEEEFF

٤- بۆی هەیە هەشتینەکە لەسەر دوو سەروا ڕۆنرا بێ کە بە موتەناوبیب لە لەتەکان دووبارە ببنەوە . لەم قالبەدا ئەگەر لەتەکانی دوو دوو لەشێوەی دێرە شیعردا لەتەك یەك بنووسرێ ، دوو سەروا جیاوازەکە بەڕێکی دابەشی سەر هەر دوو لەت دەبن ولەتەکانی پێشەوە سەروایان بەڕێز و لەژێر یەکەوە وەکو یەك دەبێ ولەتەکانی دواوەش سەروایان وەکو یەك دەبێ ، چیرۆکی سیسەبانی مەلا خالیدی زێباری کە (١٠٩) پارچەیە ، هەموو پارچەکانی بەم قالبە نووسراوە یەکەم پارچەی موسەڕڕەعە ، هەر هەشتی یەك سەروای هەیە ، ئینجا لە پارچەکانی تر ئەم قالبەی وەرگرتوە . لە پارچەیەکدا دەڵێ :

دنیای بە چەرخ و لەولەبە ژیۆ کەس نابت دەوام
بۆ کەس نابت مەرتەبە ژ خاس و خەلکی عەوام
مەشریق هەتا ب مەغرەبە شاهوو گەداوو غولام
ساحێبی تیرو مەزرەبە هەمی دێ چن بیتنەمام [۱۸۹ : ۱۰٦].

ئەم قالبە زۆر تۆکمەیە چونکە ئەو دوو سەروایە بە شێوەی ئەلقەکانی زنجیر لەتەکانیان یەك بەوەی تر بەسراوەتەوە ، لەسەرەتا تا کۆتایی شەپۆلداتێکی رێك و ئیقاعی سەروا هەستی پێ دەکرێ ، قالبەکە بەم جۆرەیە : ABABABAB , CDCDCDCD

٥- وا دەبێ هەر هەشت لەتی پارچەکە دوو دوو بەشێوەی مەسنەوی هاتبن و هۆکاری تری وەکو کورت و درێژی لەتەکان و جۆری کێشەکە چوارچێوەی هەر پارچەیەك دیار بکات. جگە لەوەی کە شاعیر خۆی پارچەکان لێك جیا دەکاتەوە. گۆران ، شیعری بەناو بانگی (ئاواتی دووری) کردوە بە (٥) پارچە ، جۆرە هونەرو وەستاییەکی تایبەتی تێدا خەرج کردوە ، کێشی عەرووزو خۆماڵی تێکەڵ کردوەو لەتی کورت و درێژی بە حسێبێکی ورد خستۆتە ناویەك[٤٩٤ : ١٢]لەم قالبەدا پارچەکان هیچ پەیوەندییەکی سەروا بەندییان لەنێودا نییە ، هەریەکە سەربەخۆیە. گۆران لە پارچەی یەکەمی هۆنراوەکەیدا دەڵێ :

ئەی چاوو چەشنی بازی قەفەز هەڵوەرێ پەرت ......... A
کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دڵبەرت؟ .............. A
کوانێ دو چاوی مەست کوانێ ؟ ........................ B
کوانێ برۆی پەیوەست کوانێ ؟ ........................ B
کوانێ زولفی رەش ؟ ........................................ C
کولمی ئاڵ و گەش ؟ ........................................ C
کوا هەیکەلی جەمال ؟ ...................................... D
کوا حوسنی بێ میسال ......................................... D [١٢ : ١٧٢].

قالبە سەرواکەی ئەم جۆرە پارچەیە ئاوایە : AABBCCDD , ..................

٦- وا دەبێ پارچەی هەشتینە سەروای لەتەکانی وەکو دوو مەسنەوی سەرەتاو کۆتایی و چوارینەیەکی پتراکی ناوەڕاست دابەش بێ. گۆران (جیلوەی شانۆ)ی کردوە بەسێ پارچە باری بە تێکەڵ کردنی لەتی کورت و درێژ کردوە ، درێژەکان هەمیشە چوار تەفعیلە و کورتەکان دوو تەفعیلەی یەکەم و چوارەمی لەتە درێژەکانن . پارچەی سێیەمی بەم قالبە سەروایە دارشتوە ، دەڵێ :

فیدات بم ژنی جوان ، ئەی جەمالی سنەتکار........... A
بەڵێ، دەلیلی سەعادەت ئەخەیتە پێش ئەنزار........... A

بەلام هەموو تاوێ ........................................b
دەوام ئەکا ، لە پرێکا وەکو مەلی ئاوات .................C
کەتۆ فڕیت هەیهات ! ...........................................c
ئەویش لەپەرە ئەپێچرێ، نیشانەیەك، ناوێ .............B
لەتۆ بمێنێ : پەنایە بەخاترەی مەئیووس ...................D
وەلێ لە ئەولەسەعادەت : سفر سفر ئەفسووس ........D [۱۷۲ : ۱۱۲].

قالبە سەرواکەی بەم جۆرەیە : AAbCcBDD

٧- وا دەبێ پارچەی هەشتینە لەسەر سێ سەروا هەستایێ ، دوو سەروا لەشەش لەتی پێشەوە بەنۆرە دووبارە ببنەوە و سەروای سێیەم دوو لەتی کۆتایی بکا بە مەسنەوی. بەختیار زێوەر لە هۆنراوەی (جەژنی قوربان)دا ، سێ پارچەی هەشتینەی وەکو یەکی هێناوە ، سەروای پارچەکان پەیوەندییان بەیەکەوە نییە ، هەریەکە بەو جۆرەی باس کرا دارژاون. لە پارچەی یەکەمدا ، دەڵێ :

| | |
|---|---|
| وا بەرەو جەژنانە ئەڕوانم زەمین | بەرگی سەوزو سووری شادی کردەبەر |
| کیژو کوڕ دلخۆش و دەم پڕ پێکەنین | هەرزەکار بۆشایی بەستوویە کەمەر |
| گیانلەبەر گەورە و بچووك هەرچی ئەژین | هەستی خۆشی کردوە و کەوتۆتە فەڕ |

جەژنی قوربانە، وڵات سەیرانییە
هەربەشی من دەربەدەرو سەرگەردانییە [۳۲ : ۱٦٥]

جێی سەرنجە لەتی (٦) کە لەگەڵ (٢،٤) هاوسەروایە ، لێرە جیاوازی دەنگییان لەنێودایە. دوەکەی پێشەوە (ر)ی لاوازن و ئەوەی سێیەم (ڕ)ی قەڵەوە ، ئەم دوە (ر-ڕ) هەریەکە فۆنیمێکی سەربەخۆیە ، لەگەڵ ئەوەشدا ، لەبەر ئەوەی شاعیرانی کورد (کۆن و تازەکانیش) شارەزای بنچینەکانی فۆنۆلۆجی کوردی نەبوون. زۆر جار ئەم دوانەیان کردوە بە ڕەوی کە لە ڕاستیدا نابێ، چونکە وەکو دەنگی تەواو جیاوازوان بانەختێ لەیەکتریش نزیك بن. ئەمە یەکێکە لە کەم و کورتییەکانی سەروای کوردی. سیستەمی سەروای ئەم جۆرە هەشتینەیە بەم شێوەیە دەڕوا :

ABABABCC , DEDEDEFF , GHGHGHII , ..........

٨- وا دەبێ هەشتینەکە لە دوو چوارینە پێك هاتبێ ، بەلام شاعیر هەشت هەشت پارچەکانی لەیەك جیا کردبێتەوە چونکە هەر هەشتیان بەیەکەوە مانایەك تەواو دەکەن. بۆ نموونە وەکو هەشتینەی سۆنێتە کە هەرچەندە دابەشبوونی سەروا لە زۆربەی جۆرەکانی بەشێوەی دوو چوارینە هاتوە بەلام لە رووی ماناوە بەیەك پارچە دادەنرێ ، بەرامبەر بە شەشینەی دوەم کە ئەویش سەرواکەی دەچێتە سەر پەیوەندی سەروابەندی دوو سێینەوە ، ئەم جۆرە پارچە هەشتینەیە زۆر حاڵەتی جیاجیای هەیە ، گرنگترینیان ئەمانەن :

أ- بۆی هەیە هەشتینەکە لە چوارینەیەکی تەواو (چوار لەتی هاوسەروا) و دوو مەسنەوی پێك

هاتبێ ، رازی لە پارچەی سێیەمی (تۆی دوور)دا دەڵێ:

به فرمێسکی سوور رەنگینم کردی ............................ A
بە برژانگی چاو پەرژینم کردی ............................ A
لەسەر لێوی خەڵك شیرینم کردی ............................ A
خۆم بۆ دڵی خۆم بە تینم کردی ............................ A
تۆی مەبەستی من ............................................ b
هیواو هەستی من ............................................ b
دڵت شکاندم ............................................... C
هەستت سووتاندم ............................................ C[٨٨ : ٩٥].

ئەمە لەهەمان کاتدا بەو جۆرە درێژی و کورتییەی لەتەکانی ، خۆی لە موستەزاد نزیك دەکاتەوە کە پاش چوار لەتی درێژ ، چوار لەتی کورتی نێو هێندەی درێژەکان هاتوون ، هەریەکە لەلەتە درێژو کورتەکان جۆرە قالبە سەروایەکیان هەیە . قالبی ئەم جۆرە پارچە هەشتینەیە ئەمەیە :

AAAAbbcc , ...............

ب- دەشێ هەشتینەکە وەکو چوارینەیەکی موتەناویب و چوارینەیەکی دوو مەسنەوی دەربکەوێ ، ئەم جۆرە هەشتینەیە لە دوو هێلەوە بواری لێك ترازانی تێدایە. پاش چوارینەکەو نێوان هەردوو مەسنەوییەکە ، چونکە ئەو چوار سەروا جیاوازەی قالبەکەیان پێك هێناوە بە جۆرێ خۆیان داوەتە پاڵ یەك زۆر بە ئاسانی لەیەك دەکرێنەوە ، بەتوندی نەکەوتوونەتە ناوئان و پۆی یەکتر و بەدەم یەکەوە نەچنراون، شێرکۆ دەڵێ :

کاتێ پرشنگی سەرنجی نیگات ..................... A
دنیای ئارامی لێ دروروژاندم ..................... B
کاتێ کە لەنجەی پڕ لە مۆسیقات ..................... A
ئەرزوی ئارەزووی خستە سەر گیانم ..................... B
زانیم کە ژینی دوێنێی بێ تۆیی ..................... C
ئەمەنی لاویم بێ هوودە رۆیی ..................... C
زانیم کەبێ تۆ ئا ئەم ژیانە ..................... D
ئاخە ، کسپەیە ، ناسۆرە ، ژانە ..................... D[١٢٠ : ٣٤].

سیستەمی سەروای ئەم قالبە بەم شێوەیەیە :

ABAB CC DD , ..................

ج دەشێ هەشتینەکە ، چوارینەی یەکەمی چوارینەی تەواو ( هاوسەروا ) بێ و چوارینەی دوەمی

مونەناویب بێ ، ڕازی یەکێ لە پارچەکانی (تۆی دوور)ی بەم قالبە داڕشتوە ، دەڵێ :

پەروەردەم کردی وێنەی داری گوڵ .................... A
ئەم پڕژاند لە رووت خوێنی گەشی دڵ .................... A
بایم ناڵەم بوو بەچەشنی بولبول .................... A
بەجۆشی سینەو دەروونی لە گوڵ .................... A
بۆ روو شکێنی ؟ ...... .................... b
توخوا لەسەرچی ؟ ... .................... c
بەدڵ نامدوێنی ؟ ... .................... b
پێم بڵێ لەبەرچی ؟ ... .................... a [٨٨ : ٦٥]

قالبەکەی بەم جۆرەیە :

AAAAbcba

د- وا دەبێ پارچەی هەشتینە لە دوو شەشینەی پتراركی پێك هاتبێ ، وەکو گۆران لە سۆنێتەی (ئاوێنەی هەستیم)دا[٤٢] هەشتینەکەی بەم جۆرە هێناوە ، قالبی ئەم جۆرە هەشتینەیە ئاوایە :

ABBA , CDDC

٩- هەشت خشتەکی : ئەمە وەکو پێنج خشتەکی (تەخمیس) هونەرێکی سەربەخۆیە، بەلام تەخمیس لە کوردیدا زۆرەو هەشت خشتەکی (تپمین) زۆر کەم و دەگمەنە. ئەوەی لێرە باسی دەکەین تاکە نموونەیەکە لە شیعری کوردیدا هاتۆتە پێشمان. شاعیری یەکەم چوارینەیەك دەنووسێ کە هۆنراوەیەکە و لەچەند چوارینەیەك پێك هاتوە و هەموویشیان یەك قالبە سەروایان هەیە ، شاعیری دوەم دێ هەر چوارینەیەك و چوار لەتی خۆی بۆ زیاد دەکات هەر چوار لەت سەروایان لەسەر سەروای لەتی یەکەمی چوارینە ئەسلەکە دەڕوا. بەمەوە هەموو هەشتینەیەك پێنج لەتی پێشەوەی هاوسەروا دەبێ و سێ لەتی دواییش بەپێی چوارینەکە دەگۆڕێن. بەلام لە نموونەکەی بەردەستمان لە سێینەکەی دواوە ، دوویان هاوسەروان و لەتی نێوانیان ئازادە . بێگومان دەبێ زیادەکەو شیعرە ئەسلییەکەش لەسەریەك کێش بن . کاکەی فەلاح شیعرێکی فەلسەفییانەی بەناوی (تێبینی) نووسیوە کە (٨) چوارینەیە و بەسەروای (XBYB) نووسراون [١٥٨ : ١٧]. چوارینەی یەکەم جۆرێکی لە تەسریع تێدا پەیڕەوکراوە کە لەتی یەکەمی وەکو دوو لەتە سەرواداره‌کە وایە (AAXA). ئینجا خادیم هاتوە ، بەهەمان کێشی چوارینەکان (کە ١٠ بڕگەیەو وەستان لە ناوەڕاستە ٥+٥) ، بۆ هەر چوارینەیەك چوار لەتی بەسەروای لەتی پێشەوەی چوارینەکە زیاد کردوە. بەمەوە هەر پارچەیەکی بوە بە هەشت لەت (هەشتینە)، ئەمەیش

(42) لێرە نموونەمان بۆ نەهێناوە ، چونکە نموونەکە لە بەشی سۆنێتەدا نوسراوە .

هەشتینەی دوەم :

هەموو ڕەنجێکت وا کەدێتە پێش ..................... A
هەموو نۆشێکت بەدوای دادێ نێش .............. A
هەرچەند ئەبینی تۆ ئازارو ئێش .............. A
گەر مویرەم نەبی هەر ئەڕوا لەپێش ........... A
(هەموو ئاگرێ بۆتە خۆڵەمێش .................. A
هەرچەند بلێسەی بەرز بێتەوە .................... B
تەنها ئاگری سۆزی دەروونە ...................... X
هەرکە هەڵگیرسا ناکوژێتەوە) ........................ B [٧٥ : ٢٧٨].

قالبە سەروای هەشت خشتەکیەکە بەم شێوەیە هاتوە :

AAAAABXB , CCCCCDYD , EEEEEFZF ,

ئەوەی لەبارەی ئەم هەشت خشتییەکەوە دەبێ بگوترێ ئەمەیە :

- تا ئێستا بەپێی ئاگاداری ئێمە یەکەم هەشت خشتەکی کوردییە کە بەو جۆرە کرابێ .

- ساغ کەرەوەی دیوانەکە هەموو هەشتینەکەی بۆ خادیم حسێب کردوە و ئیشارەتی نەداوە کە ئەمە هەشت خشتەکیەو چوارلەتی هی خادیم و چواری هی کاکەی فەللاحە . ڕەنگە لەدەستنووسەکەدا نەنووسرابێ بەلام ساغ کەرەوە هەوڵی نەداوە خاوەنەکەی بدۆزێتەوە .

- هەندێ وشەی چوارینەکانی کاکەی فەللاح لەناو هەشت خشتییەکەدا گۆڕانیان بەسەردا هاتوە. جا ئایا خادیم خۆی وای نووسیبێ ، یان لەکاتی نووسینەوەو چاپ کردندا لەدەست ساغ کەرەوە وایان لێ هاتوە ؟ بۆ نموونە ، لەچوارینەی دوەم ، لەتی یەکەم وشەی (بۆتە) گۆڕاوە بۆ (ئەبتە). لەهەمان چوارینەدا ، لەتی دوەم (بێتەوە) کراوە بە (ئەبێتەوە). لە چوارینەی سێیەمدا، یەکەم لەت وشەی (هەموو) کراوە بە (هەر). لەچوارینەی شەشەمی (لەگەڵ شەپۆلەکانا) کە لای خادیم بوە بەپێنجەم ، لەتی یەکەم کە بەم جۆرەیە (هەموو شەونمی سەر پەڕەی گوڵێ) گۆڕاوە بۆ (شەونم کە نیشتوە لەبەرگی گوڵێ). لە چوارینەی پێنجەمی (لەگەڵ شەپۆلەکانا) کەبوە بە شەشەم لای خادیم ، لەتی یەکەم ، وشەی (جوانی یەك) گۆڕاوە بۆ (جوانێك). لە چوارینەی حەوتەمیش لەتی یەکەم کە ئەمەیە (هەموو هیوایەك نائومێد ئەبێ) لای خادیم نییە ، ڕەنگە لەکاتی چاپ پەڕی بێ . دوا چوارینەیش ، لەتی چوارەمی وشەی (خۆی) پەڕیوە .

- وەك لە ڕاست کردنەوەی وشەکان دەرکەوت ، چوارینەی پێنجەم و شەشەم جێگایان پاش و پێش کراوە .

پوختەی هەشتینە :

لە لێکۆڵینەوەی قاڵبە سەروای هەشتینە ، دەردەکەوێ کە ئەوانەیان پتەوو تۆکمەن کە سەرواکانیان بەناویەکدا دەچن و ڕێگای بچڕان و لێك ترازانی پارچەکە دەگرن ، بەتایبەتی لە کۆتایی قاڵبەکانەوە تا بواری لێکدانەوەی قاڵبە سەروای پارچە بچووکەکان کەمتر بێ. هەشتینەکە توند و پۆڵتر و پەسندتر دەبێ. گرنگترین قاڵبە سەروای هەشتینە لە کوردیدا ئەمانەن:

1- AAAAAAAA , BBBBBBBB
2- AAAAAAAB , CCCCCCCB , ............
3- AAAAAABB , CCCCCCDD , ............
4- ABABABAB , CDCDCDCD , ............
5- AABBCCDD , .......
6- AAbCcBDD
7- ABABABCC , DEDEDEFF
8- a/ AAAAbbcc ,
b/ ABABCCDD ,
c/ AAAAbcba ,
d/ ABBA , CDDC
9- AAAAABXB , CCCCCDYD

هەشتەم : نۆیینە

نۆیینە ، پارچەیەکی نۆلەتییە ، بەپێی کێش و سیستەمێکی سەروای تایبەتی دەنووسرێ. پارچەی نۆلەتی بەقەد پارچەکانی تر زۆر نییە ، چ لەزمانە ئەورووپییەکان بێ وچ لەزمانەکانی ڕۆژهەڵات. لەفەرەنسی و ئەسپانیدا هەر باسی نەکراوە ، لە ئینگلیزیدا پارچەی سپنسەری هەیە کە نۆلەتەو سەروای لەتەکان بەم شێوەیە دابەش بوە (ABABBCBCC) ، (ئەم شکلە شیعرییە ئیدمۆند سپنسەر دایهێناوە و بە داهێنانێکی گرنگدادەنرێ لە مێژوویی شیعری ئینگلیزی)[٥٠٢ : ٦٤٩]. یەکەم جار لە شیعری The Faerie Queene – ١٥٨٩/١٥٩٦ – بەکاری هێناوە . ئەم جۆرە پارچەیە لە (٨) لەتی ئەیامبی پێنج پێی و لەتێکی شەش پێی -ئەلکساندەری- پێك دێ. ئەم جۆرە قاڵبە بۆ شیعری گێڕانەوە و چیرۆکامێز ناگونجێ ، چونکە سەروای هەر نۆلەت جارێك دەگۆڕێ و ڕەوانی و بەردەوامییەکەی دەپچڕێ (جگە لەسپنسەر کەم کەس توانیویە وەستایانە ئەم جۆرە قاڵبە بەکار بێنێ ،لەوانەی تێیدا سەرکەوتوون کیتس و شیللی یەکەو هۆنراوەی بەرزیان پێ نووسیوە ) [٤٦٧ : ٧٧]. نۆیینە لە کوردیدا گرنگترین قاڵبی ئەمانەن :

١- دەشێ هۆنراوەیەك کرابێتە چەند نۆیینەیەك ، هەریەکەیان لە چوار مەسنەوی و لەتێکی تەنیا پێك هاتبێ ،لەتە تەنهاکە کە لەتی نۆیەمە سەروای لەگەڵ مەسنەوی یەکەم یەك شت بێ، بەمەوە لەتی نۆیەم پارچەکە دادەخاو بەلەتی یەکەمەوە گرێی دەدا و یەکێتی پارچەکە دەستەبەر دەکا . دڵدار هۆنراوەی (لەلادێدا )ی کردوە بە (٦) پارچە ، هەر پارچەیەکی سەربەخۆیە.

پەیوەندی سەروابیان لەنێودا نییە. یەکبوونی سەروای سەرەتا و کۆتایی ، لەتەکانی ناوەوەی لەخۆ گرتوە و بەرزەفتی کردوون ، لەنۆیینەی شەشەمدا دەڵێ :

ژیانێك پڕلە خۆشی و کامەرانی ............................ A
ژیانێك پڕلەبادو میهرەبانی ............................ A
دوور لە درۆ و خوێنمژین ............................ B
دوور لەناکۆکی و لەکین ............................ B
دوور لە هەژاری ............................ c
لەدەربەداری ............................ c
دوور لە کوشتن ............................ d
لەخوێن ڕشتن ............................ d
لەبێ نانی ............................ a [٥٧ : ٨٧] .

ئەوەی بەلای ئێمەوە لەو پارچانەدا گرنگبێ ، یەك خستنی سەروای لەتی کۆتایی و لەتی سەرەتابیە. بلێزار ئەم یاسایەی لەهەموو پارچەکان پەیڕەو کردوە تەنیا لە پارچەی چوارەم نەبێ کە لەتی نۆیەمی بەئازادی جێ هێشتوە. هەرچەندە ئەمەیش ڕێگرتنە لە پچڕانی پارچەکە بەڵام بەستنەوەکەی تێدا نییە . ئەمەش قالبی ئەم پارچەیە : AABBccdda

٢- وا دەبێ نۆیینە بەسێ مەسنەوی و سێ لەتی هاوسەروا دابڕێژێ. بۆلێك جیا کردنەوەی پارچەکان هەم جیاوازی کێش دەوربگێڕێ (سێ لەتەکەی کۆتایی پارچەکان کورتتر بن لەشەشەکەی پێشەوە )و هەم دابەش کردن و لێك جیا کردنەوەی پارچەکان لەلایەن شاعیرەکە خۆیەوە کە بە نیشانەیەکی چاپ یان بۆشاییەکی زیادە پارچەکان لێك دا دەبڕێنێ . هەردێ لە شیعری (ڕازی تەنیایی) کە ناقە دیوانەکەی بەناوی ئەوەوە کردوە ، سێ پارچەی بەم سیستەمەی سەرەوە هێناوە ، ئەمەیش پارچەی یەکەم :

ژیان و ئەرکی ناخۆشی بەپوولەی ئارەزووی کوشتم .......... A
شەرابی جامی بڵداری لە نافی لاویا ڕشتم .......... A
ئەمی ڕۆژانی پڕ مەینەت ، وەها تاریك و چڵکن بوو .......... B
نیگاری خۆشەویستی دڵ پەری ئاسایی تیاون بوو .......... B
شەوی تەنیایی ، ڕووناکی چرای ئاواتی خنکانم .......... C
دەسی ناکامی ئاوازی دەروونی کەیلی تاسانم .......... C
ئەوا ئێستا لەگەڵ ڕامی .......... d
دەروونی پڕلە ناکامی .......... d
ئەبێوم چۆڵی سەرسامی .......... d [٧٩ : ٥].

لە رووی سەرواوە تێك هەڵكشانێكی پتەولە نێوان لەتەكاندا نییە ، چونكە سەرواكان (كە ژمارەیان چوارە) هەریەكە بەشێوەیەكی سەربەخۆ هاتوە. پارچەكە بەسەر مەسنەوی و سێینەدا دابەش بووە بەستنەوە و تێك چرژانی عوزوییان لەنێواندا نییە كە تان و پۆی لەتەكان بەیەكەوە بچنێ ،لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانی كێشەكە (كە لە سێینەی كۆتایی روو دەدا) لێك كردنەوەی پارچەكان ئاشكراتر دەكا . سیستەمی سەروای ئەم قالبە بەم جۆرەیە :

AABBCCddd , EEFFGGhhh

پوختەی سەروای نۆیینە :

نۆیینە لە كوردیدا ، وەكو زمانەكانی تر كەمە ، بەڵام گرنگترین قالبە سەروای كە پارچە شیعری پێ نووسرابێ ئەمانەن :

1- AABBccdda ,
2- AABBCCddd , EEFFGGhhh, ........

نۆیەم : دەیینە:

دەیینە ، پارچەیێكە بەتەنیا یان لەناو هۆنراوەیەكی درێژ ، بەكێشی تایبەتی و سیستەمی سەروای تایبەتی دەنووسرێ ئەگەر چی دەیینە لەچاو قالبە سەرواكانی تر كەمە . لە ئەسپانیدا كە پێی دەگوترێ (La decima) لەسەدەی شازدەدا بیسێنی ئیسپینێل دایهێناوە و بۆ یەكەم جار لە كتێبەكەیدا (سەروای جیاواز) (١٥٩١) چەند قالبێكی دەیینەی بەكار هێناوە) [٤٨٦ : ١١٠]. هەر بۆیەشە زۆر جار ئەم قالبە سەروایە بەناوی ئەو شاعیرەوە دەبرێ (دەیینەی ئیسپێنلی) . بەزۆری قالبەكەی لە ئەسپانیدا بەم جۆرەیە (ABBA Y cddcy) . قالبی تریشی هەیە وەكو (ABBAACCDDC/ ABAABCDCCD) . لە كوردیدا سەروای دەیینە چنگدەكەوێ بەڵام زۆرباو نییە ، تۆكمەترین قالبە سەروای دەیینە، ئەم دوەی خوارەوەن كە بەختیار زێور (١٩٤٥) و گۆران (١٩٥٩) دایانناون :

١- ئەو قالبە دەیینەی بەختیار زێوەر هۆنراوەی (بۆ گوڵەكەم)ی پێ هۆنیوەتەوە (سێ پارچەیە)، بریتییە لە شەشینەیەكی سەروای موتەناوب و سێینەیەكی هاوسەرواو دوا لەت لەگەڵ لەتی یەكەم دەبێ بە هاوسەروا. لە پارچەی یەكەمدا دەڵێ :

گوڵەكەم نازەنینەكەم ........................ A
ئەی گوڵی باخی نیشتمان ................. B
وەرە بروانە ژینەكەم ........................ A
چۆن لە دووریت بوە بەژان ................ B
برژە برژی برینەكەم ........................ A
ڕاستگۆییم ئەدا نیشان ...................... B

هەر منم سینە کون کونم ...................... C
جەرگ و دڵ ئەنجن ئەنجنم ................. C
وا بەرەو رۆژی مردنم ......................... C
وەرە نزیك سەرینەکەم ..................... A [٣٢ : ١٧٣] .

تۆکمەو پتەوی ئەو قالبە لەوەدایە کە کۆتاییەکەی کراوە نییە و بواری داخزان و پچڕانی پارچەی بچووکی تێدا نییە. کۆتاییەکە بەسێ سەروای پێشەوە گرێدراوە ، یەکی سەرەتاو دووی ناوەڕاست (٥،٣) . ئەم وردییە لەدابەش کردنی سەرواو لێك بەستنەوەی لەتەکان لەهەر سێ پارچەدا بەیەك دەستوور هاتوە . قالبەکە بەم جۆرەیە :          ABABABCCCA

٢- دەبینەکەی گۆران هۆنراوەی (مارشی ئاشتیخواز)ە. سەرواکەی بەشێوەی چوارینەیەکی تەواو (هاو سەروا )و دوو سێینەی هاو سەروا دابەش بوە. لەم قالبەی گۆراندا چنینی سەروا بەندی چڕو پتەو نییە ، سەرواکان تێك هەڵنەکشاون و وەك پارچەیەکی تێبچڕژاو نە چوونەتە ناو یەکتر. قالبەکە لەسەر سێ سەروا دامەزراوە و هەر سەروایەك بەتەنیا چەند لەتێکی پێکەوە بەستۆتەوە و سەرواکان بەناو یەکدا نەچووین. ئەمە شلۆقی دەکات و دەرفەتی پچڕان و هەڵوەشانەوەی زیاتر دەکات ، لەپارچەی دوەمدا دەڵێ :

خوێن ڕشتنی یەکتریی لاوان بەسە ..................... A
بەکەلاوەکردنی شاران بەسە ............................ A
بێشکەی منداڵ ئاگر تێبەربان بەسە ................... A
ئەتۆم کرین بە دراوی نان بەسە ......................... A
ئەی شەڕ فرۆشان ...................................... B
قاسە پڕو کەللە بۆشان .................................... B
بەس بێ بەس : بۆ شەڕ تێکۆشان ..................... B
شەڕ هەڵبگیرسێ ........................................... C
ئەوەی لەمەرگ زۆر ئەترسێ ............................... C
خاوەن ملیار ناخەلەسێ ........................................ C [١٧٣ : ٤١٦] .

ئەم هۆنراوەیە چوار پارچەیە و هەموویان بەم قالبە سەروایە هاتوون . پارچەی چوارەم دووبارە کردنەوەی پارچەی یەکەمە و بۆ جەخت و داخستنی هۆنراوەکە هاتۆتەوە . ئەمەیش قالبە سەرواکە : AAAABBBCCC , DDDDEEEFFF

<u>پوختەی سەروای دەبینە :</u>

دەبینە بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە ، چ لەزمانەکانی ترو چ لە کوردیدا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دوو قالبەی لە کوردی دەستە نیشانمان کردوە ، ئەوەی بەختیار زێوەر زۆر تۆکمەو پتەوە و

بەحیسابێکی ورد کراوە و دارشتنێکی سەروابەندی بەهێزی هەیە. ئەمەش قالبەکانی دەبینە لە کوردیدا :

1- ABABABCCCA, ........
2- AAAABBBCCC, ........

دەیەم : پارچەی یازدەیی

ئەم پارچەیە لە یازدە لەت پێك دێ ، بەپێی کێش و سەروا بەندی تایبەتی دەهۆنرێتەوە . پارچەی یازدەیی زۆر کەمە ، لەگەڵ ئەوەشدا بەختیار زێوەر ئەم قالبەی ئەوەندە بەشارەزایی و وردەکاری بەکارهێناوە نەمانتوانی بیخەینە لاوەو باسی نەکەین و نموونەی پێشان نەدەین . بەختیار زێوەر ساڵی (٩٤٦) هۆنراوەی (بۆ بەهاری ٩٤٦)ی نووسیوە کە چوار پارچەیە ، هەر پارچەیەکی یازدە لەتەو هەموو لەتەکانی بەیەك پاسای سەروا بەندی کار دەکەن. هەریەکە لە شەشینەیەکی موتەناوب و سێینەیەکی هاوسەروا و مەسنەوییەك پێك هاتوە ، سەروای مەسنەوییەکە لە هەر چوار لەتدا یەك شتە و هەموو پارچەکانی بەیەکەوە گرێ داوە . لە پارچەی یەکەمدا دەڵێ :

ئەرێ لە تەختی بەندەنا ................................ A
بوە بە میرغوزار ................................................ B
لەدۆڵ و شیو و چەمەنا .................................. A
رەوانە جۆیبار ................................................... B
لەمێرگ و دەشت و گوڵشەنا ............................ A
شەماڵی بێ قەرار .............................................. B
چییە ؟ چ باسە ؟ گوڵڕوان ............................... C
بەدەستە چەشنی ئاهوان .................................. C
بەڕاز و عیشوە وو دەوان .................................. C
هەموو لە دەوری شار ........................................ D
ئەرۆن بەکەیف و بێ جەخار ............................ D[٣٢ : ١٨٥].

هەر چوار پارچەکە سەروای مەسنەوی کۆتاییان (ـار)ە. ئەرکی ئەم سەروابە بەیەکەوە گرێدانی پارچەکانی هۆنراوەکەیە. ئەم قالبە سەروایە بەم جۆرەیە :

ABABABCCCDD , EFEFEFGGGDD , ......

## باسی سێیەم : پارچەی تایبەتی

پارچەی تایبەتی ئەو پارچانەن یان ئەو جۆرە هۆنراوانەن کە ناوی تایبەتییان وەرگرتووە، لەزۆربەی زمانەکاندا پارچەی تایبەتی هەیە، لەکوردیدا ئەوەی هەرە باو بێ، قیتعەو غەزەل و قەسیدە، ئینجا تەرکیب بەندو تەرجیع بەندو موسەممەت و موستەزاد... کە هەر یەکە لەرووی بابەت و شکڵی دەرەوەو کێش و سەرواوە سەربەخۆیە، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین جۆرە باوەکانی هۆنراوەی تایبەتی کوردی شیّ بکەینەوەو بەتایبەتی لەرووی سەرواوە هەڵیانسەنگێنین و خاسیەتەکانیان جیا بکەینەوە:

### یەکەم- قیتعەو غەزەل و قەسیدە :

ئەو قیتعەو غەزەل و قەسیدەیەی ئێستا لەئەدەبی نەتەوە موسلمانەکانی ڕۆژهەڵات شکڵی هەرە باوی شیعر گوتنە، لەبنچینەدا بۆ کاریگەری شیعرو زمان و ناوەرۆکی شیعری عەرەبی دەگەڕێتەوە، بەڵام نەتەوەکانی تر کت و مت لاسای غەزەل و قەسیدەی عەرەبییان نەکردۆتەوە، بەپێی زەوقی ئەدەبی نەتەوایەتی و میراتی ڕۆشنبیری و ڕاژاوەی ئەدەبی زمانی خۆیان دەستکاریان کردوەو بۆیان زیاد کردوە، تا لەئەنجامی ئیش تێدا کردنی نەتەوە موسلمانەکان ئەو جۆرە غەزەل و قەسیدە تایبەتییە هاتە کایەوە کە دەتوانین پێی بڵێین غەزەل و قەسیدەی ئیسلامی. شاعیرانی کورد، ئەوانەی پێشەنگی داڕشتن و چەسپاندنی غەزەل و قەسیدە بوون لەکوردیدا، لەژێر کاریگەری شیعری عەرەبی ئیسلامی و بەتایبەتیش شیعری فارسی ئەو هونەرەیان گواستەوە ناو ئەدەبی کوردی و ئەفراندن و داهێنانی خۆیان خستە سەرو دەوڵەمەندیان کرد. لەسەرەتاوە (ئەدەبی عەرەبی ئەدەبی رەسمی گەلە موسلمانەکان بوو، کاتێ ئەو گەلانە کەوتنە بایەخدان بەزمانی نەتەوایەتی خۆیان و وەکو زمانی ئەدەبی بەکاریان هێنا، ئەدەبی عەرەبی کاریگەری هەر مابوو بەسەریان، شاعیرە کلاسیکییە کوردەکان، ڕۆشنبیریان ئیسلامی بوو و لەحوجرەی دینی خوێند بوویان و پێگەیشتبوون کە ئەو کاتە سەرچاوەی وەرگرتنی زانیاری بوو، ئەو کاتەی ڕۆشنبیری کوردی لەو بنکە ئاینیانەوە کەوتە گەشە کردن، ڕۆشنبیری نەتەوە موسلمانەکانی تری وەکو فارس و تورکیش لەگەشە کردندا بوو، ئەوانیش کاریان لەشاعیرە کلاسیکییە کوردەکان دەکرد کە بەتایبەتی کەوتبوونە ژێر کاریگەری شاعیرە فارسەکان) [٣٢٢ : ١٣]. لەبارەی جۆری شیعرییەوە، کە هەر لەکۆنەوە شیعر کراوە بەلیریکی (غنائی) و ئیپیکی (مەلحەمی) و دراماتیکی، قیتعەو غەزەل و قەسیدە لەگەڵ هەندێ جۆری تر بەر هۆنراوەی لیریکی دەکەوێن.

### سەرهەڵدان:

هونەری قەسیدەو نوسین لەبنچینەدا بۆ شیعری عەرەبی دەچێتەوەو شاعیری نەتەوە موسلمانەکانی تر پەیڕەوی ئەوانیان کردوەو هونەری خۆیان تێدا نواندوە. لەعەرەبی سەردەمی

زێڕینی قەسیدە نووسین سەردەمی جاهیلیەو تا ئەو پەڕی سەدەی پێنجەمی پێش ئیسلام دەڕواو لەموعەللەقاتی (٧ یان ١٠)دا دەگاتە ترۆپکە. لەسەرەتای زیندوو کردنەوەی زمان و ئەدەبی نەتەوایەتی گەلە موسلمانەکانی پاش ئیسلام. قەسیدە خزاوەتە ناو ئەو نەتەوانەو جێگای تایبەتی خۆی کردۆتەوە، غەزەلیش لەسەردەمی (سامانیو غەزنەوی)یەکان گەیشتۆتە ئێران)[٣٩٦ : ٢٠٩]و بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە تاپێگەیشتوەو دوا قالبی خۆی گرتوە. لای خۆیشمان (یەکەمین شاعیری کوردی کە غەزەلی ئیسلامی نووسیوە مەلای جزیری بوە. ئەم فۆرمی کلاسیکیی غەزەلی عەرەبی- ئیسلامی بەناوەرۆکی لیریکی سۆفێتی تەقلیدییەوە هێناوەتە ئەدەبی کوردییەوە)[٢٠ : ١٠٦] ئینجا شاعیرانی تری هەموو زارەکان هونەری خۆیان تێدا خەرج کردوەو پێشیان خستوە.

پەیوەندی قیتعەو غەزەل و قەسیدە:

لەقەسیدەدا شاعیر یەکسەر ناچێتە سەر بابەتی سەرەکی، لەسەرەتاوە هەندێ باسی لاوەکی دێنێ کە وەکو ڕێ خۆش کردنێك وایە بۆ چوونە ناو باسەکە. ئەمە وەکو پێشەکی وایە، (ئەم پێشەکییە بەزۆری لەنێوان (٥-١٥) دێردایەو جاری وا هەیە دەگاتە سی چل دێڕ، کورتیو درێژی پێشەکی بەگوێرەی قەبارەی گشتی قەسیدەکە دەگۆڕێ. جا ئەو پێشەکییە بەزۆری بۆ شیعری پێدا هەڵگوتن (مدح) دێ، ئەگەر لەبارەی بابەتی دلداریو وەسفی کۆڕی مەیخواردنەوەو بەزم و ڕابواردن بێ پێی دەگوترێ (تغزل) یان (نسیب)، خۆ ئەگەر دەرهەق بابەتی تری وەکو وەسفی باخچەو گوڵ و کەژی ساڵ و ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا وشەو دیمەنی تری سروشت بێ یان لەبارەی دادو گلەییو شانازیو بەخۆپەسنین و شتی وابێ پێی دەگوترێ - تشبیب-)[٣٩٦ : ١٣]. ئەمە لاساکردنەوەی قەسیدەی سەردەمی جاهیلی عەرەبییە کە (-نسیب- یا تشبیب-) شوێنی یەکەمی لەقەسیدەدا هەبوو، بگرە ئەگەر هۆی سەرەکی بزواندنی شاعیرەکە بۆ شیعر نووسین شتێکی تریش بوایە، دەبوایە پێش چوونە ناو بابەتی سەرەکی پێشەکییەکی -تشبیبی- بهۆنێتەوە)[٣٩٦ : ٤]. پاشان ئەو پێشەکییە دلدارییەی قەسیدەو شیعری پێدا هەڵگوتن، وردە وردە بایەخی زیاتری پەیدا کرد بەهۆی پێش کەوتنی شارستانێتیو زیاد بوونی بەزم و ڕابواردنی کۆشکی خەلیفەو پاشاکان و پەرەسەندنی گۆرانیو کۆڕ گەرم کردن، ئیدی ئەو بایەخە وای لێ کرد لەقەسیدە جیا بکرێتەوەو وەکو جۆرێکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ (زۆربەی خاوەن ڕایەکان وای بۆ دەچن کە سەرەتا غەزەل بەشێوەی سەربەخۆ نەبوە، بەشێك بوە لەقەسیدە، هەمان -تغزل یا تشبیب- کەبوە پاشان بەشێوەی سەربەخۆو جیا لەقەسیدە، هۆنراوەتەوە)[٤٠٥ : ١٨]. ڕەنگە هەر بۆیەش بێ کە غەزەل بەقەبارە لەقەسیدە کورتترە چونکە لەبنچینەدا وەکو پێشەکییەك وابوە بۆ قەسیدە، هەڵبەت پێشەکی لەئەسلی بابەت زۆر کورتتر دەبێ.

قیتعە (چەند دێڕێکی هاوکێش و هاوسەروایە بەلام بەپێچەوانەی غەزەل و قەسیدە سەرەتای موسەڕڕەع نییە)[٣٩٦ : ٤٢]و بەلای قەیسی ڕازییەوە نەبوونی تەسریعی دێری یەکەم خەڵی

جیاکردنەوەیەتی لە غەزەل و قەسیدە، ئەو دەڵێ: ( هەر قەسیدەیەك سەرەتاکەی موسەڕڕەع نەبێ، با درێژیش بێ، هەر پێی دەڵێن قیتعەو ناوی قەسیدەی پێ نادەن ) [٤٠٢ : ٣٦١]. بۆیە پێی دەگوترێ قیتعە چونکە، لەبەر بێ تەسریعی، هەر دەڵێی قیتعە - پارچە -یەکەو لەناوەندی غەزەل یان قەسیدە دەرهێنراوە. خۆی پارچەیەکی کورتەو ( بەگشتی ژمارەی دێرەکانی قیتعە زۆر نییە ) [٤٠٥ : ٢٠]. کەواتە لەبنچینەدا قەسیدە لەدوەکەی تر ئەسلترو درێژترە. غەزەل کە بنیاد وەکو پێشەکی قەسیدە وابوە، بەحوکمی پێشەکییاتییەکەی دەبێ لەقەسیدە کورتتر بێ و قیتعەش کە وەکو پارچەیەکی لەغەزەل یان قەسیدە پچڕێنراو وایە دەبێ لەهەردووکیان کورتتر بێ و بشێ بخرێتەوە ناو هەریەکێکیان . بەم جۆرە لەبارەی ئەسلی و نا ئەسلی و گەورەیی و بچووکی قەبارەوە: قەسیدە ئینجا غەزەل ئەوسا قیتعە دێ.

## جیاوازیی قیتعە و غەزەل و قەسیدە:

ئەم سێ جۆرە شیعرە، جگە لەزۆر ڕووی تێکچوونی نێوانیان لەزۆر لاوە جیاوازن. گرنگترین جیاوازییان ئەمانەن:

١- لەبارەی دێری یەکەمەوە، لەغەزەل و قەسیدەدا دەبێ موسەڕڕەع بێ، بەڵام لەقیتعەدا نابێ موسەڕڕەع بێ.

٢- لەبارەی قەبارەی ( کورتی و درێژی ) هۆنراوەکەوە جیاوازی لەنێوان ئەم سێیانەدا هەیە. ڕادەی هەرە زۆرو هەرە کەمی دێرەکانی هەر جۆرێکیان بەپێی ڕای نووسەر و توێژەرەوەکان جیایە، بەڵام لای هەموویان بەگشتی قەسیدە لەهەموویان درێژترو قیتعە لەهەموویان کورتترەو غەزەلیش لەناوەڕاستدایە. لەکوردیدا، درێژی قەسیدە ( چامە ) لای سجادی لەبیست بەسەرەوەیە[١٢٧ : ١٦٩]، لای د.مارف لەهەژدە دێر تێپەڕ دەکا[٢٣٦ : ١٣]. غەزەل لای سجادی ( مەگەر بەدەگمەن نەبێ ئەگینا لەدەیا دوانزە هۆنراو تێپەڕ ناکا ) [١٢٧ : ١٦٨]، د.مارف ڕای جیاوازی هێناوە لەبارەی ڕادەی هەرە کەمی دێرەکانی غەزەل ( ٣،٧ ) و ڕادەی زۆری دێرەکانی( ١٢،١٥،١٨ ). لەبارەی قیتعەوە سجادی باسی درێژی نەکردوەو د.مارف درێژییەکەی دەخاتە نێوان ( ٢-٦ ) دێر[٢٣٦ : ١٢]. لەبارەی قەبارەی ئەو جۆرانە لەعەرەبیدا محەمەدی دەمەنهووری دەڵێ: ( قەسیدە لەحەفت و بەسەرەوەیە، قیتعە لەسێ دێرە تاحەوت. دەشڵێن کەمترین ڕادەی قەسیدە ( ٣ ) یان ( ١٠ ) یان ( ١١ ) یان ( ١٦ ) یان ( ٢٠ ) دێرەو لەهەموو بارێکدا قیتعە لەقەسیدە کورتترە ) [٢٤٧ : ١٣٣]. ئیبن جنی دەڵێ: ( قیتعە ( ٣ ) یان ( ١٠ ) یان ( ١٥ ) دێرە، لەوە زیاتر بوو عەرەب پێی دەڵێ قەسیدە ) [٢٧١ : ١٨١]. لەفارسیدا کورت و درێژی بەپێی شاعیرو سەردەم دەگۆڕێ، سەرەتا غەزەل کورت بوو پاشان وردە وردە زیادی کرد. غەزەل هەیە( ٤،٥ ) دێرەو هەیە ( ٢٣ ) دێرە [٣٩٦ : ٥٤]. قەسیدە لەفارسیدا ( ١٥-٢٠ ) زیاترە [٣٩٦ : ٧] و قەسیدەی درێژ هەیە دەگاتە ( ٢٠٠ ) دێرو زیاتریش

(فرخی) قەسیدەیەکی هەیە ١٧٥ دێرە، قاآنی قەسیدەیەکی نووسیوە ٣٣٧ دێرە، عونسوری قەسیدەیەکی ١٥٧ دێری لەباسی فتوحاتی سولتان مەحموود نووسیوە) [٣٩٦ : ٨]. قیتعە قەبارەی لەوان بچووکترە. د.ئیسعاد دەڵێ قیتعە لە(٢) کەمتر نییەو لە درێژیدا بەقەسیدە ناگا. هەرچەندە شاعیر بتوانێ بەکەمترین دێر مەبەست دەربڕێ پەسندترە) [٢٦٦ : ٢٣٠]. ئەم بۆچوونە جیاوازانەی سەرەوە لەبارەی قەبارەی ئەو سێ جۆرە شیعرییە لەوە یەك دەگرنەوە کە قیتعە کورتە، غەزەل لەو درێژترەو قەسیدە لەهەموویان درێژترە. لەکوردیدا قەسیدە لە(١٥) دەست پێ دەکات و غەزەل بەزۆری لە (٥) دەست پێ دەکا تا (١٥) ئەگەرچی لە (٥) کەمتریش هەیە، نالی و مەحوی غەزەلی (٤) دێریان هەیە. غەزەل لەکوردیدا بەزۆری ژمارەی دێرەکانی تاکە (٥،٧،٩،١١،١٣،١٥)و رادەی هەرە زۆریش لە(٧)و ئینجا (٩)و (١١)یە. د. مارف ژمارەی دێر بەتاکە ڕەگەزی جیاوازی نێوان قەسیدەو غەزەل دادەنێ (قەسیدە ئەدگاری وەکو غەزەل وایە، تەنیا لەژمارەی دێر لەگەڵیدا دەگۆڕێ)[٢٣٦ : ١٣]. کەچی لای سجادی جیاوازی قەسیدەو غەزەل جگە لەژمارەی هۆنراوەکان لە باسەکەشدایە [١٢٧ : ١٦٨].

٣- لەبارەی بابەت و ناوەرۆکەوە هەریەکە لەم سێ جۆرە مەیدان و بواری تایبەتی خۆی هەیە. بۆ نموونە (قەسیدە بۆ ڕووداوی درێژو قسەی زۆر بەکاردەهێنرێ، بەتایبەتی ناوەرۆکی قارەمانێتی و ڕووداوی کۆمەڵایەتی و هەندێ جاریش دڵداری و ئایین (موناجات ونەعت)و هی تریش دەبنە هەوێنی ئەم جۆرە شیعرە. گیانی مەلحەمی و ڕووداوی چیرۆکی لەهەندێ قەسیدەدا دەبینرێ) [٢٣٦ : ١٣]، بەم جۆرە مەیدانی قەسیدە فراوانەو نزیکەی هەر هەموو بابەتێکی ئەدەبی و فیکری دەگرێتەوە وەکو مەدح و لاواندنەوەو ڕەوشت و شانازیی و تۆڵەو جنێوو پەرچ دانەوەو وەسف و شین و سکاڵاو دەربڕینی دڵ ... (بەڵام بابەتی قەسیدە بەپلە یەك مەدح ولقەکانییەتی، لەدوای مەدح بابەتی ڕەوشت و حیکمەت دێ) [٣٩٦ : ٨]، کەچی غەزەل بابەتی سەرەکی دڵداریی و عیشق و ئەوین و دەربڕینی ڕازی خۆشەویستیە، بەڵام لەپاڵ ئەمیشدا بۆ بابەتی فراوانتر بەکاردێ (غەزەل بەپلە یەك بۆ ڕاڤە کردن و لێکدانەوەی بابەتی عیشق دێ، حەقیقی بێ یان مەجازی، ئینجا بەپلە دوو بۆ ڕوون کردنەوەی بابەتی سۆفیزم و فەلسەفەو کۆمەڵایەتی و ڕەوشت و بەدوا پلەش بۆ پەسن و شانازی و شین و شتی وا دێ) [٣٩٦ : ٧٣]. بەم جۆرە دیارە کە غەزەل زیاتر پەیوەندی بەهەست و سۆزی ناوەوەی شاعیرەوە هەیەو لەعیشق و دڵداریدا خۆی دەنوێنێ. ڕووی دەمی شاعیر لەناوەوەی خۆیەتی و مامەڵە لەگەڵ سۆزی هەڵچوونی خۆی دەکا. کەچی لەقەسیدەدا پەیوەندی بەدونیای دەرەوە هەیە، یەکێکی تر هەیە پێی هەڵدەڵێ، سروشت هەیە وەسفی دەکا. لێرەدا جیاوازییەکی غەزەل و قەسیدە ئەوەیە (هاندەری شاعیر بۆ نووسینی قەسیدەو زۆربەی بەشەکانی شیعر هۆکارێکی دەرەکییەو بەزۆری پەیوەندی بەهەست و چێژی ئەوەوە نییە، بەڵام ئەو شتەی شاعیر ناچار دەکا غەزەل بنووسێ هەست و سۆزی و ڕژاوو هەڵچووی شاعیر خۆیەتی کە لەهۆنینەوەی

غەزەلدا پەیڕەوی فەرمانی دڵی خۆی دەکات. ئاگرێکی لەهەناو بەربەبێ و سەراپای گیانی دادەگرێ، ئەوسا بێ دەستی خۆی زاری دەکاتەوەو وشەی سووتێنەری وەك ئاگرو برندەی وەك شیر هەڵدەڕێژێ [٣٩٦ : ٧٤]. قیتعەکە پارچەیەکی کورتە دەبێ ناوەرۆکەکەیشی چڕو خەست بێ. زیاتر بۆ دەربڕینی (لایەنی رۆحیو بیروڕاو فەلسەفەو ڕەوشت و ژیانی تایبەتی شاعیرو ئەو ڕووداوانەی بەسەری هاتوون و ئەو تاڵ و شیرینیەی چەشتوویەتیو ئەو زانیاریانەی فێریان بووەو ئەو ئەزموونانەی پێیان تێپەڕیوە) [٣٩٦ : ٤٦] بەکاردێ. کەواتە ئەم سێیانە هەریەکە بەپلە یەك تایبەتێتیەکی هەیە ئینجا لەپاڵ ئەوەدا شتی تری بێ دەنووسرێ: قەسیدە پەسن و غەزەل عیشق و قیتعە خەمی تایبەتی شاعیر دەردەبڕێ.

٤- شاعیرانی ڕۆژهەڵات، بەزۆری لەغەزەلدا، ناو یان نازناو (تخلص)ی خۆیان لەدێڕی کۆتایی یان پێش کۆتایی دەنووسن، بەزۆریش لەو دێڕەدا دەمی قسەو خیتابیان دەکەنە خۆیان، وەك ئەوەی قسەکەری ناو شیعرەکە کە سێ بێت، شاعیرەکەش کەسێکی تر. لەفارسیدا (تخلص) نووسین لەسەدەی شەشەمی کۆچیەوە دەرکەوتووەو باوی سەندوە. لەکوردیدا لەگەڵ یەکەم غەزەلنووسی گەورەی زاری کرمانجی ژووروو مەلای جەزیری هاتوە کە زۆر جار بە مەلاو مەلێ و نیشانی ناوی خۆی بردوە، کەواتە ئەم (تخلص) هێنانەیە جیاوازییەکی ترە لەنێوان غەزەل لەلایەك و قەسیدەو قتیعە لەلایەکی ترەوە.

مەتلەع و مەخلەس و مەقتەع:

ئەم سێ زاراوە لەدیراساتی قیتعەو غەزەل و قەسیدەدا زۆر دووبارە دەبنەوە، چونکە لەبنیات و هەیکەلی هۆنراوەدا شوێنی گرنگیان هەیەو وەك سێ حەلقەی توندی بەیەکەوە گرێدان و سێ ستوونی پتەوی داڕژان و ڕاگرتنی هۆنراوەن (حوسنی) دارشتنی ئەم سێ ڕەگەزە بەمەرجی هۆنراوەی سەرکەوتوو دانراوە (حوسنی مەتلەع ولوتفی مەخلەس و حوسنی مەقتەع). حوسنی مەتلەع: ئەوەیە شاعیر سەرەتای هەر شعرێك بەجۆری بێنێ لەمەبەستی خۆی بوەشێتەوەو سەرەتا بەوشەی دزێو دەست پێ نەکا (تەنیا ئەگەر شین و جنێو بنووسێ، ئەوسا ئەویش بۆ بابەتەکە لەبارو گونجاوە) [٣٩٦ : ٣٥١]. لەبەر ئەوەی مەتلەع سەرەتای هۆنراوەیەو لەوەرگایە خوێنەر دەچێتە ژوورەوەو یەکەم شتە لەهۆنراوەکە (پاش ناونیشان) بەرەو ڕووی دەبێتەوە، دەبێ لەپتەوی دارشتن و هەڵبژاردنی وشەو ڕازاندنەوەو جوانکاریو ڕەچاوکردنی جۆری بابەت لەدێڕەکانی تر بەرزتر بێ. تۆژەرەوانی غەزەل و قەسیدە لەبارەی یەکەم دێڕەوە باوەڕیان وابوە کە (دەبێ هەر دوو لەتی هاولنگو هاوکێش و شایەنی ناوەرۆکەکەی بن و مەبەستەکە بگەیەنن و لەهەموو بارەیەکەوە بەرامبەرو تەواوکەری یەکدی بن، ناوەرۆکی لەتی دوەم لەسەر ڕەوتی لەتی یەکەم بێت و بەپێی چاوەڕێ کردنی خوێنەر بێ) [١٩٦ : ١٠]. لایەکی هەرە گرنگی مەتلەع، لەڕووی بیناو شکڵی

شیعرییەوە، تەسریعە[٤٣]. (تەسریع ئەو دێرەیە کە عەرووزەکـەی دەستکـاری بکرێ کە لـەبارەی کێش و سەرواوە- وەکو زەرب دەربچێ)[٢٨٣ : ٢١]. ئیبن ڕەشیق هۆی تەسریع کردنی دێری یەکەم بەم شێوەیە لێك دەداتەوە (جۆری تەسریع ئەوەیە شاعیر دەیەوێ زوو سەرواکە ڕەپێش بکا، تا هەر لەسەرەتاوە بزانێ دەستی داوەتە شیعر نەك پەخشان، بۆیە دەکەوێتە سەرەتای هۆنراوەکە) [٢٤٦ : ١٧٤]. ئەگەرچی غەزەل و قەسیدە هەمیشە دێری یەکەمیان تەسریع دەکرێو ئەمە بەجیاوازییەکی ئەوانە دانراوە لەگەڵ قیتعە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەتایبەتی لەعەرەبیدا جاری وا هەیە هۆنراوەکە تەسریع ناکرێ. قدامە دەڵێ: (شاعیر هەبوە لەدێری یەکەمی هۆنراوەدا تەسریعی پشت گوێ خستوە، پاشان لەهەندێ دێری تری هۆنراوەکە هێناویە)[٣٣١ : ٦٠]و لەشوێنێکی تردا دەڵێ (زۆربەی شیعری ذو الرمە بێ تەسریعە)[٣٣١ : ١٧٦]. تەها حوسێن لەم بارەیەوە رای وایە: (وا ڕۆیشتوە شاعیر لەسەرەتای هەموو هۆنراوەیەکدا سەروای دوو لەتی دێری یەکەم یەك دەخا بەڵام ئەمە مەرجێکی پێویست نییە، چونکە هۆنراوەی ناودار هەیە سەروای لەتەکانی دێری یەکەمی وەکو یەك نییە وەکو هەندێ شیعری فرزدق و تەئەبەتتە شەڕەن و موتەنەبیی، بەڵام ئەمە کەمەو تەسریعی سەرەتا بۆتە تەقلید)[٣٠٤ : ١٤١]. ئیبن ڕەشیق لای وایە (هەندێ کەس لەکەم بایەخ دان بەشیعرەوە، سەرەتای شیعریان تەسریع نەکردوە، فرزدق کەم وابوو دێری یەکەم تەسریع بکا یا بایەخ بەشیعرەکانی بدا)[٢٤٦ : ١٧٥]. وەکو ئەمە هەیە، ئەوەش هەیە کە شاعیر هەر بە تەسریعی دێری یەکەم ناوەستێ، بەڵکو جاروبار لەشوێنی تریشدا تەسریع دووبارە دەکاتەوە. وا دەبێ شاعیر هۆنراوەکەی بەدێرێکی هاوسەروای لەتەکان دەست پێ دەکا، پاش چەند دێرێك سەرەتاکەی بەهەمان سەروا نوێ دەکاتەوە (واتە تەسریعی دەکا)... جاری وا هەیە لەشیعری فارسیدا مەتلەع پێنج شەش جار تازە دەبێتەوە وەکو هەندێ شیعری خاقانی)[٢٦٤ : ٨٠]، ئەمەش بەزۆری ئەو کاتە ڕوو دەدا کە هۆنراوەکە دوورو درێژ بێت و چەند بابەتێکی جیاوازی تێدا بێ، وەك ئاگادار کردنەوەی نائاگایی خوێنەر لەسەرەتای هەر بابەتێکی تازە مەتلەع و تەسریعێکی تازە دەست پێ دەکا.

[٤٣] تەسریع (تصریع) وتەقفیە (تقفیە) دوو زاراوەی جیان و دەبێ لەیەك جیا بکرێنەوە، تەسریع یەك خستنی دوو لەتی دێرە بەتایبەتی دیرێ یەکەمی هۆنراوە لەڕووی (کێش و سەرواوە)، واتە لەئەسلدا جیاوازی هەبوە لەکێشی عەرووزو زەرب. ئەو جیاوازییە یەك خراوە ئینجا سەروایشیان وەکو یەك دانراوە. یەك خستنی کێشەکە وادەبێ بەزیادە بێ یان بەکەمی، واتە پێی -تفعیلە- عەرووز شتێکی زیادەی خرابێتە سەر یان شتێکی لێ کەم کرابێ تاوەکو زەربی لێ بێت. کەچی تەقفیە ئەوەیە دوو لەتە دێر عەرووزو زەربیان لەڕووی کێشەوە لەئەسلدا وەکو یەك بێو تەنیا لەبارەی سەرواوە یەك بخرێن. واتە: هەر دێرێك لەئەسلدا عەرووزو زەربی جیا بێ، ئەگەر کێش و سەروایان یەك بخرێ ئەمە تەسریعە، بەڵام ئەگەر عەرووزو زەربەکە یەك بوو، تەنیا سەروایان یەك بخری پێی دەگوترێ (تقفیە). تێکەڵ کردنی تەسریع و تەقفیە زۆر جار لەنێوان کێشناس و زاناکانی ڕەوانبێژی رووی داوە. زاناکانی ڕەوانبێژی تەسریع بەیەك خستنی سەروای دوو لەتی دێر دەزانن کە ئەمە لای کێشناسەکان تەقفیەیە نەك تەسریع، واتە تەسریع لای کێشناسەکان بەکێش و سەروا دەبێ کەچی لای زاناکانی ڕەوانبێژی تەنیا بەسەروا دەبێ بێ گوێدانە کێش

## لوتفی مەخلەس (یان تخلص):

ئەمە لەناو قەسیدەدا دیّو زۆر جار بەفارسی (گریز)ی بۆ بەکار هاتوە، مەخلەس یان تەخەلوس ئەوەیە شاعیر لەپێشەکی نسیب و تشبیبەوە بچێتە سەر مەبەستی سەرەکی هۆنراوەکە. ئەم گواستنەوەیە دەبێ بەشێوەیەکی وەستایانە بکرێ کە خوێنەر بەزەقی نەکەوێتە بەرچاوی و وەك پچرانی هۆنراوەکەو بازبانی شاعیرو خوێنەر نەبێ. دەبێ گواستنەوەکە ئەوەندە بەناسکی (لوتفی) بکرێ کە بابەتی یەکەم پێشەکییەکی عوزوی بێ بۆ بابەتی سەرەکی و بابەتی دوەم وەکو تەواوکەری ئەوەی پێشەوە وا بنوێنێ و لەئەنجامی توند پێکەوە بەستران و تێك چنینی دوو بابەتەکەو گواستنەوەی شارەزایانە، خوێنەر هەست بەگۆڕانی بابەتەکە نەکات. لەڕاستیدا (مەخلەس لەبەشە ناسك و گرنگەکانی قەسیدەیە، سەرە داوی بەیەکەوە بەستنەوەی تشبیب و مەبەسی سەرەکییە و یەکێکە لەسێ ڕوکنی زۆر گرنگی قەسیدە) [٣٩٦ : ١٧] کە دووەکەی تریش مەتلەع و مەقتەعن. زۆر جار ئەم مەخلەس و گواستنەوەیە بەدەم نوێ کردنەوەی مەتلەع (تەسریع) دەبێ. (ئەو قەسیدانەی دوو مەتلەعیان هەیە بەزۆری مەتلەعی دووەم پاش تەواو بوونی تەغەزول و تەشبیب دێ کە پێشەکێن بۆ قەسیدە) [٣٩٦ : ١١]. لوتفی مەخلەس وەکو تیشکێکە لەناوەڕاستی قەسیدەوە بلاو دەبێتەوەو لەگەڵ دوو سەرچاوەی تری دەولەمەند یەك دەگرێتەوە کە هەردوو جەمسەری هۆنراوەکەن.

## حوسنی مەقتەع:

دێری کۆتایی هۆنراوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە، چونکە نیشتنەوەی حالّەتی سۆزو تەواو بوونی ڕشتەی بیرو چرکەی مالّاوایی خوێنەرە لەهۆنراوەکەو کاریگەری تاماوەیەکی زۆر لای خوێنەر دەمێنێ. (پێشینان بڕوایان وابوە، کۆتایی قەسیدە دەبێ جوان و باش بێ و بەشێوەیەکی پەسندو لێوەشاوە پێشان بدرێ تاکاریگەرییەکی چاك لەمێشك جێبێلێ) [٣٩٦ : ٢٣]. کۆتایی هۆنراوە دەبێ هەستی بڕانەوەی بیرو سۆزی هۆنراوەکەی تێدا ڕەنگبداتەوە. دەبێ خوێنەر هەست بکا پێویستی بەچیتر نەماوە شاعیرەکە پێی بلّێ و دوا چوڕی شیرینی بەدەمدا کردوە. وا چاکە شاعیر لەو دێرەدا زیاتر لەدێرەکانی تر خۆی لەوشەی بەتوێکل و خوازەی دوورو لێکدانەوەی سەخت دوور بخاتەوە. هەندێ جار شاعیر کۆتاییەکەی بەکراوەیی جێ دێلێ و هەندێ جاریش لەشوێنی خۆی دابەخاو جاری وایش دەبێ، بەدێری دواوە یان وشەی سەروای دواوە، کۆتاییەکە لەگەڵ سەرەتا بەیەکەوە گرێ دەداو خوێنەر دووبارە دەخاتەوە ناو بازنەی دونیای هۆنراوەکە. مەتلەع و مەقتەع دەبێ لەرووی ناسکی ماناو چڕیو پتەوی داڕشتن و بەرزی ناوەرۆك و لێك وەشانەوەی وشەکان زادەی ئەوپەڕی توانای شاعیرەکە بن لەشیعر هۆنینەوەدا بۆ ئەوەی (یەکەم خوێنەر بۆ خۆی رابکێشێ و دوەم خۆشی و شادی لەدلّ جێ بێلێ و کاریگەری لایەنی شلۆقی و ناتەواوی دێرەکانی تری ناوەوە بچووکێنێتەوە) [٣٩٦ : ٨٠]. مەتلەع و مەقتەع ئەو دوو جەمسەرە گرنگەن کە هەموو

شاعیرێ لەخوای دەوێ بەجوانی (حوسن) بیانهێنێ‌و تێیاندا سەرکەوتوو بێ. خانی لەکۆتایی مەم و زیندا، سەرەتاو کۆتایی ژیانی خۆی بەمەتلەع و مەقتەعی شاکارەکەی دەبەستێتەوە، بەدەم پارانەوە دەڵێ:

ئەووەل کوتەدا ژ عیشقێ مەتلەع

ئاخیر بدەوی تو حوسنێ مەقتەع [٣ : ٢١٧].

## غەزەل و قەسیدە لەکوردیدا :

باباتاهیری هەمەدانی‌کە کۆنترین شاعیری گەورەی کوردە تائێستا ناسرابێ، هەر بەچوارینە سۆفییەکانی بەناوبانگە، ئەگەرچی لەهەندێ چاپی چوارینەکانی چەند غەزەلیکیان داوەتە پاڵ، ئەو غەزەلانە هی خۆی بن یان هەڵبەسراوبن، نە لەزۆری‌و نەلەگرنگی ئەو بایەخەیان نییە. گەورەیی‌و ناوبانگی چوارینەکانی باباتاهیر هەموو لایەنەکانی تری ژیانی رۆشنبیری ئەو زاناو سۆفییەی شاردۆتەوە. بۆیە مەلا پەرێشان یەکەم کەسە غەزەلی خۆماڵی ڕەسەنی کوردی بەزاری گۆرانی نووسیبە و جزیری یەکەم کەسە غەزەلی ئیسلامی بەزاری کرمانجی سەروو نووسیوە واتە غەزەلی کوردی هەر لەسەرەتاوە دوو ڕێچکەی جیاوازی گرتووەو دوو جۆری جیاوازی لێ کەوتۆتەوە:
١- غەزەلی ڕەسەنی کوردی خۆماڵی کە بەزاری گۆرانییەو خاوەنی خەسیەت و نیشانەی خۆیەتی، کیانێکی سەربەخۆی هەیە لەناو ئەدەبی کوردی. ئەمەیان لەمەلا پەریشانەوە دەست پێ دەکاو زیاتر شاعیرانی زاری گۆرانی پەیڕەویان کردوە، وەکو بێسارانی‌و سەیدی‌و کۆماسی‌و میرزا شەفیعی چامەڕێژی‌و مەولەوی... ٢- غەزەلی ئیسلامی (عەرەبی- فارسی) کە لەئەنجامی تێکەڵاو بوونی ئەدەب و ڕۆشنبیری عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی‌و نەتەوە موسلمانەکانی دی هاتۆتە کایەوە. ئەمەش نیشانەو خەسیەتی خۆی هەیە، سەرەتا لەزاری کرمانجی سەروو چەکەرەی کردوەو یەکەم کەس جزیری هێناویەتە ناو ئەدەبی کوردی‌و پاش ئەویش فەقێ تەیران و مەلای باتەیی‌و پرتەوی هەکاری‌و خانی... پەیڕەویان کردوە. لەسەدەی نۆزدەمیشدا نالی‌و سالم و کوردی هێنایانە ناو زاری کرمانجی خواروو (هەندێ بەکرمانجی ناوەڕاست ناوی دەبەن)و ڕەگەزو بنەماو دەستوورەکانیان چەسپاندو دوای ئەوانیش شاعیرانی تری وەکو حاجی‌و شێخ ڕەزاو مەحوی‌و تایەر بەگ و ئەحمەد موختارو زێوەرو حەریق... زیاتر گەشەیان پێداو پێشیان خست. ئەنوەر جاف لەباسی غەزەلی کوردیدا، دەڵێ: (غەزەل - شیعرێکی لیریکی کورتە، لە ئەدەبی بە سێ دیالێکتی زمانی کوردی نووسراودا هەبوەو پەرەی سەندوە. ئاشکرایە غەزەل بە کرمانجیی ژوورو خواروو بنەوانی لە غەزەل و قەسیدەی فارسی - عەرەبییەوە هەڵگرتوە ... بەڵام غەزەل بە دیالێکتی گۆرانی، بە گوێرەی هەندێ باسای هونەری تایبەتی پەرەی سەندوە. بنەوانی غەزەلی گۆرانی ناچێتەوە سەر شیعری فارسی - عەرەبی، بەڵکو سەرچاوەکەی ئەم ئەدەبی فولکلۆری کوردییە)[٢٠ : ١٠٦-١٠٧]. ئەم دوو جۆرەی غەزەلی کوردی زۆرترین بەشی ئەدەبی نووسراوی کوردیان گرتۆتەوە. ئێستایش بۆ شێ

کردنەوەی ئەم دوو جۆرە غەزەلە.

١- غەزەلی ئیسلامی: غەزەلی ئیسلامی (فارسی- عەرەبی) لەکوردیدا بەگشتی کۆمەڵێ خەسیەتی هەیە لەجۆرەکانی تری شیعری کوردی جیادەکاتەوە، وەکو پەیڕەو کردنی عەرووزی دەستکاری کراوی عەرەبی، یەکێتی بابەتی دێرە شیعر، یەکێتی سەروا، تەسریعی دێری یەکەم، هونەرەکانی ڕەوانبێژی عەرەبی و فارسی، خواستنەوەی کەرەستەی شیعری لەڕۆشنبیری گشتی فارسی و عەرەبی، بەکارهێنانی زمانێکی تێکەڵاو لەوشەی عەرەبی و فارسی و تورکی، دووبارە کردنەوەی هەندێ لێکچواندن و خوازەی ناو ئەدەبی ڕۆژهەلات. تەعامول کردن لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی وەکو (ڕەقیب)و (واعیز)و (موددەعی)و (واشی) کە دەبنە مایەی سەرگەردانی و تێکدانی بەختەوەری شاعیر.. بێ هێزی شاعیر بەرامبەر یارو دڵڕەقی و بێبەزەیی یار بەرامبەر بەشاعیرو گریان و لاوانەوەو سووتان و بێ ئۆقرەیی شاعیر بۆ یارو خۆ کردنە قوربانی و دەست هەڵگرتن لەخۆشی و بگرە هەندێ جار لەژیانیش بۆ خۆشی یار، ئەمانە هەموو کەرەستەو بابەت و خەسیەتی غەزەلی ئیسلامین لەکوردیدا. ئەوەی لەهەموویان زیاتر مەبەستی بابەتەکەی ئێمە بێ سەروایە.

## سەروای غەزەلی ئیسلامی:

غەزەلی ئیسلامی لەڕووی سەرواوە هەندێ نیشانەی گشتی هەیە کە لای هەموو یا زۆربەی شاعیرانی کلاسیکی دووبارە دەبێتەوە، گرنگترین ئەو نیشانانە ئەمانەن:

أ- هەموو قیتعە و غەزەل و قەسیدەیەکی شیعری کلاسیکیی کوردی (زاری گۆران نەبێ) یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەو کراوە. لەسەرەتا تاکۆتایی هەموو دێرەکان لەسەر یەك سەروا دەڕۆن و لەبەر ئەوەی گرنگترین دەنگی سەروا (ڕەوی)یە، زۆر جار غەزەل و قەسیدە بەڕەوی دەناسرێنەوە، شاعیر (زۆر جار بۆ دەرخستنی دەسەڵاتی هونەری و بۆ تەواو کردنی دیوان، لەسەر هەموو تیپەکانی ئەلف و بێ شیعر دەهۆنێتەوە) [٣٩٦ : ٧٧] ئەم دیاردەیە وای کردوە شاعیرە کلاسیکیەکانی کوردیش هەوڵ بدەن لەسەر هەموو دەنگەکانی ئەلف و بێ شیعر بنووسن و ئەگەر هەندێ دەنگی بێگانەی وەکو (ث.ذ.ص.ض.ط.ظ)یان بەلاوە گران بووبێ، یەك وشەی لەباریان دۆزیوەتەوە، وەکو (عبث، حظ، غرض، خط، واعظ)و کردوویانە بەپاش سەرواو بەمەوە دیوانەکەیان تەواو کردوە. یەکێتی سەروای شیعری کلاسیکیی یارمەتییەکی تری ساغ کەرەوەی دیوانەکانی داوە کە بتوانن بەپێی دوا دەنگی سەروا هۆنراوەکان ڕیز بکەن، ئەم کارە هەم یارمەتی ڕێك خستن و پۆلین کردنی هۆنراوەکانی دیوانەکە دەدات و هەم دۆزینەوەیان بۆ خوێنەر ئاسان دەبێ و هەم شیعری شاعیرەکانیش لەتێکەڵ بوون دەپارێزێ، جگە لەوەی ڕێ خۆشکردنە لەبەردەم توێژەرەوەکان کە لێکۆڵینەوەی (موازنە)ی سەروا بەکارهێنانی شاعیرەکان ئەنجام بدەن. سەروای غەزەل و

قەسیدەی ئیسلامی جگە لەو یەکێتییەی کە نیشانەی هەرە گەورەیەتی، چەند لایەنێکی هونەری تریشی تێدا پەیڕەو کراوەکە بۆتە هۆی دەوڵەمەند کردن و قووڵ کردنەوەی ئیقاعی سەرواو مۆسیقای هۆنراوەکە بەگشتی.

ب- (تەسریع) : دێری یەکەمی هۆنراوە کە وەکو دەرگای چوونە ژوورەوەی وایە(٤٤)، بەزۆری هەردوولەتی لەسەر یەك سەروا دەبن کە سەروای گشتی هۆنراوەکەیە. بۆ نموونەی تەسریع جزیری لەدێری یەکەمی یەکێ لەهۆنراوەکانیدا دەڵێ:

بنارێ فرقە تێ صوهتم ژفەرقی سەر حەتا پێدا
خەدەنگا غەفلەتێ دوهتم ژبەرقا لامیعا تێدا [٥٨ : ٣٨]

لێرەدا هەردوولەت سەروایان (-یدا)یە. ئەمە لەهەر (٤٢) دێری هۆنراوەکەدا دووبارە بۆتەوە. لەبارەی تەسریعەوە دەبێ ئاگادار بین کە بەزۆری، شاعیر، بەهێزترین و دەوڵەمەندترین سەروا بۆ تەسریع هەڵدەبژێرێ، وشەکانی لەڕادەی پێویست زیاتر دەنگی کۆتاییان وەکو یەکە. واتە بەسەروای زێدە بار بەیەکەوە دەبەسرێنەوە. بۆ نموونە حەمدی لەسەرەتای هۆنراوەیەکیدا، بەم جۆرە لەتەکانی تەسریع کردوە:

نووسی حەرفییەن کە زولفی ماچی ڕوو مەتییە حەلال
بێ بەلابی، خەڵی نوقتەی کرد ئەوا بۆتە جەلال[٦ : ٢٨١].

وشەکانی سەروا (حەلال، جەلال) زیادلە پێویست دەنگی یەکسانیان تێدا ڕەچاو کراوە. (-ال) بەس بوو بۆ دەستە بەرکردنی سەروایەکی دروست، بەڵام ئەولەباتی ئەو دوو دەنگە، چوار دەنگی وەکو یەك هێناوە (-ەلال). ئەم دیاردەیە لەزۆر غەزەل و قەسیدەی کلاسیکیی ڕەچاو کراوە. دەشێ شاعیری کلاسیکی بۆیە وای کردبێ تا: أ- مۆسیقایەکی بەهێز بەسەرەتای شیعرەکەی بداو جەخت لەسەر شیعرییەتی سەرەتا بکات. ب- هەر لەسەرەتاوە پێشانی بدا کە دەسەڵاتی بەسەر هێنانەوەی سەروادا زۆرەو دەتوانێ سەروای لەبارو بەهێز بۆ شیعرەکەی مسۆگەر بکات. تەسریع لەبنەڕەتدا بۆ ئەوەیە لەسەرەتاوە شیعرییەتی کارەکە پێشان بدرێ و لەپەخشان جیا بکرێتەوە. لەهەمان کاتدا (دامەزراندنی سەروایە، ئەو -دڵنیایە-یە کە سەروای لێوە دروست دەبێ: تەسریع لەدایکبوونی سەرواو سەروا لەدایکبوونی دێرو دێر لەدایکبوونی شیعر دەگەیەنێ) [٢٤٥ : ١٢٤]. باسای تەسریع و ئەرکی بنیاتی و دەوری ڕێ خۆشکردنی بۆ بەیەك گەیشتنی خوێنەرو شاعیرو دۆزینەوەی ڕەوتی گشتی هونەر، پایەیەکی تایبەتی پێ دەداو وا دەکا شاعیر بایەخی زیاتری پێبدا چونکە بنیاتی گشتی هۆنراوەکە لەوێوە چەکەرە دەکا و (تەسریع ڕەگەزێکی بنیات نان و

(٤٤) وشەی تصریع لەمصراع هاتوە کە لاشیبی دەرگایە، دەرگا هەیە دوو لاشیبی هەیەو ئەو جۆرە دەرگایە پێی دەگوترێ (دەرگای دوو دەری)، (صرعا النهار)یش هەیە کە ئێوارە و بەیانییەو بۆیەش بۆ سەرەتای دێروا جوانە کە هەردوو نیوەی وەکو یەك لێ بکرێ چونکە دێری یەکەم وەکو دەرگای هۆنراوەکە وایە.

بەرزکردنەوەی شاعیریەتی دەق و تەقاندنەوەیەتی)[٢٤٥ : ١٣٣] بەلام وەکو تەقاندنەوەی تۆوی شێداری بەرهەتاو بۆ پێشوازی کردنی ژیان و وەکو تەقاندنەوەی دڵۆپی پیتاو بۆ دەست پێ کردنی یەکەم لەحزەی کاروانی ژیان. بوونی تەسریع لەغەزەل و قەسیدەدا بەم جۆرەیە:

١- بەزۆری تەسریع لەغەزەل و قەسیدەدا هەیەو ئەمە حاڵەتە باوەکەیە.

٢- جاری وا هەیە شاعیر، تەسریع بەپێویست نازانێ، یەکسەر دەچێتە ناو شیعرەکەو لەسەروای کۆتایی دێرەوە دەست پێ دەکا. ئەمەیش، یان شاعیرەکە لەبێ موبالاتی، گوێی پێ نادا، یان بەپێویستی نازانێ. تەنوخی، دیاردەی بێ تەسریعی ناو ناوە (التخميع)و دەڵێ: (تەخمیع ئەوەیە شاعیر عەرووزی دێری یەکەم تەسریع و تەقفیە نەکا. یەکسەر لەسەر سەروای (زەرب) بوەستێ. ئەمە شاعیرە نوێخوازە کۆن و تازەکان بەکاریان هێناوە)[٢٧٢ : ٥٢].

٣- وا دەبێ تەسریع نەك هەر لەدێری یەکەم بەڵکو لە دێری تریشدا هەبێ. ئەمە زیادکردنی ئاوازو ئیقاعی سەروایە. لەهەمان کاتیشدا ئەرکی دەلالی هەیە. چونکە بەزۆری دووبارەکردنەوەی تەسریع لەگەڵ گۆڕانی بابەتی هۆنراوەکە دێ. تەنوخی دەڵێ: (تەقفیەو تەسریع لەدێرەکانی تری جگە لەدێری یەکەم، زۆرە. ئەمە نەنگو کەم و کوڕتی نییە بگرە نیشانەی ڕەوانبێژیو دەسەلاتی شکانی شاعیرە بەسەر هونەرەکەیدا... وا پەسندە کە لەگەڵ گۆڕینی بابەت و دەرچوونی لەچیرۆکێکەوە بۆ چیرۆکێکی تر بێت)[٢٧٢ : ٤٨]، چونکە ئەمە وەکو ئەوە وایە کە هۆنراوەیەکی نوێ دەست پێ بکا بەلام لەچوارچێوەی هۆنراوە ئەسلیەکە. بۆ نموونە نالی لەشیعری (ئەهلی‌و...) دێری یەکەمی تەسریع کردوە:

ئەهلی تەعداد و موحاسیب نووسیبیان

خاڵ یەك، زولفی دوان، هەر دووسیان[٩٩ : ٨٠].

دوای چواردێر وەسفی خاڵ و زولف و چاوو دێتە سەرباسی فیرقەتی سالوسیان و هێرش دەکاتە سەریان. لێرەدا لەگەڵ گۆڕانی بابەتە، کە لەدێری پێنجەمدایە تەسریع دووبارە دەکاتەوە:

نەزم و زەوقی فیرقەتی سالووسیان

شاهیدی زۆرە زمانی لووسیان[٢٠٩ : ٨١].

دڵشاد عەلی ئاماژەی بەوە کردووە کە دیلان لەهۆنراوەیەکیدا، لەگەڵ گۆڕانی بابەتەکە تەسریعی دووبارە کردۆتەوە[٤٩٣ : ٢٨١]. مەرجیش نییە، تەسریع هەر لەگەڵ گۆڕانی بابەتی شیعرەکە دووبارە بێتەوە. وابوە لەشوێنی تریش هاتوە. (ئەمە بەڵگەی بەهێزی شاعیرێتی‌و کەرەستە زۆرییە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر لەهۆنراوەدا زۆربێ دەبێ بەنیشانەی زۆر لەخۆکردنی شاعیرەکە)[٢٤٦ : ١٧٤]. وا دەبێ شاعیر زۆربەی دێرەکانی تەسریع بکا، نالی لەشیعری (قەدری من چەندە لەلای)[٢٠٩ : ١٥٩]دا، سەرەتا حەفت دێری بەدوای یەکەوە تەسریع کردوە. ئینجا نۆ دێری بێ تەسریعی هێناوە و کۆتاییەکەی دووبارە کردۆتەوە موسەڕڕەع. نالی لەشیعری (موساوی

وەك یەك ولەولـن )[٢٠٩ : ١٢٣] هونەرمەندانـە بـە تەسـریع دەستی بـەدێرەکانی سـەرەتا کـردوەو لەرێی کەنڵی پـاش سـەرواوە وردە وردە وازی لـە تەسـریع هێنـاوە. چوار دێـری سـەرەتای تەسـریع کردوە. ئینجا بۆ خۆ کێشانەوە لە تەسریع، لەدێری پێنجەم پاش سەروای لەلـەتی یەکەم فڕێ داوە بەڵام سەرواکەی هەر پاراستوە، واتـە لـەدوو ڕەگـەزی سـەرواکە یـەکێکی ڕەچـاو کـردوە (سـەروا )و ئەوەی تری بەلاوە ناوە (پـاش سـەروا ). ئینجا وەکو هەنگاوی دوەم لـەچوار دێری کۆتـایی وازی لـە تەسریع هێناوە. نالی شیعری (مەستوورە )[٢٠٩ : ١٦٢]و شیعری (ئەو سیلسیلەوا مشکی )[٢٠٩ : ١٠٥] سەراپا تەسریع کردوون. ئەم دیاردەیە نەك هەر لای نالی هەیە، لەکوردی لای زۆر شـاعیری تریش هەستی پێ دەکرێ، بۆ نموونە مەلاعەباس کاکەیی زۆربـەی هـەرەزۆری شیعرەکانی هـەموو دێرەکانیان موسەڕڕەعە [١٢٤]، ئەمە لەشـیعری فارسیشدا هـاتوە، (جـاری وا هەیـە شـاعیر بـۆ هونەرنواندن، هـەموو دێـرە شیعرەکانی غەزەلەکـەی تەسـریع دەکـا، سنائیو سـەعدی ئـەم جـۆرە شیعرەیان هەیە)[٢٩٦ : ٦٧].

ج- دووبارە بوونەوەی وشەی سەروا:

کاتێ غەزەل و بەتایبـەتی قەسیدە درێژ دەبێتـەوە شـاعیر پێویستی بەوشـەی سـەروای زۆر دەبـێ بـۆ کۆتـایی دێرەکـان، بۆیە ڕێ دراوە شاعیر ناو بەناو وشەی سەروا، بەپێی پێویست دووبـارە بکاتـەوە. بەو مەرجەی حەوت دێر بەسەر بەکارهێنانی یەکەمی تێپەڕ ببێ، لەوە زووتر دووبارە بێتـەوە پەسند نییەو دەبێ بەکـەم و کورتـی (ایطـاء ). شـاعیری سـەرکەوتوو دەتوانێ بەشێوەیەکی هونەرمەندانـە وشەی سەروا لەشوێنی تایبەتی دووبارە بکاتـەوەو بینـای هۆنراوەکەی پێ مکوومتر بکـات. دووبـارە بوونەوەی وشەی سەروا، لەهەندێ شوێندا بۆتە مایەی بەرزکردنەوەی نرخی سەروا. هەر بۆیەشـە شاعیران سوودیان لێ وەرگرتوەو لـەوێ وشـەی سـەروایان هێنـاوەتەوە، گرنگترین شـوێن بـۆ دووبـارە بوونەوەی وشەی سەروا بەمانای خۆیەوە، ئەمانەن:

• دەشێ شاعیر دوو لـەتی دێری یەکەم، لەباتی سـەروا، بەوشـەی سـەروا یـەك بخـا، واتـە هەمان وشەیە لـەکۆتایی هـەردوو نیوەدا دووبـارە دەبێتـەوە بێ ئـەوەی بکەوێتـە خانـەی پـاش سەرواوە. خانیم دێری یەکەمی هۆنراوەیەکی بەم جۆرە تەسریع کردوە:

پڕتەوی حوسنت کە جیلوەیدا بەمەوجی نارونوور
سینەیی عاشیق بو هەڵگیرسا بەشوعلەی نارونوور[٧٦ : ١٣٨].

مەحوی لـە شیعری (موحەققەق)دا، کۆتـایی لـەتی یەکـەم و دوەمـی دێـری یەکـەمی بـەم دوو وشـەیە : (مـەنزوور، مەنسـوور) هێنـاوە ولـە لەتـەکانی دێـری دوەمیشـدا وەکـو خـۆی دووبـارەی کردوونەتەوە :

موحەققەق هەر کەسێ مەسلەکیبە حەقق و حەققییە مەنزوور
سولووکی چوونە سەرباره، تەریقەی پیریبە مەنسوور
لە ئولکەی عیشقەدا بۆ هەرکەسێ سەرباریبە مەنزوور
عولووی مەرتەبەی سەرباره ، بۆتە پەیڕەوی مەنسوور

شاعیر دەشێ تەسریعی دێری یەکەم بەوشەیەکی نەك دووبارەوە بوو، بەڵکو ڕەگەزدۆزی دروست بکا. ئەمە لێکدانێکی سەرواو جوانکارییە لەلایەك و یاری کردنە بەوشەو قووڵ کردنەوەی سەروایە لەلایەکی تر. زۆر شاعیری کلاسیکی، هەستیان پێ کردبێ یان نا، ئەو وشەی بزانن ڕەگەزدۆزی هەڵدەگرێ و لەگەڵ سەروای شیعرەکە دەگونجێ دەیبەنە دێری یەکەم و تەسریعی لەتی یەکەم و دووەمی پێ دادەمەزرێنن. حاجی لەسەرەتای هۆنراوەیەکیدا دەڵێ:

عەساوو قامەتم تیرو کەوانە
کەچی دڵ تالیبی ڕەوتی کەوانە [٦٠ : ١٢٨].

یەکەمیان (کەوان +ە)و دووەمیان (کەو +ان +ە)یە. حاجی لەزۆر هۆنراوەی تریدا تەسریعی ڕەگەزدۆزی هێناوە (ل٤٨، ٨١، ١١٦، ١٦٤، ١٦٦). نالیش وەك وەستای غەزەل و قەسیدەی کوردی ئەم لایەنەی پشت گوێ نەخستووە لە (ل٤٤، ٨٦) بەکاری هێناوە، حەمدی هەر زۆر حەزی لەو جۆرە وشە بازییە بووەو لەزۆر شوێندا پەنای بۆ بردوە (ل١٧٥، ١٨٦، ٢١٦، ٢١٧، ٢٤٦، ٢٤٧، ٢٦٤، ٢٨٤، ٢٩١، ٢٩٣،.....)...

• لەبەر ئەوەی شاعیر حسێبی سەرواو وشەی سەروای لەتی یەکەمی دێری یەکەمی لەگەڵدا ناکرێ، ئەوە بەهەل دەزانێ و لەدێری دووەمدا، هەمان وشەی سەروای لەتی یەکەمی دێری یەکەم دووبارە دەکاتەوە. ئەم کارە لای فارسەکان پێی دەگوترێ (رد القافیە)، سیروس شمیسا دەڵێ: (شاعیری کلاسیکی زۆرجار وشەی سەروای لەتی یەکەمی دێری یەکەم لەکۆتایی دێری دووەم دووبارە دەکاتەوە، ئەمە هونەرێکی جوانکاری (بدیعی)یە، پێی دەگوترێ -رد القافیە-و کۆنینەکان زۆر پەسندیان کردوە) [٣٩٨ : ١١٠] مەحوی دەڵێ:

خەتتی دەوری لێوی ئەڵێت ئەی مەسیحا لام وبێ
هەرلەجامەی سەبزئەچێ بۆ غەین و نوون و چیم و هێ
غونچە بازاڕی نەزاکەت داری بو تەنگی شکاند
هەر کە زاهیر بوو لە دەوری باغی حوسنت لام وبێ [١٨٠ : ٣٢٣].

یان وەکو نالی دەڵێ :

گەرمی و تەڕی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە
پشکۆی گوڵ ئاتەشی بەنەسیم بوو گەشایەوە
لالە کە مەجمەرێکە بەبا خۆش و گەش دەبێ
ناوی کە پڕ خەڵووزە بەشەونم کوژایەوە [٢٠٩ : ١٠٨].

•وا دەبێ وشەی سەروای لەتی یەکەم یان دووەمی دێری یەکەم لەکۆتایی هۆنراوەکە دووبارە بێتەوە ، ئەمە ئەرکی بەیەکەوە بەستنەوەی کۆتاییو سەرەتایی هۆنراوە دەبینێ وەك ئێستا لە خاڵی دادێ روونی دەکەینەوە.

د- داخستنی غەزەل و قەسیدەو بەستنەوەی بەسەرەتاوە. شاعیر زۆرجار کۆتایی هۆنراوەکە بەکراوەیی جێ ناهێڵێ، دەیخاتە پەیوەندییەکی بازنەیی بەوەی کە دێری دواوەی بەدێری یەکەمەوە دەبەستێتەوە، ئاشکراترین ئەڵقەی بەستنەوە دووبارەکردنەوەیە، بەتایبەتی دووبارەکردنەوەی دوا وشەی سەروای هۆنراوەکە. ئەمە بەچەند جۆرێکی جیاجیا کراوە:

•دووبارە کردنەوەی وشەی لەتی یەکەمی دێری یەکەم لەدێری کۆتایی هۆنراوەکە (بەهەمانماناوە)، مەحوی لەسەرەتای هۆنراوەیەکدا دەڵێ:

کە ئەمری فەرموو ئەو شاهە بە (اقرأ)
ئەگەر فەرمانی قەتلە کێ دەڵێ (نەء)؟ [١٨٠ : ٤٠].

لەسەروای کۆتایی هۆنراوەکە، هەمان وشەی (اقرأ)ی وەکو خۆی بەشکڵ و ماناوە دووبارە کردۆتەوە، بەمەوەش یەکەم لەت و دوا لەتی هۆنراوەکەی هێناوەتە یەك و بازنەیەکی داخراوی بەدەوری ناوەرۆکەکەدا کێشاوە، دێری کۆتایی ئەمەیە:

شەرەف هەر عیلمە نابینی کە ئەشرەف
موشەررەف بوو بە ئەمر ئەووەل بە (اقرأ).

ناری لەشیعری (غەزەل گەر)[٢٠٦ : ١٢٠]، وشەی سەروای لەتی یەکەمی هۆنراوەکەی (تەرو نارە بێ)، لەلەتی کۆتایی هەمان هۆنراوەدا دووبارە کردۆتەوەو حەریق لە هۆنراوەی (بە قوربان ئێستە هیجرانت)[٦٣ : ٣٤]، وشەی سەروای لەتی یەکەم (دەناسم)ولەتی کۆتایی هەمان شتی هێناوە. لەوەش زیاتر حەمدی لەهۆنراوەی (خۆشە سەرتانم)[٦ : ٢٤٥]دا. هەموو وشەکانی سەروای لەدێری پێش کۆتایی، لەلەتی دووەمدا داوە بەدەم یەك و دووبارەی کردوونەتەوە.

•دووبارە کردنەوەی وشەی سەروای لەتی یەکەمی هۆنراوە، لەلەتی کۆتایی هۆنراوەکەدا بەلام بەمانایەکی جیاواز، واتە لەشێوەی رەگەز دۆزی، نالی لەشیعری (ساقی بەمەیی) وشەی سەروای (نەوبە)ی لەلەتی یەکەم ولەتی کۆتایی هۆنراوەکە دووبارە کردۆتەوە بەلام لەیەکەمدا مانای (نوێ/بە) دەدات و دووەمیان مانای نۆرەو نۆبەتە.

•وا دەبێ دێری یەکەم تەسریعی بەوشە بێ نەك سەروا و وشەکە لەدێری کۆتاییش دووبارە بێتەوە، حەمدی دەڵێ:

قەمەر ئەم جارییەی کەی بوو؟ دواری دڵبەرم پێما
نەشەوقی دیدە نیم پێما، نە قووەی دەستم و پێ ما

ئینجا لەدێڕی کۆتایی هۆنراوەکەدا دەڵێ:

لەبەر دەردی سەرە (حمدی) بەسەر گەردی لەڕێدا کەوت
لەبەد بەختی لەسەر ڕێشدا سەری بێ سەندەلی پێ ما[٦ : ١٦٩-١٧٠].

وشەکانی سەروا (پێما، پێ‌ما، پێ‌ما) کە لەسەرەتاو کۆتایی هاتوون، مانایان جیایە: یەکەم واتە (بەمن)، بەمنی ڕوانی، دووەم لە(پێ)و فەرمانی (ما) پێك هاتوە، واتە هێزی (پێ)م نە (ما). سێیەم (پێ‌ما) واتە (بۆی مایەوە ئەم نموونەیە، ئەوەش دەردەخا کە سەروای دوا دێن بەهەر دوولەتی دێری یەکەمەوە بەستراوە، ئەمە پەیوەندییەکە بەهێزتر دەکات.

هـ- غەزەلی ئیسلامی کە یەکێتی سەروای تێدایە، زۆرجار پاش سەروا (ڕەدیف)ی دەبێ کە لەکۆتایی هەموو دێرەکان وەکو خۆی دووبارە دەبێتەوە، وەك ئەوەی بەردەوامی دەنگە یەکسانەکانی سەروا بێ وایە. ئەگەرچی پاش سەروا بواری شیعرەکە تەنگتر دەکاتەوە چونکە لەسەرەتا تاکۆتایی هەموو دێرەکان دەبێ لەگەڵ هەمان پاش سەروا بگونجێن، پاش سەروا جۆرە یەکێتی بابەتێك بەهۆنراوەکە دەداو وەکو تیشکۆ (بۆرە) هەموو دێرەکان لەیەك خاڵ کۆ دەکاتەوە. بۆ ڕادەی بەکارهێنانی پاش سەروا، با سەیری دیوانی چەند شاعیرێك بکەین: نالی لە(١٢١) هۆنراوەی (٣٤)ی پاش سەروای هەیە، بەڕێژەی (٢٨.١٪)، سالم لە (٢٣٢) هۆنراوە (٨٢)ی پاش سەروایە، ڕێژەی (٣٥.٤٪).

و- یەکێکی تر لەنیشانەکانی سەروای شیعری کلاسیکی پەیڕەوکردنی هونەری تەشتیرە (التشطير). تەشتیر ئەوەیە شاعیر هەر لەتێکی دێرە شیعرەکانی بکا بە دوو پارچەی هاوکێش، بەمەوە هەر دێرێك دەبێ بەچوار پارچەی وەکو یەك لەکێش (ئەم هونەرە لەو کێشانە دەبێ کە هەشت تەفعیلەیین، جا چ کێشی ساف وچ کێشی دەوری، ئەگەرچی لە کێشی ساف زیاترە)، سێ پارچەی پێشەوە هاوسەروا دەبن و پارچەی دواوە سەروای لەوان جیا دەبێ، لەگەڵ سەروای گشتی هۆنراوەکە یەك دەگرێتەوە[45]. لەشیعری کلاسیکیدا، جزیری لە هەموو شاعیرانی تر زیاتر مەراقی تەشتیرەو لەهەموویان زیاتر بایەخی پێداوە. جزیری لەهۆنراوەی (پێتا ئا تەشێ)دا کە لەسەر سەروای (ەشیش)ی نووسیوە، (جگە لەدێری یەکەم) ئەوانی تری هەموو تەشتیر کردوە. لە دێری (١٨)دا دەڵێ:

میحنەت کە شین ڕوژو شەبێ دەرفیرقە تا شیرین لەبێ
زولا ژیەر دەستێ تەبێ ئەو عەدلە، ئەم پڕ بێ خوەشین[٥٨ : ٣٩١].

---

(45) لەعەرەبیدا ، ئەگەرچی ئەم هونەرە زۆر نییە، بەڵام خەتیبی قەزوینی دوای پێناسە کردنی، نموونەیەکی (امرء القیس) هێناوە:

الماء منهمر و الشد منحدر    والقصب منظمر و المتن ملحوب [illegible].

لەبارەی تەشتیر کردنی دێرەکانی هۆنراوە، چەند جۆرێك هەن:

- وا دەبێ هۆنراوەکە هەمووی لەسەرەتا تاکۆتایی (جگە لەدێری یەکەم) تەشتیر بکرێ، وەکو ئەم شیعرانەی جزیری: (مشانەی حوسن) [٥٨ : ١٣]و (موغبەچەیێن مەی فرۆش) [٥٨ : ١٩]و (غەم و شادی) [٥٨ : ٢٧]و.... وەکو نموونەکەی سەرەوە.

- وا دەبێ (جگە لەدێری یەکەم)، هەموو دێرەکان تەنیا لەتی یەکەمیان تەشتیر بوو بێ بۆ دوو پارچەی هاوسەروا، لەتی دوەمیان تەشتیر نەبوو بێ، وەکو شیعری (دلّی یەخسیر)ی جزیری کە لەدێری دوەمدا دەڵێ:

زولفان تو بەس چین چین بکە، بسکێن مقابل دین بکە
پێشکێشی یەك زولفەك تەبن مولکی خوتەن، تەختی خەتا [٥٨ : ٣٤].

- بۆی هەیە شاعیر بەرێك و پێکی لەسەرەتاوە تاکۆتایی دێرەکان تەشتیر نەکا، چۆن و لە کوێ بەچوان و پەسندی زانی تەشتیرەکە بەو جۆرە بکا. وەکو نالی لەشیعری (دەستم لە گەردەنی خۆت) [٢٠٩ : ٩٣] کە (٩) دێرە، هەندێکی دێرەکەی هەموو تەشتیر کردوە، هەندێکی یەك لەتی تەشتیر کردوە، هەندێکی بێ تەشتیر هێناوە، بەم شێوەیە:

- دێرەکانی ٣، ٥، ٦، ٧، ٨ تەنیا لەتی یەکەمیان تەشتیر کراوە.

- دێرەکانی ٢، ٤ هەر دوو لەتیان تەشتیر کراوە: سێ پارچەی ناوەو هاوسەروان، پارچەی کۆتاییان چۆتەوە سەر سەروای گشتی.

- دێری (٩) کە دوا دێرە تەشتیرە و هەر چوار پارچەی هاوسەروان.

دێری یەکەمی شیعری تەشتیر کراو: ئەو شیعرەی تەشتیر دەکرێ، دێری یەکەمی بەحوکمی ئەوەی دەبێ تەسریعی تێدا ڕەچاو بکرێ، لەبارەی تەشتیرەوە شێوەی تایبەتی وەردەگرێ:

- دەشێ دێری یەکەم بکرێ بەچوار پارچەو هەر چواریان یەك سەروایان هەبێ کە سەروای گشتی هۆنراوەکەیە، وەکو جزیری لەدێری یەکەمی هۆنراوەی (غەم و شادی)دا دەڵێ:

چین چین کرن زولفێن سیا کەسك ئەتلەسی دیبا قەبا
ئیدی نیشان نابن خویا تێکەڵ کرن لازم سەبا [٥٨ : ٢٧].

لەتی یەکەم دوو پارچەیە لەسەر (سیا، قەبا) وەستاون، دوەمیش هەر دوو پارچەیە لەسەر (خویا، سەبا) وەستاون. هەموو پارچەکان سەروایان (ا)یە.

- وا دەبێ لەچوار پارچەی دێری یەکەم، پارچەی (١،٣) هاوسەروابن و پارچەی (٢،٤) هاوسەروابن. ئەمە لەهەموو جۆرەکانی تری تەشتیری دێری یەکەم باوترە. جزیری لەهۆنراوەی

(مەی چارەیە)دا دەڵێ:

دیسا ژنوو بێ حاڵە دڵ، ساقی وەرین جاما زوجاج
موشتاقی خەمرا ئاڵە دڵ، لێ خۆش ئانی بت میزاج [٥٨ : ١٧٢].

(حاڵە دڵ، ئاڵە دڵ) هاوسەروان و (زوجاج، میزاج)یش هاوسەروان.

- بۆی هەیە شیعرەکە سەراپا تەشتیر بێ. تەنیا دێری یەکەم نەبێ بەشێوەیەکی ئاسایی و بێ تەشتیر هاتبێ. وەکو هەر غەزەل و قەسیدەیەکی تر هەردوولەتی تەسریع کرابێ. جزیری شیعری (شەپالا شەنگ)[٥٨ : ٢٠١]ی سەرلەبەر تەشتیر کردوە تەنیا دێری یەکەم بێ تەشتیر ماوە، کە دەڵێ:

دلبەرێ ئێرۆ سەحەر ئاڤێتە جەرگێ من دو دۆخ
یەك ل سینە، یەك د دلدا، لەو ژمن تێن ئاخ و ئۆخ [٥٨ : ٢٠].

ئەمەیە هونەری تەشتیری باوی عەرەبی- فارسی کە هاتۆتە ناو شیعری کوردی. جزیری هەنگاوێکی لەوەیش مەزنتری هاویشتوە، لەباتی دێر بکا بەچوار لەت بەسەرواوە بیانبەستێتەوە، دێری کردوە بە(٨) یەکەی ئیقاعی (پێ)و هەمووی خستۆتە پەیوەندی سەروا بەندییەوە [٥٨ : ٢٢٠].

٢- غەزەلی خۆماڵیی ڕەسەن:

جۆری دووەمی غەزەلی کوردی، غەزەلی خۆماڵیی ڕەسەنە کە بەزاری گۆرانی دەستی پێکردوەو گەشەی سەندوە. ئەمە پەیوەندی بەدەستوورو یاساکانی غەزەلی ئیسلامییەوە نییە، سەرچاوەکەی بۆ فۆلکلۆری کوردی دەچێتەوە. ئەم غەزەلە ئەگەرچی لەجەرگەی زاری گۆرانییەوە چەرەکەی کردوە بەڵام هەر لەوێ نەماوەتەوە، لەم سەدەی بیستەمەدا پەڕییەوە بۆ سنووری زاری کرمانجی خوارووش. پیرەمێردکە زۆر کەوتبوە ژێر کاریگەری شاعیرانی زاری گۆرانی وەکو بێسارانی و مەولەوی و زۆر شیعری کردوون بەکرمانجی خواروو[46]، خۆیشی ئەم ڕێبازەی نووسینی غەزەلی پەسندتر کردوەو زیاتر پەیڕەوی کردوە. ئەم جۆرە غەزەلە نیشانەو خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیە، وەکو: بنەمای ڕەسەنی فۆلکلۆری، کێشی خۆماڵی دە بڕگەیی (٥+٥)، یەکێتی بابەتی سەراپای هۆنراوە، سەروای مەسنەوی، دووبارە کردنەوەی نیوەی لەتی یەکەم لەدێری یەکەم، بەکارهێنانی زمانێکی پاك و پاراوی کوردی. ئێستایش بۆ شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی سەروای غەزەلی خۆماڵی.

---

(46) پیرەمێرد زۆر شیعری بێسارانی کردوە بەکرمانجی خواروو لەدیوانەکەیدا هاتوون، جگە لەوەی نزیکەی هەر هەموو شیعری مەولەوی کردوە بەکرمانجی خواروو و بەناوی رۆحی مەولەوی چاپی کردوە. (دیوانی مەولەوی، گۆڕینی پیرەمێرد، چاپخانەی - سلمان الاعظمي - ، بەغداد، ١٩٦٨.)

## سەروای غەزەلی خۆماڵیی :

أ- سەروای غەزەلی خۆماڵیی بەگشتی مەستەوییە، هەربوو لەت بەیەکەوە دێرێك پێك دێنن و سەروایەك دەیانباتەوە سەریەك. ئەم دیاردەیە شاعیر کەمتر ماندوو دەکات و بەیەکێتی سەرواوە نابەستێتەوە، لەئەنجامدا وای لێ دەکا بێن درێژتربێ و ئازادانەتر پەل بەهەموو لایەکدا بهاوێ.

ب- لەباتی تەسریعی غەزەلی ئیسلامی، دێری یەکەمی غەزەلی خۆماڵی لەسەر بنەمای دووپات کردنەوە (التکرار) دادەمەزرێ، زۆر جار پێی یەکەم و دوەمی لەتی یەکەم هەمان شتە دووبارە دەبێتەوە وەکو رەنجووری دەڵێ:

دڵە نامەنی ، دڵە نامەنی
عەجائب پابەست، دانەو دامەنی [٩٦ : ٦٩].

جاری وا هەیە هەمان پێ لەکۆتایی لەتی دوەمیش دێتەوە، بەمەوە لەچوار پێی دێری یەکەم، سێیان دووبارەن (١،٢،٤) تەنیا پێی سێیەم دەگۆرێ، بۆ نموونە بێسارانی لەسەرەتای هۆنراوەیەکدا دەڵێ:

تەشریف نەوەردی، تەشریف نەوەردی
(یا)ی شەماڵ چێش بێ، تەشریف نەوەردی [٣٧ : ٦١]

پێی (تەشریف نەوەردی) سێ جار هاتووە. ئەم دووبارە بوونەوەی پێیەکانی سەرەتای هۆنراوە بۆ چەند مەبەستێك دەبێ، گرنگترینیان ئەمانەن:

- بۆ دامەزراندنی کێش و کەوتنە سەر ئیقاع و مۆسیقای شیعرەکەو جەخت کردن لەسەر شوێنی وەستانی ناودێر -Cesure- چونکە لەشیعری ژمارەییدا، شوێنی ئەم وەستانە بایەخێکی تایبەتی هەیە بۆ راگرتنی کێشەکە.

- دامەزراندنی سەروا، بەدووبارە کردنەوەی چوار جار لەیەك تاکە دێردا، تا ئەم تێر سەرواییە شیعرییەتەکەی قووڵتر بکاتەوەو لەدێرەکانی دواوەش سەروای بەئاسانی بۆ بێت.

- بۆ راکێشانی سەرنجی خوێنەر بۆ کەش و هەوای شیعرەکەو راهێنانی لەگەڵ سەرواو ئیقاع و ئاوازی هۆنراوەکە.

-جەخت کردن لەسەر ناوەرۆکی بابەتەکە، چونکە کرۆکی بابەتەکە لەدێری یەکەمەوە دەخرێتە روو، ئینجا لەدێرەکانی تر راڤە دەکرێو فراوان دەکرێتەوە. بێسارانی دەیەوێ باسی تاسەو پەرۆشی خۆی بکات، لەیەکەم دێرەوە تیشکی بۆ داوێو جەختی لەسەر دەکا:

تاسەی زەرووری، تاسەی زەرووری،
دەردی بێ هامدەرد، تاسەی زەرووری [٣٧ : ٥٥].

بۆ سەلماندنی ئەم دیاردەیەو چەسپاندنی وەکو دەستوورێکی غەزەلی خۆمالی، ئەم سەرژمێرەمان لەدیوانی (١٠) شاعیری ڕازی گۆرانی ئەنجامدا کە زۆر ئاشکرا دووبارە بوونەکە وەکو ڕەگەزێکی بنچینەیی غەزەل ساغ دەکاتەوە:

| دیوانی | ژمارەی غەزەل | بەدووبارە بوونەوە | بێ دووبارە بوونەوە | ڕێژەی سەدی دووبارەبووەکان |
|---|---|---|---|---|
| وەلی دێوانە | ٥٥ | ٥٤ | ١ | ٪٩٨.١ |
| ڕەنجووری | ١٠٣ | ٩٢ | ١١ | ٪٨٩.٣ |
| بێسارانی | ١٠٩ | ٩٠ | ١٩ | ٪٨٢.٣ |
| مەستوورە | ١٩ | ٨ | ١١ | ٪٤٢.١ |
| سەیدی | ٧٠ | ٣٧ | ٣٣ | ٪٥٢.٨ |
| مەولەوی | ٢١٣ | ١٢ | ٢٠١ | ٪٢.٦ |
| جەفایی | ٧٥ | ٩ | ٦٦ | ٪١٢ |
| مەلا عەباس حیلمی | ٢٠٦ | ١٥٠ | ٥٦ | ٪٧٢.٨ |
| خلیل مونەووەر | ٥٤ | ١٨ | ٣٦ | ٪٣٣.٣ |
| مەلای جەباری | ٣٧ | ١٤ | ٢٣ | ٪٣٧.٨ |
| هەمووی | ٩٤١ | ٤٨٤ | ٤٥٧ | ٪٥١.٤ |

خشتەی (١) ڕێژەی سەدی دووبارە کردنەوەی دەستەواژەی پێی یەکەمی دێری یەکەمی غەزەلی گۆرانی.

لەم خشتەیەدا دەردەکەوێ:

- زیاتر لەنیوەی غەزەلەکان (٥١.٤٪) ئەم جۆرە دوویات کردنەوەیان لەدێری یەکەم پەیڕەو کردوە.
- وەلی دێوانە لەهەموو شاعیرەکانی تر زیاتری بەکار هێناوە. (٩٨.١٪)ی شیعرەکانی بەم شێوازە دەست پێدەکەن.
- مەولەوی لەهەموویان کەمتری بەکار هێناوە. تەنیا (٢.٦٪)ی شیعرەکانی ئەم هونەرەیان تێدا هەیە.
- ئەگەر شاعیرەکان بەگوێرەی زۆر بەکار هێنانی ئەم دووبارە کردنەوەیەی سەرەوە ریز بکەین،

بەم جۆرە دەردەچێ: (وەلی دیوانە، ڕەنجووری، بێسارانی، مەلا عەباس کاکەیی، سەیدی، مەستوورە، مەلای جەباری، خەلیل منەووەر، جەفایی، مەولەوی).

مەولەوی کە لووتکەیەکی بەرزە، لەئەدەبی کوردی بەگشتی و زاری گۆران بەتایبەتی، کەمتر لای ئەم دیاردەیە کردۆتەوە، چونکە لەوە دەچێ دیاردەکە زیاتر فۆلکلۆری بێ، ئەوەتا وەلی دیوانە کە شیعرەکانی لەهەموو شاعیرانی تر سادەو میللی ترە، لەهەموویان زیاتر ئەم دیاردەیەی بەکار هێناوە. ئەم هەڵوێستەی مەولەوی سەرنجی توێژەرەوە کوردەکانی تریشی ڕاکێشاوە. ئەنوەر جاف لەنامەی دکتۆراکەیدا دەڵێ: (بەپێچەوانەی گەلێ لەشاعیرانی دیالێکتیکی گۆرانییەوە، مەولەوی تەعبیری یەکەمی نیو بەیتی یەکەم زۆر دووبارە ناکاتەوە[٢٠ : ١٩٦].

جێی سەرنجە، ئەم جۆرە دووپات کردنەوەیەی سەرەتا هەر لای شاعیرانی گۆران نەماوەتەوە، بۆ زاری کرمانجی خواروویش پەڕیوەتەوە. بۆ نموونە شێخ سەلام لەسەرەتای هۆنراوەی (تۆزێ لەنجەولار)، ئەم دەستەواژەیە (٣) جار دووبارە دەکاتەوە:

تۆزێ لەنجەولار، تۆزێ لەنجەو لار،
ناسك و نازدار، تۆزێ لەنجەولار[١٠٩ : ٨٩].

سەلام ئەم دیاردەی لەشیعری (ئەبجوولی گوێ چەمە)یش[١٠٩ : ٩١] هێناوە.

جگە لە سەلام، پیرەمێرد، سەرەتای (٣٨) هۆنراوەی بەم دووبارە کردنەوەیە دەست پێ کردوە، هەر بۆ نموونە بڕوانە پیرەمێردی ئەمر[٤٤]، لاپەڕەکانی (١٠٨، ١٤٠، ١٧٥، ٢٣١، ٣٠٤).

ج- لەم جۆرە غەزەلەدا، جگە لەو دووپات کردنەوەی لەدێڕی یەکەمدا دەکرێ، وا دەبێ شاعیر سەروای مەسنەوی یەکەم و دووەم یەك بخا، لەو حاڵەتەدا لەسەرەتای هەموو هۆنراوەیەکدا لەباتی دوولەت، چوارلەت هاوسەروا دەبن، وەکو بێسارانی لەسەرەتای هۆنراوەیەکیدا دەڵێ:

چراغم شەهید، چراغم شەهید
وەختێ وەنیگات، مەکەریم شەهید
بۆ بەشقی خودای حەمیدو مەجید
جەزولفی سیات یەك تایێ وەحید[٣٧ : ٨٩].

دێڕی یەکەم کە (چراغم شەهید)ی تێدا دووبارە بۆتەوەو سەرواکەی (ید)ە، ئەم سەروایە لەدێڕی دووەمیش پەیڕەو کراوە (مەجید و وەحید). ئەم دیاردەیە وەنەبێ شتێکی ڕێکەوت و سەرەڕۆ بێ، بەڵکو وەکو دەستوورێك وایە، هەر کاتێ دێڕی یەکەم دووبارە بوونەوەی دەستەواژەی پێی یەکەمی تێدا بێ، مەگەر بەدەگمەن، ئەگەرنا سەرواکەی لەدێڕی دووەمیش دووبارە دەبێتەوە. بۆ سەلماندنی ئەم ڕایە، با سەیری ڕێژەی دووبارە بوونەوەی دەستەواژەی دێڕی یەکەم و یەکخستنی سەروای دوو دێڕی سەرەتا بکەین لای دە شاعیرەکەی پێشوو:

| دیوانی | ژمارەی غەزەلی بەدووبارە | ژمارەی هاوسەروای دێری ٢،١ | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|---|
| وەلی دیوانە | ٥٤ | ٥٤ | ٪١٠٠ |
| ڕەنجووری | ٩٢ | ٨٩ | ٪٩٦،٧ |
| بێسارانی | ٩٠ | ٩٠ | ٪١٠٠ |
| مەستوورە | ٨ | ٨ | ٪١٠٠ |
| سەیدی | ٣٧ | ٣٦ | ٪٩٧،٢ |
| مەولەوی | ١٢ | ١٢ | ٪١٠٠ |
| جەفایی | ٩ | ٩ | ٪١٠٠ |
| مەلا عەباس حیلمی | ١٥٠ | ١٥٠ | ٪١٠٠ |
| خلیل مونەووەر | ١٨ | ١٨ | ٪١٠٠ |
| مەلای جەباری | ١٤ | ١٤ | ٪١٠٠ |
| هەمووی | ٤٨٤ | ٤٨٠ | ٪٩٩،١ |

خشتەی (٢)، ڕێژەی سەدی یەك خستنی سەروای مەسنەوی (٢،١) لەگەڵ ئەو غەزەلانەی دەستەواژەی یەکەمی دێری یەکەمیان دووبارە دەبێتەوە

لەم خشتەیەدا دیارە:

- (٨) شاعیر لەسەدا سەد پەیڕەوی ئەو دەستوورەیان کردووە.

- تەنیا دوو شاعیر لەو دەستوورە لایان داوە، ئەوانیش بەڕادەیەکی کەم، یەکەمیان سەیدی لە(٣٧) هۆنراوەدا تەنیا لەیەکێکیان پەیڕەوی نەکردوە کە دەکاتە ٢،٨٪. ڕەنجووری لەسەرجەمی (٩٢) هۆنراوەدا، لە(٣) هۆنراوە گوێی بەم دەستوورە نەداوە کە دەکاتە ٣،٢٪.

- کەواتە وەکو دەستوورێك دەتوانین بڵێین غەزەلی گۆرانی دێری یەکەم و دووەمی هاوسەروا دەبن. ئەم دەستوورە نەك غەزەلی زاری گۆرانی دەگرێتەوە، ئەو شیعرانەش دەگرێتەوە کە بەزاری کرمانجی خواروو نووسراون بەڵام بەدەستووری غەزەلی خۆماڵی داڕژاون. سەلام دوو هۆنراوەی مەسنەوی هەیە، لەدێری یەکەم دەستەواژەی پێی یەکەمی دووبارە کردۆتەوە، لەهەردووکیاندا دێری یەکەم و دووەم هاوسەروان. پیرەمێرد لەو (٣٨) هۆنراوەی دەستەواژەی یەکەمی تێدا دووبارە

کردوونەتەوە، تەنیا لە(٤) هۆنراوەدا لەو دەستوورە لای داوە کە دەکاتە (١٠,٥٪)ی هۆنراوەکان.

د- ئەگەرچی سەروای غەزەلی خۆماڵی مەسنەوییە، بەڵام شاعیر بەزۆری دڵی بەمەسنەوی دا ناکەوێ، حەزلەدووبارە کردنەوەی هەمان سەروا دەکا لەچەند مەسنەوییەکی دوای یەك. بۆ نموونە شیعری لاپەڕە (١٣٦)ی دیوانی رەنجووری زۆربەی تەسریعەو سەروای لەتەکان یەکە (-ەسم)، ئەم دیاردەیە لای جەفایی [٥٤ : ٣٩، ٥٥، ٦١، ٨٣، ٩٥]و لای وەلی دێوانە [٢١٥ : ٤٤]و لای بێسارانی [٣٧ : ٨٢، ١٠١]و لای مەولەوی [١٨٦ : ٣٠٧، ١٨٢، ١٤١]و... بەرچاو دەکەوێ، لەوەش زیاتر، شاعیر زۆر جار هەر بەیەك خستنی سەروای چەند مەسنەوییەك واز ناهێنێ، بگرە سەراپای هۆنراوەکەی تەسریع دەکا، واتە هەر لەسەرەتاوە تاکۆتایی لەتەکان یەك سەروایان دەبێ. سەراپای دیوانی عەباس حیلمی کاکەیی، چەند هۆنراوەیەکی کەمی لێ دەرچێ ئەوەی دی هەمووی موسەڕڕەعە. ئەم دیاردەیە لای بێسارانی [٣٧ : ١٤٧]و جەفایی [٥٤ : ١٣٦، ٤١، ١٢٣، ١٥١، ١٦٠]و رەنجووری [٩٦، ١٠٤، ١٠٥، ١٠٦، ١٢٩، ١٤٤]و وەلی دێوانە [٢١٥ : ٢٢...]و... دووبارە بۆتەوە.

ە- شاعیر زۆر جار لەم جۆرە غەزەلەدا، وەکو غەزەلی ئیسلامی، پەیڕەوی تەشتیر دەکا. هەر لەتێکی دەکا بەدوو پارچە، هەر دێڕێکی دەبێ بەچوار پارچە، بەڵام لەوەدا لەتەشتیری غەزەلی ئیسلامی جیایە، لەوێ هەر پارچەیەك دوو تەفعیلەی عەرووزی دەردەچێ، لێرە هەر پارچەیەك یەك پێی کێشی خۆماڵییە (٥ بڕگەیی). تەشتیر لەغەزەلی خۆماڵیدا، بەزۆری بەدوو جۆر دەبێ:

- وا دەبێ هەر چوار پارچەی مەسنەوییەکە یەك سەروایان هەبێ، وەکو مەولەوی دەڵێ:

تبنەت نەزیفێ، زینەت زەریفێ
خەلقی لەتیفێ، خولقی شەریفێ [١٨٦ : ٤٨٤].

مەسنەوییەکە لەئەسلدا سەروای (-ەریفێ)یە، ئینجا هەمان سەروا لەناوەڕاستی هەردوو لەتدا هاتوە، جگە لە سەروای ناوەوە، ئاوازی وشەکان بەجۆرێکی وا گونجاو بەیەکەوە هاتوون، هەردەڵێی ئاوی ڕەوانە بەنەرم و هێمنی، بەسەرواو ئاوازێکی ناسك شۆڕەبێتەوە ناخی مرۆڤ. ئەو ئاوازەی جگە لەسەروا لە وشەکانی سەروادا هەیە (نەزیفێ، زەریفێ، لەتیفێ، شەریفێ)، جگە لە وشە هاوجێکانی (تبنەت، زینەت) هاوکێش و هاو ئاوازو هاوسەروان، (خولقی، خەلقی)یش لەنیوەی دوەمدا سەدا و دەنگدانەوەیان زۆر لەیەك دەکات.

- وا دەبێ مەسنەوییەکە سەروای خۆی هەبێ، پارچەکانی پێشەوەی هەردوو لەتیش لەگەڵ یەکتر هاوسەروابن، هەر مەولەوی لە دێڕێکی تردا دەڵێ:

خورشید ئەتوارێ، نیلوفەر زەوقێ
عەزرا عوزارێ، وامیقێ شەوقێ [١٨٦ : ٤٨٢].

سەروای کۆتایی مەسنەوییەکە (-ەوقێ) لە (زەوقێ، شەوقێ)دایە، ئینجا پارچەی یەکەمی هەردوو لەتەکە بە سەروای (-ارێ) بەیەکەوە بەسراون کە لە وشەی (ئەتوارێ، عوزارێ)دا هەیە.

مەولەوی لێرەش هەر بەسەروای ناوەوە و تەشتیرەکە وازی نەهێناوە ، لەپاڵ ئەمیشدا ، یاری بە دوویات کردنەوەی دەنگی وشەکان کردووە جۆرە مۆسیقایەکی زیادەکی بەئاوازی دێرەکە داوە و وشەکانی توند بەیەکەوە شەتەك داوە . وەکو دەنگی (ع،ز) لە (عەزرا و عوزار)، دەنگی (ق) لە وشەی (وامیق ، شەوق)، هەردوو پارچەش لە ڕووی دەلالییەوە بە وشەی (عەزرا، وامیق) بەیەکەوە بەسراون کە ئەوانیش خۆشەویستی بەیەکەوە بەستبوونییەوە، ئەمە زیاتر تەرسیعە نەك تەشتیر

و- پاش سەروا (ڕەدیف) لەغەزەلی خۆماڵیدا ، لەگەڵ مەسنەوی دەڕوا ، چونکە پاش سەروا بەزۆری بەندە بە سەروا ، لەکوێ سەروا هەبوو دەشێ پاش سەروا بۆ خۆی ڕابکێشێ ، جا ئەو سەروایە یەك جار دووبارەبێتەوە یان سەدجار ، لەغەزەلی خۆماڵیدا ، زۆر جار سەرباری ئەوەی دێرەکان سەروایان مەسنەوییە ، یەك پاش سەروا چەند مەسنەوییەك پێکەوە دەبەستێتەوە وەکو وەلی دێوانە [٢١٥ : ٣١ ، ٤٥ ، ٦٥ ، ٧١ ، ٨٠] و بێسارانی [٣٧ : ٤١ ، ١٠٢] و مەستوورە [١٨١ : ٢٤ ، ٢٦ ، ٤٥ ، ٥٦ ، ٦٥] و ڕەنجووری [٩٦: ٥٢ ، ٥٤ ، ٩٤ ، ٩٧ ، ١٣٥ ، ٢٠٤ ، ٢٢٧] و مەولەوی [١٨٦ : ١٠٠] . زۆرجاریش یەك پاش سەروا لەگەڵ هەر هەموو مەسنەوییەکانی هۆنراوەکە دێتەوە، وایش دەبێ یەك دوو مەسنەوی مل نادەن بۆ پاش سەرواکە ، وەکو وەلی دێوانە [٢١٥ : ٧٣] وشەی (شەم)ی کردووە بە پاش سەروا ، تەنیا دوو دێری کۆتایی بە ڕووتی هێناوە، ئەوەی تر (١٥) مەسنەوییە هەموویان بەم پاش سەروایەوە لکاون. یان ڕەنجووری [٩٦ : ٩٧]، لەهۆنراوەیەکی (١٢) مەسنەویدا ، (بۆ)ی کردووە بە پاش سەروای گشتی و لەکۆتایی هەموو دێرەکان دووبارە بۆتەوە، تەنیا دێری (٧،٨،١١) نەبێ ، پاش سەرواکەیان ڕەت کردۆتەوە .

## لەنێوان غەزەلی ئیسلامی و غەزەلی خۆماڵی :

ئەم دوو جۆرە غەزەلەی کوردی ، کە هەر لەسەرەتاوە لەیەك جیا بوون و هەریەکە سەربەخۆ و بەپێی بنەماو دەستووری تایبەتی خۆیەوە گەشەی کردووە و پەرەی سەندووە ، لەزۆر لاوە جیاوازن وەکو بنەمای دەرکەوتن و خاسیەتی وەکو کێش و سەروا و زمان و بابەت و زاری نووسین ...

لەبەراوردی ئەم دوو جۆرە غەزەلە چەند تێبینیەك گەلاڵە دەبێ پێویستی بەئاماژەکردنە :

لەبارەی کێش و سەرواوە ، غەزەلی ئیسلامی لەسەر کێشی دەستکاری کراوی عەرووزی و یەکێتی سەروا دەڕوا، کەچی غەزەلی خۆماڵی بە کێشی خۆماڵی دە بڕگەیی (٥+٥) و سەروای مەسنەوی دەنووسرێ. ئەمە لەسەرەتاوە وەك دەستوورێکی پتەو پەیڕەوی کراوە ، بەڵام لەئەنجامی تێکەڵاوی و کاریگەری شاعیرانی زارە جیاکان، جۆرە تێکەڵی و بەناویەکدا چوونێك لەم دوو ڕەگەزەی غەزەل پەیدا بوە. جۆرە غەزەلێك سەری هەڵدا دەشێ پێی بڵێین (نیمچە ئیسلامی، یان نیمچە خۆماڵی)، چونکە لە نێوان هەردوو جۆرەکەدایە. لەم دوو ڕەگەزەی باس کران (کێش و سەروا )، هەریەکەی لە جۆرە غەزەلێك خواستۆتەوە ولەیەکی داون و غەزەلێکی تازەی لێ دروست کردوون، ئەمیشیان دووجۆرە :

- وا دەبێ کێشی غەزەلی ئیسلامی (عەرووزی) وەرگیرابێ و لەگەڵ دەستووری سەروای غەزەلی خۆماڵی (مەسنەوی) لێك درابێ ، غەزەلێك دەرچووبێ بە کێشی عەرووزی و سەروای مەسنەوی.

زۆربەی هۆنراوەکانی ئەوڕەحمان بەگی بابان لەم بابەتەن ، لە هۆنراوەیەکدا دەڵێ:

من بەحەقتا سڵەوە کەوتوومە داوی ناسکێ ................... A

چاو غەزاڵێ ، وردە خاڵێ ، بەژن و باڵا ناسکێ ................... A

ئەو بەحەققە سڵەوە وەك دارگوڵێ تازە و تەڕە ................... B

دڵ فڕێنە ، دڵ ستێنە ، دڵ شکێنە ، دڵبەرە ......................... B[٢٥ : ٤٨].

هۆنراوەکە (١٢) دێڕەو هەمووی سەروای مەسنەوییە . ئەم جۆرە غەزەلە لای زۆر شاعیری تر بەرچاو دەکەوێ ، بەتایبەتی شاعیرانی سەدەی بیستەم کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری بزووتنەوەی نوێخوازی نەتەوەکانی دەوروبەرو سوودیان لە فۆلکلۆر دەبینێ بۆ وشەو دەستەواژەی کوردی ڕەسەن و بابەتی نوێ و سەروای مەسنەوی و کێشی خۆماڵی وەکو شێخ نووری (٦) هۆنراوەو جروستانی (٢) هۆنراوە و کانی (٢) هۆنراوە و بێ‌وەی (١) هۆنراوەو ئەدەب (٣) هۆنراوەو بەختیار زێوەر (١٠) هۆنراوەو مینە جاف (٨) هۆنراوەو خادیم (١٢) هۆنراوەو حەمدی (١) هۆنراوەو حەریق (١) هۆنراوەی لەم بابەتەی هەیە.

- وا دەبێ بەپێچەوانـەوە، کێشی شیعرەکە وەکو غەزەلی خۆماڵی کێشی خۆماڵی (دە برگەیی: ٥+٥) بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەباتی مەسنەوی شاعیر بەگشتی سەروای تێدا پەیڕەو کردبێ.

پیرەمێرد لە شیعرێکدا کە بەم جۆرەی نووسیوە دەڵێ :

ئۆخەی بەسەرچوو زستانی بێ‌ژین

ئەمڕۆ بەهارە غونچەی باغی ژین

نزیکە دەرچێ بەدیاری و خەڵات

بۆمان هەڵبدرێ لەدیوی پەرژین[٤٣ : ٢٥٣].

ئەم شیعرە لەسەر کێشی خۆماڵی دە برگەییە ، بەڵام لەسەرەتا تا کۆتایی یەك سەروای هەیە (ـژین) وەکو غەزەلی ئیسلامیش دێڕی یەکەم تەسریع کراوە. ئەم جۆرە غەزەلە لای شاعیرانی تریش بەرچاو دەکەوێ : حیلمی و شێخ ڕەزا و عەونی یەکەو (١) هۆنراوە، لوتفی (٢٧) هۆنراوە و شاکەلی (٤) هۆنراوە و شاهۆ (٣) هۆنراوەو کەمالی (٣) هۆنراوەو ویسالی (٤) هۆنراوەو شاری (١٤) هۆنراوەی بەم جۆرە غەزەلەنووسیوە .

• بزووتنەوەی نوێخوازی لە شیعری کوردی ، غەزەل و قەسیدە ، لە غەزەلی ئیسلامییەوە بەرەو غەزەلی خۆماڵی دەبا ، چونکە یەکەم بنەوانی لە شیعری نەتەوەکانی تر وەرگرتوە و ڕەسەن نییە ، کەچی دوەمیان سەرچاوەکەی بۆ ئەدەبی فۆلکلۆری دەگەڕێتەوە و بنەمایەکی ڕەسەنی هەیە ، یەکێ لە ڕەگەزەکانی نوێخوازی گەڕانەوەیە بەرەو ڕەسەنایەتی ، چ لە وشە بێ و چ لە دەستووری شیعری بێ و چ لەبابەت و کەرەستەی نووسین بێ .

## دووەم- تەسمیت و تەرجیع بەندو تەرکیب بەند :

ئەم سێ هونەرە شیعرییە لەوە یەك دەگرنەوە کە لەسەر بنچینەی دابەش کردنی شیعر بۆ چەند پارچەی جیاواز هاتوون. ئەو پارچانە لەهەندێ سەرەوە لێك دادەبڕێن و لەهەندێ سەرەوە بەیەکەوە دەبەسرێنەوە. لەم دابڕاندن و بەیەکەوە بەستنەوەیەدا سەروا دەوری خۆی دەبینێ. لە هەر هۆنراوەیەکدا، پارچەکان، جگە لەبیری گشتی و کێش، بەسەروای یەك دوو لەتی کۆتایی پارچەکان یان بەشێوەی دابەشبوونی لەت و سەروای لەتەکان بەیەکەوە دەبەسرێنەوەو بەگۆڕانی سەروای لەتەکان لێك دادەبڕێن. بەڵام ئەم سێیانە هەریەکە دەستوورو خەسیەتی خۆی هەیەو بەپێی سیستەمی تایبەتییەوە کار دەکات و پەرەدەسێنێ.

تەسمیت لەبنچینەدا لەسەر چۆنیەتی دابەشبوونی سەروای لەت هاتووە نەك دێر. ژمارەی لەتەکانی پارچەی تەسمیت بەزۆری لەنێوان (٤-٨) دایە. بەگوێرەی ژمارەی ئەو لەتانەی لەکۆتایی پارچەکاندا سەروایان دەگۆڕێ، دوو جۆرە تەسمیت هەیە.

أ- وا دەبێ لەهەر پارچەیەکدا، تەنیا یەك لەتی کۆتایی سەروای دەگۆڕێ‌و لەتەکانی پێشەوە ژمارەیان هەرچەندەی هەبێ (٣-٧) هاوسەروا دەبن، ئینجا سەروای لەتی کۆتایی هەموو پارچەکان یەك شت دەبێ‌و پارچەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. ئەم جۆرەیان، لەکوردیدا، بەتایبەتی لەو هۆنراوانەدا زۆرە کە بۆ پارچەی چوار لەتی‌و پێنج لەتی دابەش بووین، ئەمەیان دوو جۆرە:

- وا دەبێ لەتی کۆتایی پارچەکان تەنیا سەروایان وەکو یەك بێ‌و بەیەکەوە بیانبەستێتەوە. لە نموونەی چوارینە وەکو (لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتوە)ی بێخود [٣٦ : ٦٦]و (بەندی شەمال)ی پیرەمێرد [٤٤ : ٣٤٩]و (بەهەشت)ی بێکەس [٣٨ : ٦٦]. بۆ پارچەی پێنج لەتی، ئەو هەموو پێنج خشتەکییانە دەگرێتەوە کە شاعیران لەسەر شیعری یەکتریان کردوە. ئەمە نموونەی لەشیعری کوردیدا، زۆرە پێویست بەئاماژە کردنی ناکا. پێنجینەیش لەکوردیدا زۆرە، هەر بۆ نموونە وەکو (نەورۆزنامەی نەورۆزو بەرۆژن)ی پیرەمێرد [٤٤ : ٣١٣]و (کاکی زاڵم) [١٥٥ : ٦٦]و گلەیی لەچەرخ [١٥٥ : ٦٦]و نامەیەك [١٥٥ : ٨٣]ی قانیع.

- وا دەبێ لەتی کۆتایی لە هەموو پارچەکاندا یەك شت بێ‌و وەکو خۆی بێ دەستکاری بێ‌و دووبارە بێتەوە. ئەم لەتە دووبارە بووەوە دەوری بەیەکەوە گرێدانی پارچەکان دەبینێ، چونکە دوای هەر پارچەیەك دەگەڕێتەوە سەر هەمان شت. ئەمە توندی‌و پتەوییەکی زیادە بەیەکێتی پارچەکان دەدا وەکو: (لاوی کوردان)ی دڵدار [١٢٥ : ٢٠٢] کە دابەشی پارچەی چواریی کردوەو لەتی کۆتایی هەموو پارچەکان هەمان شتە (بەگۆڕانێکی کەمی هەندێ وشە): (لاوی کوردان هەر لەدەوری مەی ئەکەن غیرەتکەشی). هەندێ جار (لاوی کوردان) بوە بە(لاوی ئێمەش)و یان سەرەتاکەی

لەباتی (لاوی کوڕیان هەر) بوە بە(عەیبە چیتر بەس).. یان وەکو (ئەو دلبەرو)ی بێکەس [٣٨ : ١١٢] کە لەتی چوارەمی هەموو پارچەکان ئەمەیە: (باوەڕ بەوەعدەی ئەو نەکەی). لەپێنجینەیشدا وەکو (فەرمانی میری بۆتانە)ی پیرەمێرد [٤٤ : ٣٤٥] کە لەکۆتایی هەموو پارچەکان ئەم ڕستەیە دووبارە دەکاتەوە، یان وەکو ئەم پێنجینانەی قانیع کە لەهەموویاندا لەتی پێنجەم لەهەموو پارچەکانی هۆنراوەکەدا یەك شتە، (بۆوەتەن بێشەی شێرانم) [١٥٥ : ٧٢] (دینێنی ئالاّ) [١٥٥ : ٧٤]، (لەگەڵ زانین) [١٥٥ : ١٤١]. یان وەکو (لەڕێگەی چەمچەماڵ)ی سەلام [١٠٩ : ١٠٢] کە لەکۆتایی هەموو پارچەکاندا (بەرتۆ هەزاران، عەلبە جۆ) دووبارە دەکاتەوە.

ب- وا دەبێ لەهەر پارچەیەکدا (ژمارەی لەتەکانی هەرچەندی بێ) لەتە[illegible]ی هاوسەروا دەبن تەنیا دوولەتی کۆتایی نەبێ کە لە نێوخۆیاندا هاوسەروابن و لە لەتەکانی تر جیابن. بەمەوە کۆتایی هەر پارچەیەك وەکو مەسنەوی خۆی دەنوێنێ. ئەمە سێ لقی لێ دەبێتەوە:

١- وا دەبێ لە هەموو پارچەکان مەسنەوەییەك وەکو تەرجیع لەکۆتایی هەموو پارچەکان دووبارە دەبێتەوە. لەم حاڵەتەدا مەسنەوییەکە بە: دووبارە بوونەوەی گشتی و سەرواوە، هەموو پارچەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، وەکو هۆنراوەی (قانیع و سەری) [١٥٥ : ٢٤٣]ی قانیع کە (١٠) پارچەی شەشینەیە، لەهەر پارچەیەکدا چوار لەتی پێشەوە هاوسەروان و دوولەتی کۆتایی (مەسنەوی)ن. لەهەموو پارچەکان یەك شتە دووبارە دەبێتەوە:

لە خوا ئەخوازم کە بە بڕین چێ
تا دوا هەناسەی بە زارو شین چێ [١٥٧ : ٢٤٣].

قانیع لەشەشینەی (قانیع دڵی) [١٥٥ : ٢٤٥]و بێکەس لەپێنجینەی (دڵ) [٣٨ : ٨٤] هەمان شتیان کردوە. ئەمەیش لەبەر ئەوەی مەسنەوی کۆتایی هەموو پارچەکانی هەمان شتە پێی دەگوترێ (تەسمیتی تەرجیع).

٢- وا دەبێ مەسنەوی کۆتایی هەموو پارچەکان یەك شت نەبێ، لەپارچەیەکەوە بۆ پارچەیەکی تر بگۆڕێ، ئەمە لەڕووی سەرواوە دوو جۆرە:

•وا دەبێ سەروای مەسنەوی کۆتایی هەموو پارچەکان یەك بێ و بەم سەروایە پارچەکان بەیەکەوە ببەسرێنەوە، وەکو هۆنراوەی (لەسەر لوتکەی پیرە مەگروون)ی بەختیار زیوەر [٣٢ : ١٩٠] کە (٩) پارچەی شەشینەیە. هەر نۆیان سەروای مەسنەوییەکانی کۆتایی (-اسین)-ە: یان وەکو پێنجینەی (بەشارەت بێ لەقەومی کورد)ی بێکەس [٣٨ : ٧٥].

•وا دەبێ سەروای مەسنەوییەکان یەك نەبێ، مەسنەوی کۆتایی هەر پارچەیەك سەروای سەربەخۆی هەبێ، کە لەسەروای لەتەکانی تری هەمان پارچەو لەسەروای مەسنەوییەکانی تری پارچەکانی تریش جیابێ، وەکو (مەلی گیرۆدە)ی سەلام [١٠٩ : ١٣٧]. ئەم جۆری دوەمینە

لەبەر ئەوەی سەرواى پارچەکانى لەسەر بنچینەی لەت هەستاوە (تەسمیتە) و لەبەر ئەوەی، دێڕێک (مەسنەوی) نەک (تەنیا یەک لەت) لەکۆتایی هەموو پارچەکان سەرواى دەگۆڕێ، وەکو تەرکیب بەند خۆی دەنوێنێ، بۆیە دەشێ پێی بگوترێ (تەسمیت تەرکیب).

•وا دەبێ پارچەکان سەروایان لەسەر بنچینەی لەت هاتبێ و لەکۆتایی هەر پارچەیەکیشدا سێ لەت سەروایان لەسەرواى لەتەکانی پێشوو جیا بێ. لەم سێ لەتەیش یەک یان دوو لەتیان لەپارچەیەک بۆ پارچەیەکی تر بگۆڕێن جا سەروایان هەمان شت بێ یان سەروایان جیابێ و لەتی کۆتایی لەهەموو پارچەکان وەکو خۆی دووبارە بێتەوە، وەکو هۆنراوەی (چرای کوردستان)ی جزیری کە (٥) پارچەیەو هەر پارچەیەک (٢٥) لەتە (٢٢) لەتیان هاوسەروان و سێ لەتی کۆتاییان هاوسەروان و لەسەرواى لەتەکانی پێشەوە جیان، ئەم سێ لەتەی کۆتاییش لەتێکیان لەپارچەیەکەوە بۆ پارچەیەکی تر دەگۆڕێ بەڵام لە هەر (٥) پارچەدا سەرواى لەگەڵ دوو لەتی کۆتایی وەکو یەکە. ئەگەر هەر پێنجیان کۆ بکەینەوە پارچەیەکی (٥) لەتی هاوسەرواى سەربەخۆی لێ دەردەچێ. پارچەکە بەم شێوەیە یە:

ژ خو دێرا ڤەکە بەندا بەرێ ............. پارچەی (١)
زوهرە ڕەنگێ و شەفەق مشتەرێ ..... پارچەی (٢)
ماوە دلبەر دکرن دلبەرێ ............... پارچەی (٣)
ئەگری ئەرک توڤێ کافرێ ............... پارچەی (٤)
تو بشیرانی و لە ب شەککەرێ .......... پارچەی (٥) [٥٨ : ٥٣٤-٥٣٩].

بەڵام دوو لەتی کۆتایی لەهەموو پارچەکان بە دەقە خۆی، بێ گۆڕان و دەستکاری دووبارە دەبێتەوە:

(دین بەرێ حوری میسا لێ زەرێ          نازکێ ئەیشەکەرێ سوڕ بەرێ).

ئەم جۆرە: لەبەر ئەوەی سەرواى پارچەکانی لەسەر لەت هاتووە (تەسمیتە)، لەبەر ئەوەی هەموو پارچەکان کۆتاییان بەچەند لەتێک هاتوە (یەکێکیان دەگۆڕێ) کە سەرواى لەگەڵ سەرواى لەتەکانی پێشوو جیایە (تەرکیبە) و لەبەر ئەوەیش کە لەکۆتایی هەر پارچەیەکدا، دوو لەت کت و مت وەکو خۆی بێ گۆڕان دووبارە دەبێتەوە (ترجیعە)، کەواتە ئەم جۆرەیان پێی بگوترێ: (تەسمیتی تەرجیع تەرکیب).

## چەند سەرنجێک لەبارەی هونەری تەسمیت:

١- بۆی هەیە لەهەموو جۆرەکانی تەسمیت پارچەی یەکەم وەکو تەسریع وابێ، واتە لەسەرەتا تاکۆتایی هەموو لەتەکانی هاوسەروا بن و ئینجا بۆ پارچەی دوەم و پارچەکانی دواتر لەتەکانی پێشەوە سەروایان بگۆڕێ و یەک، دوو، سێ لەتی دواوەش یان هەمان سەرواى لەتەکانی پارچەی

یەکەمیان هەبێ یان سەروایەکی سەربەخۆی تری جیا لەسەروای لەتەکانی پارچەکەیان هەبێ.

٢- بۆی هەیە تەسمیت لە هەموو پارچەکان دا، هەموو لەتەکانی هاوسەروابن و لەهیچ پارچەیەکدا هیچ لەتێك سەروای نەگۆڕێ، وەکو (سکاڵای دڵ بۆ ئەستێرەیەکی هاوڕێم)ی بەختیار زێوەر[٣٢ : ١٥٥] کە (١٥) پارچەی چوارینەیەو هەموو چوارینەکان هاوسەروان (لەناو دڵی مێرگەکەمان) (ل١٧٧)یشی هەمان شتە. یان وەکو تەسمیتی (بەهاری سلێمانی)ی بێکەس [٣٨ : ١٠٠] کە (٧) پارچەیەو هەر پارچەیەکی (٦) لەتی هاوسەروایە.

٣- وا دەبێ شاعیر لەسەرەتا تاکۆتایی هۆنراوەکەی تەسریع دەکا. واتە سەروای هەموو لەتەکانی یەك دەخاو بیناى سەروای هۆنراوەکە لەباتی دێر دەکەوێتە سەر لەت. وەکو دوو شیعری نالی (ئەو سیلسیلە) [٢٠٩ : ١٠٥]و (مەستوورە) [٢٠٩ : ١٦٢]و زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی مەلا عەباس حیلمی کاکەیی [١٢٤]. شیعری (مەستوورە)ی نالی تەسمیتە، چونکە هەم سەروای هۆنراوە کە لەسەر بنچینەی لەت هاتووە هەم هۆنراوەکەش دابەشی چەند پارچەیەك کراوە، ئەگەرچی پارچەکان ژمارەی لەتەکانیان یەکسان نییە. (١١) بەندە، ژمارەی لەتەکانیان لەنێوان (٦-٣٠) دایە. کەچی شیعری (ئەو سیلسیلە)ی نالی و شیعرەکانی مەلا عباس و هەر شیعرێکی تری وا کە هەموو لەتەکانی هاوسەروا بن بەلام دابەش پارچە نەکرا بێ، نابێ بە تەسمیت.

٤- ئەم جۆرانەی تەسمیت لەگەڵ هەندێ حاڵەتی پارچە گشتیەکان یەك دەگرنەوە، ژمارەو دابەشبوونی سەروای لەتەکانی پارچەکان لە هەر دووبارادا یەکە، بەلام ئەگەر کەوتنە ئەم قالبەی ئێرە دەبن بەتەسمیت.

<u>تەرجیع بەندو تەرکیب بەند:</u>

ئەم دوو هونەرە لەو بارەیەوە وەکو یەك وان کە بریتین لەهۆنراوەیەکی دوورو درێژ کە دابەشی چەند پارچەیەك دەکرێ، هەر پارچەیەك وەکو قەسیدەیەکی سەربەخۆ وایە، سەرەتای بەزۆری تەسریعەو یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەو کراوە. هەموو پارچەکان کە پێشیان دەگوترێ (بەند) یان (خانە) [٢٦٦ : ٢٥٩] لەسەر یەك کێش دەڕۆن. بەلام هەر پارچەیەك سەروای تایبەتی خۆی هەیە، لەبەینی هەر پارچەیەك و پارچەیەکی تر دێرێك دێ کە پارچەکان لەیەك جیا دەکاتەوە. ئەم دێرە وەکو هەموو پارچەکان لەسەر هەمان کێشە. جۆری ئەم دێرە دەبێ بەهۆی لێك جیا کردنەوەی تەرجیع بەندو تەرکیب بەند. ئەگەرچی لەسەردەمی کۆنا هەمووی هەر بەتەرجیع بەند ناوبراوە، قەیسی رازی بەپێناسە هەردوو جۆری ڕوون کردۆتەوە بەلام بۆ هەردووکیان هەر ناوی تەرجیعی داناوە، دەڵێ: (ئەوەیە کە هۆنراوەیەك دابەشی چەند پارچەك بکەن کە هەموویان لەکێشدا وەکو یەك و لەسەروادا جیاواز بن. شاعران هەر پارچەیەکی لەمانە بەخانە ناو دەبن و ئەوسا نێوان دوو خانە بەتاکە دێرێك لەیەك جیا دەکەنەوەو بەم دێرە دەڵێن تەرجیع بەند. ئەگەر بیانەوێ <u>هەمان دێر</u>

دەکەن بە تەرجیع بەندی هەموو خانەکان و لەکۆتایی هەر پارچەیەك و سەرەتای پارچەی تری دوای ئەو دەینووسن و ئەگەر بیانەوێ لەهەر خانەیەکدا تەرجیع بەندێکی سەربەخۆ دەڵێن و ئەگەر بیانەوێ تەرجیع بەندەکان لەسەر یەك سەروا دادەڕێژن تا ببێ بەپارچەیەکی سەربەخۆ) [٤٠٢ : ٣٤٥-٣٤٦]. ئەو دێڕەی کە لەنێوان پارچەکان دووبارە دەبێتەوە، فارس سەرەتا بە(تەرجیع بەند) ناویان بردوە، ئێستا پێی دەڵێن (بیت واسطە) [٣٩٦ : ٢٤].و بەکوردی (ناو بەند) زاراوەیەکی لەبارە بۆ ئەو دێڕەی لەناو بەندەکان دێ و بەیەکەوە بەندیان دەکات.

ئەگەر ناو بەندەکە بەدەقە خۆی دووبارە بێتەوە، ئەوە تەرجیع بەندە. ئەگەر بەدەقە خۆی دووبارە نەبێتەوە، پاش هەموو بەندێك گۆڕانی بەسەر دابێ و دێڕێکی تر بێ، ئەوە تەرکیب بەندە.

خۆ ئەگەر لەو دێڕە ناوبەندەدا، لەتێك بگۆڕێ (بەزۆری لەتی یەکەم) و لەتێك وەکو خۆی دووبارە بێتەوە، ئەوە لەنێوان تەرجیع و تەرکیبدایە، چونکە ئەو لەتەی وەکو خۆی دووبارە دەبێتەوە بەرەو تەرجیعی دەبات و ئەو لەتەی دەگۆڕێ بەرەو تەرکیب ڕایدەکێشێ، بۆیە باشترین زاراوە بۆ ئەم هونەرە (تەرجیع - تەرکیب)ە.

لێرەدا سێ جۆری جیاوازمان بۆ پەیدا دەبێ:

١- تەرجیع بەند- دێری ناو بەند لەهەموو بەندەکان یەکە.

٢- تەرکیب بەند- دێری ناو بەند پارچە بەپارچە دەگۆڕێ.

٣- تەرجیع - تەرکیب- دێری ناو بەند، لەتێکی لەهەموو پارچەکان یەکە و لەتێکی دەگۆڕێ.

لەڕاستیدا ئەم تەرجیع و تەرکیب و تەرجیع- تەرکیبە هەر قەسیدەن، بەڵام لەبەر درێژی دابەشی چەند پارچەیەك کراون تا شاعیر بەسەروا هێنانەوە ماندوو نەبێ و ناچار نەبێ بۆ پاراستنی یەکێتی سەروا شوێنی سەروا بە وشەی نالەبار پڕ بکاتەوە. د.محەمەد نورەدین دەڵێ (ئەمانە لەم جۆرە قەسیدانەن کە فارس دایانهێناوە تا لەمەرجی یەکێتی سەروا ڕزگار ببن کە عەرەب بۆ هۆنینەوەی قەسیدە بەمەرجیان داناوە) [٣٥٦ : ٢٢٥]. لەبارەی ژمارەی بەند (پارچە)و ژمارەی دێرەکانی هەر بەندێك ڕاو بۆچوونی جیا جیا هەیە. لەفارسی (لە (٣-٢٢) پارچەو زیاتریش بەرچاوکەوتوە و هەر پارچەیەك لەڕادەی یەك غەزەلدایە. (٧-١٠) دێرە، بەگشتی تەرجیع و تەرکیبی پێشینان کورتترو هی ئەوانەی دواتر درێژترە) [٣٩٦ : ٢٦]. ڕادەی ناوەندی ژمارەی بەندەکان لەنێو (٥-١٠) دایە. ژمارەی دێرەکانی هەر پارچەیەکیش بەزۆری وەکو یەك دەبێ بەڵام مەرجیش نییە، چونکە بۆی هەیە شاعیرەکە بەیەك دوو دێر جیاوازی بخاتە نێوان درێژایی پارچەکان.

دێری ناوبەند:

ئەم دێرە دەورێکی گرنگی لەتەرجیع بەند و تەرکیب بەندا هەیە و شوێنێکی ناسك و بەنرخی

لەسەرایای هۆنراوەکەدا گرتووە. بەتایبەتی لەتەرجیع بەندا کە هەمان دێڕەو دووبارە دەبێتەوە. ئەو دێڕە دەبێ مانایەکی بەرزو کاریگەرییەکی بەهێزی هەبێ، چونکە ڕۆح و ئەڵقەی بەیەکەوە بەستنەوەی پارچەکانە. هەر پارچەیەکی تەرجیع بەند دەبێ بەجۆرێ کۆتایی بێ خوێنەر وا هەست بکا ئەو پارچەیە، هەمووی یان بەشی کۆتایی، پێشەکییە بۆ دێڕی ناوبەندو لە هەمان کاتیشدا دێڕی ناوبەند پێشەکی و ڕێگا خۆشکردنە بۆ پارچەی دواوەی. ناوبەندی پتەوو بەهێزو پڕ مانا، خۆی دەکەوێتە سەر زاری خەڵك، چ خوێنەرێکی شیعر هەیە ئەم ناوبەندەی تەرجیعەکەی حەمدی لەبەر نەبێ و لەبەر خۆیەوە نەیڵێتەوە:

ڕەببی مووی لێ بێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەر کەسێ گوڵشەن بەدەردی کوڵخەنی دۆزەخ بەرێ[٦ : ٨٣].

دێڕی ناوبەند، لەتەرکیب بەندا ، دەشێ بەسێ جۆری جیاواز ڕێك بخرێ:

١- بۆی هەیە ناو بەندی یەکەم وەکو مەسنەوی، هەر دوو لەتی هاوسەروا بێ. هەموو ناو بەندەکانیش لەنێوان خۆیاندا سەروای کۆتاییان وەکو یەك وابێ، بەجۆرێ ئەگەر ناو بەندەکان جیا بکەیتەوەو بەسەر یەکەوە بیاننووسی هۆنراوەیەکی سەربەخۆی موسەڕڕەعی لێ پەیدا دەبێ.

٢- بۆی هەیە هەموو دێڕە ناو بەندەکان لەشێوەی مەسنەویدا دابن و ئەگەر کۆیان بکەیتەوە هۆنراوەیەکی سەربەخۆی مەسنەوی دەردەچێ. لەکوردیدا تەنیا ئەمەیان بەرچاو کەوتووە. وەکو تەرجیع بەندی خادیم کە سەرەتای ( غوبارێکی ئالوودە )[٧٦ : ٣١١]یە. تەرجیعەکە شەش بەندەو هەموو بەندەکان یەکسانن، هەریەکە ( ٩ ) دێڕەو دێڕی ناو بەندی مەسنەوی بەدوادا هاتووە.

٣- بۆی هەیە ناو بەندەکان لەیەك جیا بن، هەریەکە سەروا وڕەوییەکی جیاوازی هەبێ لەوانی تر بەجۆرێ ئەگەر کۆیان بکەیتەوە هیچ شتێکی وەکو قەسیدە یان مەسنەوی لێ پەیدا نابێ.

لەفارسیدا لەسەدەی شەشی کۆچییەوە شاعیران تەرجیع بەندو تەرکیب بەندیان هۆنیوەتەوە. فرخی سیستانی لەڕیزی هەرە پێشەوەی ئەو شاعیرانەیە کە تەرجیعیان داناوە. پاش ئەویش شاعیرانی وەکو سنائی غەزنەوی و خاقانی و جەلالەدینی ڕۆمی و فەخرەدینی عیراقی و سەعدی شیرازی ئەم هونەرەیان نووسیوە. لەکوردیدا یەکەم کەس جزیری ئەم هونەرەی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردی[٥٨ : ٥٢٠] و دوای ئەویش کۆمەڵێ شاعیری کورد تەرجیع و تەرکیبیان نووسیوە، وەکو سالم کە تەرجیع بەندێکی چوار پارچەیی هەیە، ناوبەندەکەی ئەمەیە:

هەر یەکێکە خوای حەق ئەك دوو
وەحدە هو لائیلاهە ئیللا هوو[١٠١ : ٥٩].

بەلام لەکاتی چاپ کردنی دیوانەکەدا، هەر چوار پارچە نەخراوەتە تەك یەك و حسێبی تەرجیع بەندیان بۆ نەکراوە، بەڵکو هەر پارچەیەکی بەپێی سەروای خۆی کەوتۆتە شوێنێك و بەناو ئەم

لاپەڕانەی دیوانەکەدا بڵاو بوونەتەوە (٥٩، ١١٥، ١٢٣، ١٣٤). ئەم تەرجیع بەندەی سالم لەژێر کاریگەری تەرجیع بەندە بەناوبانگەکەی هاتیفی ئیسفەهانی نووسراوە کە (یست واسطە)ی بەم جۆرەیە:

که یکی هست و هیچ نیست جزاو
وحده    لا اله    إلا    هو [٢٩٦ : ٣٨].

جگە لەسالم حەمدی[٤٧] و خادیم و بەختیار زێوەرەو تەرجیع بەندو تەرکیب بەندیان هەیە. خادیم سێ تەرجیع بەندو تەرکیب بەندێکی هەیە [٧٦]. لەیەکێ لەتەرجیعەکانیدا کەوتۆتە ژێر کاریگەری هاتیفی ئیسفەهانی و لەناو بەندەکەدا دەڵێ:

نییە مەعبوود غەیری زاتی ئیلاهـ
وەحدە هو لا ئیلاهە ئیللە للاهـ [٧٦ : ٢٩٥].

ئەم تەرجیعە (٦) بەندە، هەموو بەندەکان یەکسانن. هەریەکە (١٠) دێڕە. عەزیز ئالی ڕای وایە، ئەم تەرجیعەی هاتیفی کاری لەحەمدیش کردوە لەو تەرجیعەی ناوبەندەکەی ئەمەیە:

یا ئیلاهی بەقەدری تۆ بێ شك
(ما عرفناك حق معرفتك)[٦ : ٥٥].

ئەو لای وایە ئەم تەرجیعە گۆرانیشی بزواندوە، چونکە گۆران هەوڵی داوە وەریبگێڕێتە سەر کوردی [٢٢٩ : ٣٦] بەلام هەمووی وەرنەگێڕاوە. تەنیا بەندی یەکەمی وەرگێڕاوە کە بەم دێڕە دەست

---

[٤٧] تەرجیعەکانی حەمدی شوێن و پایەی خۆیان لەشیعری کلاسیکی کوردیدا هەیە. لەکاتی چاپ کردنی هەر پارچەیەك لەو تەرجیعانە ژمارەیەکی بۆ داندراوەو ناو ناونیشانێکی تایبەتی خراوەتە سەر. ئەمە جۆرە تێکەڵییەك لای خوێنەر دروست دەکا. بۆیە چوار تەرجیعی هەیە، لێرە هەر چواریان لەیەك جیا دەکەینەوە:
١- تەرجیع بەندی لاپەڕە (٥٥-٦٠) شەش بەندو ناوبەندیان ئەم دێڕەیە:
یائیلاهی بەقەدری تۆ بێ شك
(ماعرفناك حق معرفتك)[٦ : ٥٥].
٢- تەرجیع بەندی لاپەڕە (٦٠-٦٨)، حەوت بەندە، ناوبەند لەسەرەتایش هاتوە، ئەمە دەوری بەیەکەوە گرێدانی سەرەتاو کۆتایی هۆنراوە دەستەبەر دەکات. ناوبەندەکە ئەمەیە
مسوەددەیی سوبحی ئەزەلی مووبی محەممەد
خورشیدی بەیازی ئەبەدی ڕوویی محەممەد [٦ : ٦٠].
٣- تەرجیع بەندی لاپەڕە (٧٨-٨٢)، سێ بەندە، ناوبەندیان ئەم دێڕەیە:
شیرەکەم پێتان حەلال بێ، خوێنەکەم گەرگوم نەکەن
نامداران وحەمییەت کاری ئەولادی وەتەن [٦ : ٨٠].
٤- تەرجیع بەندی لاپەڕە (١٠٢-١٠٤)، نۆ بەندە. دێڕی ناوبەند دێڕە بەناوبانگەکەی (ڕەببی مەوی لێ بێ زمانی)یە.
دوو تەرجیعەکەی کۆتایی بەسەریەکەوە نووسراون و بەندەکانیان یەك ژمارەیان دراوەتێ لە(١-١٢) وەك ئەوەی هەردووکیان یەك شت بن. دەبێ لێك بکرێنەوە چونکە دوو تەرجیعی جیان.

پێ دەکا:

ای فیدای تو هم دل و هم جان
وی نگار رهت هم این و هم آن [۳۹٦ : ۳۸].

گۆران بەم جۆرە کردوویەتی بەکوردی:

ئەی بەسەر گەردی تۆ بێ دڵ و گیان
وەی بەشا باشی ڕێت بچن دڵ و گیان [۱۷۳ : ٤۷۱].

ناوبەندەکەشی بەم جۆرە وەرگێڕاوە:

کە یەکێکە و هەیە و ئەبێ و هەربوو
وەحدە هو لا ئیلاهە ئیللا هوو [۱۷۳ : ٤۷۳].

بێجگە لەشیعری شاعیران، مەولوودنامەکانیش، ئەو دەقانەی بەشیعر هۆنراونەتەوە، دابەش پارچە پارچە کراون و لەدوای هەر پارچەیەك کە بابەتێك یا چیرۆکێکە دێرێك ناوبەند دێ. ئەو مەولوودنامانە بەپێی دێری ناوبەند دوو جۆرن:

۱- هەندێکیان وەکو تەرجیع بەند وان، یەك دێرو هەمان دێر لەکۆتایی هەموو بەندەکان دووبارە دەبێتەوەو گوێگران ئاگادار دەکاتەوە کە سەڵەوات لەدیاری پێغەمبەر بدەن، وەکو:

أ- مەولوودنامەی مەلایێ باتەیی کە دێرە ناو بەندەکەی ئەمەیە :

گەر دڤێن هون ژناریێ بن نەجات
ب عیشق و شەوقەك هون ببێژن ئەسسەلات [٥١].

ب- مەولوودنامەی محەمەد ڕەشاد مفتی، کە دێرە ناو بەندەکەی ئەمەیە:

هەر کەسێ دەیوێ ببینێ ڕێی نەجات
لێ بدا بۆ ڕۆحی پێغەمبەر سەلات [۱۹۱]

ج- مەولوودنامەی مەلا حوسێن شێخانی کە ناوبەندەکەی ئەمەیە:

موسلمانان بەدڵ زەوق و سەفاکەن
هەمیشە ڕوو لەقاپیەی موستەفا کەن [۷۳].

د- مەولوودنامەی حاجی مەلا خلیل موخلیس، ئەمە ناو بەندەکەیەتی:

هەر کەسێ دەیوێ بەمەقسەد گەر بگات
با لەپێغەمبەر بداتن سەد سەلات [۲۷۸].

۲- هەندێکیان تەرکیب بەندن، دێری ناوبەندیان لەپارچەیەکەوە بۆ پارچەیەکی تر دەگۆڕێ وەکو:

أ- مەولوودنامەی ڕەسوولی نازدار، نووسینی سەید ئەنوەر ئەحمەد بەرزنجی، (٧) پارچەیەو حەوت ناوبەندی جیاوازی هەیە. ناوبەندی یەکەمی ئەمەیە:

به دڵێکی ساف و بێگەرد لێ بدا بۆ ئەو سەلات
تا نەجاتی بێ لەترس و دەهشەتی حەشرو مەمات[٢٣].

ب- مەولوودنامەو بڕوانامەی دەشتی، مەلا خدری دەشتی. (١٢) پارچەیە، دوازدە ناوبەندی جیاوازی هەیە، لەیەکەمیاندا دەڵێ:

صلِّ یارب علی من أرسلا
مع سلام دینه قد فصلا[٨٣].

ج- مەنزوومەی کوردی، مەولوودنامەی حەزرەتی ڕەسوول، سەید بەهائەدین شمسی قورەیشی، (٨) پارچەیە، ناوبەندەکانی جیان، لەیەکەم ناوبەندیدا دەڵێ:

تەعدا دی نەفس، نفووسی عالەم
سەڵەوات بێ لەسەر ڕەسوولی خاتەم[٣٤].

سێیەم- <u>موستەزادو قالبە سەرواکانی :</u>

موستەزاد هونەرێکی شیعرییە. بەو شیعرە دەڵێن دوای هەر لەتێك یان چەند لەتێك، تیکەیەك یان چەند تیکەیەکی بەکێش و سەروای تایبەتییەوە بۆ زیاد دەکرێ لێرە، باسی مێژووی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی موستەزادی جیهانی و کوردی ناکەین، باسی کێشەکانی موستەزادیش ناکەین چونکە لەشوێنی تردا باسیان لێوە کراوە [٤٩٤ : ٢٨٠]. تەنیا لەڕووی دابەشبوونی سەرواو سەروا بەندی لەت و تیکەکانەوە شی دەکەینەوە. جزیری[٥٨ : ٥٣٠] و ئەحمەدی خانی[٤ : ٥٦]و پرتەوی هەکاری[٤٠ : ١٨٠]و نالی[٢٠٩ : ١٦٨]و حەمدی[٦ : ١٢٤،ل١٢٥،ل١٢٦] موستەزادی کلاسیکیان هەیە. موستەزاد لەکاتی بزووتنەوەی نوێ کردنەوەی شیعری کوردی لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا، بەتایبەتی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی پەرەی سەندو گۆڕانی بەسەردا هات و جۆرو دابەشبوونی جیا جیای لێ پەیدا بوو. بێ گومان ئەمەش لەژێر کاریگەری شیعری تورکی و فارسی بوە. چونکە لەتورکی لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە کۆمەڵەی (فروت فون )و ئینجا (دەستوور) داهێنانی جۆراو جۆریان لەمستزاد کردو لەفارسیشدا (لەسەردەمی شۆڕشی مەشرووتە شاعیرە شۆڕشگێرو ئازادیخواکان ڕوویان کردە موستەزادو زۆر تێیدا قووڵ بوونەوەو جۆری جیا جیایان لەموستەزاد هێنایە کایەوە)[٣٩٦ : ١١٨]. ئیتر لەژێر کاریگەری ئەوان و لەڕەوتی قووڵ کردنەوەی بزووتنەوەی نویخوازی شاعیرانی وەکو شێخ نوری و گۆران و پیرەمێردو سەلام و دڵزارو دیلان و هی تر موستەزادی جۆراو جۆریان خستە ناو ئەدەبی کوردی. لێرەدا، بێ چاودانە ڕەگەزەکانی تر تەنیا لەڕووی سەرواوە موستەزادی کوردی پۆلین دەکەین و جۆرەکانیان لێك جیا دەکەینەوە:

## أ- ئەو موستەزادانەی ژمارەی لەت و تیکەکانیان یەکە :

لەم جۆرەیان دا، دوای هەر لەتێك تیکەیەك زیاد دەکرێ و گرنگترین قالبی ئەمانەن:

١- قالبی هەرە باوی موستەزادی کلاسیکیی ئەوەیە دوای هەر لەتێك تیکەیەك زیاد دەکرێ، لەتەکان سەروایان وەکو سەروای غەزەل و قەسیدە وایە و بەزۆری دێری یەکەمیشیان موسەڕڕەعە، تیکە زیادەکانیش لەنێو خۆیاندا دابەشبوونی سەروایان وەکو غەزەل و قەسیدە وا دەبێ و بەزۆری ئەوانیش دێری یەکەمیان موسەڕڕەع دەبێ. لەتەکان لەلایەك و تیکە زیادەکان لەلایەکی تر وەکو دوو غەزەل یان قەسیدەی جیا خۆیان دەنوێنن، کە یەکەمیان بەکێشی زیاد کراو دووەمیان بەکێشی مەجزووئی هەمان بەحر نووسراون. لەبەر ئەوەی لەتەکان و تیکەکان لەڕووی ماناوە تارادەیەك سەربەخۆن و هەردوولایش یەکێتی سەروای خۆیان پاراستوە، دەشێ تیکەکان جیا بکرێنەوە و هۆنراوەیەکی سەربەخۆی بەکێشی کورتی مەجزووئیان لێ دەربچێ، دەشکرێ تیکەکان دوو دوو بخرێنە پاڵ یەك بۆ دروست کردنی یەك لەت و لەتەکان دوو دوو بەرامبەر یەك دابنرێن بۆ پێك هێنانی دێر. لەم حاڵەتەدا کێشی هۆنراوەی تیکەکان تارادەیەك راست دەبێتەوە، دەبێ بەچوار پێی کورت. بەڵام سەرواکەی دەگۆڕێ، لەیەکێتی سەرواوە دەبێ بەسەروایا موسەڕڕەع. لەم جۆرە موستەزادەدا، سەروا دەوری بەیەکەوە گرێدانی هەردوولا دەبینێ، هۆنراوەی لەتە ئەسلییەکان و هۆنراوەی تیکەکان، ئەویش بەیەکخستنی سەروای لەتی یەکەمی ئەسڵەکەو لەتی یەکەمی زیادەکە لەهەموو دێرەکاندا. ئەم کارە یەکێتی موستەزادەکە دەستەبەر دەکات و ڕێگای پچڕان و هەڵوەشانەوەو لێك دابڕانی لێ دەگرێ. بۆ نموونە موستەزادەکەی نالی کە دێری یەکەمی بەم جۆرەیە:

| | |
|---|---|
| ئەی تازە جەوان، پیرم و ئوفتادەو کەوتووم | تا ماوە حەیاتم |
| دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کە لەدەست چووم | قوربانی وەفاتم[٢٠٩ : ٣٣]. |

سەروای دێری یەکەم (ـووم)ە، ڕەوی (وو) و (م) پاش ڕەوییە. سەروای هەردوو تیکە زیادەکەش (اتم)ە، (ت) ڕەوییە و (م) پاش ڕەوییە. وەك دیارە سەروای دێرە ئەسڵەکان و سەروای تیکەکان جیایە، تەنیا لەپاش ڕەوی یەك دەگرنەوە. ئەگەر لەتە ئەسڵەکان و تیکەکان لێك جیا بکەینەوە، هۆنراوەی لەتەکان بەم جۆرە دەبێ:-

ئەی تازە جەوان پیرم و ئوفتادەو کەوتووم
دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کەلەدەست چووم
تۆ یوسفی نەو حوسنی لە سەر میسری جیهانی
لەم کولبەیی ئەحزانە، نەزیندووم و نەمردووم
فەرقێکی نەکرد نەفسی نەفیسم بەعینایەت
لەم گۆشەیە وێرانەیە هەر مامەوە وەك بووم



Scanned with CamScanner

ئەی قوببەیی تەیبە کە حوققەیی تیبی

مسکینم و بەو خاکە عەترناکەوە هاتووم

ئەمە چوار دێری هۆنراوەکە کە هەمووی (٩) دێرە ، وشەکانی سەروای هۆنراوەکە ئەمانەن: (کەوتووم ، لەدەس چووم ، نەمردووم ، بووم ، هاتووم ، هەڵاتووم ، رووم ، مەعلووم ، مەعدووم ، مەحرووم) . کەچی ئەگەر تیکەکان بەجیا بنووسرێن ئەم هۆنراوە مەجزووئەیان لێ دەردەچێ :

| | |
|---|---|
| تا ماوە حەیاتم | قوربانی وەفاتم |
| من پیرم و فانی | هەروا بەتەماتم |
| وەحشێ لە ویلایەت | وەی شوومی وڵاتم |
| مەئوایی حەبیبی | بەو بۆنەوە هاتم |

لەلایەکی ترەوە ئەو سەروایەی کە لەتەکان و تیکەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و لێ ناگەرێ لێک بترازێن ، سەروای لەتە تاکەکان و تیکە تاکەکانە، بۆ نموونە سەیری ئەم دێرە بکە :

| | |
|---|---|
| ئەی مەسجیدو میحرابگەهت قیبلەیی حاجات | بۆ ئەهلی موناجات |
| مەحجووبی هەوام ، واسیتەیی مەشهەدی مەعلووم | بۆ راهی نە جاتم. |

وشەی سەروای گشتی دێرە ئەسڵەکە (مەعلووم)و هی تیکەکە (نەجاتم)ە. لەتی پێشەوەی دێرە ئەسڵەکە و تیکەی پێشەوەی زیادەکە وشەی سەروایان (حاجات) (موناجات)ە. هەردوکیان هاوسەروان ، سەروایان (اجات)و رەوییان (ت)ە .

موستەزادی کلاسیکی هەمووی بە کێشی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف (هەزەج یان موزاریع) و بەم قاڵبە سەروایە دارژاوە کە دەشێ بەم جۆرە پیشانی بدەین :

Ab Ab / CcAb / DdAb / Ee Ab ......

٢- دەشێ موستەزادەکە بەهەمان قاڵبی پێشوو بێ ، بەڵام لەتەکانی پێشەوە و تیکە زیادەکان هیچ پەیوەندی سەروایان لە نێواندا نەبێ بەیەکەوە بیانبەستێتەوە. وەکو موستەزادەکەی پرتەوی هەکاری کە بەم جۆرە دەست پێ دەکا :

| | |
|---|---|
| ئیرۆکەم تالع سەحەرێ دلبەرا سەلا | مەشیاب خەرامان |
| مەستانە وەش و کەج کلەوو قامەتی رەعنا | شەنگاشەیی رەیحان [٤٠ : ١٨٠]. |

سەروای لەتە ئەسڵەکان (ا) و سەروای تیکەکان (ان)ە . ئەمە دێری یەکەمە لەهەردوو لادا (لەت و تیك) موسەررەعن . تا ئێرە ئەم قاڵبە وەکو قاڵبەکەی پێشوە، لەدوای دێری موسەررەعی یەکەم پەیوەندی سەروا بەندی نێوان لەتی یەکەمی دێرە ئەسڵەکان و لەتی یەکەمی تیکەکان نامێنێ، بۆ نموونە لە دێری دوەمدا دەڵێ :

| | |
|---|---|
| سیمین بەدەن و سیم تەن و سیم بەرامن | پر غەنج و گرشمە |
| ئاهوڕەوش و خووخوش و چاڤێن بەسەد ئیما | بۆ فیتنەئی دەوران |

لەم دێڕەدا وەك دیارە لەتی دووەم سەرەوای گشتی خۆی پاراستووە (ئیمـا-ا) و تیکـەی دووەمیش سەرەوای خۆی پاراستووە (دەوران-ان)، بەڵام لەتی یەکەم و تیکەی یەکەم هاوسەروا نین، لەتی یەکەم بە (من) و تیکەی یەکەم بە (گرشمە) کۆتاییان هاتووە و سەروایان لێ نەکەوتۆتەوە. ئەم قاڵبە بەم جۆرەیە:

AbAb / CdAb / EfAb / GhAb .........

٣- دەشێ دوای هەر لەتێك تیکەیەك زیاد کرابێ و دێڕەکانی ئەسڵەکە و دێڕەکانی تیکەکانیش هەردوولا هاوسەروا بن، ئەم لاو ئەولا بەیەکێتی سەروا نووسرابن، لەهەردوولایشدا سەرواکە هەر یەك شت بێ، بەهەمان شێوە لەتی یەکەمی دێڕە ئەسڵەکان و لەتی یەکەمی تیکە زیادەکان وەکو مەسنەوی هاوسەروابن. حەمدی سێ موستەزادی نووسیوە، لەهەرسێکیاندا ئەم قاڵبەی پەیڕەو کردووە. لەیەکێکیاندا دەڵێ:

وەك عاشیقە هاتۆتە دەرێ نێرگسی بیمار — بۆ دیدەنی یار
یادی وەتەنی کردووە، یا گۆشەیی گوڵزار — دوور بێ لەئازار
ئەی غونچە نەپشکووتی؟ دڵی کوردی مەگەر تۆ — وا چووی لەسەرخۆ
سەودایی گوڵان گەرمە لە مەیدان و لە بازاڕ — بلبل نییەبێدار
ئەی خەلقی چەمەن، دەرکە چرۆیێکی نەزاکەت — سابەسیە فەلاکەت
نابینی گوڵاڵە ئەگەڕێن دامەنی کۆسار — سەرچەشمەوو جۆبار[٦ : ١٢٦].

هۆنراوە ئەسڵەکە موسەڕڕەعە و سەرەوای (ار)ە، هۆنراوەی تیکە زیادەکانیش هەر موسەڕڕەعە و ئەویش هەر سەرەوای (ار)ە. یەکێتی سەرەوای هەردوو لا یەکە جگە لەمە لەتی یەکەمی هەموو دێڕەکانی ئەسل و تیکە زیادەکانی هاوسەروان. لە دێڕی دووەمدا سەروایان(-ۆ) ولە دێڕی سێیەمدا (-اکەت)ە... سیستەمی سەرەوای ئەم قاڵبە موستەزادە بەم جۆرەیە:

BbAa / CcAa / DdAa .....

٤- بۆی هەیە دوای هەر لەتێك تیکەیەك زیاد بکرێ، لەتە ئەسڵەکان لەناو خۆیاندا مەسنەوی بن و تیکە زیادەکانیش مەسنەوی بن، بێ ئەوەی هیچ پەیوەندی سەروا بەندی لە نێوان ئەم لاو ئەولادا هەبێ. بەڵام لە ڕووی دەلالییەوە یەکێتی عوزوی لە نێوان لەتەکان و تیکەکاندا هەیە، ڕەنگە هەر بۆیەش بێ سەروا پێکەوە بەستنی ئەم لاو ئەولا خۆی کێشاوەتەوە. سەلام (٥) موستەزادی هەیە لە هەموویان پەیڕەوی ئەم دەستوورەی کردووە، لەیەکێکیاندا دەڵێ:

جەرگ هەڵئەقرچێ دڵ پڕ لە ناڵین — جەرگم براوە
چۆن ئۆقرە ئەگرێ سەر لەسەر سەرین — مێشکم بڕاوە
بۆ دوایی نەهات فرمێسکی چاوم — هەتا بوو بەخوێن
بەترۆکەی نەبەست جەرگی براوم — تۆ بێ سەروشوێن[١٠٩ : ١٩١].

قالبی سەروای ئەم موستەزادە بەم جۆرەیە :

Ab Ab / Cd Cd / Ef Ef .....

٥- وا دەبێ دوای هەر لەتێك تیکەیەك زیاد بکرێ. لە ڕووی سەرواوە بەهەردووکیان حسێبی یەك دێریان بۆ بکرێ (صدروعجز)، ئینجا هۆنراوەکە هەمووی بە یەکێتی سەروا بێ و دێری یەکەمیش (لەتی ئەسلی و تیکە زیادەکە) موسەڕڕەع بێ. ئەم جۆرە هەر لەبەر ئەوە بەرموستەزاد دەکەوێ چونکە پارچەی دووەمی هەر دێرێك کورتە (نیو هێندەی پارچەی پێشەوەیە)، ئەگەرنا لە ڕووی دەلالی و بابەشبوونی سەرواوە وەکو غەزەل و قەسیدە وایە. دڵدار لە (ڕۆڵەی خوبا وەندی جەمال)دا دەڵێ :

ڕۆڵەی خوبا وەندی جەمال　　　کانگەی کەمال
هەوڵنی مێشك و　عاتیفە　　　شیعر و خەیاڵ
نازەنینێکە　بێ　میسال　　　ئەمەن منالّ
کچێکە　بالاّ　بەرزو ڕێك　　　دیدە کەژاڵ [٨٧ : ٣٢٨].

سەروای هۆنراوەکە (ال)ە و کەوتۆتە سەر تیکە زیادەکان. سەروای ئەم قالبە وەکو غەزەل و قەسیدە وایە و بەم جۆرە دەڕوا :

Aa / Ya / Za ..........

ب- ئەو موستەزادانەی ژمارەی لەت و تیکەکانیان جیایە :

لەم جۆرەدا یان ژمارەی لەتەکان لە تیکەکان زیاترە، یان بە پێچەوانەوە. بەلاّم ئەو قالبانەی لەتەکانیان زیاترە پتر بەکار هاتوون، گرنگترینیان ئەمانەن :

١- دەشێ دوای دێرێکی تەواو (دوولەت) ئینجا یەك تیکە زیاد بکرێ و دوو لەتەکە سەروایان مەسنەوی بێ و سەروای تیکە زیادەکەش بچێتەوە سەر ئەوان، واتە هەرسێکیان هاوسەروابن. هۆنراوەکە وەکو کۆمەڵێ سێینەی سەربەخۆی هاوسەروا دەکەوێتە بەرچاو کە بەکێش (تیکە کورتەکە) لەیەك جیا دەبنەوە، زێوەر دەڵێ :

تۆ عیشقی جەماڵت وەرە ئەی قاسیدی یەزدان
نامەم بگەیێنە　دەست　مەردی سوخەندان
یاری شەکەر ئەفشان　　[٤٩١ : ١١٦].

بۆ دێری دووەم سەروا دەگۆڕێ وشەکانی سەروای دوولەتی ئەسلی (قەدیمە، نەدیمە)ن و وشەی سەروای تیکە زیادەکە (سەمیمە)یە. قالبە سەروای ئەم جۆرە موستەزادەیە ئەمەیە :

AAa, BBb, Ccc, ......

٢- دەشێ دوای هەر دێرێك (٢لەت) یەك تیکە زیاد بکرێ وەکو قالبەکەی پێشوو بەلاّم

بەسەروایەکی تر. لەمەیاندا دێرە ئەسڵەکان مەسنەوی دەبن ، کەچی تیکەکان لەسەرەوە تا خوارێ هەموویان هاوسەروا دەبن لەگەڵ یەکتر و وەکو تەسریع لەگەڵ سەروای مەسنەوی یەکەمیش سەروایان یەك دەبێ ، شێخ نووری شێخ سالح لە شیعری (بەمن بڵێ)دا ئەم قالبەی بەکارهێناوە . ئەمە دێری یەکەم و چوارەم بە نموونە :

بەمن بڵێ ، چ میللەتێ لەمەقبەری مەماتەوە
لەمەحوو ئینکسارەوە ، لەدووری نەهاتەوە
نەچۆتە ناو موجادەلەی حەیاتەوە
ئەڵێ کە ڕۆژی کورد ئەوا بەرێوەیە لەدەم کەلا
لە ئوفقی ئینشتمانەوە ، خەریکە وا شەبەق ئەدا
بەعالەما ، بەجارێ شەوق ئەداتەوە [٢١٢ : ٩٩].

سیستەمی قالبە سەروای ئەم جۆرە ، ئەمەیە :

AAa, BBa, CCa, ......

٣- دەشێ دوای دوو دێر (ئەلەت)ی هاوسەروا ئینجا یەك تیکە بەهەمان سەروای لەتەکانی پێشەوە زیاد بکرێ بەمەوە وەکو پێنجینەیەکی هاوسەروا دەردەکەوێ و هیچ سەروایەك پارچەکانی بەیەکەوە نابەستێتەوە ، وەکو شێخ نووری لە هۆنراوەی (عەسکەر)دا دەڵێ :

سەف سەف کە دێن وتێدەپەڕن چوست و باویقار
مازی لە سیدقی ئێوە ئەبینم ئەکا فیرار
سویحێکی پاك و بێ غەش ئەبینم وەکو بەهار
موستەقبەلێکی بێ لەکە ، پڕ کەیف و نەشئەدار
بێ تۆزو بێ غوبار [٢١٢ : ١٠٠].

ئەمەش قالبە سەرواکەی ئەم جۆرە موستەزادە :

AAAAa / BBBBb / CCCCc / ......

٤- دەشێ تیکە زیادەکە دوای پێنج لەت بێت ، هەر پێنجیان هاوسەروابن و سەروای تیکە زیادەکەش وەکو سەروای لەتەکان وابێ . هەر پارچەیەکی وەکو شەشینەیەکی هاوسەروا خۆی دەنوێنێ ، شێخ نووری لە موستەزادێکدا دوو پارچەی پێشەوەی بەم قالبە داڕشتوە ، دەڵێ :

دەورەی تەجەددود وەکو ماهێ لە ئاسمان
هەڵهات وبوو بەدافیعی زوڵمەت لە ئینس و جان
نوورت ڕژانە مەجلیسی ئەفکاری عاقلان
بوویتە ژیانی دوشمنی بەدخواهی کوردەکان
ئەی ناشری مەعاریف و ئەی خەصمی جاهیلان
ئەی موحتەرەم ، ژیان [٢١٢ : ١٠٧].

قاڵبە سەرواکەی ئەم موستەزادە بەم جۆرەیە :

AAAAAa / BBBBBb / CCCCCc

هەر لەم هۆنراوەیە ، لە پارچەکانی تردا تیکە زیادەکە دوای شەش لەت هاتوە . لەتەکان هاوسەروا نین ، دابەش کردنی جیاجیای سەروایان بۆ کراوە بەڵام لەهەموویاندا سەروای تیکە زیادەکە وەکو سەروای لەتی پێش خۆیەتی ، وەکو ئەم دابەشبوونانە : (ABAAABb / ABCACBb / ABABBCCc)

٥- لەو قاڵبانەی ژمارەی تیکەکان لە ژمارەی لەتە ئەسلییەکان زیاترە ، تەنیا یەك قاڵبمان دیوە ، ئەویش لە ئەسلدا مەسنەوییە و دوای هەر لەتێکی مەسنەوییەکە تیکەیەکی زیاد کراوە و پاشان لەژێر هەردوو تیکە زیادەکە تیکەی سێیەمی هاتوە. مەسنەوییەکە لەتەکانی هاوسەروان و هەرسێ تیکەش هاوسەروان. لەت و تیکەکان هیچ پەیوەندییەکی سەروا بەندییان لەنێواندا نییە . هەرپارچەیەکیش سەروای تازەی هەیە و بە سەروا پەیەکەوە نەبەستراونەتەوە . جەلال مەدحەت خۆشناو لە هۆنراوەی (لەیادی نەورۆز)دا دەڵێ :

ئەگەرچی سووسن و مێلاق — لەبەر چاوە

بزەی ڕوو نەرگزو لەیلاق — کەزی خاوە

نەوەی کاوە

ئەوا بۆنی هەلالان دێ — لەیاران دێ

لەپەرباخی گوڵاڵان دێ — بەباران دێ

بەهاران دێ [٥٥ : ٩٩].

قاڵبەکەی بەم جۆرەیە : AbAbb , CdCdd , .....

جـ- موستەزادی ئازاد :

لەم جۆرەدا ژمارەی تیکە زیادەکان بەرامبەر بەلەتە ئەسلییەکان ، لەسەراپای هۆنراوەدا یەك شت نییە .. شاعیر بەپێی زەوق و سەلیقەی خۆی ، بەپێی بیرو بۆچوون و هەست و خرۆشانی دەروونی ، بەپێی زنجیرەی ناوەڕۆکی بابەتەکە ، لەت و تیکە دووبارە دەکاتەوە ، بێ ئەوەی گوێ بە پەیڕەو کردنی شکڵێکی تایبەتی دووبارە بوونەوەیان بدات . ئەگەر هونەری موستەزاد ، خۆی جۆرە ئازادییەك بێ لە خۆبەستنەوەی شاعیر بە یەکێتی کێش و یەکێتی سەروا ، ئەوا ئەم جۆرەیان ئازادییەکی ترە لەو شکڵەی شاعیر لە موستەزادا پەیڕەوی دەکات . (جیلوەی شانۆ)ی گۆران نموونەیەکی ئەم جۆرە ئازادییەیە لە داڕشتنی هونەری موستەزاد. ئەم هۆنراوەیە سەرلەبەری (٥٧) لەت و تیکەیە، (٣٧) لەتی درێژو (٢٠) تیکەی کورت ، بەسەر سێ پارچەی گەورە (٨،٣٦،١٤) دابەشبووە و بەئەستێرە لەیەك جیا کراونەتەوە ، ئەوانیش بە بۆشایی زیادەی چاپ هەریەکە دابەش چەند پارچەیەکی بچووکتر بووە . هەموو لەت و تیکەکان لەژێر یەك نووسراون

نەك بەرامبەر یەك . بەگوێرەی ژمارەی لەتەكانی تیكەیان بەدوادا دێ ، لەیەك لەتەوە تا حەوت لەت هەیە. بەگوێرەی بەشوێن یەكدا هاتنی تیكەكانیش تەنیا لەیەك تیكەوە تا دوو تیكە هاتوە و بەس . تیكەكان جاری وا هەیە لەبەینی خۆیاندا دەكەونە پەیوەندی سەروابەندی مەسنەوی و جاری وا هەیە (ئەمە زۆر كەمە) لەگەڵ لەتەكان و تیكەی تر سیستەمی سەروا دروست دەكەن وەكو (AbAb) یان (aBAb) یان (AAbA) یان (aBcAcB) و هی تریش . بەكورتی دەتوانین لەبارەی ئەم موستەزادە ئازادەی گۆرانەوە بڵێین :

- ئەم هۆنراوەیە لە رووی كێشی لەت و تیكەكانەوە خۆی بە دەستووری سەروای موستەزادی كلاسیكی بەستۆتەوە . هۆنراوەكە لەسەر كێشی موجتەسی هەشتی ئەسڵەمە (مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن) . لەتەكان بەم چوار پێیە هاتوون و تیكەكانیش بەپێی یەكەم و چوارەم (مفاعلن فع لن) ، بەڵام خۆی بەدەستووری رێژەی ژمارەی لەت و تیكە لەگەڵ یەكترو دەستووری داڕشتنی سەروای كلاسیكی نەبەستۆتەوە. لە بەدوای یەك هێنانی لەت و تیكە و دروست كردنی پەیوەندی سەروا بەندی نێوانیان ئازادییەكی تەواوی وەرگرتوە .

شاعیر بۆ یەكەم جار لەهەندێ شوێنی هۆنراوەكەیدا تیكەی زیاد دەخاتە پێش لەتی ئەسلی ، وەكو بەندی دوەم و سێیەمی پارچەی یەكەم و بەندی شەشەمی پارچەی دوەم .

- رێــژەی تیكــە زیادەكــان بــۆ لــەتی ئەســلی زۆر كەمــە (٣٥,١٪)ی هــەموو لــەت و تیكەكان(٥٢,٦٪)ی لەتەكان ، واتە نزیكەی بۆ هەر دوولەت تیكەیەك زیاد كراوە، ئەگەرچی دابەشبوونەكە بەیەكسانی نەكراوە ، لەدوو شوێن حەوت لەت بەدوای یەك دێن و خوێنەر تا رادەیەك زەینی لەسەر موستەزاد لادەكەوێ كەچی دووبارە دەگەڕێتەوە سەریدا ، جاریش وا هەیە لەبەندێكی بچووكدا یەك لەت سێ تیكە بەدەوری خۆیدا كۆكردۆتەوە .

**پوختەی سەروای موستەزاد :**

گرنگترین قاڵبە سەروای موستەزاد لە كوردیدا ئەمانەن :

1- AbAb / CcAb / DdAb / ........
2- AbAb / CdAb / EfAb / .........
3- AaAa / BbAa / CcAa / .........
4- AbAb / CdCd / EfEf / ..........
5- Aa / Ya / Za / ......................
6- AAa / BBb / CCc ................
7- AAa / BBa / CCa ................
8- AAAAa / BBBBb / CCCCc
9- AAAAAa / BBBBBb / CCCCCc
10- AbAbb / CdCdd / EfEgg / ......

### چوارەم – سۆنێتە :

سۆنێتە هونەرێکی شیعری ئەورووپییە ژمارەی لەتەکانی دیارەو بابەت و کێش و سەروای تایبەتی خۆی هەیە . لە رووی دابەشبوونی ناوەڕۆك و سەرواوە جۆری جیاجیای هەیە .

سۆنێتە لە وشەی sonnetoی ئیتالییەوە هاتوە کە بەمانای –دەنگۆکە– یان –سروود– هاتوە . سۆنێتی کرتاو(٤٨) ی لێ دەرچێ ئەوەی تر هەمووی لە (١٤) لەتە دێر پێك دێ ، بەشێوەیەکی ئاسایی کێشەکەی ئەیامبی پێنج پێیە و زۆر قالبە سەروای جیاوازی هەیە ) [٥٠٢ : ٦٤٢] . گرنگترین قالبە سەروای سۆنێتە ئەمانەن:

١- سۆنێتەی پترارکی : لە هەشتینەیەك (octave) ی (ABBA ABBA) و شەشینەیەك (sestet)ی (CDE CDE یان CDCDCD یان هەر جۆرێکی تر تەنیا مەسنەوی نەبێ) پێك دێ.

٢- سۆنێتەی سپنسەری : لەسێ چوارینە و مەسنەوییەك پێك دێ و سەرواکەی بەم جۆرەیە : (ABAB BCBC CDCD EE) .

٣- سۆنێتەی شەکسپیری : ئەمەش هەر لەسێ چوارینەو مەسنەوییەك پێك دێ بەلام سەرواکەی بەم جۆرەیە : (ABBA CDCD EFEF GG) .

لەم سێ جۆرە ، سۆنێتەی پترارکی لەهەموویان باوترە . سۆنێتەکە لەرووی ناوەڕۆکەوە بە گشتی لەتەکانی بەسەر دوو بەش دابەش دەبێ (٨) و (٦). بەشی یەکەم دامەزراندنی گرێکی بیری سۆنێتەکەیە ، بەشی دوەم لەناو ئەوەوە چەکەرە دەکات و بیرەکەی فراوانتر دەکات و بە کۆتایی دەگەیەنێ . کەچی لە دوو جۆرەکەی تردا هەر چوارینەیەك بیرێکی جیاواز دەگەیەنێ ، چوارینەی یەکەم بنچینەکە دادەنێ و ئەوانەی تر هەریەکە لە چوارینەی پێش خۆی چەکەرە دەکات و هەموویشی لە کۆتاییدا بەمەسنەوییەکە دەبڕێتەوە .

سۆنێتە هەر بەتەنیا وەکو یەکەیەکی سەربەخۆ بەکاردێ ، بەلام جاروبار وادەبێ شاعیر کۆمەڵێ سۆنێتە بەیەکەوە دێنێ کە هەر چەندە تا رادەیەك سەربەخۆیان هەیە بەلام هەموویان وەکو ئەڵقەی یەك زنجیر بەیەکەوە بەستراون و بیری سەرەکی هۆنراوەکە تەواو دەکەن. ئەمە پێی دەگوترێ (زنجیرە سۆنێتە sonnet cycle). لە زنجیرە سۆنێتە ناو دارەکان، وەکو (ژیانی نوێ)ی دانتی و (دیوان یان گۆرانی )یەکانی پترارك و (زەیتون )ی دوبیلێ و (ئەڤین )ی رۆنسار و (ئەسترۆفیل و ستێلا )ی سدنی ...

---

(48) سۆنێتی کرتاو curtail sonnet – ئەو سۆنێتەیە کە چەند لەتێکی لە کۆتاییەوە کرتابێ . بۆ یەکەم جار جیرارد مانلی هۆبکز ئەم زاراوەیەی لە پێشەکی کۆمەڵە شیعری –poems ،١٩١٨ – بۆ ئەو جۆرە شیعرە بەکارهێنا کە خۆی دایهێنا بوو. ئەم جۆرەیان لەباتی (١٤) لەت لە (١٠) لەت و تێکەیەکی بچووك پێك دێ ، دە لەتەکە بە (٦+٤) دابەش دەبن ، یەکێ لە قالبەکانی دابەشبوونی سەروای ئەم جۆرە سۆنێتەیە ئەمەیە: (ABC ABC/6 DBCD/4 c/1.5) [٥٠٢ : ١٧٠-١٧١].

(کۆنترین سۆنێته دەدرێته پاڵ جیاکۆمۆ دا لێنتینۆ (١٢١٥-١٢٣٣) ی قوتابخانەی سەقلیە ، بەڵام ئەم شکلە شیعرییە بۆی هەیە شاعیرێکی تری بارەگای ئیمپراتۆر فردریکی دوەم لە سەقلیە داینابێ) [٥٠٢ : ٦٤٣] . زۆربەی شاعیرە ئیتاڵییە ناودارەکان لە ئاخر و ئۆخری سەدەکانی ناوەڕاست ئەم شکڵەیان بەکارهێناوە ، وەکو گینیچێلی و کاڤالکانتی و دانتی و ... بەڵام لەهەموویان زیاتر پترارك شێوەی سۆنێتی چەسپاند و کردی بە شکڵێکی شیعری سەربەخۆ. (گۆرانی) یەکانی پترارك جۆرە ئینسکلۆپیدیایەکی سۆز و خۆشەویستییە و شیعرەکانی بەم قاڵبە هۆنرییە دارشتوە . پاش پترارك زۆر شاعیری ئیتالی تریش کاریان لەسەر سۆنێتە کرد و پەرەیان پێدا.

ئەمە لە ئیتالیا، لە ئەسپانیا (مارکیز دی سانتیانا (١٣٩٨ ، ١٤٥٨) یەکەم کەس بووە هەوڵی نووسینی داوە .. سۆنێتە نووسە ناودارەکانی دوای ئەو خوان بۆسکان - ١٤٩٠ - ١٥٥٢ - و گارسیلاسۆ دۆلاڤێگا - ١٥٠٣ - ١٥٣٦ - و هی تر) [٤٨٦ : ١٣٢] .

مۆریس گرامۆن لەبارەی سەرەتای بڵاو بوونەوەی سۆنێتە لە فەرەنسا دەڵێ : (تەنیا لە سەدەی شازدەدا ، سۆنێتە هاتە ناو شیعری ئێمە، بەڵام هەر زوو سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا ..) [٤٨١ : ١٠٢] . دوبیللی و رۆنسار و مالێرب دەوریان زۆر بوو لە چەسپاندنی سۆنێتە لە شیعری فەرەنسیدا .

کەچی لە ئینگلیزیدا ، سۆنێتە لەسەدەی شازدەدا ، بەهۆی سێر تۆماس ویات و سێرلی کەوتە ناوەوە. ئەمانە قاڵبە سەروای سۆنێتەی پتراركیان پەیڕەو کرد. لەکۆتایی سەدەی شازدەدا ، سۆنێتە بەتەواوی چەسپا . سپنسەر لە (ئەمۆرێتی) ی قاڵبە سەروایەکی تایبەتی لە سۆنێتەدا چەسپاند کە پاشتر هەر بەناوی خۆیەوە بڵاوبووەوە. بەڵام لەهەموو سۆنێتە نووسە ئینگلیزەکان گرنگتر شەکسپیرە کە ١٥٤ سۆنێتەی نووسیوە و و جۆرە سەروایەکی تایبەتی تێدا بەکارهێناوە و هەر بەناوی ئەوەوە ناسراوە [٤٧١] . دوای شەکسپیر میلتۆن سۆنێتەی تایبەتی نووسیوە بەڵام زۆربەی سۆنێتەکان لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دلداری نین ، شیعری بۆنەو ڕووداوەی تایبەتین . میلتۆن بە زۆری وەستانی نێوان هەشتینەو شەشینەکە ناهێڵێ ، هەر بۆیەشە هەندێ ڕەخنە گر ئەمە بەجۆرە سۆنێتێکی تایبەتی دادەنێن [٤٥٦ : ٥٧]. دوای میلتۆن کزی لەبەکارهێنانی سۆنێتە پەیدا بوو تا سەردەمی ڕۆمانتیکی ئەوسا زیندوو بوونەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە دی. وۆردزوێرت و کیتس و شیلی سۆنێتەی بەرزیان نووسیوە .

سۆنێتە لە وڵاتەکانی تر درەنگتر گەیشتە ئەلمانیا و زیاتر بەهۆی بەرهەمەکانی ڤێکیرلن (١٥٨٤-١٦٥٣) [٥٠٢ : ٦٤٣] بوو.

سۆنێتە لە ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم ، لەڕێگەی کاریگەری

شیعری ئەورووپییەوە کەوتە ناو ئەدەبی تورکی ، شاعیرانی (ثروت فنون).. دەوریان لە هێنانی هەموو جۆرە سۆنێتەکان و بەتایبەتیش سۆنێتەی پترارکی هەبوو.

لەفارسیدا جگە لە وشەی سۆنێتە، وشەی (سایە) و (غزلوارە)یشی بۆ بەکارهاتوە[٤٠١ : ٢١٨]و لەسەردەمی مەشرووتەدا کەوتۆتە ناو شیعری فارسی.

لە کوردیدا ، ئەوەی بەهەموو مانای سۆنێتە ، سۆنێتە بێ، یەک نموونەی گۆرانمان هەیە (ئاوێنەی هەستیم)[١٧٣ : ٢٢٥]. لەگەڵ دوو هۆنراوەی تر (شەوێکی بەهار)[١٧٣ : ١٧١] و (دەروێش عەبدوڵلا)[١٧٣ : ١١٩] کە سیمای سۆنێتەیان پێوە دیارە، یان لەسەر بنچینەی چوارینە و سێینەی سۆنێتەوە هاتوون بەلأم دەق وەکو سۆنێتە وانین لە رووی ژمارەی پارچەکانەوە. ئەمەیش سۆنێتەی ئاوێنەی هەستیم :

هەر زەرڕەیەك لە خوێنی دەماری پڕ ئاگرم .............. A
هەرچی حوجەیرەکانی هەیە کوورەیی دڵم .............. B
مەشبووعی عیشق و جەزبەیە ، بۆ جوانی باقڵم .......... B
قابیل نییە فەراغەتم ، حەتتاکە بیشرم .................. A
نەمدی دەمێ لەوەختی تەفەککور وە مەشغەڵەم .......... C
لێی تێك نەدا خەیاڵی حوسنی ڕابیتە و قەرار ............ D
بیرم نەچوو لەگەر مەخەوا زیکرو فیکری یار ............. D
هەر عیشقی بێ برانەوە بوو عومری کورت و کەم ...... C
هەرچەن بتی جوانی بەعەکسی پەرستشم .................. E
هەر دووره لێم ، لەهەیکەلی حوزن و قەلەندەریم ........ F
هەر ساڵ ئەکات و بێ بەشە ناز و نەوازشم ................ E
لاکین چ باك؟ ڕاستییەکەی : چ دەستەلأت ................ G
مایەو مەداری تەسلیەتی عیشقی مەعنەویم ............... F
بووکی خەیاڵی شۆخمە سەرگەرمی ئیلتیفات ! ........... G [١٧٣ : ٢٢٥]

هەشتینەکە لەسەر دوو چوارینەی سەروا جیاواز دامەزراوە کە هەریەکە یان سەرواکەی بەشێوەی چوارینەی پترارکی هاتوە. سێینەکانیش بە سەروای لەتی ناوەڕاستەوە(F) بەیەکەوە گرێ دراون ، ئەمە کت و مت لە سۆنێتەی (عشق)ی تۆفیق فیکرەت دەکات . کەچی هۆنراوەی (شەوێکی بەهار) (٣٠) لەتە ، (١٤) لەتی یەکەمەوەی دەق وەکو سۆنێتە دابەش بوە بۆ هەشتینەیەك و شەشینەیەك و سەرواکەیشی وەکو سەروای سۆنێتەکەی پێشوو وایە تەنیا لە شەشینەکەدا جیاوازی هەیە . سیستەمی سەروای ئەو بەشە بەم جۆرەیە : (ABBACDDC EFGGFE) . بەشی دووەمی هۆنراوەکەش کە (١٦) لەتە ، لەشێوەی سۆنێتەدا یە بەلأم ئەوەندە هەیە چوارینەی دووەم بوە

بەشێنە ، بەمەش هەشتینەکە بوە بە دەیینە و شەشینەکە وەکو خۆی ماوەتەوە .

سیستەمی سەروای ئەم بەشەیان کە سۆنێتە ئاسایە بەم جۆرەیە :

( ABABCDEEDC FGHIGI )

کەچی هۆنراوەی ( دەروێش عەبدوللا ) لەوەوە سیمای سۆنێتەی وەرگرتووە کە ( ٥ ) چوارین و دوو سێ پێنەی هێناوە ، هەمووشیان بەشێوەی چوارین و سێینەی سۆنێتە سەروایان داڕژاوە.

پێنجەم - موەششەح :

یەکێ لەو هونەرە شیعرییانەی بەشێوەی بەند دەنووسرێ موەششەحە. موەششەح لە ئاخرو ئۆخری سەدەی سێیەمی کۆچی لە ئەندەلوس سەری هەڵداوە. جگە لەوەی لە عیراق و یەمەنیش موەششەح هەبوە . کێشەیەکی زۆر لەسەر ئەوە هەیە ئایا موەششەح داهێنانێکی عەرەبییە یان لە گۆرانییە میللییەکانی ئەوروپا وەرگیراوە وەکو ترو بادووری پرۆفنسالی و تروڤێری فەرەنسی و ترۆڤاتۆری ئەسپانی و مینیسنگەری ئەلمانی. ڕای جۆراو جۆر لەم بارەیەوە هەیە . موەششەح هەر بەندێکی چەند لەتێکی هەیە کە بەشێوەیەکی تایبەتی ریز دەبن و سیستەمی سەروای تایبەتی لەتەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. محەمەد مەهدی بەسیر لەبارەی سەروای موەششەحەوە دەڵێ : (موەششەح جۆرە هۆنراوەیەکە ، کێشی جۆراو جۆر و سەروای جیاجیای هەیە. ئەم گۆڕینی کێش و سەروایە پەیوەندی بە ئارەزوو و دەسەلاتی شاعیرەکەوە هەیە )[٨ : ٣٥٥] . لەڕاستیدا موەششەح جۆرە شیعرێکی پارچەدارە و لە موسەممەت دەکا . د.ئیبراهیم ئەنیس ڕای وایە ( موەششەح بەر لەوەی ئاوازی بۆ دابنرێ جۆرێکە لە موسەممەت و بەس چونکە قوفلی بەندی موەششەح تا کۆتایی وەکو خۆی دووبارە دەبێتەوە ) [٢٤٣ : ٣٠٨] . هەرچەندە موەششەح قالبی جۆراو جۆری هەیە بەڵام بنیاتی سەرەکی لە رووی ریز بوونی لەتەکان و دابەشبوونی سەروا و دارِاوەی بەشەکانی بەم جۆرەیە:




قوفل ( خەرجە )

لەموەششەحدا مەتلەع دەشێ هەبێ و دەشێ نەبێ ، بەڵام موەششەح بێ قوفل دروست نابێ .

ژمارەی لەتەکانی هەریەکە لەمەتلەع و دەورو قوفل لە موەششەحێکەوە دەشێ بۆ موششەحێکی تر گۆڕانی بەسەربابێ. جگە لەم ڕەگەزانە هەندێ جار شاعیر خانە و سیلسیلە و دەوری مەدیحیشی (٤٨) بۆ زیاد دەکا.

<u>موەششەح لە کوردیدا</u> : لە ئەنجامی تێکەڵاوبوون و کاریگەری ئەدەبییەوە، شاعیرانی کورد لەم سەدەیەدا، لەڕەوتی نوێ کردنەوەی شیعری کوردیدا پەنایان بردۆتە بەر موەششەح و بەزۆر شێوەی جیاجیا بەکاریان هێناوە، وەکو گۆران و بەختیار زێوەر و دڵدار و دڵزار و کەریم شارەزا و هەردی و پیرەبال مەحموود. گرنگترین قالبی موەششەح لە کوردی ئەمانەن :

١ – وا دەبێ هەریەکە لە مەتلەع (ئەگەر هەبێ) و دەورو قوفل لەتەکانیان سەروای سەربەخۆیان هەبێ، پەیوەندییان نە بەسەروای یەکترەوە هەبێ ونە بە سەروای بەندەکانی تر. کەریم شارەزا موەششەحێکی (ڕۆژهەڵاتن) چوار بەندی هەیە، لە بەندی یەکەمدا دەڵێ :

لێواری زەریای ئاسمانی زیوین
ماچ ئەکا کوڵمی ئاسۆکەی خوێنین
سەرپۆشی کێوان
بەپرشنگی جوان
چەشنی ئەرخەوان
پەمەیی ئەرزە        جوان و دڵگیرە
لەم جێگە بەرزە        ڕاکێشی بیرە   [١٦٨ : ٤٠]

مەتلەع مەسنەوییە و سەرواکەی (ین)ە، دەور سێینەی هاوسەروایە و سەرواکەی (ان)ە، قوفلیش چوارینەیەو لەسەر دوو سەروای موتەناوب دامەزراوە (ەرزە، یرە). قالبی ئەم سیستەمە سەروایەی موەششەح بەم جۆرەیە :

AA/BBB/CDCD

هەرلەم قالبەدا بۆی هەیە مەتلەع نەبێ واتە موەششەحەکە (اقرع) بێ، لەو حاڵەتەدا لەتەکانی دەورولەتەکانی قوفل هەریەکە سەروای سەربەخۆیان هەیە، وەکو (ئاهەنگی نۆکتۆیەر)ی دڵزار [١٨٧ : ٤٠]، دەوری سێ سەمتە و قوفلی دوولەتە و سەرواکەی بەم جۆرەیە: (AAA/BB).

---

(48) خانە : دەوری دوومە لەسەر کێش و سەروای دەوری یەکەم دێ و ئاوازی گۆرانییەکەی پێ دەبڕێتەوە.
سیلسیلە : دەورێکی نوێیە هەندێ جار بۆ موەششەح زیاد دەکرێ و دەخرێتە نێوان قوفل و سەمتەکانی دەورەکانی موەششەح بەلام ڕەوییەکەی لەگەڵ هی سەمت و قوفل جیایە.
دەوری مەدیح : دەورێکە لە کۆتایی موەششەح دێ و بەزۆری بۆ مەدحی پلەنەبەرز تەرخان دەکرێ.

٢- وا دەبێ سەرواى قوفل و مەتلەع وەكو یەك بێ ، بەمەوە سەرو بنى هەر بەندێك بەیەكەوە گرێ دەدرێ و لەبەندەكانى تر دادەبڕێ ، واتە هیچ پەیوەندیەكى سەروا بەندى لە نێوان بەندەكاندا نییە . (خەندەكەى بایى )ى دلْدار (٧) بەندە و هەر بەندێكى مەتلەعى خۆى هەیە. لەهەر بەندێكدا سەرواى قوفل و مەتلەع یەك شتە ، لەبەندى یەكەمدا دەڵێ :

لە ئافاقى ژیانى نائومێدیم خەندەكەى بایى
فریشتەى پاكى هیواى نیشان دام وا كە بیدوێنم
پڕیشكى تیشكى ئەستێرەى جوان ئیمشەو بە ئەسپایى
بە سوزێ هاتە نێو كونجى دڵى تاریكى پڕ خوێنم
دەسا دەى مەسدەرى هەستى
دە خێرا لا دەرى پەستى
وەرە تا من بە رازى تۆ نەمامى شادى بروێنم [١٢٥ : ١٩٦]

ئەوەى لەم موەششەحەوە دەگیرێ ئەوەیە، بەدەگمەن موەششەح دەورى دوو سەمتە هەمیشە سێ سەمت و بەسەرەوەیە. مەتلەع چوار لەتە بەدوو سەرواى موتەناوبب بەیەكەوە بەسراون، سەمت دوولەتى مەسنەوییە، قوفل یەك تاكە لەتەو سەرواكەى بۆ مەتلەع دەگەڕێتەوە(بروێنم - بیدوێنم ، خوێنم) . قالبە سەرواكە بەم جۆرەیە ABAB / CC / B

٣- بۆى هەیە سەرواى مەتلەع و قوفلەكان هەمووى یەك بێ و تەنیا لەبەندەكاندا سەرواى سەمتەكانى دەورەكان بگۆڕێ . دلْدار لە موەششەحى (گوڵى سوور)دا كەسێ بەندە ، لەبەندى یەكەمدا دەڵێ :

گوڵى سوور ئەى كچى نەورۆز ئەرێ كام دەس لە باخى ژین
لە بۆ یەك دەفعە بۆن كردن ، بە ناكامى ئەتۆى هێنا
ئەوێستا كەش بەژاكاوى
وەها بێ قەدرو تۆزاوى
لەسەر ڕێگا فڕێ دراوى
لە جەور و زوڵمى ئەو دەستە پەریزادەى بەیان لەرزین
لەدەورى ئەم چلەى لێى بووى پەپوولەى زەردو سوور گریا [١٢٥ : ٩٥]

مەتلەع و قوفل یەكەو دوو لەتن ، لەنێوان خۆیاندا سەرواى موتەناوبیان پێك هێناوە لەتى یەكەم لەمەتلەع و قوفل سەرواكەى (ین )ە ، لەتى دووەمیشیان (ا )یە . ئەم پەیوەندییە موتەناوبییەى نێوان لەتەكان بۆ بەندەكانى تریش بەردەوام دەبێ، واتە هەموو مەتلەع و قوفلەكان ئەم دوو سەروایەیان هەیە كە هەموو موەششەحەكە بەیەكەوە گرێ دەداو وەك یەك پارچەى لێك نەبچڕاو كۆى دەكاتەوە سەریەك ، هەمان سەروا لە ئاستى هەر بەندێكیشدا هەمان دەور دەبینێ، لێنجا سەمتى دەورەكان سەرواى تایبەتى خۆیان هەیە . ئەم قالبە موەششەحە ، سەرواكەى بەم

جۆرەیە :
AB / CCC / AB

٤- وا دەبێ مەتلەع سەرواى خۆى هەبێ و سەمتەکان سەرواى خۆیان هەبێ و قوفلیش یەك لەت بێ و لەناو بەندەکە هیچ پەیوەندی سەروایی نەبێ ، بەلام لەگەڵ قوفلی هەموو بەندەکان سەروا دروست بکا و بەندەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە . بەختیار زێوەر لە موەششەحی پیرە مەگروون "دا بەندی یەکەمی بەم جۆرە هێناوە :

فەسلی زستان بەرگی سپی ئەپۆشی و چوویتە ئاسمان
سەیری هەموو دنیا ئەکەی تۆی شاهنشایی شاخەکان
کۆمەڵێ گەوهەری
هەیکەلی زەفەری
لا بەری کەدەری

با عیسی لەبۆ نەهێشتنی میحەن [٣٢ : ٥٥]

مەتلەع چوار لەتە و لەسەر یەك سەروا هاتوە (ان)، لە لەتی (٢-٤) دووبارە بۆتەوە . دەوری سێ سەمتی هاوسەروایە (ەری) و قوفل لە ئاستی بەنددا هیچ هاوسەرواى نییە بەلام لەگەڵ سەرواى قوفلی بەندەکانی تر یەك دەگرێتەوە (ەن). قالبە سەرواى ئەم جۆرە موەششەحە بەم شێوە دەبێ :

XAYA / BBB / C -- XDYD / EEE / C

٥- بۆى هەیە لەتەکانی مەتلەع هاوسەروابن و سەمتەکانی دەور هاوسەروابن و قوفل لەتێکی بچووکی سەربەخۆ بێ و لەناو بەندەکە سەرواى نەبێ بەلام لەهەموو بەندەکاندا دووبارە بێتەوەو بەیەکەوە گرێیان بدا وەکو (خەو رەوێنکە)ی بەختیار زێوەر کە (١٠) بەندە و لەبەندی یەکەمدا دەڵێ :

هەستە لەخەو کوردی هەژار ئەی نەو نەمامی رۆژگار
خۆت گورج کە وەك مەردی بەکار رەنجێك بدە بۆ یاد گار
تۆ دەمدەمی
کەمتەرخەمی
کوا مەرهەمی

رامی نیهان [٣٢ : ١٤٤]

ئەوەی ئەم قالبە لە قالبی پێشوو جیا دەکاتەوە سەرواى مەتلەعە . لەوێ تەنیا دوو لەتی (٤،٢) هاوسەروا بوون ، لێرە هەر چوار لەت هاوسەروان و قالبەکە بەم جۆرەیە:

AAAA / BBB / C - DDDD / EEE / C

٦- بۆى هەیە مەتلەع چوارینەیەکی موتەناویب و سەمتەکان هاوسەروا و قوفل مەسنەوی بێ و هیچ پەیوەندییەك لەنێوان سەرواى مەتلەع و دەورو قوفلی یەك بەندا نەبێ ، بەلام سەرواى قوفل لە

هەموو بەندەکان دووبارە بێتەوە ، وەکو (پایزی زستان )ی بەختیار زێوەر کە (٥) بەندە ، لەبەندی یەکەمدا دەڵێ :

وا گەلا رێزانە گیانە بۆ چەمە نزار
هاژە هاژی بای خەزانە روو بە رووی شار
ئەو درەختانەی کە سەریان ، زۆر بڵندە
ئەو گوڵانەی رەنگو بۆیان زۆر پەسندە
ئەو مەلانەی جێگەیان گاوو سەهەندە
هاتنی پایزلەبەر دڵیان گرانە چونکە توندی و گرژ و مۆنی پڕ جیهانە [٣٢ : ١٩٨] .

سەرەوای قوفل (انە ) لەهەموو قوفلەکانی تر دووبارە دەبێتەوە . لەم موەششەحەدا دوو شت سەرنج رادەکێشێ

١- مەتلەع وەکو دێرێکی موستەزاد خۆی دەنوێنێ چونکە لەتەکانی(٢-٤) لە (١-٣) کورتترن ، ژمارەی برگەیان (٨) بە (٤)ە .

٢- دەشێ سەمتەکان (بەلام تەنیا لەم بەندەدا ) لەباتی سێ سەمت بکرێن بە شەش ، بە سەرەوای موتەناویب بەیەکەوە بەسرابنەوە ، لەهەمان کاتیشدا وەکو موستەزاد خۆیان دەنوێنن چونکە لەتەکانی پێشەوە ژمارەی برگەیان دوو هێندەی لەتەکانی دواوەیە . واتە دەشێ دەور بەم جۆرە بنووسرێ :

ئەو درەختانەی کە سەریان زۆر بڵندە
ئەو گوڵانەی رەنگو بۆیان زۆر پەسندە
ئەو مەلانەی جێگەیان گاووسەهەندە

ئەگەرچی بەمەوە دوا سەمت کێشی بە نابەشبوونەکە دەشێوێ بەلام ئەگەر بەختیار زێوەر دەوری هەموو قوفلەکانی بەم جۆرە دابڕشتایە موەششەحەکەی بەهێزتر دەبوو . ئەم موەششەحە قالبەکەی بەم جۆرەیە :

ABAB / CCC / DD - EFEF / GGG / DD

٧- وا دەبێ سەرەوای مەتلەع سەربەخۆ بێ و سەرەوای سەمتەکانی دەورو قوفلیش یەك بێ وەکو موەششەحی (شەو)ی کەریم شارەزا کە (٧) بەندە ولەبەندی یەکەمدا دەڵێ :

پرشنگی رۆژی بە شەوقی زێڕین
ئەما لە کێو و بەرزایی زەمین
گوند و شارەکان
باخ و گوڵستان
گشتی بەجارێ واڕەش داگەڕان [١٦٨ : ٤٤]

قاڵبە سەرواکەی بەم جۆرەیە : AA/ BB / B ,

**پوختەی قاڵبەکانی سیستەمی سەروای موەششەح :**

ئەمە قاڵبە هەرە باوەکانی موەششەحە لە کوردیدا ، قاڵبی تریش هەن بەڵام یان بە گۆڕانێکی کەم دەکەونە ژێر یەکێ لەم قاڵبانە یان هەموو مەرجێکی موەششەحیان تێدا نەهاتوە . وەك دیارە سیستەمی سەروای موەششەح لەسەر بنچینەی لەت هاتوە ، لەتەکانی مەتلەع و دەور و قوفل ، ئینجا پەیوەندی سەروای ئەو بەشانەی بەند و بەندەکانی تر.

موەششەح و موسەممەت لەوە لەیەك نزیك دەبنەوە کە لەسەر بنچینەی سەروای لەت هاتوون ، بەڵام هەریەکە جۆرە بابەشبوونی خۆی هەیە . قاڵبی موەششەح زۆر جار لەبارەی ژمارەی لەتەوە لە پارچە گشتییەکان دەکا بەڵام گۆڕانی کێش و سەروای موەششەح لە مەتلەع و دەور و قوفلدا جۆرە شکڵێکی هەندەسی تایبەتی پێدەدا ، هەر ئەو شکڵەشە سیمای تایبەتی بە موەششەح دەدا و لە موسەممەت و پارچە گشتییەکان جیای دەکاتەوە .

قاڵبە هەرە باو و گرنگەکانی موەششەحی کوردی ئەمانەن :

1- AA / BBB / CDCD
2- ABAB / CC / B
3- AB / CCC / AB
4- XAYA / BBBC - XDYD / EEE / C ......
5- AAAA / BBBC - DDDD / EEE / C .......
6- ABAB / CCC / DD - EFEF / GGG / DD .......
7- AA / BB / B

شەشەم - شیعری ئازاد :

شیعر بە زمانی مەجازو دەربڕینی هەست و ئیقاعەوە لە پەخشان جیا دەبێتەوە . ئیقاعەکە ئیقاعی دەلالی و وشەیی دەگرێتەوە ، ئیقاعی وشەیی لە کێش و سەروا و ئیقاعی ناوەوە و دووبارە بوونەوەی دەنگ لە شوێنی تایبەتی و هێنانەوەی دەستە دەنگ و یاری کردن بە جێگای وشەو خستنە پاڵ یەکتری هەندێ دەستەواژەی لەبار دایە کە مۆسیقای دەقەکە پتەو بکات و بەرەو چڕی و دواییش تەقاندنەوەی مانا بیبات. کێش و سەروا لە هەموو ڕەگەزە وشەییەکانی تر زەقترە و پتر سەرنجی شاعیر و خوێنەرانی ڕاکێشاوە، بۆیە لای هەر نەتەوەیەك کێش و سەروا بە جۆرێك سەری هەڵداوەو پەرەی سەندوە و قاڵبی گرتوە کە لەگەڵ زمانەکە خۆی بگونجێ . بەپێی کار لەسەر کردنی چەندەها نەوەو سەدەی یەك لە دوای یەك قاڵبی تایبەتی بەخۆیەوە گرتوە ، کە بوە بەباو و هەموو شاعیران لەسەری ڕۆیشتوون . ئەو قاڵبانە هەڵبەت دەستووری تایبەتییان هەیە و بەپێی یاسای تایبەتی لێك دەدرێنەوە ، جا ئەو دەستوور و یاسا و قاڵبانە کە چەسپان وەکو شتی پیرۆزیان لێ دێ و نەوەکانی پاشتر بە ئەرکی خۆیانی دەزانن کە پەیڕەویان بکەن و مەگەر بە دەگمەن ئەگەر نا لێی لانەدەن. شیعریش وەکو هەموو دیاردەیەکی تری بیر و هونەر و باوەڕ بەپێی سەردەم دەگۆڕێ ، ئەمانە

ڕەنگدانەوەی باری ژیانی مادی و پەیوەندی کۆمەڵایەتین، بۆیە هەر سەردەمێك جۆرە ئەدەب و هونەرێکی دەبێ کە سیما و خەسیەتی ئەو سەردەمە و ئەو کۆمەڵە و ئەو نەتەوەیە هەڵدەگرێ، بۆیە ئەو دەستوورانەی لەسەردەمێك و لە کۆمەڵێکدا دەبن بەباو ، بۆ سەردەمێکی تر کت و مت وەکو خۆیان دەست نادەن . دەبێ یان گۆڕانیان بەسەردابێ و لەگەڵ سەردەم بگونجێندرێن یان هەر لە بنەڕەتەوە بخرێنە لاوەو یاساو دەستووری تری سەربەو سەردەمە نوێیەیان بخرێتە شوێن ، بەمەوە دەردەکەوێ هەر سەردەمێك جۆرە بیرو بۆ چوون و ئەدەب و هونەرێکی هەیە کە لە سەردەمەکانی پێش خۆی و پاش خۆی جیای دەکاتەوە.

بەگوێرەی شیعر ، ماوەیەکی دوور و درێژ بوو لای زۆربەی نەتەوەکان ، نزیکەی بەهەمان دەستوور بابەرڕاو نوێ کردنەوەی تێشدا کرابێ کەم بوە . نوێ کردنەوەی بنچی و بنەڕەتی شیعری جیهانی لەسەردەمی ڕۆمانتیکی و ئینجا ڕەمزییەکان دەست پێ دەکا کە قالبە دەق گرتوەکانی کلاسیکیان ڕەت کردەوە و داوایان کرد شاعیر بە پێی بیرو هەست و سۆزی ناوەوەی خۆی و بە یاسای زمانی خۆی بەپێرەوی شیعر نووسین بکا ، نەك یاسای دەرەوەی خۆی و دەرەوەی زمانەکەی بەسەر شیعری خۆی دابسەپێنێ . ئەم نوێکارییە جگە لە ڕەگەزەکانی تر ، لەدوو لایەوە ئاشکرا دیارە : ١- کێش ، ٢- سەروا . شاعیران قالبە ڕەقەکانی ئەم دوو ڕەگەزەیان دایە دواوە . بەڵام بەتەواوی پشتیان تێ نەکردن ، ئازادییان لە جۆری کێش و ژمارەی پێیەکان و لە چۆنیەتی و کاتی هێنانەوەی سەروا بەخۆدا. ئەمە قۆناغی یەکەمی نوێ کردنەوەی شیعر بوو . پاشتر هەر بەتەواوی ئەم دوو ڕەگەزە درانە دواوە و شیعر لە پەخشان نزیك بوەوە ، وەك پەخشان گوێ بە کێش و سەروا نادا ، وەکو شیعریش بە زمانێکی مەجازی و چڕو پڕ ئیجا دەنووسرێ. ئەمە زیاتر بە (پەخشانە شیعر) ناسراوە [٢٩٤]. ئەمەیان لە زمانە ئەورووپییەکاندا بەپێی شکڵ و ناوەرۆکەوە دوو جۆری هەیە :

١- پەخشانی شیعری (poetic prose) : ئەمە پەخشانە بەڵام لە بەکارهێنانی ڕیتم و جۆری کێش وسفتی و ڕازاندنەوەی زمان ، بەتایبەتی لەبەکارهێنانی هونەرە ڕەوانبێژییەکانی وەکو دەنگە لاسکەو ئەسۆنانس و میتافۆر، لە شیعر نزیك دەبێتەوە [٥٠٣ : ٥٢٠].

٢- پەخشانە شیعر یان هۆنراوەی پەخشانی (prose poem) : ئەمە بەرهەمێکە وەکو پەخشان چاپ دەکرێ بەڵام ڕەگەزە باوەکانی شیعری تێدایە ، وەکو ڕیتم و مەجاز و سەروا و سەروای ناوەوە و ئەسۆنانس و کۆنسۆنانس و وێنەی سەرنجکێشی ورد دابڕاو [٥٠٣ : ٥٣٦].

ئەوەی ئێمە لێرەدا دەمانەوێ زیاتر لێی بدوێین ، قۆناغی ناوەڕاستە ، ئەو شیعرە ئازادەی کێش و سەروای تێدایە بەڵام خۆی بە قالبی تەقلیدی نابەستێتەوە. ئەمە سەرەتا لە ئەورووپا لای شاعیرە فەڕەنسییەکانی وەکو ڕامبۆ و فرلین و مالارمێ سەری هەڵدا و لە ئینگلیزیدا والت ویتمان و ئینجا ئەزرا پاوند و ت.س. ئیلیۆت پەرەیان پێدا. لەعەرەبیدا هەر لە سەدەی نۆزدەدا ، لەژێر کاریگەری

ئەدەبی ئەورووپـا جۆرە ئازادییـەك لە كێش و سـەروا و بەتایبەتیش سەروا كەوتە ناوەوە، ئەمە هەر لە حەسوونی سووری كە بۆ یەكەم جار شیعری بێ سەروا (blank verse-)ی نووسی و لەسەرەتای ئەم سەدەیەش زەهاوی یەكێ بوو لەوانەی داوای دانەدوواوەی سەروای دەكرد چونكە سوودی نییە ، ئەم نوێ كردنەوەیە لە قوتابخانەی (دیوان) و (ابولو) پەرەی سەند تـا كۆتـایی چلەكان لەسەر دەستی سەیاب و نـازك الملائكە بەتـەواوی تەقییـەوە[٣٦٥]. دوای ئـەوانیش شـاعیرانی تـری وەكـو عبدالوهاب البیاتی و بلند حەیدەری و یوسف الخال و عبدلمطـی الحجـازی و... پـەرەیان پێدا.. لـە توركیدا ئەم بزوتنـەوەی ئازادییە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا دەستی پێ كرد . بۆ نموونە عـەلی كـامی لـە (ثروت فنون)دا شیعرێكی نووسیوە بەناوی (یانغین) [٤٤٨ : ٣٧٥] ،لە ژێر ناونیشانەكە تێبینی نووسیوە (قافیەسز) ، دێرەكانی بەسەر پارچەی (٢ ، ٥ ، ٢ ، ٢، ٥ ، ٥) لـەتی دابەش بوە و هیچ سەروای تێدا پەیرەو نەكراوە . لە ڕاستیدا (ثروت فنون) دەرفەتێكی بـاش بـوو بۆ بـەرپاكردنی (شۆڕشێكی فراوانی ئەدەبی) [٣٤٦ : ٢٤٥] و نووسەر و شاعیرانی ئەم ڕۆژنامەیـە توانیـان لـە ڕێـی كاریگەری ئەورووپی و بەتایبەتیش فەڕەنسییەوە تازە كردنەوەیەك لـە شیعری توركی ئـەنجام بدەن . پاش ئەمان و دوا بەدوای ڕاگەیاندنی دەستوور (١٩٠٨) و نەمانی (ثروت فـنون) بزووتنەوەیەكی تری ئەدەبی بەناوی (فجر آتی) سەری هەڵدا كە (ئەمانە توانییان ئەدەبی توركی لە كۆتی قورس ڕزگار بكەن) [٣٤٦ : ٢٤٦] . شاعیرانی وەكو حسین زادە عەلی و ڕەزا توفیق بولوك باشی و ئەحمەد هاشم و جەلال ساهر و محەمەد عاكف پەرەیان پێدا و لای نازم حیكمەت گەیشتە ترۆپكە .

شـاعیرانی فـارس لـە ئەنجامی كاریگـەری شیعری ئینگلیزی كەوتنـە تـازە كردنـەوەی شیعری فارسی. بۆ نموونە (ذبیح بهروزی) كە ماوەیەك لە ئینگلستان بوو كەوتبوە ژێر كاریگەری شەكسپیر و سـاڵی ٩٣٠ دوو شانۆگەری دانا یەكێ بەناوی (شاه ایران و بانوی ارمن) و ئەوەی تر بەناوی (در راه مهر)، لەهەردووكیاندا خۆی لە كێش و سەروای تەقلیـدی ڕزگار كردوە[٣٩١ : ١٣٠] سـاڵی ٩٣٢ كە محەمەد مقەدەم لەئەمریكا گەڕایەوە ،لەژێر كاریگەری والت ویتمان شیعرێكی ئـازادی نووسی بـەناوی (ڕازی نیمـە شـب) [٣٩١ : ١٣٢] بـەڵام لەهـەموویان زیـاتـــر بزووتنـــەوەی نوێخـــوازی شیعری فارسی بـە (نیمـا یـوشیج) گەیشتە پۆپـە. كـە سـاڵانی ٩٢٨-٩٣٩ كۆمـەڵێ شیعری لـە گۆڤاری مۆسیقی بڵاو كردەوە (لـەم شیعرانەدا هیـچ گوێـی بـە هێنانـەوەی سـەروا نـەدەدا) [٣٩١ : ١٣٣] . دوای ئـەویش شـاعیرانی وەكـو (تندركیـا) و گولچین گـەیلانی و فـەرەیدون تـەوەللی و نـادر نادرپوور و سایە و سیاوەش كسرائی و م.اومیدو فروغ فروغزادە .... پەرەیان بەم بزووتنەوەیەدا .

لە كوردیدا ، ئەگەر چی هەر لەسەدەی نۆزدەوە هەوڵی دەرچوون لەیەكێتی سەروا هەبوو وەكو مەسنەوییەكانی حاجی قادر بەڵام یەكەم هەوڵی بەرچاو عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەكاری داویە بۆ نەهێشتنی قـالبی تایبـەتی سـەروا ، جـا یـەكێتی سـەروا بێ یـان مەسنەوی [١٥٠ : ٥٢] . ئینجـا لـەماوەی نێوان (٩٢٠-٩٣٠)، گۆران و شێخ نـووری شێخ سـالح و ڕەشید نـەجیب و عـەبدورەحمان

بەگی نفووس ، لە ڕێگای لاساکردنەوەی شاعیرانی تورکی وەکو تۆفیق فیکرەت و جەلال ساهر و نازم حیکمەت کەوتنە نوێ کردنەوەی شیعری کوردی بەڵام وەك گۆران دانی پیّ دا دەنێ شێخ نووری سەر دەستەی ئەوانە بوە ، چونکە هەم زۆری دەنووسی و هەم نووسینەکانیشی بڵاو دەکردەوە و نەنسیریان دەبوو[٢٣٢ : ٣] . ڕەشید نەجیب و عەبدولرەحمان بەگی نفووس زیاتر خۆیان لەیەکێتی سەروا لاداوەو گەڕاونەتەوە سەر مەسنەوی خۆماڵی. شێخ نووری داهێنانەکەی لە نووسینی موستەزادی جۆراو جۆر و موسەممەت و شیعری پارچە دار و مونوریەکردنی چوارینەی کوردییە بەسەروای پتراکی جگە لە بەکارهێنانی مەسنەوی و نووسینی ئۆپەرێت. گۆران ئەگەرچی چ لە ڕووی تەوازوعەوە بێ و چ لە ڕووی ڕاستی دەست نیشان کردنی سەرەتاکان، شێخ نووری بەسەرۆك دادەنێ ، بەڵام گۆران خۆی بوو ئەو بزووتنەوەی پێ داو گەیاندە پۆپە . نابێ دەوری پیرەمێرد و قەدری جان و جگەر خوێن و بەختیار زێوەر لەبیر بکرێ کە هەریەکە لە ئاستی خۆیەوە شتی نوێی خستۆتە سەر ئەو هەوڵەی نوێ کردنەوە، بۆ نموونە پیرەمێرد جگە لە گەڕانەوە بۆ سەروای مەسنەوی خۆماڵی هەندێ شیعری پارچە داری هەیە ، شەشینە و پێنجینە و چوارینە ، جگە لە کۆمەڵێ موسەممەت [٤٤] . و بەمەوەش تازە کردنەوەی سەروای قووڵتر کردەوە .

<u>شیعری ئازاد و سەروا :</u>

ئەو شیعرە ئازادەی باسی دەکەین، بەتەواوی لە کێش و سەروا ئازاد نییە، بەڵکو لە کۆتی تەقلیدی ئەم دوو ڕەگەزە ئازادە. سەروای ئازاد ئەوەیە کە خۆی بە هیچ قالبی دەرەوە نابەستێتەوە، هاتنی بەپێی یاسای دەرەوە نییە، بە پێی هەست و نەستی شاعیرە، بەپێی دەلالەت و دابەشبوونی ڕستە و دەستەواژەی شیعرەکەیە. شاعیر کەی ویستی و بەچاکی زانی سەرەتای سەروا دادەمەزرێنێ و کەی بۆی گونجا و بێ زۆر لە خۆکردن، سەرواکە دووبارە دەکاتەوە. بەڵام لەهەمان کاتیشدا هەوڵ دەدا سوود لە ڕەگەزی تری دەنگو وشە وەربگرێ بۆ قووڵ کردنەوەی ڕیتمی شیعرەکە و پتەو کردنی سەرواو دەوڵەمەند کردنی ئیحا و دەلالەتی وشەکان . بۆ نموونە [٤٩] با بەشی یەکەمی (لەزیندانا چوارەی تەمووز)ی گۆران وەربگرین کە تا ڕادەیەك ئازادی بەخۆی داوە لە دامەزراندنی سەروای شیعرەکە ، دەڵێ:

(١) دەنگێکی دوور ........................................ A
(٢) دوور .. ئێجگار دوور ... ................................ A
(٣) بەئاستەمێك ئەگاتە ژوور ! ................................ A
(٤) ئەی دەنگی دوور ، ........................................ A

---

[٤٩] گۆران یلشەنگی بەکارهێنانی سەروای ئازادە ئینجا لەدوای ئەوەوە شاعیرانی کورد ڕوویان کردە ئەم جۆرە سەروایە و بەرەیان پێدا . لێرەدا تەنیا (٣) نموونەی گۆران و شێرکۆ و بەشێو وەردەگرین . داوای لێ بووردنیش لە شاعیرانی تر دەکەین کە لێرەدا بواری ئەوە نییە نموونەی شیعری هەموویان شی بکەینەوە .

(٥) بەئاستەمێك ئەگەیتە ژوور! .................................... A

(٦) ئاخۆ سپیت یان ڕەش یان سوور؟ ........................ A

(٧) وەرە پێشتر.. .................................................. B

(٨) چۆن ئاو ئەرژێنە ناو ئاگر، ............................. B

(٩) لە ڕێی گوێوە بڕ ژێرە گیان ............................. C

(١٠) زیندانم پڕکە لەکۆڵ دان!.. ............................ C

(١١) زنجیری بێ ............................................... D

(١٢) کپ بە تاوێ، وەك لوکەی گوێ! ......................... D

(١٣) هەوای شلەقاوی زیندان، ................................. C

(١٤) بنوو وەك بەرمەمكان ئەنوێ! ........................... D

(١٥) با دەست ڕێژی ئەم دەنگەی دەر ......................... E

(١٦) گوللەی مانای گوێم بپێکێ ............................. D

(١٧) بەڵکو گرەی تینوێتی سەر ............................... E

(١٨) وەك تۆپ نالەی بێ و بتەقێ!... ..................... D[١٧٢ : ٢٨٠]

ئەم پارچە شیعرە لەسەر (٥) سەروا دامەزراوە، بەڵام. بەکارهێنانی هەموو سەرواکان مل کەچی یەك تاکە یاسای سەروا نییە. هەر سەروایەك جۆرە بەکارهێنانێکی تایبەتی بۆکراوە. ئەمەیش زیاتر سەربەستی بە شاعیر دەدا کە خۆی بەیەك تاکە یاسا نەبەستێتەوە لەسەرەتاوە تا کۆتایی. یەکەم سەروا (A) شەش جار بەدوای یەکدا هاتوە، بەڵام هەموویان مەرجی سەروایان تێدا نییە، چونکە لە لەتی(٤،٢،١) وشەی (دوور) بە هەمان ماناوە دووبارە کراوەتەوە بێ ئەوەی وەك پاش سەروا حسێبی بۆ بکرێ و سەروای وشەکانی پێشەوەی ڕابگیرێ، ئەم جۆرە سەروایە لە شیعری کلاسیکی ڕێ نەدراوە، بەکەم و کورتی (ایطاء) داندراوە، کەچی گۆران زۆر سەربەستانە بەکاری هێناوە چونکە شوێنەکە و بابەتەکە ئەو جۆرە دووبارە بوونەوەی دەوێ. ئەمە لە (٥،٣)یش هەمان شتە. ئەم هەر شەش سەروایە دەنگی بزوێنی (وو) یان تێدایە و ئەمەش بزوێنێکی درێژەو ئاستی کشانی ئاسۆییە. دوورایی دەنگو باسەکە دوور دەکاتەوە کە ئەمەیە مەبەست لەم چەند دێرە. دوای یەك مەسنەوی هاتوە (٨،٧). لە (١٢،١٠،٩) یەك سەروا دووبارە بۆتەوە (C) و تێك چرژانێکی دروست کردوە لە نێوان سەروای مەسنەوی (١٠،٩) و سیستەمی سەروای لەتەکانی دوای ئەوەوە. لەتەکانی(١١، ١٢، ١٤، ١٦، ١٨) هاوسەروان (D) ولەگەڵ سەروای پێشەوە (C) و سەروای نێوانیان (E) یەکتریان لەباوەش گرتوە. دوو لەتەکەی تریش (١٧،١٥) هاوسەروان. وەك دیارە ئەم پێنج سەروایەی لەم شیعرەدا هاتوون. دوویان (A.B) بەشێوەی سەربەخۆ لەشەشینە و مەسنەوی پێشەوە هاتوون و بەناویەکدا چوونیان لەنێواندا نییە، کەچی سێ سەرواکەی تر(C.D.E) تێك هەڵکشاون و یەکێتییەکی پتەوتریان بەشیعرەکەداوە و سفتتریان کردوە. (C)

لەگەڵ (D) و (D) لەگەڵ (E) کەوتوونەتە ناویەك .

شێرکۆ بێکەس لەپارچەی یەکەمی (بەیانی بێ خۆر)دا دەڵێ :

(١) ڕێگا دوورە ، بەرچاو لێڵە ........................ A
(٢) ئاسۆی گیانم بەدوای تیشکی ........................ B
(٣) خۆری هەواڵێکا وێڵە ........................ A
(٤) خەیاڵ ڕێبوارێکی ماندووی ........................ C
(٥) لەش کە ئەفتی ........................ B
(٦) خەم داگرتووی ........................ C
(٧) بیابانی مابێن .. کێڵە ........................ A [١٢١ : ٣٩]

ئەم پارچە شیعرە (٧) لەتە لەسەر سێ سەروا (ABC) دامەزراوە . دامەزراندنی ئەو سەروایانە بەپێی دەستووری کلاسیکی نەهاتوە . سەروای یەکەم (A) لە لەتی (١ ، ٣ ، ٧) دووبارە بۆتەوە ، دەوری زایەڵە دانەوەی سەرەتا و کۆتاییە ، سەروبنی پارچەکەی بەیەکەوە بەستۆتەوە و وەك ئەڵقەیەکی بازنەیی دایخستوە . جگە لەسەدایەکی ناوەڕاست کە دەنگەکانی ئەم لاو ئەولا لەخۆی کۆدەکاتەوە و بنکەی ئاوازی سەروای سەرەکی شیعرەکە دادەڕێژێ . دوو سەرواکەی تر یەکە و دووجار هاتوون . یەکێکیان (B) لە لەتی دوەم دەستی پێ کردوە ، دوای دوو لەت ئینجا لە لەتی پێنجەم دووبارە بۆتەوە ، کەچی ئەوەی تر (C) لەلەتی (٤) هاتوە و لەلەتی (٦) سەدای هاتۆتەوە . لەم پارچەیەدا هیچ لەتێك بەرەهایی و بێ سەروا نەماوەتەوە ، هەرسێ سەروایش بەناویەکدا چوونەو بەنۆرە ڕێگای دەنگدانەوە بۆ یەکتر دەکەنەوە و لە کۆکردنەوەی هەموویان ئاوازێکی هەمە ڕەنگەی بڵند بەئەنجام دێ .

بەشێوله (ئەو بەڕی تاسە)دا دەڵێ :

(١) چۆن دڵت هات ........................ A
(٢) لەگەڵ سەرینی ، ........................ B
(٣) تەنیایی دەرزی چنا ........................ C
(٤) جێم بهێڵیت ؟ ........................ D
(٥) چۆن دڵت هات ........................ A
(٦) لەگەڵ شەوی ، ........................ B
(٧) ساردو سڕی ، بێ نووستنا ........................ C
(٨) جێم بهێڵیت ........................ D
(٩) بگەڕێوە ........................ E
(١٠) ئەوری تەنیام چاوەڕێتە ........................ F

(١١) بگەڕێوە ............................................E

(١٢) عومری زاوام ............................................X

(١٣) شەیدای بووکی تریەی بێنە ! .................F [١٢٢ : ٩٦]

ئەم شیعرە ، زیاتر لەسەر هونەری دوویات کردنەوە بنیات نراوە . دوویات کردنەوەی لەتە دێر و دوویات کردنەوەی سەروایە . سەروایەکی گشتی و سەراپاگیری لەت . دوو جار (چۆن دڵت هات) و دووجار (جێم بهێڵیت) و دووجاریش (بگەڕێوە) هاتوە . لە (١٣) لەت ، (٣)ی دووبارەیە ، دەوریان جەخت کردنی مانا و فراوان کردنی ڕیتم و مۆسیقایە . یەکەم و دوەم بەیەکەوە ڕستەی سەرەکی پێك دێنن و گلەو گازاندە کردنە لەیار ، سێیەمیش تکایە بۆ گەڕانەوە. ئەم دوو هەڵوێستە بە جەخت و دووبارە ناشیرین نابن ، بەڵکو بەهێزتر دەبن بۆیە دووبارەکان لە شوێنی خۆیاندا هاتوون .

سەروای یەکەم (A) لەلەتی یەکەم (١) هاتوە ولەلەتی(٥) دووبارە بۆتەوە ، سەروای (B) لەلەتی (٢) ولەتی (٦). بەڵام ئەم سەروایە لە ڕوانگەی بۆچوونی کلاسیکی بێهێزە ، چونکە دوو وشەی کۆتایی (سەرینی ، شەوی) تەنیا لە دەنگی (ی) هاوبەشن و ئەویش لەئەسلی وشەکاندا نییە ، مۆرفیمی ڕێزمانییە و بارشتنی ڕستە هێناویە، بەڵام شاعیری نوێ ئەو یاسا سەختە دەشکێنێ ، ئەو ئەوەندەی بەسە کە دەنگەکانی کۆتایی ڕایەڵەی یەکتربن ، ئیدی دەنگەکە ئەسلییە یان ئەسڵی نییە بەلایەوە گرنگنییە . سەروای لەتی (٣) و (٦)یش یەك شتە (١) دوا لەتیش سەرواکەی بۆ لەتی (١٠) دەچێتەوە کە دوو لەتیان لەناوەخۆ گرتوە . (عومری زاوام) کە لەتی (١٢)یە وادەکەوێتە بەرچاو کە ڕەهاو بێ سەروا بێ، بۆیە (X) مان بۆ داناوە ، بەڵام ئەویش هاوسەروای خۆی هەیە ، لەگەڵ سەروای ناوەوەی لەتی (١٠) (ژووری تەنیام) هاوسەروان . وەك دیارە شاعیر لە دارشتنی سەروادا پەنای بردۆتە بەر دووبارەکردنەوەی دەستەواژە ولێك گرێدانی سەروای کۆتایی و سەروای ناوەوە و تێك هەڵکێشانی سەرواکان بۆ دەستەبەر کردنی چنینێکی سفتی کۆتایی لەتەکان .

جگە لەم سێ شاعیرە شاعیرانی تری وەکو لەتیف هەڵمەت و جەلالی میرزا کەریم و ئەنوەر جاف و .... ئەم جۆرە سەروا ئازادەیان بەکارهێناوە . لەشی کردنەوەی ئەم سێ نموونەیەی سەرەوە دەگەینە چەند ئەنجامێك لەبارەی سەروای ئازادی کوردی: لەم جۆرە سەروایە :

١- شاعیر بە هیچ جۆرێ خۆی بەهیچ دەستوورێکی سەروا و هیچ قالبە سەروایەك نابەستێتەوە .

٢- شاعیر لەسەروا هێنانەوەدا ، گوێ بە یاسای دەرەوە نادا ، تەنیا گوێ لەهەست و سۆزو بیری خۆی دەگرێ . سۆزو بیری کەی و چ جۆرە سەروایەکی بوێ ، پەیڕەوی ئەو سەروایە دەکا. واتە هەست و سۆزو بیری شاعیر ناترنجێنرێتە ناو بۆتەی تەسکی قالبە سەرواوە ، بەڵکو سەروا مل کەچ دەکرێ بۆ هەستی ناوەوەی شاعیر و چۆنیەتی کارکردنی لە خوێنەر.

٣- شاعیر سەرواکانی بە درێژایی هۆنراوەدا بڵاودەکاتەوە ، بۆی هەیە یەك سەروا سەرەتا و

کۆتایی پارچە شیعر بگرێتەوە و بەشێوەیەکی ئاسایی و پەرت و بڵاوی بەناو شیعرەکەدا پەرت ببێ. شوێنی دووبارە کردنەوەی سەروا دیار نییە ، شاعیر خۆی دەزانی لە چ شوێنێکدا دووبارەی دەکاتەوە.

٤- بۆ دەستەبەرکردنی یەکێتی ئاوازی شیعرەکە ، شاعیر هەوڵ دەدا سەرواکان لێك دانەبڕێنێ، بە پێی توانا تێکیان هەڵدەکێشێ بۆ ئەوەی هەموو سەرواکان بەردەوامییان هەبێ و بەهەموویان وەك پارچە مۆسیقایەکی گشتی ئاوازی شیعرەکە بەرز بکەنەوە .

٥- یەکێ لە ڕەگەزەکانی پتەو کردنی سەروا و ئاوازی شیعر دووبارە کردنەوەیەکە شاعیری تازە زۆر جار پەنای دەباتە بەر ، بەتایبەتی لەسەرەتا و کۆتایی هۆنراوە ، ئەگەرچی زۆر جار لەناوەڕاستیشدا دێ . ئەمە تینێکی زیادەکی بە هێزی سەروا دەدا و بنکەی دووبارە بوونەوەکە مکوومتر دەکا .

## بەشی چوارەم

# جوانکاری وکەم و کورتییەکانی سەروای شیعری کوردی

**باسی یەکەم : جوانکاری سەروای شیعری کوردی**

١- ئیعنات
٢- جووت سەروا (دوقافیتین)
٣- سەروای دووبارە (التکرار)
٤- سەروای دوو لانە.
٥- سەروای ئەلقەبەند
٦- سەروای چوار گۆشەیی
٧- تەشتیرو تەرسیع
٨- سەروای وشەبڕ
٩- سەروای بەتیپ (ناوی دەنگ)
١٠- چینەکردنی ڕەوی
١١- چینەکردنی وشەی سەروا.

**باسی دووەم : کەم و کورتییەکانی سەروای شیعری کوردی**

یەکەم : کەم و کورتی دەنگو ئاوازی سەروا

١- جیاوازی دەنگی ڕەوی
أ- جیاوازی لە بزوێندا
ب- جیاوازی لە نەبزوێندا
٢- جیاوازی دەنگی پێش ڕەوی
أ- گۆڕانی بزوێنی کورتی پێش ڕەوی
ب- گۆڕانی بزوێنی درێژی پێش ڕەوی
ج- گۆڕانی قەید
د- گۆڕانی ئەلفی تەئسیس
هـ- گۆڕانی ئیشباع
٣- گۆڕینی بنیادی وشەی سەروا

دووەم : کەم و کورتی زمانەوانی و فەرهەنگی سەروا

١- ئیتا
٢- شایگان
٣- تەزمین (التضمین)
٤- تەحرید
٥- هێنانی وشە بۆ خاتری سەروا
٦- وشەی سادە و ناسادەی سەروا.

## باسی یەکەم - جوانکاری سەروای شیعری کوردی :

جوانکاری یەکێکە لەئەرکە ئیستاتیکییەکانی شیعر و شاعیر زۆرجار ئەم ڕەگەزە بەدەرفەت دەزانی بۆ پتەوکردنی بەهای جوانکاری. لەم گۆشە نیگایەدا، سەروا وەکو هونەرێکی ڕەوانبێژی، لقی (جوانکاری - بدیع) دەوری خۆی دەبینێ، وەکو (تەجنیس) و(رد القافیە) و (تەرسیع) کە لە بەشەکانی پێشوو باسیان کراوە، جگە لەمانە گرنگترین هونەرەکانی جوانکاری سەروا ئەمانەن :

١- (ئیعنات) - سەروای فراوان - دەنگە دووبارەبووەکانی کۆتایی لەت یان دێرە شیعر تا زیاتر بن، مۆسیقای شیعرەکە دەنگدانەوەیەکی بەرزتری دەبێ. ئەو دووبارە بوونەوەیە وەك ڕادەی هەرە کەم یان یەك دەنگی بەسە (بزوێنی درێژ) یان دوو دەنگ(بزوێن و نەبزوێن)، لەوە تێبپەڕێ دەبێ بە زێدەڕەوی و دەکەوێتە قالبی جوانکاری، چونکە زیادەکە بۆ پێویستی نەهاتوە، بەڵکو بۆ جوانی هاتوە. ئەم زیادەیەش :

- یان لە دوای ڕەوییەوە دەبێ، ئەمە پاش ڕەوی و پاش سەروا دەگرێتەوە [(٥١)]

- یان لەپێش دەنگە ئەسلییەکانی سەروا دەبێ. ئەم زیادەیە وەکو سەروا دەبێ لەسەرەتا تا کۆتایی دووبارە بکرێتەوە. بێگومان ئەوە بارێکی قورستر دەخاتە سەر شانی شاعیر بەلاّم سەرواکە قووڵتر و فراوانتر دەکا. ئەم دیاردەیە لەعەرەبیدا پێی دەگوترێ (لـزوم مـالایلزم) یـان (اعنـات). یەکەم کەس ئەبو عەلای مەعەڕڕی بناغەی داڕشتوە و پاشان کەم کەمە شاعیران لاسایان کردۆتەوە. نالی لەشیعری (ئەی قەلعەیی)دا، لە هەموو دێرەکان دا، بەلاّم لەزۆربەیان ئەم هونەرەی ڕەچاو کردوە، لەسەرەتادا دەڵێ :

ئەی قەلعەیی ماهم کە دەڵێی ئەوجی برووجی
وەك قوولـلەیی دووری کە دەڵێی قامەتی عووجی [٢٠٩ : ١١٨]

وشەکانی سەروا : (برووجی، عورووجی، دورووجی، سورووجی، خورووجی، لەجووجی، نووجی) دەنگەکانی سەروایان (ووجی)یە، (ج) ڕەوییە و (ی) پاش ڕەوییە. واتە دەنگە ئەسلییەکان (ووج)ن. نالی لە چوار وشەی سەروادا پێش ئەم دوو دەنگە دەنگی (ور)یشی پەیڕەو کردوە. ئەمە پێویستی‌یەکی سەرواناسی نییە بەلاّم جوانییەکی زیادەی بەسەرواکە داوە. وادەبێ شاعیر لەباتی زیادکردنی سنووری دەنگەکانی سەروا، ئاوازیان یەك دەخا، ئەمەیش هێزێکی زیاتر بەسەرواکە دەدا (ئاوازی وشە خۆی لەیەکێتی بزوێنی هاوجێی وشەکاندا دەبینێ)، خادیم دەڵێ :

ئەی غولامی دەرگەهی تۆیە لەسەر شاهان شەرەف
جان و دڵ بۆتیری موژگانی تۆ وەکو دایم هەدەف [٧٥ : ١٥٥].

---

[(51)] لەشوێنی خۆی بە درێژی باسی ئەم دوو ڕەگەزەی سەروا کراوە، پێویست بە دووبارە نموونە هێنانەوە ناکات.

وشەکانی سەروای ئەم هۆنراوەیە ئەمانەن : (شەرەف، هەدەف سەدەف، بەسەف، بەکەف، تەرەف، تەلەف، خەزەف). ئاوازیان یەکە چونکە هەریەکە لە سێ نەبزوێن و دوو بزوێن دروست بوە. برگەیەکی کراوەو برگەیەکی داخراو، بزوێنی هاوجێیان هەموو یەك شتە (ە).

٢- جووت سەروا (ذوقافیتین) : ئەو شیعرەیە کە دوو وشەی سەروای هەبێ. ئەگەر وشەکانی سەروای کۆتایی لەسەر لەبەری دێرەکان لابدەی، دیسان سەروای خۆی هەر بپارێزێ. ئەمە لە عەرەبیدا بە (تەشریع) ناسراوە و (ئەو دێرەیە ئەگەر بەشێکی لابدرێ بەمەجزووئی و بەسەروایەکی تر بمێنێتەوە .. مەرجە لە تەشریع یەك دێر و زیاتر دوو سەرواو دوو کێشیان هەبێ) [٢٨٣ : ٣٥]، لەفارسیدا پێی دەگوترێ (ذوقافیتین). د.علی سولتانی دەڵێ : (لەڕاستیدا، ئەمە جۆرە هونەرێکی (اعنات)ە، چونکە شاعیر خۆی ناچار دەکا لەکۆتایی لەتەکاندا دوو سەروا بێنێ) [٤٠٥ : ٦٥]. سالم لەهۆنراوەی (خەمی قەددم)دا، لەسەرەتا تا کۆتایی کە شەش دێرە و دێری یەکەمی موسەڕڕەعە دوو سەروای دامەزراندوە. دەڵێ :

خەمی قەددم لەغەمدا شێوەیی ئەبرووتە/تامووتە
بە دائم پێچشی خاتر وەکو گێسووتە/ تابووتە
دڵی تەنگم لەعیشوەو فەننی تۆ مەحبووسی جاویدە
لەچاهی میحنەت و غەمدا هەتا وا خووتە/هارووتە
خەیاڵم تیژە وەك ئەلماس و هەم لەم فیکرەدا کۆڵە
لەباتی خاتەمی لە علت مەگەر یاقووتە / یاقووتە [١٠١ : ١٢٢]

سەروای ئەم هۆنراوەیە (ووتە)یە، لە وشەکانی (تامووتە، تابووتە، هارووتە، یاقووتە، هیندووتە، واجووتە، یابووتە)دا هاتوە، ئەم وشانە لەکۆتایی دێرەکان بپچڕێن، وشەی پێشەوەیان جێگەیان دەگرێتەوەو هەمان سەروا (ووتە) دەمێنێ کە لەم وشانەدایە (ئەبرووتە، گیسووتە، خووتە، یاقووتە، گاجووتە، تابووتە) لەمانە هەندێکیان دوو وشەکەیان جیایە وەکو : (ئەبرووتە/تامووتە، خووتە/هارووتە) و هەیشە هەمان وشەیە دووبارە بۆتەوە بەڵام بەواتایەکی تر (ڕەگەزدۆزی) وەکو : (یاقووتە/یاقووتە).

- هەر لەم جووت سەروایە، وادەبێ، وشە یان دەستەواژەی دوەم وەکو بەشێکی وشە یان دەستەواژەی یەکەم وابێ، وەکو (هەوابێ/وابێ) لە شیعرە ناودارەکەی زێوەر کە دەڵێ :

کێیە تا سەر لەفەزای دەردو غەمابێ/مابێ
ئەوە هەر کوریە کە چاوی لە هەوابێ/وابێ
هەر سولەیمانییە عیفریتی حەسەد سواری بوە
هود هودی خۆش خەبەرم گەر لەسەبا بێ/بابێ
ڕاستی ڕێگەی ڕاستت ئەدەب و ئەخلاقە
ئەمدی هەرگیز لەکەسێ ڕووی لەکەچا بێ/چابێ [٩٧ : ١٦]

کۆتایی هەر دێڕێك بەدوو دەستە دەنگی لەیەك نزیك کۆتایی هاتوە، لەهەمووشیان بەیەك ئەسەق یەکەمیان دوو دەنگی سەرەتای زیاترە لە دووەم (هەوابێ/وابێ ...) یان وەکو ئەمە خۆی دەنوێنێ کە وشەی یەکەم دوو برگەی کۆتایی دووبارە بوویێتەوە (هەوابێ - وابێ).

- هەرلەم جۆرەدا بۆی هەیە لەباتی دووبارە بوونەوەی دوو برگە، وشەکانی سەروای کۆتایی وەکو دووبارە بوونەوەی یەك برگەی پێشەوەیان وابێ، حەمدی دەڵێ :

دەکابەغما بکا جانان لەگەڵ فەردی بەشەر/ شەڕ
لەدڵ شەوق و لەدەم زەوق و لەمل تەوق و لەئەفسەر/سەر
بەندوە بێکەنینی زولفی لادا رووومەتی دەرخست
ئەتەنگی ما دڵی غونچە نەگوڵ ڕەنگ و نە عەنبەر/ بەر [٦ : ٢٢٥]

لەسەراپای دێڕەکاندا جووت سەروا بەو شێوەیە دارژاوە، تەنیا لەیەك دێر نەبێ ئەمەی تێدا پەیڕەو نەکراوە (دێری ٣). ئەویش لەرواڵەت دا وەکو ئەوانەی تر خۆی دەنوێنێ کە هەردوو سەروا هەڵدەگرێ بەلام لەیەك وشەدا کۆبوونەتەوە (مەرمەر). نابێ دەوری ریتمی سەرواو ئاوازی ناوەوەی لەنێو دووەمی دێری یەکەم لەبیر بکەین، کە سەرواکە لە (شەوق، زەوق، تەوق) دایەو هەمووشیان هاوئاوازن، ئینجا دابەش کردنی ئەم وشانە بەسەر سێ وشەدا کە یەکەمیان (دل) لەگەڵ هەردووەکەی تر (دەم، مل) دەنگدانەوەی نەبزوێنی تێدایە. (دل و دەم) بە (د) و (دڵ و مل) بە (ل) و بزوێنەکە پێکەوە بەسراون.

هەرلەم جۆرەدا کە دووەم وشەی سەروا، لە رووی دەنگەوە دووبارە بوونەوەی برگەی کۆتایی وشەی یەکەم بێ، دەشێ هەردوو وشەکە ڕاستەوخۆ بەدوای یەکەوە نەهاتبن، بەڵکو بە (ی)ی پێوەندی پێکەوە لکابن، وەکو حەمدی لە شیعرێکیدا دەڵێ:

شەکوەیی ئەغیاری خۆم کەم، ڕەبی، یا/ ئەغیار/ ی/ یار
چاری سەر یا دڵ بکەم، چ بکەم لەگەڵ/دووچار/ی/چار
جامی دڵ لەبریزی خوێنە، بەسمە وەك مەجنوون لە چۆڵ
نۆشی بێ لەیلا دەنۆشی ساغری/ سەرشار/ ی/ شار [٦ : ٢٣٢]

لەدێری یەکەمدا (ئەغیار-یار) و (دووچار-چار) و لەدێری دووەمدا (سەرشار-شار) دوو وشەی سەروان، بە (ی) پێکەوە لکاون و لە هەمووشیان دووەم برگەی کۆتایی یەکەمە.

- هەرلەم جۆرە جوانکارییەدا، وادەبێ لەدوو وشەکەی کۆتایی هەر دێرێك، دووەمیان دەنگێکی زیاتر بێ نەك کەمتر لەوشەی یەکەم و ئەویش لە دواوە. حەمدی دەڵێ :

تاکەی ئەدەی بەخەڵقی لە عەقڵ و زەکا/زەکات

کوڕە دەکا لە لیباسی حەیاتا حەیا/حەیات [52]

ئیسلاحی نەفسی خۆت بکە ڕازی ببە حەق

ئیزهاری عیجزە، بەسبە ، ڕەواجی شکا/شکات

تاکەی لەنەفعی خۆت و زیانی خەلق ئەدوێی

حەیفە کە ئابڕووی لە جیهانا تکا / تکات [٦ : ١٨٥]

لەسەراپای ئەم شیعرەدا کە (١٠) دێرە بە تەسریعەوە لەسەر ئەم هونەرە جوانکارییە – سەرواناسییە دامەزراوە. وشەکانی کۆتایی (زەکات، حەیات، شکات، تکات، ریات، نەبات ...) وەکو دووبارەکردنەوەو زیادە خستنە سەری وشەکانی پێشەوەی خۆیانن (زەکا، حەیا، شکا، تکا، ڕیا، نەبا ...).

– بۆی هەیە کۆتایی دێرەکان لە جیاتی دوو وشە، بەدوو دەستەواژە بڕابێتەوە کە دەنگەکانیان یەك بێ و مەعانایان جیا بێ (ڕەگەزدۆزی بن) ، شێوەی نووسینیان وا دەبێ وەکو یەك بێ و وادەبێ جیا بێ، زێوەر شیعرێکی بەم جۆرە جووت سەروایە داڕشتوە، دەڵێ :

دا نەچێتە لای ڕەقیبان یار ئەنیسی خانەبێ

لازمە ئەو ئاسکە لەولا نەبێ/ لەولانەبێ

دیدە وەختێ تۆی لەلا حازر نەبێ واحەز ئەکا

بۆ نەزەر لەعل و دوڕڕی یەکتانەبێ/یەك تانەبێ [١٣٩ : ٥٤١]

دێری یەکەم بەدوو دەستەواژەی وەکو یەك کۆتایی هاتوە (لەولانەبێ، لەولانەبێ) کە دەنگەکانیان یەکە بەڵام مانایان جیایە. لەخوێندنەوەدا بەسترێس بەشەکانی هەریەکەیان دیار دەکرێ : (لەو/لانە/بێ) یان (لەولا/نەبێ). لەشێوەدا وەکو یەك دەنووسرێن تەنیا ئەگەر بە بۆشایی پارچەکانیان لێك جیابکرێنەوە. دێری دووەمیش بەدوو دەستەواژەی وەکو یەك لەدەنگو جیا لەماناو نووسین کۆتایی هاتوە : (یەکتا/نەبێ، یەك/تانە/بێ).

٣– سەروای دووبارە (التكرار) – دووبارە بوونەوە لەگەڵ ڕەگەزدۆزی جیایە. لێرەدا وشەکە بەهەمان مانا دووبارە دەبێتەوە، (ئەوەیە دوو وشەی هاوڕەگەز –متجانس– لەکۆتایی هەڵوێستی پەخشان یان دێرە شیعر بەدوای یەکەوە دووبارە بێنەوە) [٤٠١ : ٨٣]، دەشێ لە شوێنی تریش بێن، بەڵام بەهای جوانییەکەی لە کۆتایی زیاترە کە لەگەڵ سەروادا یەك دەگرێتەوە، سالم دەڵێ :

لازمی عەرز حالە کاغەزی زەڕ تەبەق / تەبەق

شەرحی میحەن بەخوێنی دڵ سەبتی ئەکەم وەرەق وەرەق

تیری نیگاهی دڵبەرم یەك یەکی نیشتە ناو جگەر

سینە لە ترسی پێلەکی موتتەسیلە شەبەق / شەبەق [١٠١ : ٧٦]

---

(52) لەتی دووەمی ئەم دێرە کێشەکەی لەنگە.

وشەی کۆتایی وەکو خۆی دووبارە بۆتەوە : (تەبەق تەبەق، شەبەق شەبەق، سەبەق سەبەق، فیرەق فیرەق).

- بۆی هەیە ئەو وشەیەی لەکۆتایی دووبارە دەبێتەوە، دوو وشەکە ڕاستەوخۆ لەتەك یەك نەیەن، بەهۆی ئامرازێکەوە بچنەوە سەریەك، خادیم دەڵێ :

تورەیی مشکسایی تۆ حەلقە بە حەلقە، خەم/بە/ خەم
حەلقە بە دەوری عاریزە وەك گوڵی سوبحەدەم/بە/دەم
شەوقی جەمالی حوسنی تۆ ئاگری زەوقی عیشقی من
ڕوو لە زیادە هەر دەمێ لەحزە بە لەحزە دەم/ بە / دەم [٧٥ : ١٧٣]

جووت وشەکانی سەروا ئەمانەن (خەم بە خەم، دەم بە دەم)، یەك وشەیە دووبارە بۆتەوە و بە (بە) دراونەتە دەم یەك. جووت سەروای دێرەکانی تری ئەم شیعرە ئەمانەن : (جەم بە جەم، یەم بە یەم، نەم بە نەم، بەرلەبەر، غەم بە غەم، کەم بە کەم، چەم بە چەم). جگە لە کۆتاییەکان، کاریگەری ئەم جۆرە سەروایە بۆ ناوەوەش باکشاوە، لەسەرەتا جگە لە وشەکانی سەروا، (حەلقە بە حەلقە) بەهەمان دەستووری سەروای شیعرەکە دووبارە بۆتەوە. ئەم باکشانی کاریگەری سەروایە بۆ ناوەوە، لەشیعری (وێل و فیراری) سالم باشتر دەردەکەوێ، کە دیارەکە لەتی دووەم هەمووی بادەگرێ تەنیا لەیەك دێر نەبێ تەنیا نیوەی لەتەکەی گرتوە، وەکو دەڵێ :

وێل و فیراری عیشقی تۆم شەهریە شەهرسوو / بە/ سوو
پشتە بە پشتە تەل بە تەل دەشت بە دەشت، کوو/بە/کوو
قەیدە لە گەردنی دڵم زولفی سیاهی پڕ خەمت
حەلقە بە حەلقە چین بە چین عوقدە بە عوقدە موو/بە/موو [١٠١ : ١١٢]

لەم جۆرە هونەرکارییە وردەدا، سەروا لەگەڵ سەراپای لەتی دووەمدا دەکەوێتە ناویەك ئاوازی دووبارە بوونەوە و لەگەڵ سەروای لەتی یەکەم تێك دەکاتەوە. جۆرە ئاوازێکی سووك و سەمایانەی خێرا دەخولقێنێ و هەست و سۆزی خوێنەر دەخاتە بەر شەپۆلی جۆشانێکی ڕێك و بەردەوام.

٤- سەروای دوو لانە : ئەوەیە لەهەردوولای دێرە شیعرەکان، لەسەرەتاو لە کۆتایی، هەمان وشەی سەروا بەکاربێرێ، بۆ نموونە خەلیل موخلس دووسەرەیی دەڵێ :

قوربان لەغەما فەوتام، فەوتام لە غەما قوربان
زیندان بووەتە قەسرم ، قەسرم بووەتە زیندان
تاکەی وەکو نەی ناڵێن، ناڵێن وەکو نەی تاکەی
هیجران بەخودا بەسیە، بەسیە بەخودا هیجران [٤٩٠ : ١١٣]

لێرەدا جگە لە دووبارەبوونەوەی وشەی سەرەتاو کۆتایی هەر لەتێك (قوربان/زیندان / تاکەی / هیجران)، جۆرە هونەرێکی تری جوانکاری تێدا بەکارهاتووە کە عەکس و تەبدیلە. لەهەر لەتێکدا

دوو ڕستەی هێناوە. ڕستەی دووەم هەڵگەڕانەوەی وشەکانی ڕستەی یەکەمە. بەمەوە وشەی سەرەتای لەت لەکۆتایی دووبارە بۆتەوەو هەردوو جەمسەری لەتەکەی بەیەکەوە گرێداوە.

٥- سەروای ئەلقەبەند (la rime enchainee)، بۆیە وای پێ دەگوترێ چونکە دوو دێڕ بەیەکەوە گرێ دەدا و بریتیبە لە دووبارە بوونەوە وشەی سەروای لەتی دووەم، چ وەکو خۆی و چ بەگۆڕانێکی کەم. لەسەرەتای دێڕی دواتر. ئەمە لەفەرەنسیدا وەك حاڵەتێکی تایبەتی سەروا باسی کراوە (٥٣). لە شیعری ئینگلیزیدا ئەم جۆرە سەروایە باسی لێوە کراوە بەلاَم بەم شێوەیە تەحدید کراوە وشەکان (هەر چەندە دەنگەکانیان یەکە بەلاَم مانایان جیایە) [٥٠٢: ١٠٨] ئەمە لە عەرەبی و فارسیدا (رد الصدر الی العجز)ی پێ دەڵێن [٤٠٠: ٥٩]، لە کوردیدا زیاتر لەو شیعرانەدا بەرچاو دەکەوێ کە بەهونەری تەشتیر ڕازاونەتەوە، مەلای جزیری لە هۆنراوەی (بیتا ئاتەشێ)دا پەیڕەوی کردوە، دەڵێ:

کوشتم بقەوسی عەنبەرە شۆخی ژدل مل دان بەرە
ئێخستە دل " سەد پەنجەرە ئەڤ ڕەنگە ئەم میحنەت کەشین.
میحنەت کەشین ڕوژو شەبێ دەر فیرقەتا شیرین لەبێ
زولا ژبەر دەستی تەبێ ئەو عەدل ئەم پرپێ خوشین[٥٨: ٣٩١]

وا دەبێ ئەو کەرتەی (بەزۆر دوو پێیە) لەکۆتایی دێر سەرواکەی هەڵگرتووە، هەمووی لەسەرەتای دێڕی دواتر دووبارە بێتەوە، ئەحمەدی کۆر دەڵێ:

کوا حەبیبی کوللی عالەم ماتەقەدووم قەبلی ئادەم
پاك لە مەحشەردا بوین جەم بو زەغال سەمع و بەسەر
بو زەغال سەمع و بەسەرمان باری عیسیان بوو بەبارمان
چاوکە هەڵنایە لە شەرمان دەستە ئەژنۆ قوڕ بەسەر[٩: ١٨].

ئەحمەدی کۆر لە ڕیزی هەرە پێشەوەی ئەو شاعیرانەیە کە ئەم هونەرەیان بە هەموو جۆرەکانییەوە بەکارهێناوە. زۆر لەهۆنراوەکانی بەم هونەرە جوانکارییە سەرەتا و کۆتایی دێرەکانیان پێکەوە بەستراوە.

پێویستە ئەوەش بڵێین کەوا دەبێ ئەم (رد الصدر الی العجز)ە لە ڕووی ماناوە بێ نەك بە وشە، وەکو جزیری دەڵێ:

---

(٥٣) فرانسوان لەباسی ئەم جۆرە سەروایەدا، ئەم نموونەیەی کلێمان مۆرۆی داوە:
Dieu des amants , de mort me garde
Me gardant donne moy bon heur . [٣٠: ٤٨٢]
مانای ئەم شیعرە بەم جۆرەیە:
خوای عاشقان لەمردن دەمپارێزێ
دەمپارێزێ و بەختەوەریم پێ دەدا

زولفی سیاهـ عەنبەر بکە خەملی ژ زێڕی زەڕ بکە
زەڕباف و دیبا بەربکە میسك و گولاْبێ لێ رەشین
ماوەرکە تەرح و پشکوان جیرانی بەرگ ولوولوان
ئەو عەرعەرو سەروا جوان شەتری بمەستی لێ خوەشین [٥٨ : ٣٩٠]

(ماوەر) واتە (گولاو)، ماوەرکە = گولاو پشێن بکە. ئەمە دوبارەکردنەوەی مانای دەستەواژەی کۆتایی دێری پێشوە (میسك و گولاْبێ لێ رەشین).

٦- سەروای چوار گۆشەیی : ئەمە لەعەرەبی و فارسیدا بە هونەری (مطیر) یان (مشجر) ناسراوە.

ئەمە زیاتر بۆ هونەری قسەو شکڵی هەندەسەی چوارینەکە دەگەڕێتەوە . ئەویش ئەوەیە (شاعیر چوارلەتە دێر دێنێ و بەجۆرێ دایاندەڕێژێ ، لەیەکەم و شەوە بگری و چ بە شێوەی ئاسوویی بخوێنیتەوە و چ بەشێوەی ستوونی یەك شت دەردەچێ) [٢٦٦ : ٣٢٦] و وشەکانی سەروایش لە هەردوو حاڵەتدا هەریەکەو ناگۆڕێ (ئەم جۆرەیان ڕەشیدەدینی وەتوات ئاماژەی بۆکردوەو نموونەی بۆ هێناوە) [٢٦٦ : ٣٢٦] . قەیسی ڕازی ئەم جۆرە تەربیعە بە تەرزە تەوشیحێك دادەنێ و دڵێ : (بەم تەرزە تەوشیحە دەڵێن موتەڕڕەفی موزەللەع) [٤٠٢ : ٣٤٥] . عبدالجبار داود البصری لەبارەی ئەم هونەرەوە دەڵێ : (دیاردەی شکڵی لەبنیادی شیعردا ئەگەرچی تایبەت نییە بەسەروا ،بەلاْم لەگەڵ ئەوەشدا سەروا دەوری خۆی تێدا دەبینێ . یەکێ لەو شکڵە شیعریبانە ئەوەیە شاعیر چوارینەیەك بهۆنێتەوە بشێ هەر وشەیەکی بێ بەسەرەتا و لە ئەنجامیشدا هەر وشەیەکی بێ بەسەروا) [٣٠٦ : ٩٢].

لەعەرەبیدا دکتۆرە ئیسعاد ئەم نموونەی بۆ ئەم جۆرە هێناوە بەلاْم ناوی خاوەنەکەی و سەردەمی نووسینەکەی نەداوە :

| | | | |
|---|---|---|---|
| فزادی | سباه | غزال | ریب |
| سباه | بقد | کغصن | رطیب |
| غزال | کغصن | جناه | عجیب |
| ریب | رطیب | عجیب | حبیب |

[٢٦٦ : ٣٢٦].

بەفارسیش ئەم نموونەی داوە ، دیسان ناوی خاوەنەکەو سەردەمەکەی نەنووسیوە :

| | | | |
|---|---|---|---|
| ازفرقت | آن دلبر | من دایم | بیمارم |
| آن دلبر | کزعشقش | بادردم | وبیدارم |
| من دایم | بادردم | بی‌مونس | وبی‌یارم |
| بیمارم | وبیدارم | وبی‌یارم | وغم خوارم |

[٢٦٦ : ٣٢٦].

لەکوردیشدا ، دلْزار شیعرێکی دەق بەم شێوەیە داڕشتوە بەناوی (ئەی نیگارا):

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بێ‌قەرارم | ئەی نیگارا | مەرحەمەت کە | من نەماوم |
| ٢ | ئەی نیگارا | خۆت ئەزانی | من لە عیشقت | دڵسوتاوم |
| ٣ | مەرحەمەت کە | من لە عیشقت | شێت و شەیدام | تێك شكاوم |
| ٤ | من نەماوم | دڵ سوتاوم | تێك شكاوم | نووری چاوم [٨٧ : ٢٩١]. |

٧- تەشتیر و تەرسیع (التشطیر و الترصیع) : ئەمانە پەیوەندییان بەسەروای ناوەوە هەیە. ئەگەر شاعیر سەروای ناوەوەی لەتەکان بەرێکی بکا بە چەند پارچەیەك و بە پەیوەندییەکی ئاسۆیییەوە لێکیان گرێ بدا، ئەمە تەشتیرە. ئەم هونەرە تەنیا لەو کێشانە دەبێ کە هەشت پێین. تەشتیر لە رووی کەرت بوونی لەتە دێرەوە دەکرێ بە دوو جۆر :

- وا دەبێ هەر لەتێك بکرێ بە دوو کەرت، دێرەکە دەبێ بە چوار کەرت، سێ کەرتی پێشەوە هاو سەروا دەبن و کەرتی چوارەم سەروای گشتی هۆنراوەکە رادەگرێ. ئەمە بە نموونەوە لەباسی (قیتعەو غەزەل و قەسیدە)دا روون کراوەتەوە.

- وا دەبێ هەر لەتێك بکرێ بە چوار کەرتی وەکو یەك، دێرەکە دەبێ بەهەشت کەرت و سەروای کەرتەکان بەزۆر شێوەی جۆراوجۆر دابەش دەبێ :

• بۆی هەیە لەتی یەکەم چوار سەروای سەربەخۆی هەبێ و لەتی دوەم سێ کەرتی پێشەوە هاو سەروابن و کەرتی کۆتایی سەروای گشتی هۆنراوەکە هەڵبگرێ، وەکو شیعرە ناوبارەکەی جزیری (من دی سەحەر ...) کە دێری یەکەمی موسەررەعە و لەدێری دوەمدا دەڵێ :

حوری‌وەشە، شیرین مەشە، کاکۆڵ رەشە، خاڵ حەبەشە

خاڵێن دقەر، میسکاتەتەر، نازك بەشەر، کافوور بوو [٥٨ : ٤٠٧]

لەتی یەکەم چوار پێیی (مستفعلن)ە، هەموویان سەروایان یەکە (ەشە). لەتی دوەم چوار پێیە، سێی پێشەوە هاوسەروان (ەر)و پێی کۆتایی سەروای گشتی هۆنراوەکەی هێناوەتەوە (-وور + بوو).

•بۆی هەیە یەك دێرە شیعر هەشت پێ بێ و هەر هەشتیان یەك سەروایان هەبێ. ئەمە لە (لەعلێن شەفەقی) مەلای جزیریدا هاتوە کە (٨) چوارینەیە و لە هەموو چوارینەکاندا دێری یەکەم هەشت جار سەرواکەی دووبارەبۆتەوە و دێری دوەم حەفت جار سەرواکەی دووبارە بۆتەوەو سەروای هەشتەمی کە کۆتایی دێرەکەیە لەگەڵ سەروای چوارینەکانی تردا یەك دەگرێتەوە. لە چوارینەی دوەمدا دەڵێ :

وەربان گولاڤ/گرتن خۆناڤ/لێ من د ناڤ/صوهتن هەناڤ/

من دی بچاڤ/زولفێن بلاڤ/لێ بوو نەباڤ/ بەندکر بناڤ/

نوورا بەسەر/گفت و خەبەر/قەند و شەکەر/زولفان لەسەر/
خالێن دقەر/ بابێ سەحەر/ دابێتە دەر/ سوبحا بحەق [٥٨: ٣٢١].

دێری یەکەم هەشت جار سەروای (اف) و دێری دووەم حەفت جار سەروای (ەر) دووبارە بۆتەوەو سەروای لەتی کۆتایی (ەق) لەگەڵ چوارینەکانی تر یەکە.

کەچی تەرسیع ئەوەیە لەهەر دێڕێکدا سەروای ناوەوەی دوو لەتەکە بەرامبەر یەك بوەستێ و پەیوەندییەکی ستوونی لە سەروای کەرت کردنی لەتەکان بێتە کایەوە. لەجۆرەکانی سەروادا باسی تەرسیع کراوە و نموونەی بۆ دراوە.

٨- سەروای وشەبڕ (broken rhyme) : ئەوەیە کە دەنگەکانی سەرواو ڕەوی بکەونە ناوەندی وشەوە، وەك ئەوە وابێ سەرواکە وشەکەی بڕیبێ بۆ دوو پارچە تا سەروای لێ بەدەست بێنێ. لە ئینگلیزیدا ئەمە (لەشیعری سووك و بۆ جۆرە کاریگەرییەکی کۆمیدی نائاساییە، بەڵام لە شیعری جیددیدا دەگمەنە. لەگەڵ ئەوەشدا جیرارد مانلی هۆپکنز لەچەند شیعرێکدا سەرکەوتوانە بەکاری هێناوە) [٥٠٣ : ٩٠]. نازك مەلائکە بۆ ئەم هونەرە ئەم نموونەیەی خوارەوەی لە (وفیات الاعیان) گواستۆتەوە :

اصلحك الله وابقاك لقد كان من الـ
واجب أن تأتينا اليوم الى منزلنا الـ
خالي لكن نحدث عهدنا بك يا خير الاخل
اء فما مثلك من غي ر عهودا و غفل [٣٦٦: ٤٠]

لەلەتی (٢،١)دا تەنیا (الـ)ی ناسین لە وشەکە کراوەتەوە (الـ - واجب، الـ - خالی) کەچی لەسێیەمدا ناوەڕاستی وشەکە شەق بوە و سەروای لێ دەرهێنراوە (الاخل - اء).

لە کوردیدا نموونەی سەروای وشە بڕ لە شیعرێکی جزیریدا هاتوە کە هەر دێڕێکی کردوە بە هەشت کەرت و هەر هەشتی یان حەوتی بەیەك سەروا بەستۆتەوە، بێگومان دیارە باری قورسی سەروای زۆرە، جزیری ناچار کردوە، هەندێ جار سەروای پێ لەناوەندی وشە دەربێنێ، وەکو لە دێرە شیعرێکدا دەڵێ :

زولەت نەما / سوحبەت وەما / نوورا (شەما / لان) چوو سەما
لێ ئەو دەما/زولف بوون جەما / هاتن (سەما/ یێ) یەك نەسەق [٥٨: ٣٢٠].

شەمالان، کۆی (شەمال)ە، لەناوەڕاست شەق بوە و (ەما)ی لێ کراوە بەسەروا و وشەی (سەمایێ) کراوە بە (سەما/یێ) بۆ سەروای (ەما). لەهەمان هۆنراوەدا، جزیری لە دێری یەکەم وشەی (غەفلەت)ی شەق کردوە بۆ دەرهێنانی سەروای (ەف) (غەف/لەت) و لە دێری نۆیەمدا وشەی (قەوسی) شەق کردوە بۆ سەروای (ەو)، کردوویە بە (قەو/سی).

٩- سەروای بەتیپ (ناوی دەنگ) : ئەمە یەکێکە لەجۆرەکانی (توشیح، موشح) کە شاعیر

وشەی کۆتایی لەت یان دێڕ هەڵدەوەشێنێتەوە و ناوی دوا تیپ دەکا بە وشەی سەرواو دەشێ ئەم تیپانە کۆبکاتەوە و ببیانکا بە وشەی سەرەتای دێڕی پاشتر و دەشێ هەروا لێیان بگەڕێ و بەسەرەتای دێڕی دواتر نەیانبەستێتەوە. ئەمە چەند جۆرێکی هەیە :

أ- وا دەبێ (هۆنەر چامەیەك دانەنێ، دوایی هەر هۆنراوێکی بەچەند پیتێکی تەنها دێنێتەوە، ئەو پیتانە کۆ ئەکاتەوە، ئەیانکا بە وشەیەك و ئەیکا بەیەکەم وشەی هۆنراوەی دوای ئەو هۆنراوە) [١٣٧ : ١٨٠]. حەمدی دەڵێ :

نیمە یارایی نیگاهی (غ، م، ز، ە)
غەمزە دڵدوزە لەتم کە تۆبە (ش ، ی ، ر)
شیری ئەبرۆت یەك ئیشارەی بۆ منی شەیدا بەسە
تیژە چونکە داویە کوورەی محەبەت (ا، ب)
ئابی .................................. [٦ : ٣٧٢]

ئەم شیعرە حەفت دێڕە، دێڕی یەکەم بەم هونەرە موسەرڕەعە و دێڕی کۆتایی هونەرەکەی تێدا نییە. لە هەموشیاندا تیپەکانی کۆتایی کراونەتە وشەیەك و چوونەتە سەرەتای دێڕی پاشتر وەکو سەروای ئەلقەبەند دێڕەکانیان لەهەردوو سەرەوە پێکەوە گرێداوە و ئەمە چنینی دێرەکانی سفتتر کردوە.

لەم جۆرەیاندا وەکو دیارە ئەگەر تیپەکانی کۆتایی لە شوێنی خۆیاندا بکەی بە وشە وشەکان سەروایان تێدا نییە (غەمزە، شیر، ئاب) بەڵام ئەگەر ناوی تیپەکانی کۆتایی وەربگری سەروایان لێ دروست دەبێ (هێ، ڕێ، بێ)، سەرواو ڕەوی دەنگی (ێ)یە. هەر ئەم سەروایەش لەم هۆنراوەیەدا مەبەستە.

ب- لەجۆری دوەمدا کە تیپەکان نابن بە وشەی سەرەتای دێڕی دادێ، وەکو خادیم دەڵێ:

گۆشە گیرم من لە کونجی (خ ، ل ، و ، ت)
تا لەگەڵ دڵبەر بکەم من (ص، ح ، ب، ت)
تەفرەقەی حسسم لەپەردەی کیسرە تا دێنێتە دەر
ڕشتەیی زولفی لە بۆ ڕووی (و، ح ، د ، ت) [٧٥ : ٢٦٤].

تیپەکانی کۆتایی نەبوونەتە وشەی سەرەتای دێڕی تر.

ج- بۆی هەیە، ئەو تیپانەی لە کۆتایی دێڕ هاتوون و کراونەتە وشەی سەرەتای دێڕی دواتر لەباتی ئەوەی دوو دێڕ بەیەکەوە ببەستنەوە، دوو چوارینە بەیەکەوە دەبەستنەوە. بۆ نموونە جەعفەر قولی زەنگلی هۆنراوەیەکی هەیە بەناوی -کاف ومیم و ڕێ (کمر)- لەشەش چوارینە پێك هاتوە، چوارینەی یەکەم هەردوو دێڕی کۆتاییان بەتیپ هاتوە، ئەمە وەکو تەسریع وایە، چوارینەکانی تر

تەنیا لەتی چوارەمیان تیپە و تیپەکان بۆ سەرەتای چوارینی دادێ بوونەتە وشەی سەرەتا. بەمە کۆتایی چوارینی پێشەوە و سەرەتای چوارینی دواوە بەیەکەوە دەبەسترێنەوە کە لەوەی پێشەوە شیکراوەتە بۆ تیپ و لەوەی دواوە بەسەریەکەوە هاتوە، بۆ نموونە لەچوارینی دووەمدا دەڵێ :

زولفی تە درێژن کەمەندانی کەیان
ئوریکا دال دەوان لە فەسلا چیان
دلێ من بریە وان چاڤان وەبریان
قونچە و وخەندان، هەردو لام و بێ [٥٣: ١٩٠]

چوارینی پاشتر بە (لب) دەست پێ دەکا.

د- هەرلەم هونەرەدا بۆی هەیە، شاعیر کۆتایی هەموو لەتەکان (نەك دێرەکان) بە تیپ بێنێ بەڵام کۆیان نەکاتەوە بۆ وشەی سەرەتای لەتی دواتر، وەکو سالم دەڵێ :

ئەی بەتەلعەت ماهی تابان، وەی بەعیززەت بێ و تێ
زولف داری همچو عنبر لب چوشین و کاف و رێ
دڵ گەلێ ئاشفتەیە شەوها لە قەیدی میم و واو
دەرد مندم ، مستمندم ، تن گرفتەء ، تێ و بێ [١٠١: ١٥٤]

- بۆی هەیە تیپەکانی کۆتایی هەموو تیپەکانی وشە هەڵوەشاوەکە نەبن و مەرجیش نییە وشەکە لەدێری پاشتردا لەسەرەتا هاتبێ، بەڵام دەبێ لەپارچەی یەکەمی لەتی یەکەم بێ، ئەحمەدی کۆر لەشیعری (دڵبەرا مەحبوسی داوم)دا [٩: ٣٩]، لەکۆتایی دێری یەکەم تەنیا (بێ و رێ)ی هێناوە، لە دێری دوەم کردوویە بە (یار) بەڵام ئەویش لەسەرەتا نەهاتوە (ئاخ بۆ یاری نازەنیم). لەکۆتایی دێری چوارەم (نون و بێ)ی هێناوە و کردوویە بە (نەو نەمام). لەکۆتایی دێری حەوتەم بەجۆرێکی تری هێناوە (دوو قاف و نون سین) و لەدێری دواتر بوە بە (بووم بە قەقنەس) بەم جۆرە ئەحمەدی کۆر سەربەستی زیاتری بەخۆی داوە، لەهێنانی تیپەکانی کۆتایی و شوێنی دووبارە بوونەوەی لە لەتی پێشەوەی دێری پاشتر.

تێبینی :

(١) لەم جۆرە هونەرەدا، ناوی دوا دەنگ(تیپ) دەبێ بە وشەی سەرواو ئینجا لەو ناوانەوە حسێبی دەنگەکانی سەرواو ڕەوی دەکرێ. بۆ نموونە لە شیعرەکەی سالم ناوی دەنگەکانی کۆتایی دێرەکان ئەمانەن : (رێ، بێ، فێ، خێ، یێ)، لەم وشانەدا (ێ) سەروایە و لەهەمان کاتیشدا ڕەوییە.

(٢) بۆی هەیە هەم ناوی دەنگەکانی کۆتایی ببن بە وشەی سەرواو لە هەموو دێرەکان دووبارە بێنەوە و هەم ئەو وشانەی لە دەنگەکان دروست دەبن هاوسەروابن وەکو شیعرەکەی خادیم کە

وشەکانی سەرواى ئەمانە دەردەچن : ( خەلوەت، سوحبەت، وەحدەت، سورەت، دەشت، نوکهەت، لەززەت، مەست، شکەست، محەببەت ) هەموو ڕەوییان ( ت )ە و سەروایان ( ەت ) بەلام ئەوەندە هەیە ئەنگى لەسەرواى وشەی ( دەشت و مەست و شکەست ) هەیە چونکە ئەمانە قەیدیان هەیە و قەیدەکەشیان یەك نیە (س، ش ).

١٠- چینەکردنی ڕەوی : بۆی هەیە شاعیر هۆنراوەیەك بنووسی، تیپی یەکەمی هەموو دێرەکان یان لەتەکان، یان تیپی کۆتایی هەندێ لەتی تایبەتی کۆبکەیتەوە ناوی کەسێ یان شوێنێ یا شتێ دەربچێ کە شاعیر شیعرەکەی لەسەر نووسیوە. ئەحمەد شوکری لە پێنجینەی شۆڕشدا هۆنراوەیەکی پێنجینەی نووسیوە، لەهەموو پێنجینەکاندا ئەگەر تیپی سەرەتای لەتی چوارەمیان لەسەرەوە بۆ خوارەوە کۆبکەیتەوە وشەی ( کوردستان )ی لێ دەردەچێ و ئەگەر تیپی کۆتایی ( ڕەوی ) لەتی پێنجەمیان لە خوارەوە بۆ سەرەوە کۆبکەیتەوە دیسان هەر وشەی ( کوردستان ) دەردەچێ. لە پێنجینەی یەکەمدا دەڵێ :

زۆر دەمێکە چاو لەڕێم کەی بێ ئەبێ بڕوا خەزان
تاوەکو سەوز و خوڕەم بێ و بپشکوێ تا گوڵستان
کاتی وەسلی عاشیقان بێ، جەژنە بێ بۆ بولبولان
کەی بێ ئاواتم بەدی بێ ، من ببینم کورد ژیان
سەریەخۆ، بۆ خۆی بژی یەك دڵ لەخاکی نیشتمان [٣١:٧]

وشەکانی سەرەتای لەتی چوارەمی پێنجینەکان ئەمانەن : ( کەی، وەك، ڕۆژی، دوودڵ، سەر لەڕێی، تێبکۆشن، ئەو، نابێ )، دەنگی یەکەمی هەموویان بەسەر یەکەوە وشەی ( کوردستان )ی لێ دەردەچێ، دەبێ ئەوەش بگوترێ لەهەندێ حاڵەتدا دەنگەکان لە ڕووی فۆنۆلۆجییەوە پڕ بە پێستی دەنگە کۆکراوەکانی ناو وشەی ( کوردستان )نین. بۆ نموونە ( ء ) جیایە لە ( ا ) کە بەرامبەر یەکتر هاتوون، ( ڕ ) جیایە لە ( ر ) کە ئەوانیش بەرامبەر کراون.

وشەکانی سەرواى لەتی پێنجەمی پێنجینەکانیش ئەمانەن : ( نیشتمان، برا، ولات، مەلاس، پرد، ئەسین، جوو، ڕەشبەڵەك )، ئەگەر دوا دەنگیان ( ڕەوی ) لە خوارەوە بۆ سەرەوە بخەیتە سەر یەك دیسان هەر ( کوردستان ) دەردەچێ. ئەم هونەرە زیاتر پەیوەندی بە دەنگیان وشەی سەرەتای لەت و دێرەکانەوە هەیە نەك کۆتایی، چونکە لە یەکێتی سەروادا ڕەوی لەسەرەتا تا کۆتایی یەك شتە. شاعیر یان دەبێ لە لەتی یەکەم ئەم هونەرە دروست بکا یان لە چوارینەو پێنجینەدا کە سەرواى پارچەکان لە گۆڕان دابێ. بۆ نموونە جەعفەر قولی زەنگلی شیعرێکی هەیە بەناوی ( ٣٢ حروف )، ( ٣٢ ) چوارینەیە، بەڕیز هەر چوارینەیەك بە تیپێکی ئەبجەدی دەست پێ دەکا، چوارینەکان لەتەکانیان هاوسەروایە. لە چوارینەیەکدا دەڵێ :

دال - دلیّ من تەبریە وەرە رووني ئاشكار
تا بویژم دەرد دل، چەرە بوومە گرفتار
دادیّ خا ئەزوەکیّ کەم تا حەل کە مشکل کار
دەردیّ من بیّ دەرمانە، لە من نەمایە قەرار [٣١١:٥٣].

ئەمـە جۆرێکـە لە (توشیح-موشح) و بەفارسی زاراوەی (موشـح آبجدی) بۆ دانـدراوە[٤٠١: ٩٢]. وا دەبیّ دەنگی یەکەمی وشەی سەرەتای لەتەکان کۆبکرێنەوەو بکریّ بە نیولـەتی کۆتایی دوا دێرو هۆنراوەکەی پیّ ببڕێتەوە، شێخ نووری شێخ سالح لە هۆنراوەی (بۆ موتەسەرریفی کەرکووك)، سەرەتای لەتەکانی بەجۆریّ هێناوە ئەگەر یەکەم دەنگیان کۆبکرێنەوە دەردەچیّ (نووری بـۆ خزمەت جەنابت ئارەزووی تەحویل ئەکا) کە دوا لـەتی هۆنراوەکەیە [٢١٢: ٣٨٢]. لە شیعری سریانیدا بەتایبەتی لەکلاسیکیاتدا زۆر شاعیر خۆیان لەم هونەرە داوە بەلاّم تیپەکانیان خستۆتە سەرەتای دێرەکان نەك کۆتایی (وەکو هەندیّ هۆنراوەی عەبدیە شوعی سوباوی و هەندیّ شاعیری کۆنی وەکو مار ئەفرام...) [٣٦٨: ١٩].

١١- چینە کردنی وشەی سەروا (التقاط کلمات القافیة) : ئوسامە لە پێناسەی ئەم هونەرەدا دەڵیّ: (ئەوەیە دێرێك لە دێرەکانی پێشەوە دروست بکریّ) [٢٦٥: ٢٠١]. واتە شاعیر لە ئاخرو ئۆخری هۆنراوەکەیدا، بگەرێتەوە، لەسەرەتا تا کۆتایی هەموو وشەکانی سەروا چینە بکاو کۆیان بکاتەوە و بیانخاتە پاڵ یەکترو دێرێك یان لەتێکیان لیّ دروست بکا، ئەمە بەستنەوەیەکی تونـدو زیادەکی کۆتاییە بەسەراپای هۆنراوەکە. حەمدی لە شیعری (خۆشە سەر شانم)دا ئەم وردەکارییەی نواندوە. وشەکانی سەروای هۆنراوەکە ئەمانەن : (رێش، خوێش، نێش، ئێش، مێش، پێش، کێشەکێش)، هۆنراوەکە (٧) دێرە، لەلەتی دووەمی دێری شەشەمدا هەموویان بەسەریەکەوە کۆدەکاتەوە، تەنانەت وشەی سەروای دێری حەوتەمیش پێش دەخاو لەگەڵ ئەوانی تر کۆیان دەکاتەوە، دەڵیّ :

بۆتە دەستوور (العمل) ئەم قافیانە بۆ جیهان
رێش و خوێش و نێش و ئێش و مێش وپێش و کێشەکێش [٦: ٢٤٦].

ئەمە بوو هەندیّ لە لایەنی جوانکاری و وردەکاری بەکارهێنانی سەروا، ئێستاش بۆ هەندیّ کەم و کورتی.

## باسی دووەم - کەم و کورتییەکانی سەروای شیعری کوردی :

سەروا وەك ڕەگەزێکی هونەری و زمانەوانی، زۆر جار بەهۆی نەشارەزایی یان ناچاریی شاعیرەوە بەجۆرێکی وا دێ کە نەك هەر ئەو ڕۆڵە ناگێڕێ کە دەبێ بەجێی بێنێ بەڵکو زیانیش بە تریە و مۆسیقای ڕەوتی شیعرەکە دەگەیەنێ و لەنگەری ئاوازی تێك دەدا و بەهای ئیستاتیکی دادەبەزێنێ. لەباتی ئەوەی خوێنەر ڕابکێشێ و خۆشی دەروونی بۆ مەیسەر بکا، وەڕسی و بێزاریی لەلا دروست دەکا. بۆیە شاعیر دەبێ زۆر وریا بێ لە مامەڵـە کردنی لەگەڵ سەروادا. نابێ ڕێگا بدا هیچ کەلەبەرێکی تێ بکەوێ و کەم و کورتییەکی وای پێوەبێ لەبەهای شیعرەکە کەم بکاتەوە. ئەو جۆرە کەم و کورتییانە هەرچەندە بەسەلیقە و لەئەنجامی خوێندنەوەی زۆری شیعر، زۆر بەئاسانی هەستیان پێ دەکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا جار وبار یەخەی شاعیری گەورە و بەدەسەڵاتیش دەگرن. جیاوازیی شاعیری بەتوانا و شاعیری ناشی لەبەرەو ڕوو بوونەوەو چارەکردنی ئەم کەم و کورتییانە لەوەدایە، کەم و کورتییەکان خۆیان بەسەر شاعیری ناشی دادەسەپێنن و شیعرەکەی دەشێوێنن، بەڵام شاعیری گەورە بە جۆرێ دەوری ئەو کەم و کورتییانە دەدا، نایەڵێ هەر پێوە دیار بێ. واتە ڕادەی قەبە بوون یان کەم بوونەوەی کاریگەریی کەم و کورتییەکان تا ڕادەیەکی زۆر بۆ توانا و دەسەڵاتی شاعیر دەچێتەوە. لەم بەشەدا هەندێ لەو کەم و کورتییانەشی دەکەینەوە کە لە شیعری کوردیدا دەردەکەون، ئەمانە بەگشتی دوو جۆرن :

یەکەم - کەم و کورتی دەنگ و ئاوازی سەروا.

دووەم- کەم و کورتی زمانەوانی و فەرهەنگیی سەروا.

### یەکەم : کەم و کورتی دەنگو ئاوازی سەروا :

ئەمە پەیوەندی بەهەر ناتەواوی و لاوازی و لەنگی و ترازانێکەوە هەیە کە تووشی دەنگو ئاوازی سەروا دەبێ. ئەگەرچی لەزۆربەی زمانەکان کەم و کورتی سەربەدەنگو ئاوازی سەروا دەردەکەوێ، بەڵام جۆری کەم و کورتییەکە و ڕادەی پەسندنەکردنی لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەگۆڕێ، بگرە دیاردەی دەنگسازی هەیە لەزمانێکدا زۆر ئاساییە کەچی لە زمانێکی تر بە کەم و کورتی دادەنرێ. ئەمە هەندێ لەم جۆرە کەم و کورتییانە :

١- جیاوازی دەنگی ڕەوی : ڕەوی بەهێزترین ڕەگەزی مۆسیقی سەروایە، چونکە هەموو شەپۆلەکانی دەنگی سەراپای دێڕە شیعرەکە لەو خاڵەدا کۆ دەبنەوەو دادەکوترێنەوەو ئەو دەنگە زیاتر لەگوێدا دەزرنگێتەوەو ماوەیەکی زۆرتر لای گوێگر دەمێنێتەوەو تاسەی ڕەچاوکردنی لاتێر دەکا، کە دەنگەکە گۆڕا ئەو نیزامە دەشێوێ و ڕەچاو کردنی دەنگەکە پووچ دەردەچێ و گوێگر تووشی بێ متمانەییەك دێ.

أ- جیاوازی لە بزوێندا : وا دەبێ ڕەوی بزوێن بێ و بزوێنەکە لە دێڕێك یان چەند دێڕێکی

هۆنراوەکەدا بە بزوێنێکی تر بگۆڕێ.

• گۆڕانی (ا ــــ> ە) : دڵدار لەبەشی یەکەمی (تووتنەوان)دا، ڕەوی لەسەر دەنگی (ا) دامەزراندوە. وەکو لەم وشانەی سەروادا دەردەکەوێ: (گەرما، ئەدا، تا، گۆیا، بەخێوکا، ئەم لا...) تا دەگاتە دێڕی کۆتایی، لەوێ ڕەوییەکە دەکا بە (ە):

نەخۆشی لێنە، گەر تێنوویان بێ

بەخێری باوکت ئاویان پێ بدە. [١٢٥: ٢١٩]

ئەمە لای (سەفوەت)یش دووبارە بۆتەوە، لەشیعری ژمارە (٦٠)دا، کە (٧) دێرە و بەئەسریعەوە (٨) سەروایە، لەمانە (٥)یان ڕەوییان (ا)یەو سیانیان (ە)یە. (ئەگەرچی لە دیوانەکە هەمووی هەر بە (ا) نووسراوە)، لەدێری یەکەمدا دەڵێ:

لە دووری تۆ زەگی بەگ دڵ سووتاوە

هەموو کوردێ هەناسەی لێ براوە

شکا پشت و برا هێزی دو ئەژنۆ

لە گریەن پیر هەتا منداڵی ساوا [١٠٨: ١٠٩]

وشەکانی تری سەروا (چاوا، ناوا، ئاوا، لاوا) بەڵام وشەی سەروای کۆتایی دیسان دەبێ بە (ە) (وتی پێم نیشتمان پەروەر نەماوە). لەم شیعرو ڕەوی گۆڕینەدا، دوو سەرنج هەن:

١- ئەمە دەنگیەکەی بەقەد شیعرەکەی دڵدار نیە، چونکە لەوێ ڕەوییەکە بەتەنیا سەروای دروست کردبوو، هیچ دەنگی تری لەگەڵدا نەبوو، گۆڕانەکە زەقتر بوو، لێرە ئەگەرچی ڕەوی(ا)یە بەڵام دەنگەکانی سەروا بریتین لە (ـاوا)، ئەمە وا دەکا کەم و کورتییەکە کەمتر بێتەوە یا بەو ڕادەیە هەستی پێ نەکرێ.

٢- ئەو گۆڕانەی لە ڕەوی ڕوویداوە، (ا) بووە بە (ە) لە دێری یەکەم (بە سەروای هەردوو لەتەوە) و دێری کۆتایی دایە، ئەمە وەك بەستنەوەیەك وایە، بەداوێکی وا وەهمی سەروینی هۆنراوەکە دەگەنەوە یەکتر بە بەرەوییەکی لاوازیش بێ، ئەمە دیسان کەم و کورتییەکە کەمتر دەکاتەوە ئەمە لای پیرەمێردیش لە مەسنەوییەکی شیعری (مەولوودی پێغەمبەر)دا هاتوە کە دێری پێنجەمینەو دەڵێ:

هەر لە ڕۆژهەڵات هەتا ڕۆژاوا

چرای ئەم دینەی تیا هەڵکراوە [٤٣: ٢٧١]

• گۆڕانی (ە ـــ ی)، زۆر جار وادەبێ ئەم دوە دەبن بە ڕەوی دێرە شیعرێك کە دوو دەنگی لەیەك دووری وەکو فەتحەو کەسرە یان فەتحە و بۆربێ، جیاوازییەکە زەق بیشان دەدا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا حاجی لە (هەیەونی‌یە)دا کردوونی بە ڕەوی:

تاکی دونیا مایە پوختەی هەر هەیە
لەم کەروخامەی کە هەن باکم نییە [٦٠ : ٢٠٤]

کەریم شارەزا، لەو باسەی بەناوی (ساغ کردنەوەی هەندێ گیروگرفتی شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی) نووسیویە، لەباسی سەرواولە ژمارە (٤)دا ئەم دێرە شیعرەی حاجی دێنێ و ئەم تەعلیقەی لێ دەدا : (دەبینین لە نیوە دێری یەکەم (هەیە) بووە بە سەرواو لە نیوەی دووەمیشدا ووشەی (نیە). دیارە لەکاتی خۆیدا بە رێنووسی کۆن (هیە)، (نیە) نووسراون بەلام کە خرانە سەر رێنووسی نوێ کەمێك لێك دوور دەکەونەوە....) [٢٣٣: ٢٤٧] ئینجا تەبریر بۆ حاجی دێنێتەوەو دەڵێ (ئەم جۆرە سەروایانە لە کوردی و غەیری کوردیدا هەن). پاشان بەگلەییەوە دەڵێ (بەلام من حەزم دەکرد رێکتر بانایە). واتە ئەوەندە رێك نین. ئەگەر بەشێوەیەکی زانستی لەم دوو وشەیە بکۆڵینەوە دەبینین هەردووکیان لەیەك کارەوە هاتوون و بۆ یەك کات و یەك کەسیش گەردان کراون، کاری (هەبوون)، کاتی ئێستا، کەسی سێیەمی تاك بەلام جیاوازیان لە ئەرێ و نەرێدا هەیە (هەیە-ئەرێ) (نییە-نەرێ). لەبەر ئەوەی شارەزا دەڵێ ئەم جۆرە سەروایانە لەکوردی و غەیری کوردیدا هەیە، دەمەوێ بڵێم لە زمانێکی وەکو ئەسپانیدا، یەکێ لە مەرجە بنچینەییەکانی سەروا ئەوەیە دەڵێ (خۆت دوور بخەوە لە بەکارهێنانی کۆتایی باوی وشە، بۆ نموونە وەکو کۆتایی گەردان کردنی فەرمان) [٥٠٥ :١٢٥]. جگە لەوەش ئەگەر زیادەی سینتاکسی لەم دوو وشەیە لابەین، کە فرمانی بێ هێزی (ە)یە لەگەڵ نیمچە بزوێنی (ی) کە بۆلێك دابڕاندنی دوو بزوێن هاتوە، دەمێنێ (هە، نی) (ە-ی) دوا دەنگی دوو حاڵەتی وشەکەن، ئەمانە هاوڕەوی نین. (هە-نی) ڕەگی ڕانەبردووی فەرمانەکەیە و بەپێی ڕستە بەم جۆرە زیادەکانی دێنە سەر (هەیە، هەن، هەم، هەین، هەیت، هەن)، (نییە، نین، نیمە، نیمانە، نیتە، نیتانە).

• گۆرانی (ی)ی بزوێن و (ی)ی نیمچە بزوێن، وەکو کوردی دەڵێ :

شیختنی بهجرك واللە یا صبی
ڕەحمەت برا لەبۆ کەی و هیجرت هەتا بەکەی
دائیم لە دەوری خاڵی ڕوخت بێ قەرارە دڵ
هەروەك لە دەوری قوتبی فەلەك دائیرەی جەدی [١٧٢ :٨٩]

وشەی سەروای لەتی یەکەم (صبی)یە، ڕەوییەکەی (ی)ی بزوێنە، وشەی سەروای دێری یەکەم (کەی)یە، ڕەوییەکەی (ی)ی نیمچە بزوێنە، کەچی وشەی سەروای دێری دووەم (جەدی)یەو ڕەوییەکەی (ی)ی بزوێنە.

• (وو ــ ۆ) مەلا موخلیس دوو سەرەدی لە شیعرێکدا، ڕەوی (وو-ۆ)ی بەیەکەوە هێناوە، وەکو لە وشەکانی سەروا دەردەکەوێ کە ئەمانەن : (موو، توو، بوو/ئەژنۆ، ڕۆڕۆ) وەکو دەڵێ :

ئەی تازە گوڵی باغی ئەمەل بۆچی وەهازوو
ڕۆیشتی، بەجێت هێشت لەبۆ ئێمە کەسەر و سوو
گەنجیم سەمەرێکی نەبوو، پیریم بە سەراهات
ئاگام چ لە پیری نەبوو ، ڕۆڵەم ، لە هەوای تۆو[٤٩٠ : ١٦٥]

ب- جیاوازی لە نەبزوێنیدا : زۆر جار وادەبێ جیاوازی لە ڕەوییە نەبزوێنەکانی هۆنراوەیەك پەیدا دەبێ، ئەم جیاوازیە بەگوێرەی دوور و نزیکیان لە یەکترەوە دوو جۆرن :

١- ئەو نەبزوێنانەی سازگەکان (المخرج point of articulation) یان لە یەکەوە دوورە وەکو :

• (ڕ ــــ ز) : ئەدەب شیعرێکی هەیە (پێوەم کە خۆم لەبی ...) هەموو ڕەوییەکانی (بەڵەتی یەکەمی دێری یەکەمیشەوە چونکە موسەڕڕەعە) (ڕ)ە تەنیا دێری یەکەم نەبێ ڕەوی لەتی دووەمی (ز)ە ... دەڵێ :

پێوەم کە خۆم فیدایی لەبی ئەو نیگارەکەم
گیانی عەزیز هەدییەی ئەو یارە تازەکەم [١٤ : ٦٢]

وشەکانی تری سەروای ئەمانەن : (مەیگوسار، کار، نزار، شەهوار، غەمگوسار، سایەدار، بەهار، ئیفتیخار، گیان نیسار) (کەم) فەرمانی، رانەبردووی ڕێژەی ئینشائی‌یە (subjunctive)، وەك دیارە هەموو ڕەوییەکان (ڕ)ن تەنیا دێری یەکەم (ز)ە، ئەم دوەش سازگەیان لەیەك دوورە. ئەدەب لە لاپەرە (٩٩)دا ئەم گۆڕینەی دووبارە کردۆتەوە بەلام ئەمجارەیان بە پێچەوانەوە هەموو وشەکانی سەروا ڕەوییان (ز)ە، تەنیا دێری یەکەم (ڕ)ە. (نار، موختار-شەهباز، سەرباز...).

ئەگەرچی ئەم دوانە (ڕز) وەك تیپ (شکل) لەیەك نزیکن بەلام وەك دەنگکە بنچینەی زمان و سەروایە، زۆر لێك دوورن. بۆی هەیە ئەو نزیکی شکلی تیپە بێ، ئەو تێکەڵییەی دروست کردبێ، چونکە بۆچوونی کۆن زیاتر بەلای تیپدا دەچوو نەك دەنگ یان بۆی هەیە پاش سەروای (کەم) کە تا ڕادەیەك ڕەوی داپۆشیوە، بووبێ بەهۆی کەوتنەوەی ئەم ناتەواوییە.

کوردیش لە شیعری (چاوەکەم دەرهەق بەمن)[١٧٢ : ٧١] هەموو ڕەوییەکانی (ڕ)ەو پاش سەروای (مەکە)ی هێناوە. تەنیا لە دێری سێیەمدا ڕەوی کردوە بە (ز). وشەکانی سەروای شیعرەکە ئەمانەن : (پیر، دڵگیر، تەنخیر، زیز، شیر، تیر، ئیکسیر، تەقسیر).

• (ل ــــ ت) : حەریق لە شیعری (لەخزمەت قازی لاریم نیە ...)دا هەموو ڕەوییەکان (ل)ن، تەنیا دێری پێنجەم نەبێ بووە بە (ت)، لەم شیعرەدا پاش ڕەوی هەیە، (م)ی ڕاناوی لکاوە، ڕەنگە هەر ئەم پاش ڕەوییەش بێ، وای لێ کردبێ (ت) لە باتی (ل) بەکاربێنێ و بەسەر خوێنەری تێبپەڕێنێ چونکە خوێنەر زیاتر گوێی بەدەنگی کۆتایی (ڕەوی، یان پاش ڕەوی) دەزرنگێتەوە. لە

دێری یەکەم دەڵێ :

لە خزمەت قازی لاریم نییە بۆسەر، چ جای مالم

چ حیکمەت بوو ئیشاراتی ئەفەرمووی بۆ شیفای حالم [١٦٣ : ٤٠]

ئینجا لە دێری پێنجەمدا، لەتی دووەمی کە سەروای تیا دێتەوە دەڵێ :

لەهەر لایێ دەفەرمووی حازرو موشتاقی بالاتم.

• (ن ــــ ل) : کوردی لە شیعری (تالانی سەرو ماڵت)، هەموو ڕەوییەکانی (ن) هێناوەو پاش ڕەوی (ت)ی پێوە لکاندوە.

تالانی سەرو مالم چاوی ڕەشی فەتتانت

پابەندی دڵ و دینم کاکۆڵ ی پەرێشانت [١٧٢ : ٢٠]

وەك لەوشەکانی سەروادا هاتوە (موژگان، خەندان، چەوگان، هامان ...) کە (١٧) دێرە، تەنیا دێری (١٠، ١١، ١٢) ڕەوی گۆڕاوەو بوە بە (ڵ) ئەویش لە دوو وشەدا (شمشاڵ، خرخاڵ) چونکە خرخاڵ دووجار هاتوە، ئەگەرچی بۆی هەیە (خڕخاڵ) هەر جارەی مانایەکی هەبێ (ڕەگەز دۆزی بێ)، یەکێکیان (خرخاڵ) (الخلخال) و ئەوەی تر خڕ/خاڵ (هەمووی هەر خاڵ)، چونکە یەکێکیان لەگەڵ ئەگریجە هاتوە، ئەگریجە و خاڵ بەیەکەوە بەسەر گۆنا دا بڵاو دەبنەوە، ئەوەی تریش لەگەڵ پاوانە هاتوە، پاوانە و خرخاڵ لە پێ دەکرێن.

• (د ــــ گ) : لەزاری سلێمانیدا (نگ) هەیە، زیاتر لە دەنگی / ŋ /ی ئینگلیزی دەکا، لەژێر کاریگەری ئەم دەنگەدا زۆر (ند) کە لە کۆتایی وشە بێ، لەو زارەدا دەبێ بە (نگ)، وەکو :

(مەنگ) بۆ (مەند) بەکاردێ. ئاورەحمان بەگی نفووس لە شیعری چیای زاگرۆس دا، کە سەرواکەی (٣-٢) هێناوە، لە سێینەی یەکەمدا دەڵێ :

چیای زاگروس بەرز و بلنگە

گشت پیچ و دەری بیێشەی پلنگە

جیگەو هەواری قەومی بە چنگە [٢٥ : ٩١]

دیارە یەکەم لەت (بڵندە) کراوە بە بلنگە بۆ ئەوەی سەرواکە لەگەڵ (پلنگە و چنگە) بێتەوە.

• (ن ــــ ر) : تایەر بەگی جاف دەڵێ :

دڵ لە هیجرت وا لە غەمدا ماهی روخسارم وەرە

زەخمە جەرگم بۆ فیراقت زوو بە لوقمانم وەرە [٤٨ : ١٢]

(وەرە) پاش سەرواو (م) پاش ڕەویە، لێرە ڕەوی (ن)ی وشەی (لوقمان)، بەدرێژایی ئەم هۆنراوەیە کە (١٣) دێرە، بۆتە ڕەوی، تەنیا لەدێری دوەم لە (هاوار) و دێری (١٢) لە (کۆسار)

بووە بە (ر)، ئەوەش جێی سەرنجە لەتی یەکەمی دێری یەکەمیش کە بەزۆری موسەرروەع دەبێ واتە وەکو سەروای گشتی دەبێ لێرە (ر)ە (روخسار)، وەکو (هاوار) و (کۆسار). لێرەش ئەوەی ئەم گۆڕینەی ناپۆشیبێ پاش سەرواو پاش ڕەوییە کە ئەوەی وورد نەبێ هەستی پێ ناکا.

• (ل ـــ ر) : ئەسیری لە شیعری (مەقسەدت حاسیل دەبێ) کە چوار دێرەو دێری یەکەمی ڕەهایە (موسەرروەع نییە)، واتە چوار وشەی سەروای هەیە، سیانی (ل)ی کردوە بە ڕەوی (غافیل، باتیل، حاسیل)، ئەوەی کۆتاییش (ر)ی هێناوە، (زاهیر). دێری یەکەم و کۆتایی ئەمانەن :

جەوهەرێکی گەرتیا بێ کەللە چۆن ساکن دەبێ
مەرد ئەگەر موشتاقی چشتێ بێ چلۆن غافیل دەبێ
گەر لە ڕێگەی دین و قەومت لەت لەتت کەن بتکوژن
ئەی ئەسیری ناوی چاکت تا ئەبەد زاهیر دەبێ[١٧ : ٧٨]

لێرەش گۆڕانی ڕەوی لە (ل)ەوە بۆ (ر) کەوتۆتە بەنای پاش سەروای (دەبێ)، بەڵام لێرە لەبەر ئەوەی هەم پاش ڕەوی نییە و هەم جیاوازییەکە زۆرە، گۆڕانەکە زەق دیارە. ئەمە وای کردوە کەریم شارەزا لە پەراوێزدا ئەم ڕوون کردنەوەیە بنووسێ : (هەرچەندە وشەی (زاهیر) لەگەڵ سەرواکانی تری وەك (غافل) و (باتبل) و (حاسل) ڕێك ناکەوێ و بێ هێزییەکی داوە بە هونەری شیعرەکە بەڵام ئێمە بەبێ دەستکاری ئاوامان لەسەرچاوەی پارچە شیعرەکە وەرگرتوە). [١٧ : ٧٨]

• (ت ـــ ق) : ئەحمەد موختار بەگی جاف، لە شیعری (گەر لە مەحبووسی خەلاس بم) کە پڕە لە جوێن و هەڕەشە بۆ دوژمنان و بەڵێنی چاکە بۆ دۆستان و گلەو گازاندەیە لە بەختی نەیاری خۆی کە خزاندویتە ناو کونجی بەندیخانە، پاش سەروای (ئەکەم)ی هێناوەو هەموو دێرەکان ڕەویان (ت)ە تەنیا دێری یەکەم نەبێ (ق)ە، لەدێری یەکەمیش لەتی یەکەم ڕەوییەکەی وەکو دێرەکانی تر هەر (ت)ە. وشەکانی سەروا ئەمانەن (بەت، ڕەق، خەت، نەگبەت، سەروەت، غەیبەت) :

خەلقە ئەمرۆ چونکە حەپسم ڕێگەیی دەستم نی‌یە
ناتوانم هیچ بکەم مەجبورم هەر غەیبەت ئەکەم[١٠ : ٩٤]

لە ڕووی ئەوەوە کە تەنیا دێری یەکەم ڕەوی جیایە و لەتی یەکەمیش لەگەڵ دێرەکانی تر هاوڕەوییە ئەم شیعرە لە شیعرەکەی تایەر بەگ دەکا کە لەسەرەوە شیمان کردوەوە.

ئەم کەم و کورتییە لای سەرواناسە عەرەبەکان بە (الاجازه) یان (الاجاره) ناسراوە.

٢- ئەو دەنگانەی سازگەیان لەیەك نزیکە یان یەکەو سیفەتی تریان جیایە، وەکو :

• (ب ـــ پ) : ئەم دوو دەنگە زۆر لەیەکەوە نزیکن، سازگەو شێوەی هاتنە دەرەوەیان یەکە،

تەنیا لە رووی (گڕی- voiced) وکپی (voiceless) جیان. یەکەمیان (ب) گڕەو دووەمیان (پ) کپە، نالی لە شیعری (ئەحوەلی تەفریقە نەزەر.... )دا، جگە لەپاش سەروای (دەکا)، سەروای شیعرەکەی (-ەب) هێناوە کە ڕەویەکەی (ب)ە. شیعرەکە (٧) دێرەو دێری یەکەمی موسەرڕەعە، واتە هەشت وشەی سەروای تێدایە. لەم هەشتە شەشیان ڕەوییەکەیان (ب)ەو دوویان (پ)ە. وشەکان ئەمانەن: (سەبەب، ئەدەب، تەلەب، لەهەب، لەپ، چەپ، تەرەب، گەپ) دێری یەکەم دەڵێ:

ئەحوەلی تەفریقە نەزەر تەقوییەتی سەبەب دەکا

عاریفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب دەکا [٢٠٩ : ٥٣]

__وردەکارییەکی نالی :__

ڕاستە (پ-ب) لە ڕووی کپی و گڕییەوە جیان و نەدەبوو نالی بیانکا بە ڕەوی لەیەك هۆنراوەدا چونکە هۆنراوەی یەکێتی سەروا دەبێ یەکێتی ڕەوی تێدا بپارێزرێ، بەڵام لێرەدا نالی پاش سەروای (دەکا)ی هێناوە، یەکەم بەم پاش سەروایە جیاوازییەکەی کەم کردۆتەوە چونکە زەین و گوێچکەی گوێگر زیاتر بەدوا دەنگەدەرزنگێنەوەو ئەو جەختەی لەسەر ڕەوییە، پاش سەروا زۆری بۆ خۆی ڕادەکێشێ، دووەم ئەو دوو ڕەوییەی کە بوونەتە (پ)، لە خوێندنەوەدا وەکو (ب) گۆ دەکرێن چونکە دەنگی (د)ی (دەکا)یان بە دوا دێ، (چەپ دەکا، گەپ دەکا)، ئەگەر یەکێ ئەم جووتە وشانە بخوێنێتەوە، هەست دەکا بێ دەستی خۆی (پ) وەکو (ب) دەخوێنێتەوە. ئەمە بۆ دەستوورێکی گۆرانی دەنگەدەچێتەوە کە پێی دەگوترێ (assimilation) واتە (تەبایی یان گونجاندن) کە ئەوەیە دوو دەنگی جیاواز لە گڕی و کپی، ئەگەر بکەونە تەنیشت یەکەوە، یەکێ کار لەوی تر دەکات و لەگەڵ خۆی دەگونجێنێ، یان کپەکە گڕەکە کپ دەکا، یان گڕەکە کپەکە گڕ دەکا لێرەدا (پ،د) لەتەك یەك هاتوون، (پ) کپ و (د) گڕە، (د) کارلە (پ) دەکا و گڕی دەکا، (پ) گڕ بێ دەبێ بە (ب) ئەوەشیان پێی دەگوترێ (regressive assimilation) چونکە کاریگەرەکە لەدواوە بەرەو پێشەوەیە، واتە کشانەوەیە. لەمەوە وەستایی و وردەکاری نالی دەردەکەوێ کە هەرچەندە بە شکل ڕەوی گۆڕیوە بەلام لە ڕاستیدا چۆنیەتی خوێندنەوەی ڕەوییە گۆڕاوەکە دەیهێنێتەوە سەر ڕەوتی گشتی ڕەویەکانی تر (پرتەوی هەکاری)ش، لەشیعرێکیدا ڕەوی (ب) یەکجار گۆڕیوە بە (پ) کە لە دووبارە بوونەوەی وشەیەك دا هاتوە (تیپ تیپ)، لێرەدا جیاوازییەکە زەق دیارە، چونکە پاش سەروای نییە، دەڵێ :

زوڵف و گیسوو جەعدو کاکل خاڵ و خەت موژگان بەسەف

هاتنە دەعوایێ دڵێ من دەستە دەستە تیپ تیپ [٤٠ : ٩٢]

لە شیعرێکی سەلامیش (بە زوڵف و پەرچەمی) [١٠٩ : ١٠٠] کە (٩) دێرەو موسەرڕەعە واتە(١٠) وشەی سەروای هەیە، وشەیەکیان (گەپ) سەرواکەی گۆڕاوە، ئەوانی تر

هەمووی(ب)ە: (عەقرەب، غەبغەب، مەنسەب، مەکتەب، کەوکەب، لەب، گەپ، مەزهەب، مەتلەب).

(ناری)یش هەمان گۆڕانی لە شیعرێکدا کردوە کە بۆ بابە عەلی کوڕی شێخ مەحمودی حەفید زادەی نووسیوە [٢٠٦ : ٣٩-٤٠]، (١٥) دێڕەو موسەررەعە، واتە (١٦) وشەی سەروای هەیە، (١٤)یان بە (ب) کۆتاییان دێ (تەرەب، عەرەب، نەسەب ...) دووشیان بە (پ) : (گەپ، قەپ).

• (هـ ــ ح) : خانی دەڵێ :

زینێ مرنا مەمێ بگوهـ کەت

گۆیا مریو ژنو بروح کەت [٢ : ١٦٨]

لەم دێڕەدا (کەت) پاش سەروایەو وشەکانی سەروا ئەمانەن : (گوهـ، روح) لەیەکەمدا ڕەوی (هـ) ولەدووەمدا (ح)ە.

• (خ ــ غ) : ئەم دوو دەنگە وەکو دووەکەی پێشوو، تەنیا لە ڕووی کپی و گڕییەوە جیان. (خ) کپ و (غ) گڕە. سابیری لە شیعری (عیشقی پەری ڕوویەك)دا کە (٨) دێڕەو موسەررەعە، لە (٩) وشەی سەروادا جارێکیان (خ)ی کردوە بە (غ)، (ئەگەرچی هەر بە (خ) نووسراوە، بەڵام ڕاستیەکەی (غ)ە . لە دێری یەکەمدا دەڵێ :

لەتاوی ئاگری عیشقی پەری ڕوویەکی قەد بەیداخ

خودا ئاگاهە یەك لەحزە نیە جەرگ و دڵم بێ داخ [٩٨ : ٦٧]

وشەکانی تری سەروای ئەمانەن : (شاخ، چەرداخ، سۆراخ، داخ، شاخ، گوستاخ، سۆراغ)، دووجار سۆراغی بەکارهێناوە کە تەعقیب کردنە، لە دێری کۆتاییدا دەڵێ :

چ حاصل صابری هاوار ئەکەی قاتیل لەدەست دەرچوو

هەتا ڕۆژی قیامەت قاتلت بێ ئاگرێ سۆراغ.

سەیدی هەورامیش لەدوو شیعردا (خ،غ)ی کردوە بە ڕەوی [١١١ : ١٦٣،٩٣].

• (ج ــ چ) : ئەم دوەشیان هەر وەکو ئەوانی پێشوو جیاییان تەنیا لە گڕی و کپی دایە، عەونی لە شیعری (بەدڕەوشتی)دا کە (٧) دێڕەو موسەررەعە و ڕەوییەکەی (ج)ە لەهەشت وشەی سەروادا، جارێکیان (دێری چوارەم)ی، کردووە بە (چ) (خاچ) دەڵێ :

بێ لە سەرنان و جوێندانت بە زانایانی خۆت

تف لە ڕووی خۆ کردنەوەك لەعنەتی ڕاهیب لە خاچ [١٤٥ : ١١٨]

کەچی وشەکانی تری سەروا بریتین لە : (ڕەواج، ساج، تاج، باج، عاج، سەراج).

• (ك ـــــ گ) : حاجی لە شیعری (لەگاوان و شوانی کوردەکان یەك)دا هەموو ڕەوییەکانی (ك) هێناوە : (یەك، لەك، بەرمەك ...) ئینجا لە دێری حەوتەمدا کردوویە بە (گ)، دەڵێ :

لە گوێی گا نووستون بۆ یێکا رێوی
لەسەر ئێوە وەها شێرگیرە وەك سەگ [٦٠ : ٧١].

• (ز ـــــ س) : ئەدەب لە شیعرێکدا (شۆخەکەم دیسان دیارە ....)، (ز)ی کردوە بە ڕەوی وپاش سەروای (هەیە)ی بۆ هێناوە، لە شیعرەکەدا وەك پێشتر باس کرا گۆڕانێکی تریش لە ڕەویدا هەیە، دێری یەکەم (ز) بوە بە (ر)، لە هەمان کات دا دێری پێنجەم گۆڕانێکی تری تێکەوتوە (ز) بوە بە (س). جیاوازی ئەم دوو دەنگە هەر لە کپی و گڕیدایە. وشەکانی سەروا ڕەوییان (ز)ە وەکو : (ناز، شەهباز، سەرباز، تەنناز ....) تەنیا لە پێنجەمدا بوە بە (قەفقاس) :

عەسکەری موژگانی ئێرانی موسەخخەر کردوە
وەك ئەمن بیستوومە ئێستا عەزمی قەفقاسی هەیە [١٤ : ٩٩]

• (ش ـــــ ژ) : ئەم دەنگانەش کە لە نێوان کپی و گڕی دان، جاری وا هەیە لە بوون بە ڕەویدا جێگای یەکتر دەگرنەوە. چیرۆکی زەمبیل فرۆشی مراد خانی بایەزیدی کە بەزاری کرمانجی سەرووە، لە شێوەی چوارخشتەکی دایە (AAAB)، لەسەرەتا تا کۆتایی چوارەم لەتی چوارینەکان هاوسەروان و سێ لەتەکەی پێشووی هەر چوارینەیەکیش لەنێوان خۆیاندا هاوسەروان. چیرۆکەکە بە سێینەیەك دەست پێ دەکا (لەباتی چوار خشتەکی)، ڕەنگە ئەمە بۆ دامەزراندنی کێش و سەرواو ڕێگا خۆش کردن بێ بۆ ئاوازی هۆنراوەکە دەڵێ :

ئەی مەجلیسا پڕ زەوق و خۆش          گۆهـ بدەنە سوحبەتەك خۆش
دەکەین بەحسی زەمبیل فرۆش [٢٠٠ : ١٥]

ڕەوی هەموو چوارینەکان (ش)ە، تەنیا چەند جارێك نەبێ بە (ژ) دەیگۆڕێتەوە، وەکو وشەی (ڕۆژ ل١٥، ١٦، ١٧، ٢٤، ٢٥، ٢٨، ٣٢)و وشەی (بسۆژ ل١٨) و(بێژ ل٢٣ - لەمەیاندا ڕیدفیش گۆڕاوە. ۆ - بۆتە (ێ) ... ) جگە لەسەروای گشتی چیرۆکەکە کە لە چوارەم لەتی هەموو چوارینەکانداپە، لە (٨)ەم چوارینەدا، سەروای سێ لەتی پێشەوەی چوارینەکە بەم جۆرە هاتوە (پێش، دەروێش، نێژ)، واتە لە سەروای چوارینەکەشدا (ش) بوە بە (ژ).

• (ل ـــــ ڵ) : ئەم دوو دەنگە هەر زۆر لەیەکەوە نزیکن، نەمزانیوە لەهیچ زمانێك وەکو کوردی فۆنیم بن، واتە دەنگی سەربەخۆ بن و مانای وشە بگۆڕن، لە ئینگلیزیدا، هەردوکیان هەن بەڵام بە دوو ئەلۆفۆنی یەك فۆنیم دادەنرێن و هەریەکە شوێنی خۆی هەیە لەوشەدا (لامی قەڵەو - dark L) و (لامی لاواز - Light L)، کەچی لەکوردیدا وەکو دەنگی تەواو جیاوازن، هەریەکە فۆنیمێکی

سەربەخۆیە، بۆیە ئەگەر لە نووسیندا دوو رەمزی لەیەك دووریان بۆ دابنرایە زۆر لەبارتر بوو نەك وەكو ئێستا بەنیشانەیەك (ٚ) لێك جیابكرێنەوە. هەر ئەم لێك نزیكییەشە، وای كردووە زانـاو شاعیرانی كۆن هەست بە جیاوازیان نەكەن و یەك حسێبییان بۆ بكەن و لە شیعریشدا شاعیران، هەردووكیان لەیەك هۆنراوەدا بكەن بە ڕەوی بێ ئەوەی هەست بكەن كە لە یەكێتی ڕەوی لایان داوە.

شێخ نووری شێخ سالح لە شیعرێكدا بەناوی (شێوەنی زێوەر) كە (٧) دێرەو موسەررەعە، پاش سەرەوای (ئەمڕۆ) و سەرەوای (ماڵ/ال)ی هێناوە لە سەرەتادا دەڵێ :

ئەزانم بینووسم بۆ هەر كەسێ من عەرزو حاڵ ئەمڕۆ
لەعەرزی حاڵی خۆم داماوم و ساحیب مەلاڵ ئەمڕۆ[٢١٢ : ١٧٥]

وشەكانی تری سەروا ئەمانەن : (خاڵ، میسال، جەمال، ئیعتیدال، بەتاڵ، كەماڵ) وەك دیارە ڕەویەكان لەنێوان (ڵ/ل) دان.

ئەمە لای زۆربـەی شاعیرانـی كلاسیكیمـان دوبـارە بۆتـەوە، هەر بۆنموونە حەمدی(ل٢٠١، ٢٠٤)، ئەحمەد موختار (ل٧٥)، ناری (ل٤٨)، قانع (ل١٠٨، ١٠٩).

• (ر ـــ ڕ) : ئەم دوو دەنگە زۆر لەیەكەوە نزیكن، ئەگەرچی دوو دەنگی جیان بەڵام لە كەم زماندا دەبن بە فۆنیم، هەر دوو ئەلۆفۆنی یەك فۆنیمن، بۆ نموونە لە عەرەبیدا دوو جۆر (ر) هەن : (مفخمە) و (مرققە) كە هەر یەكەیان شوێنی تایبەتی خۆی هەیە لە وشەدا [54]. بەڵام هەرگیز گۆڕانیان مانای وشەكە ناگۆڕێ، لە ئینگلیزیشدا، (round) و (flap) هەیە [55] ئەوانیش هەر ئەلۆفۆنن، كەچی لە كوردیدا بە پێچەوانەی ئەوانەوە ئەم دوو جۆرە (ڕ)ە، دوو دەنگی جیاوازن و هەریەكە دەورییەهای فۆنیمایەتی خۆی هەیە. وەك دوو دەنگی لێك دوور وان،(ر)ی قەڵەو لاواز لەكوردیدا، ئەگەرچی دوو دەنگی جیاوازن بەڵام بەپێی یاسای فۆنۆلۆژی (ر)ی لاواز قـەت لەسەرەتـای وشە نایە، هەر لەناوەڕاست و كۆتایـی دێ. كەواتە (ر ـــ ڕ) هەردووكیان دەشێ

---

[54] لەعەرەبیدا ، ئەم دووجۆرە (ر)یە هەریەكە بەپێی دەستووری تایبەتی شوێنی خۆی لەوشەدا دەگرێ. بۆ نموونە رێی مفخمە (قەڵەو) بریتیە لەو رێیەی (كە سەربار یان بۆربار بێ، ئەگەر زەننەداریش بێ بەڵام تیپی پێشەوەی بۆربار یان سەربار بێ، قەڵەو دەبێ، یان ئەگەر تیپی پێشەوەی ژێربار بێ، بەڵام كەسرەكەی سەرەرۆ بێ (عارضە)، هەروەها ئەگەر زەننەدار بێ و ژێری تیپی پێشەوەی ئەسلی بێ و بەكێ لە تیپەكانی (استعلاء)ی بە دوادا بێ كە لە (خص ضغط قظ)دا كۆ دەبنەوە، دیسان قەڵەو دەبێ...) [٣٥٨ : ٢٤] كەچی رێی لاواز (المرققە) (ئەو رێیەیە كە ژێردار بێ جا چ لەسەرەتای وشەدا بێ و چ لەناوەڕاست و چ لە كۆتایی، چ لەناودا بێ و چ لەفەرمان ... یان ئەگەر تیپی پێش رێ، بزوێن بێ یان بێ بێ ... هەروەها رێ لاواز دەبێ ئەگەر زەننەدار بێ و پێشەوەی ژێری ئەسلی بێ وتیپی (استعلاء)ی بەدوادا نەبە). [٣٥٨ : ٢٥].

[55] ئەم دووجۆرە (ر) لە ئینگلیزیدا بەپێی شوێن گۆكردنیان دەگۆڕێ.

لەکۆتایی وشە بێن کە شوێنی ڕەوییە لەسەروادا، ئەم نزیکییەی نێوانیان وای کردوە زۆر جار لە شیعری کلاسیکی کوردیدا تێکەڵ بین، واتە هەردوو جۆریان لەیەک هۆنراوەی یەکێتی سەروادا ببن بە ڕەوی.

نالی لە شیعری (پێم دەڵێن ...) هەر دوو جۆری کردوە بە ڕەوی، دەڵێ :

پێم دەڵێن مەحبووبە خێڵ و قێچە مەیلی شەڕەکا

خێڵ و قێچە یا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکا [٢٠٩ : ٥٤]

لەم دێڕی یەکەمەدا هەر دوو جۆرە (ر) هاتوون. لە (شەڕ) قەڵەوە و لە(سەر) لاوازە. وشەکانی تری سەروا ئەمانەن (دل پەیکەر، نیلوفەڕ، شەڕ، باوەڕ، دەفتەر، سەر). ئەم دیاردەیە لای زۆربەی شاعیرانی کلاسیکی دوبارە دەبێتەوە، حمدی (ل٤٥، ٢٢٥)، سالم (ل٤٧)، خادیم(ن، ١٣٥)، تاهیر فوئاد (ل٢٨)، پرتەوی هەکاری (ل١٠٧)، مەحوی (ل ١٣٠ ...).

ئەم کەم و کورتییەی جیاوازی دەنگە لەیەک نزیکەکان لە سەروانناسی عەرەبیدا بە (الاکفاء)[56] ناسراوە.

---

(56) (الاکفاء) و (الاجازە - الاجارە) کە بریتین لە جیاوازی دەنگی ڕەوی، لەگەڵ زاراوەی تری وەك (الاقواء) - جیاوازی حەرەکەی ڕەوی لەنێوان کەسرەو زەممە -و الاصراف- جیاوازی حەرەکەی ڕەوی لە نێوان فەتحە و زەممە، وەك زاناکانی سەروانناسی عەرەبی لەسەری ڕێك کەوتوون، لەسەرەتادا زۆر جار لای زاناکان تێکەڵ دەکران و یەکێ دەخرایە شوێنی ئەوەی تر بۆ نموونە، ئیبن ڕەشیق لە (العمدە)دا دەڵێ (لای زۆربەی زاناکان جیاوازی ئیعرابی سەروا (اقواء)ە ... بەڵام ئیبن عوبەیدە و ئەوانەی قسەی ئەو دەڵێنەوە وەکو ئیبن قوتەیبە ئەمە بە (اکفاء) ناو دەبەن و بەلای ئەوانەوە (اقواء) نەمانی تیپێك یا گۆڕینێتی لە عەرووزی دێڕدا) [٢٤٦ : ١٦٥] ئینجا دەڵێ (لای زۆربەی زاناکان (اکفاء) هەر (اقواء) خزیەتی، وەکو ئەبو عەمری کوڕی عەلاء و خەلیل و یونس بن حەبیب، ئەمە قسەی ئەحمەدی کوڕی یەحیای پهلەبە) هەروەها دەڵێ (فیراء دەڵێ : بەقسەی خەلیل (اجازە) ئەوەیە سەروایەك طاء بێ یان دال، ئیبن کیسان دەڵێ پێناسەکە لای (ابو عبداللە) دەبێ بە (اصراف) (ئیسرافیش وەکو (اجازە) لای ئەبو عەبدوڵلای شێخمان ئەوەیە سەروایەك دال بێ و یەك طاء) ل١٦٧. ئیبن عەبد ڕەبیە، لە (العقد الفرید) دەڵێ (لای هەندێ زانا (الاقواء) و (الاکفاء) یەك شتن، هەندێکیش (اقواء) تایبەتی دەکەن بە عەرووز نەك زەرب (اکفاء) و ( ایطاء )تایبەت دەکەن بە زەربی نەك عەرووز[٢٤٨ : ٣١٣-٣١٤] ئینجا دەڵێ : (یونس لای وایە (اکفاء) لای عەرەب (اقواء)ە. هەندێکیش بە گۆڕینی سەروای دادەنێن وەکو هێنانی عەین و غەین، کەچی خەلیل ئەمە بە (اجازە) ناو دەبا و ئەبو عومەر دەڵێ جیاوازی ئیعراب سەروایە بە کەسرەو زەممە و فەتحە، (اجازە) لای هەندێکی تر کۆبوونەوەی زەممە و کەسرەیە لەسەروا و (اجازە) تەنیا لەوە دەبێ کە (هاء)ی وەسلی وەستاو بێ) [٢٤٨ : ٣١٤]. (اکفاء لای هەموو شیعر ناسان جیاوازی سەروایە بە کەسرەو زەممە تەنیا ئەوە نەبێ کە یونس باسی کردوە) [٢٤٨ : ٣١٤]. لەبارەی تێکەڵ کردنی (اکفاء) و(اقواء) ئیبن کیسان دەڵێ (هەندێ کەس گۆڕانی مجری (حرکەی ڕەوی) بە (اکفاء) دەزانن و هەندێك بە (اقواء) [٣٧٢ : ٢٥] ئینجا دەڵێ (کەچی (اقواء) بریتییە لە گۆڕینی سەروا ) و هەندێ کەس ئەمە بە (اکفاء) ناو دەبەن، لەکۆتاییدا لای ئیبن کیسان زاراوەکان پێچەوانە دەبنەوە (جیاوازی ڕەوی (اقواء) وجیاوازی حەرەکەکەی (اکفا)یە) [٣٧٢ : ٢٩].

٢- جیاوازی دەنگی پێش ڕەوی :

مەبەست دەنگی پێش ڕەوی داخراوە (نەبزوێن)، چونکە ئەگەر ڕەوی کراوە (بزوێنی درێژ) بێ، دەنگی پێشەوەی هەرچی هەبێ گرنگنییە، لەبەر ئەوەی خۆی بێ یارمەتی هیچ دەنگێکی تر دەتوانی لەنگەری سەروا ڕابگرێ.

دەنگی پێش ڕەوی، بۆی هەیە بزوێنی کورت، یان درێژ، یان نەبزوێن بێ.

ا- گۆڕانی بزوێنی کورتی پێش ڕەوی : بزوێنی کورت لە کوردیدا بە زۆری (ە) ، (ی) ، (و)، بزرۆکە دەگرێتەوە. بەپێی بۆچوونی عەرەبی بێ ئەمانە دەبن بە حەرەکەی تیپی پێش ڕەوی (التوجیە). لە شیعری کلاسیکی کوردیدا - تێکەڵ کردنی ئەم بزوێنە کورتانە زۆر جار دووبارە دەبێتەوە، کە ئەمە نابێ، چونکە لانی کەم دەبێ نەبزوێنی (ڕەوی) و بزوێنی پێشەوەی یەك بن. بزوێنەکە با کورتیش بێ ئاوازەکە ڕادەگرێ، لەنگبوونی ئاوازەکە لە ئەنجامی گۆڕانی بزوێنە کورتەکە یەکێکە لە کەم و کورتییەکانی سەروا، بۆ نموونە خادیم دەڵێ :

سەبا سروەت بێ بەسەر جان و دڵ
مژدەی بە هاریش بدە بە بولبول [٧٥ : ١٦٤]

وشەکانی تری سەروا بریتین لە : (چڵ، سونبول، بولبول، گوڵ، قەرەنفل، مول)، وەك دیارە بزوێنی سەروا (پێش دوانە بزوێن) هەمووی یەك نییە، لەنێوان (و) و بزرۆکە دایە. ئەمە لای ئەسعد مەحوی (ل٩، ٤٩) و سالم (ل١١٢، ١٤٠، ١٤٤)، خادیم (ب١ ل١٠٦، ١٦٤)، ئەسیری (ل٦٧)، ئەحمەد مختار (ل٧٥، ٧٦)، حەمدی (ل٢٨٨)، مەحوی (ل٢٨٣)، دووبارە دەبێتەوەو لەسەرواناسی عەرەبیدا بە (سناد التوجیە) ناسراوە. لەبارەی ئەم جیاوازییەی بزوێنی کورتی پێش ڕەوی، کەریم شارەزا لەبارەی دێرە شیعرەکی حاجی کە ئەم جۆرە کەم و کورتیەی تێدایە، دەڵێ:

(ئەم حاڵەتەش کزییەك دەدات بە شیعرەکەو هونەری سەرواکەی) [٢٣٣ : ٢٤٤].

ب- گۆڕانی بزوێنی درێژی پێش ڕەوی نەبزوێن :

• (وو ــــ ۆ) : خادیم دەڵێ :

ئەمانەی عاشیقن دیارە بەڕەنگ وچەهرە مەعلوومن
ئەمانەی مونکیری عیشقن کەرو هەم جاهیل و شوومن [٧٥ : ١٩٩]

لەم شیعرەدا (ن) پاش ڕەوییەو ڕەوی (م)ە، بزوێنی پێش ڕەوی لەم دوولەتەدا بریتییە لە(وو)، بەڵام ئەم بزوێنە، کە دەبێ تا سەر پەیڕەو بکرێ، لەهەندێ دێردا دەگۆڕێ بۆ (ۆ)، وەکو لە وشەکانی تری سەروادا دەردەکەوێ : (مۆمن، مەحکوومن، مەحروومن، ڕۆمن، مەزلوومن، مەعسوومن، مەعلوومن، نۆمن) دیارە ریدف لە نێوان (وو،ۆ)دایە کە ئەمە ئیقاعی سەروا دەشکێنێ. ئەم گۆڕانە

لە شوێنی تر و لای شاعیرانی تریش هاتوە: خادیم(ل١٣٤، ١٣٨، ١٧٣، ٢٧٣)، شاهۆ (ل٢٢)، دڵدار (ل١٨٠)، شێخ ڕەزا (ل٢٨)، حەمدی (ل٢٠٨)، گۆران (ل٤٦).

• (ۆ ـــــ وە) : ئەگەرچی لەزۆر حاڵەتدا دەنگی (ۆ) لە (وە) یان (ەو) پەیدا دەبێ. وەکو ڕەوشەن ـــــ ڕۆشن. کەون ـــــ کۆن ... بەڵام مەرج نییە ئەمە لەهەموو وشەیەکدا ڕوویدابێت، بۆیە نەبیسراوە مەفەووەز ببێ بە مەفەوۆز بەتایبەتیش کە (و)ەکە موشەددەدە. شیعرێکی مینە جاف لەنگی لە ڕیدف تێدایە، لەسەرەتاکەیدا دەڵێ :

شەهاب یارەب، کە ئەم جەژنەت مویارەك بێت و پیرۆز بێ

هەسێرەی بەخت و ئیقبالت وەکو خۆر پرتەو ئەفرۆز بێ[٢٠٥ : ١٨٧]

جگە لەم دوو وشەیەی سەروا (پیرۆز، پرتەو ئەفرۆز)، لەدوو دێری تردا دوو وشەی تری هێناوە (نەورۆز، مفەوەز) - وشەی مفەوەز لە ڕیدفدا لەگەڵ سێ وشەکەی تر یەك ناگرێتەوە.

• (ێ ـــــ ی) : سایێری لە شیعری (شیوەن کە ئەی دڵ)دا، (ێ-ی) کردوە بە ڕیدفی وشەکانی سەروا، لەسەرەتادا دەڵێ :

مانەمە، شیوەن کە ئەی دڵ چاوە ئەمجا بێرەتێش

وا دلارامم ئەکا عەزمی سەفەر ڕێی هاتە پێش[٩٨ : ٩٣]

وشەی سەروای دێرەکانی تریش ئەمانەن : (تێش، خویش، نیش، ڕیش، سریش، پێش ...) وەك دیارە لەم وشانەدا (تێش، پێش) ڕیدف (ێ) یە و لەمانەش (خویش، نیش، ڕیش، سریش) (ی)یە.

• (وو ـ ۆ ـ ی ـ ێ) : مەلا وەسمان لە شیعری (بەخاتری خاڵت)دا ڕیدفی بەچوار جۆر گۆڕیوە کە ئاوازەکەی تەواو تێك داوە، دێری یەکەمی ئەمەیە :

بەخاتری خاڵ و زوڵفت (ڕیشەیی) دڵ

دەسا مەشکێنە توخودا (شیشەیی) دڵ[٢١٣ : ١٠٢]

لێرەدا (دڵ) پاش سەروایە و (ی) پاش ڕەویە و بۆ پێکەوە بەستنی دەرخەرو دەرخراو هاتوە. سەروا لەم دوو وشەیەدا (ڕیشە، شیشە) ڕێکە، ڕیدف (ی) و نەبزوێنی (ش) ڕەوییە، بەڵام لە دێرەکانی تر وشەکانی سەروا ڕیدفیان دەگۆڕێ : (تووشە، تیشە، خۆشە، پیشە، ئەندێشە، بێشە). وەك دیارە ڕیدف بەسەر (ی، ۆ، وو، ێ)دا دابەش بوە.

• (ا ـ ی) : میهری لە شیعری ژمارە (٢)ی نیشتمانی و نەتەوایەتیەکانی سەرواکانی هەموو (الم) هێناوە کە (م) پاش ڕەوییە و (ل) ڕەوییە و (ا) ڕیدفە، بەڵام لە دێری پێش کۆتاییدا کردوویە بە (یلم) واتە ڕیدفی گۆڕیوە، لە دێری یەکەمدا دەڵێ:

وەتەن ، بۆتۆ بەدایم من دەنالم
وەتەن، بۆتۆ پەشێوە وەزع و حالم [٢٠١ : ٢٧]

وشەکانی سەروا ئەمانەن (دەنالم، حالم، مەلالم، خەیالم، نیهالم، کەمالم، دەلالم، جەمالم، زەوالم)

کەچی لە دێری پێش کۆتاییدا دەڵێ :

خەلان و روست و زینو شاخی هەلگورد
بە قوربانی ئەوان بێ ، رووی نیلم [٢٠١ : ٢٨]

ئەم گۆڕانەی بزوێنی دێری پێش ڕەوی لە شیعری عەرەبیدا بە (سناد الردف) ناسراوە کە یەکێکە لە کەم و کورتییەکانی سەروا.

ج- گۆڕانی قەید، کە دەنگی نەبزوێنی وەستاوی (زەنتەدار) پێش ڕەوی نەبزوێنە، بۆ نموونە: خانیم دەڵێ :

بکا هەر کەس لەشەودا چاوەڕێی ئەمر
ئەبینێ پرتەوی جیلوەی شەوی قەدر[٧٥ : ١٣٧]

لێرەدا وشەی (ئەمر، قەدر) کە وشەی سەروان و ڕەوییان (ر)ە، قەیدیان جیایە لە یەکەم(م) و لە دووەم (د)ە. ئینجا بزوێنی کورتی، پێشەوەیان یەکە، ئەم قەیدە لە وشەکانی تریشدا گۆڕاوە کە ئەمانەن : (فەجر، عەتر، فەخر، قەدر، سەبر، جەهر، ...) قەیدەکان (ج، ت، خ، د، ب، ه) یەک نین. ئەمە یەکێکە لە کەم و کورتییەکانی سەروا. یەک قەید لەسەرپای هۆنراوەیەکدا جیا بێ بەعەیب دانانرێ چ جای هەموو قەیدەکان جیابن. حەمدی لە دوو هۆنراوەدا، رێگای بەم عەیبەداوە بکەوێتەوە ناو هۆنراوەکانی، یەکەم لە هۆنراوەی (نە عەقلم پێ دەمێنێ... )[٦ : ٢٥١]. کە (٦) دێڕە و دێری یەکەمی موسەڕڕەعە واتە (٧) سەروای هەیە، ڕەوی (ض)ە لەمانە پێنجیان قەیدیان (ر)ە (غەرض، عەرض، فەرض، قەرض، ئەرض) و دوانیان قەیدیان (ب)، (قەبض، نەبض) کە ئەمە تەنگیە بۆسەروا. هۆنراوەی دووەمیش ئەوەیە (لەگەڵ ئیدراك و ... ) دەست پێ دەکا[٦ : ٢٦٤]. (٥) دێری یەکەمی موسەڕڕەعە. ڕەوی (ف)ە و هەموو قەیدەکانی (ر)ە : ( ظەرف، صەرف، بەرف) تەنیا لە دێری کۆتایی قەید بوە بە (ل) : (ئەلف).

خانیش لە دێرە شیعرێکدا وشەی (لفظ، قرض)ی کردوە بە وشەی سەروا [٣ : ٣٢].

جگە لەوەی ئەم دوو وشەیە ڕەوییان جیایە، قەیدیشیان یەک نی یە (ف،ر).

وا دەبێ قەید لە وشەیەکی سەروادا هەبێ و لە وشەیەکی تردا نەبێ. پیرەمێرد دەڵێ :

ئاوە جوانەکەی سەرچاوەی زەلم
بۆچ بەهار لێلی و پایز سەربەتەم [٤٣ : ١٧٤]

وشەی یەکەمی سەروا (زەڵم) قەیدی لەگەڵ هاتوە (ل)، ئەم قەیدە لە وشەی دووەمی سەروا (ئەم)دا نەهاتوە.

د- گۆڕانی ئەلفی تەئسیس : ئەلفی تەئسیس لەو دەنگانەیە، ئەگەر شاعیر لە دێڕی یەکەمدا لە وشەی سەروادا هێنای دەبێ لە هەموو وشەکانی سەروای هۆنراوەکەیدا هەبێ، ئەگەر لە یەکێکیاندا نەبێ بە کەم و کورتی دادەنرێ و پێی دەگوترێ (سناد التأسیس) واتە یەکێتی تەئسیسی نییە، لەسەروادا لە نێوان بوون و نەبوون دایە کە ئەمە نابێ.

پرتەوی هەکاری، لەشیعری (بەچین و حەلقە و ....)دا سەروای بە تەئسیس و بێ تەئسیسی هێناوە، ئەمە لە دێڕی یەکەمدا دیارە :

ب چین و حەلقە و تاب و موسەلسەل
کولاه و توررەوو جعدو زولف و کاکول [٤٠ : ١٥٧]

ئەگەر بە موسەڕڕەعی دانابن، جیاوازی ئەم دوو وشەی سەروایە (موسەلسەل، کاکول) لە دوو لاوەیە : ١- یەکەم تەئسیس نییە، دووەم تەئسیسە. ٢- تێبی بزوێنی کورتی پێش ڕەوی جیایە (سناد التوجیە)، با سەیری وشەکانی تری سەروای هەمان هۆنراوە بکەین : (بولبول، دڵ، گوڵ، کول، مل، شەمائیل، بیسمیل، حەمائیل، حاسیل، موشکیل).

ئەم وشانەی سەروا کە ڕەوییان (ل)ە، جگە لە بەناو یەکدا چوونی هەردوو جۆرە (ل/ڵ)، هەندێکیان ئەلفی تەئسیسیان هەیە (شەمائیل، حەمائیل، حاسیل، کاکول) و هەندێکیان نیانە (بولبول، دل، گول، مل، کول، بیسمیل، موشکیل)، جگە لەوەی کە بزوێنی پێش ڕەویش لە هەموویان دا یەك نییە، لە نێوان (ی، و، بزرۆکە) دایە. ئەم دیاردە ناتەواوە لای سالم (ل٦٥)، نالی (ل٥٤)، مەلا وەسمان (ل٨٦)، حەمدی (ل٢٤٨)دا هاتوە.

هـ- گۆڕانی ئیشباع : ئەو دەنگەی لەپاش ئەلفی تەئسیس دێ پێی دەگوترێ (دەخیل). دەشێ لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەمان دەنگبێ و دەشێ لە سەروایەکەوە بۆ سەروایەکی تر بگۆڕێ بەڵام نابێ حەرەکەکەی بگۆڕێ کە پێی دەگوترێ (الاشباع)، ئەگەر بگۆڕێ بەعەیب دادەنرێ و ئەم عەیبە لە سەرواناسی عەرەبیدا بە (سناد الاشباع) ناسراوە. بۆ نموونە لە شیعرەکەی پێشەوەی پەرتەو، ئەو وشانەی تەئسیسیان هەیە (کاکول، شەمائیل، حەمائیل، حاسیل)، ئیشباعیان کەسرەیە تەنیا (کاکول) بۆتە (زەمە)، ئەمەیش نەنگییە بۆ شیعر دەبێ شاعیر خۆی لێ لادا.

٣- گۆڕینی بنیادی وشەی سەروا بۆ ئەوەی لەگەڵ وشەکانی تری سەروادا بگونجێ :

- کرتاندنی دەنگێك یان چەند دەنگێکی کۆتایی وشە، وەکو نالی لە شیعری (پێچەیی پەرچەمی یو...)دا، ئەلفی کردوە بە ڕەوی. وشەکانی سەروای ئەمانەن : (شیا، تیا، زیا، گیا، حەیا، قیا، بیا،

چیا، ریا، ژیا)، هەموو وشەکان مانایان دیارە بەڵام (قیا) بە ڕوونی کەس نازانێ چیە، چونکە لە کوردیدا نییە، بەڵام کە دێرە شیعرەکە دەخوێنینەوە، پێش ئەوەی بگەینە وشەکە دەزانی وشەی (قیامەت)ەو (مەت)ی قرتاوە، هەم لەبەر ئەوەی کێشەکە ئەم برگە درێژەی کۆتایی هەڵناگرێ و هەم سەرواکەش لەگەڵ (ا) دێ نەک (ت):

مەمخەرە هاوییەیی هەولی فیراق

دەستی من دامەنی تۆ ڕۆژی قیا [٢٠٩ : ٥٢]

هەمان وشەی کرتاو (قیا) لەباتی (قیامەت) لای ویسالی دوبارە بۆتەوە [٢١٦ : ١٢٩].

- بێدار لە شیعرێکدا (د)ی وشەی (زیاد)ی کرتاندوەو کردوویەیە (زیا) تا لەگەڵ کێش و سەروای شیعرەکەی بگونجێ:

ئێستاش چ حەقت لای من نەماوە

خوار باشت وەرگرت گەلێکیش زیا [١٢٥ : ٢٢٥]

شیعرەکە (تونتەوان) (٧) بەندە، ئەم بەندەیان (١٠) دێرەو ڕەوی (ا)یە، هەر ئەم ڕەوییەشە ناچاری کردوە (د)ەکە فڕێ بدا تا (زیا) بمێنێتەوە و لەگەڵ سەروای دێرەکانی تر بگونجێ.

- ویسالی لە شیعرێکدا، کە بە (ڕۆژو شەو قوربان ...) دەست پێ دەکاو (٩) دێرەو موسەڕڕەعە، (١٠) وشەی سەروای هێناوە بە ڕەوی (ن) کۆتاییان دێ. ئەگەرچی لە هەندێ وشەدا بزوێنی کورتی پێش ئەم ڕەویە لە نێوان (ە، یـ، بزرۆکە) لە گۆڕاندایە، جگە لەم کەم و کورتییە، کەم و کورتیەکی تریش ئەوەیە لە دێری کۆتایی پێویستی بەناوی (ویس القرنی)یەو بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕەوییەکانی تری بگونجێ (ی)ی لێ کرتاندوەو نووسیویە (وەیسی قەرەن):

ئەی ویسالی مژدە بێ خوا ویسعەتی خستە ولات

زەیفەتی ڕۆیی بە ئیزنی حەزرەتی وەیسی قەرەن [٢١٦ : ٢٩٤]

- گۆڕان لەدوا دێری موستەزادی (بەردە نووسێك)دا کە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| یان دایکی دڵسۆزم وێرای بەبێ شەرم | بۆ جوانە مەرگی |
| وەك دایکان شیوەنێك بگێڕی بە گەرم | ڕەش کا بۆی بەرگی ؟ [١٧٣ : ٢١١] |

لەلەتی دوەمدا، (شیوەنێك بگێڕێ بەگەرمی) ڕاستە نەك (بەگەرم)، ئەمە ئاوەڵکارە (adv.)، وەکو (بەچاکی، بەخراپی، بەمەردی، بەسووکی، بەچاپووکی...) فڕێدانی (ی)یەکە هەر بۆ ئەوەیە کە (گەرم) لەگەڵ (شەرم)دا ببێ بەسەرواو لە ڕەوی (م)دا یەك بگرنەوە، ئەگینا لە ڕووی مۆرفۆلۆجییەوە تەواو نییە، چونکە کورد وای بەکار ناهێنێ.

حاجی لە شیعرێکدا بۆ جەخت کردنی نەهی لە وشەی (نەکەن)دا (ەن)ی کۆتایی فڕێداوە. تا

لەگەڵ ڕەوی شیعرەکە بگونجێ، بەڵام ئەم جۆرە کرتاندنەی کۆتایی فەرمانی نەهی، بۆ جەخت کردن و بێزارییە، دەڵێ :

سەلاحی ئێوە ئێستاکە سیلاحە
تەماعی گەورەیی بێ چەك نەکەن، نەك [٦٠ : ٧١]

بۆیە وای کرتاندوە تا (نەك) لەڕووی سەرواو ڕەوییەوە لەگەڵ وشەکانی تری سەروای هۆنراوەکە ڕێك بکەوێ (یەك، لەك، بەرمەك، لەك لەك، شەك، نۆشەك).

ئەم جۆرە نەنگییە لەسەروانانسی عەرەبیدا بە (الشلیم) ناسراوە.

دووەم : کەم و کورتی زمانەوانی و فەرهەنگی :

لە بواری زمانەوانی و فەرهەنگییەوە هەندێ کەم و کورتی دەکەونە ناو سەروا، دەیشێوێنن و شیعرەکەی پێ دزێو دەکەن، بۆیە دەبێ شاعیر خۆیان لێ بە دوور بگرێ. ئەمەیش هەندێ لەم جۆرە کەم و کورتیانە :

١- ئیتا: وشەیەك ئەگەر بەهەمان شێوەو ماناوە لە دوو لەتە دێر یان لە دوو دێر دوبارەبێتەوە، نابێ بەسەروا، شاعیری چاك ئەوەیە ئەگەر ناچار بوو وشەیەك دووبارە بکاتەوە بیکاتە پاش سەرواو وشەکانی پێش ئەو بکاتە سەروادار، با تەنیا لەمەودای یەك دوو دێریشدا بێ. (دووبارە بوونەوەی وشە بەهەمان شێوەو ماناوە بۆ سەروا تەنیا لە دێری یەکەمدا، لەهەردوو لەتدا ڕێگای دراوە) [٢٨٢ : ١٠٨]. ئەویش کە تەسریعە و مەرج نی یە هەمیشە نیوەی یەکەم هاو سەروای نیوەی دوەم بێ. نموونەی ئەم دوبارە بوونەوەی وشەی سەروایە، وەکو : ئەسعەد مەحوی دەڵێ :

گورگی دوو پێ هێندە زۆرە، گورگی چوار پێ کەم بووە
پیاوی غەمخۆری نەماوە ، بۆیە غەم بێ خەم بووە
عەقلی چی ؟ دانش چییە ؟ بێ دانشی باوی هەیە
باری کرد شەرم و حەیا ئەم عالەمە بێ خەم بووە [١٦ : ٨٨]

هەندێ وشەی سەروای دێرەکانی تر ئەمانەن : (بێ دەم بوە، زەم بووە، چەم بوە...) واتە پاش سەروا تەنیا (بووە)یە، (بێ خەم) لەم دوو دێرەی سەرەوەدا وەکو خۆی دوبارە بۆتەوە، ئەمە نەنگییە. ئەم جۆرە نەنگییە لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ (الایطاء). لەبارەی (الایطاء)ەوە زۆر ڕاو بۆچوونی جیاجیا هەیە، ئایا شاعیر نابێ هەر هیچ وشەی سەروا دوبارە بکاتەوە، یان بە پێی دەستوورو مەرجی تایبەتەوە دەتوانێ دوبارەی بکاتەوە. لەم بارەیەوە زاناکانی سەروانناسی بۆچوونیان جیایە.

بۆیە دوبارە کردنەوەی وشەی سەروا ڕاستەوخۆ لە دوو دێری دوای یەك یان لەیەك نزیك، بەعەیب زانراوە چونکە کراوە بە بەڵگەی بێ دەسەلاتی شاعیر و زاڵ نەبوونی بەسەر فەرهەنگی

زمانەکەی، بەڵام خۆ هەموو جارێ دوبارە کردنەوەی وشەی سەروا لە ئەنجامی وشك کردنی دەرهەنگی شاعیرو بێ دەسەلاتی نییە، زۆر شاعیری گەورەو زمانزان و بەتوانا وشەی سەروایان دووبارە کردۆتەوە. جگە لەوەی شوێن هەیە دوبارە کردنەوەی دەوێ، لەو حاڵەتانەدا نیشانەی بێ دەسەڵاتی شاعیر نییە و شیعرەکە ناشکێنێ بەڵکو بەهێزتری دەکا. شاعیر زۆرجار کە وشەیەك دووبارە دەکاتەوە لەباری خۆیەوە سەیری دەکا بۆیە وا دەکا چونکە لەناخەوە هەست دەکا هێزێك هەیە لەکەش و هەوای شیعرەکەو هەڵڕژانی تاقی کردنەوەکەی پاڵی دەدا وشەیەك دووبارە بکاتەوە وچێژو ئێزخەی دەروونی لە گوتن و بیستنی دەبینێ بۆیە دەستی پێوە ناگرێ و نایگێڕێتەوە، وەکو وشەی خوا، پێغەمبەر، بۆ شاعیرە سۆفییەکان، ناوی یار بۆ عاشیق، یان کاتێ کە شیعرەکە داشۆرین بێ، دووبارە کردنەوەی جوێنەکەیان ناوی کابرا لە شوێنێکی بەهێزی وەکو شوێنی سەروا کاریگەرەکە بەهێزتر دەکا. عبداللە الطیب المجذوب دەڵێ : (بەشێوەیەکی گشتی ڕێ نەدان بە دووبارەکردنەوە کارێکە زەوق قبولی دەکا، چونکە زەوقی ناسك هەوەسی بە دوبارە کردنەوە نایە. تەنیا ئەوە نەبێ ئەگەر هۆیەکی گرنگبەدەستەوە بێ. جەخت کردن لەسەر ئەم ڕێ نەدانە لەهەموو بارێك و هەموو بۆنەیەك، بێ گوێدانە ئەو زەوقەی دووبارە کردنەوەکە دێنێ هەڵەیەکی گەورەیە ...)[١١٤ : ٣٢]. لێرەدا نەرمییەك لە دووبارەکردنەوەی وشەی سەروا پێشان دراوە، کەچی لای یەکێکی وەکو خەلیل فەراهیدی (هەر وشەیەك ببێ بە سەرواولە سەروایەکی تر دووبارە بکرێتەوە، ئەمە -ایطاء- ە مانایان یەك بێ یا جیا)[٢١٤ : ٣٢]. واتە لای خەلیل ڕەگەز دۆزیش هەر نابێ کە دووبارە بوونەوەی وشەیە بەمانایەکی نوێ. (لە زەجەلدا کە جۆرە هونەرێکی شیعری میللی عەرەبی وەکو موەشەح وایە ئەگەر سەد دێریش بێ نابێ بەهیچ جۆرێ (ایطاء)ی تێدابێ) [٢٩٢ : ١٠٥]. جیاوازی زاناکان لەبارەی دووبارە بوونەوەی وشەی سەروا (الایطاء)، بەپێی ڕایان بەرامبەر ڕادەی هەرە نزمی دێرەکانی هۆنراوە دەگۆڕێ (الاخفش) ڕای وایە قەسیدە لانی کەم (٣) دێرەو بەسەرەوە، خەلیل لای وایە (٧) دێرە (ئەمە باوەکەیە)، ئیبن جنی دەڵێ (١٥) دێرە، فیراء دەڵێ (٢٠) دێرە، هەریەکە بەلایەوە ڕادەی هەرەکەمی دێرەکان چەند بێ، ڕێی داوە پاش ئەوەندە دێرە وشەی سەروا دووبارە بێتەوە بێ ئەوەی بە عەیب دابنرێ. هۆیەکەش ئەوەیە وا دادەنێن وەك ئەوەی وشەکە لە قەسیدەیەکی تردا دووبارە بووبێتەوە پاش تەواو بوونی ئەو مەودایەی کە قەسیدەیەکی لێ دروست دەبێ. بەکورتی ناشیرینی (ایطاء) بە پێی زوو و درەنگی دووبارە بوونەوەکە دەگۆڕێ، تا نێوان دوو وشەکە کەمتر بێ عەیبەکە گەورەترەو تا زیاتر بێ کەمترە، ناشیرینترین (ایطاء) ئەوەیە لەدوو دێری دوای یەکتر دوبارە بێتەوە و هەر بەتەنیاش نا بەڵکو لەگەڵ چەند وشەیەکی تردا دووبارە بێتەوە. لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، دیاردەی (ایطاء) گەلێ زۆرە بەتایبەتی ئەگەر مەودای دوبارە کردنەوەکە بە (٧) دێر دابنرێ، بۆ نموونە : سالم پاش یەك دێر (شیرینە پاوانەو خالخالت)ی دووبارە کردۆتەوە :

نارنجی زولەبخایە گۆی چاهی زەنەخدانت
تەوقی ملی شیرینە پاوانە وو خالخالت[١٠١ : ٥٢]

ئینجا دوای تەنیا یەك دێر دەڵێ :

بەخ بەخ لە قەدی سەروت چەند دلبەر و مەوزونە
سەیریکە چ شلێرینە پاوانە وو خالخالت

ئەگەر چی (شیرین) لەم دوو دێرەدا رەگەز دۆزیە، بەڵام دوو وشەکەی تر (پاوانە ووخالخالت) دووبارە بوونەوەیە.

سالم لە لاپەرە (١٢٩) هەروەها ل٦٤، ٧٠، ٧٤، ١٢١ دوو دێری لەدوای یەك و دێرێکی تریش هەمان وشەی سەروای دووبارە کردۆتەوە. ئەمە بۆ نموونە هەندێ شاعیر کە (ایطاء)یان بەکارهێناوە : مینە جاف (ل٢٥)، تایەر بەگ (ل١٠)، ئەسعەد مەحوی (ل٨٨، ٤٠)، خادیم(ل٢٣٦)، وەفایی (ل٨، ٩٨)، ... جاری وا هەیە شاعیر خۆی هەست پێ دەکا کە دووبارە کردنەوە (ایطاء) پەسند نی یە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شوێنەکە وا دەخوازێ دووبارەی بکاتەوە، ئیدی پێش (ایطاء )ەکە عوزری بۆ دێنێتەوە، وەکو ئەحمەد موختار جاف لەشیعرێکدا کە شەش دێرە و موسەررەعە (٧) وشەی سەروای هێناوە لەگەڵ پاش سەروای (ئەکا) و رەوییەکەی(ژ)ە. لە دێری پێنجەمدا (پێش کۆتایی) وشەی (نوێژ)ی کردوە بە سەروا، بۆ دێری کۆتایی (شەشەم) پێویستی پێ بۆتەوە، ناچار عوزری بۆ هێناوە ئینجا دوبارەی کردۆتەوە تا قسەی نەیەتە سەر :

قافیە هەر چەندە تیکرارە ، بەڵام ئەحمەد بە دڵ
هەر بەیادی تاقی ئەبرۆی تۆیە، جارجار نوێژ ئەکا[١٠ : ٥٥]

٢- سەروای شایگان : شایگان لە فەرهەنگی جامع، فارسی - ئینگلیزی بەم جۆرە لێك دراوەتەوە :

(شایگان واتە شاهـ گانە) هەر شتێ شایەنی پاشا یان پیاوی گەورە بێ، شتی زل، شتی زۆر گەورە (بەتایبەتی خەزنەی شاهانە)، ناوی یەکێکە لەخەزنەکانی خوسرەو، شتی کراوە، عەرز کراو، بەرین، فراوان، دووبارە کراوە، جەخت لەسەر کراو، شایەن، لێوەشاوە، بێگاری[٥٠٨ : ٧٢٨] جۆرە سەروایەکی تایبەتییە، دەکرێ بە دوو جۆر : (شایگان خفی) (شاردراوە) و (شایگان جلی) (ئاشکرا).

أ- خەفی : ئەوەیە کە ئەلف و نونی زەرفی حالەت وەکو گریان و خەندان، لەگەڵ ئەلف و نوونی ئەسلی وشە وەکو زەمان و مەکان بێ بەسەروا : وەکو سالم دەڵێ :

لێم گەرێن با گۆشە گیر بم دەستە ئەژنۆ کەف زەنان
گێژەلووکەی بای نەدامەت تاری کرد صەفحەی جیهان[١٠١ : ٩٧]

(کەف زەنان) واتە لەپ لە لەپ دان. ئەمە نیشانەی خەم و پەك کەوتن و مایە پووچ

دەرچوونە. (جیهان) وشەیەکی سادەیە. هەردوکیان کراون بەسەروا. یان ئەوەی کە یاو نوونی نسبەتی وەکو زیوین و ئاگرین لەگەڵ یاو نوونی ئەسلی وەکو زەمین و کەمین ببێ بەسەروا، وەکو: ئایەر بەگ لە هۆنراوەیەکدا دوو وشەی (شین) و (ئاتەشین)ی بۆ سەروا هێناوە، کە (ین) لەیەکەمدا ئەسلی و لەدووەمدا نسبەتە:

خۆم لەقوڕ بگرم بەجارێ هەر لەبێ تا تەوقی سەر
بەلکولوتفی شاهی لەولاك بێ نەجاتم دا لە شین

..................

حەسرەتا مەئیووسی شەهد و زیارەتی شوبباکی تۆم
بۆ ئەرێژم ئەشکی ئاڵ و ئاوی گەرمی ئاتەشین[٤٨ : ٣٢]

ب- جەلی: ئەوەیە کە ئەلف و نوونی کۆ وەکو یاران و دۆستان لەگەڵ (ان)ی ئەسلی وەکو گیان و... ببێ بەسەروا، حاجی دەڵێ:

ئێستەکەش فورسەتە گەلی یاران
کە پەنك بۆ چیپە لە پاشی باران[٦٠ : ٢٣٧]

زانا کۆنەکانی فارس ئەم جۆرە سەروایەیان لەیەك جار زیاتر لە غەزەل و قەسیدە نەدەهێنا و هەرکاتێ شاعیر سەروای شایگانی بهێنایە، ئیشارەی بۆ دەکرد و عوزری دەهێنایەوە (٥٧)، ئەمە لە کوردیشدا باو بوە، حاجی دەڵێ:

ئەم قافیە شایگانە ئەمما
عەیبی نییە جاهیلی بەڕازی[٦٠ : ١٥٤]

ئەمە شایگان وەکو لەفارسیدا هاتوە، لە کوردیدا جۆرێکی تری شایگان دەست نیشان کراوە: ئەو تیپانەی لە عەرەبی هەن و لەکوردی نین، بە کوردی بخوێنرێنەوە و دەنگە کوردییەکەیان لەگەڵ دەنگی تری وشەی ڕەسەنی کوردی ببێ بەسەروا، (ض، ظ، ذ) لەگەڵ تیپی غەیری عەرەبی وەکو (ز) بەك حسابیان بۆ بکرێ وەکو هەڵبەستەکەی سەرەوەی حاجی، کە ئەم وشانەی کردوە بەسەروا: (عیشقبازی، (ماضی)، مەجازی، بەیازی (بیاضی)، ڕازی، غازی (قاضی)، ڕازی، نەخوازی، دەنازی) لێرەدا (ض)ی عەرەبی لەگەڵ (ز)ی کوردی کراوە بە ڕەوی چونکە کورد بە (ز)ی دەخوێنێتەوە. [٦٠ : ١٥٥].

---

(57) ئەنوەری لە شیعرێکدا عوزر بۆ شایگان دێنێتەوە و دەڵێ:
گرچە بعضی شایگانست از قوافی باش گو
عفوکن وقت ادا دانی ندارم بس ابات[٤٩٨]

٣- تەزمین: یەکێ لە عەیبەکانی شیعری کلاسیکی، ئەوەیە سەروا ئەرکی وەستان نەبینێ، ئەمە هەڵبەت لە نرخی دەوری سەروا کەم دەکاتەوە. ئەمە کاتێ کە مانای دێرەکە بەند بێ بە دێری پاشەوەی و لەگەڵ سەروادا تەواو نەبێ، واتە یەکێتی دێرە شیعر نەمێنێ. ئەگەر چی لەبۆچوونی ڕەخنە گرانەی نوێدا، ئەوە بە چاکەی شیعر دادەنرێ کە دێرەکان سەربەخۆ نەبن و یەکێتی یان نەبێ، بەڵکو یەکێتی عوزوی بەسەر هەموو هۆنراوەدا دابەش ببێ. لەبۆچوونی کۆن دەبوایە هەر دێرەو مانای سەربەخۆی هەبێ، بۆیە پەیوەندی بوونی مانای دێر بەدێری دواوە بەعەیب زانراوە و پێیان گوتوە (التضمین). گۆران لەبەرەبەری کۆتایی (بەردە نووسێك)دا دەڵێ:

منی کچ مامزی بەندیخانەی ژین
سزای تاوانم
بەدەستی باوکی خۆم چووم بەسەر بڕین
پرچی پەخشانم
تلا لە خوێناو کەوتە سەر چاوم
ئیتر نەمبینی
لە جەرگی باوکما سەری براوم
چۆن بوو بڕینی [٢١١ : ١٧٣]

ئەمە موستەزادە، بەلام مانای دێرەکان لەگەڵ سەروا تەواو نابێ، بەسەر سەروادا باز دەدا بۆ دێری دواوە و لەوێ تەواو دەبێ.

لەبارەی ئەم عەیبەوە زاناکان ڕایان جیایە، خەلیل هەر ناوی نەهێناوەو بەعەیبی سەروای دانەناوە، ئەخفەش لەبەر زۆری بەعەیبی نەزانیوە، ئیبن کیسان دەڵێ (تەزمین عەیبێکی گەورە نیە بەلام پتەوترین قسە ئەوەیە کە سەربەخۆ بێ، ئەگەر دێرێکی شیعرەکە بەتەنێ خوێنرایەوە، ئەو مانایە بدا کە بۆی دانراوە ...) [٢٧٢ : ٢٧]

بۆیە (التضمین) بەعەیب زانراوە (چونکە سەروا شوێنی وەستان و پشوودانە، ئەگەر پێویستی بەدوای خۆی هەبێ نابێ لەسەری بوەستی، دەبێ بیخەیتە ناو قسەوە، بەشێکی زۆری زرنگەکەی دەڕوا ...) [٢٨٢ : ١١٢].

٤- تەحرید: لەبەر ئەوەی سەروا دەکەوێتە زەرب، لەشیعری کلاسیکی عەروزیدا دەبێ زەربەکان هەموو یەك بن، نابێ گۆڕانیان بەسەردا بێ. ئەگەر لەدێرێکدا زەرب بگۆڕێ کە تەفعیلەی سەروایە، ئاوازی سەرواکە دەشێوێ. ئەم جۆرە عەیبە لە عەرەبیدا بە (التحرید) ناسراوە. لە کوردیدا ئەمە زیاتر لەو کێش و قالبە کێشە عەروزیانە دەردەکەوێ کە مەخبوونی مەحزووف بن و

دوا پێیان (فاعلاتن) بێ. وەکو کێشی خەفیفی (٦)ی مەخبوونی مەحزووف، کێشی ڕەمەلی (٨،٦)ی مەخبوونی مەحزووف، کێشی موجتەسی (٨)ی مخبوونی محزووف، ئەمانە لەگەڵ مەخبوونی ئەسڵەمەکانیان تەحرید دروست دەکەن. واتە زەرب لەدێڕێکا مەخبوونی مەحزووف بێ و لە دێڕێکی تردا ئەسلەم. فاعلاتن بە مەخبوونی مەحزووف دەبێ بە (فعلن) کەسێ بڕگەیە دووی کورت و یەکی درێژ، بە سەلم دەبێ بە (فع لن) کە دوو بڕگەی درێژە. ئەم جیاوازی ژمارەی بڕگە و جۆری بڕگەی کورت و درێژە (التحرید) ئاوازو مۆسیقای سەرواکە تێك دەدا، بۆیە بە عەیب دانراوە، وەکو حاجی دەڵێ :

ئیددیعای هەر سەنایەك ناکەن
تاکو نەیخوێنن ئیمتیحانی نەکەن [٦٠ : ١٨٥]

عەرووزی لەتی یەکەم (ناکەن - فع لن) ئەسلەمی (فاعلاتن)ە، کەچی زەربی لەتی دووەم گۆڕاوە (نی نەکەن - فعلن) کە مخبوونی مەحزووفی (فاعلاتن)ە. یەکەمیان تەنیا یەك حەرەکە لەنێوان ساکنی کۆتایی و ساکنی پێشەوەی هەیە (متواترە)، کەچی دووەم (سێ حەرەکەیان بەینە) و (متراکبە) واتە دوو جۆری سەروای جیاواز لەیەك هۆنراوەدا هاتوون، ئەمە بۆ ئیقاعی تسلسلی حرکە و ساکن پەسند نییە. ئەمە لای زۆر شاعیر هاتوە. وەکو سالم (ل١٥)، نالی (ل١٣٨)، حاجی (ل٩٦).

ە- هێنانی وشە بۆ خاتری سەروا :

- وشەی سەروا دەبێ تەواو لەگەڵ شوێنەکەدا بگونجێ و مانای دێڕەکە تەواو بکا. نابێ بۆ خاتری سەروای دێڕەکانی تر هاتبێ و ماناکەی بەمەوە شێواند بێ یان ناشیرینی کردبێ. سەیرکە لەم حەیرانەدا، چۆن حەیران بێژ بۆ سەروا ناچار بوە وشەیەکی وابێنێ کەنەك مەدحی یارەکەی تێدا نەبێ (وەك ئەو دەیەوێ) بەڵکو زەم بێ بۆی :

(حەیران، ماڵ وێران چەندی گاز دەکەم گەڕی بە گەڕی ، نۆڕی بە نۆڕی،

جێکەم دیسان لە (گرەسۆری) - لەملی حەیرانێ سۆر دەکرێ مەرجان و مۆری،

بەژنی ئەو زاڵم بابەی لەبۆمن بمێنێ بەکارو کار غەزاڵەکی سۆری سۆر غەڕی، کووڕەکەی دومانگی وەکی دەلەوەڕێتەوە لە بانە بۆران، کرد وکێلی ئازیانەی، چێشتاوێ خۆی دەکاتەوە لە شاقازی، گردی قەرەبەگی ئەمان حەیران منارە لە دوو داکی دەقۆڕی) [١٩٧ : ٨٣].

وشەی (دەقۆڕی) نەك هەر جوان نییە، بەڵکو ناشیرینیشە. زۆرجار شاعیر وشەیەك دەکا بەسەروا، زەق دیارە تەنیا بۆ خاتری سەرواکە ئەو وشەیەی هێناوە، ئەگینا دەشێ هەر وشەیەکی تری لەجێ دابنرێ، ئەمەیش سەروا بەندیەکە کز دەکا، قانی دەڵێ :

بۆ نەمانی یەکتری ئامادەبین شەش سەد هەزار
بۆ شەڕی بێگانە چ بڵێم، چەندە زۆرین هەر شەشین [١٥٢ : ٧٩].

(شەش) بەمەجاز بۆ کەمی بەکار هاتوە، دەیتوانی (پێنجین، چوارین، سێین، حەوتین، هەشتین) بەکاربێنێ بەڵام کە (شەش)ی بەکارهێناوە، لەڕووی ماناوە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ژمارەکانی تردا نییە، واتە نەزانراوە وەك مەجاز بۆ کەمی کورد تەنیا شەش بەکاربێنێ، ڕاستە (شەش و حەوت) بەکاردێ بەڵام (شەش) بەتەنیا نەء ... بۆیە شەشی هێناوەتا لەگەڵ وشەی سەروای دێرەکانی تر ڕێك بکەوێ (بەش، غەش، ڕەش، مامەش، گەش، باوەش، دابەش). بەڵام بۆ چەسپاندن و جێ کردنەوەی ئەم شەشە. شاعیر فێڵێکی هونەری تری نواندووەو تا ڕادەیەك هێنانی (شەش)ی پێ پاساو داوە، ئەویش لە لەتی یەکەم دا دوژمنی بە (٦٠٠٠٠٠) شەش سەد هەزار داناوە، ئەگەر چی ئەو ژمارەیش هەر مەجازە بۆ زۆری، بەڵام ڕاگرتنی شەش بۆ کەمی بەرامبەر شەش سەد هەزار بۆ زۆری پاساوێکی تێدایە. یان میرزا غەفوور لە شیعرێکدا دەڵێ :

یا ئیلاهی بەندەیی پڕ جورم و عوسیانە (غەفوور)
تۆبەخشایی بەحەققی سوورەتی (طاها) و (طور) [٢٠٤ : ٣٧].

دەیتوانی هەر سوورەتێکی تر لە جیاتی (طاها) و (طور) بێنێ، بەتایبەتی (طور) کە سەروایە، چونکە هیچ پەیوەندییەك نییە لەنێوان ناوەرۆکی دێرەکەو ئەم سوورەتە. بەڵام کە لە هەموو سوورەتەکاندا (طور)ی هەڵبژاردوە، بۆ سەروا هێناویە تا لەگەڵ (غەفوور، سوور، دوور، لوور، حوزوور، ...) بگونجێ کە وشەی سەروای هۆنراوەکەن.

- وا دەبێ ڕیزی وشەی باوی سەرزاری خەڵك بۆ سەروا تێك بدرێ و پاش و پێش بکرێ.

کوڕەکان ئیمامی عەلی هەر بە حەسەن و حوسێن ناو دەبرێن لە فولکلۆردا هاتوە :

حەسەن و حوسێن برا بوون
لە کەندەکی کوژرا بوون

کەچی شاعیرێکی وەکو حاجی قادر بۆ سەروا ناوەکانی پاش و پێش کردوە، بە حوسێن و حەسەن ناوی بردوون، دەڵێ :

شیعی وەك تیشنە بوو لە سینە زەدەن
بەدوو قەترە دەدا حوسەین و حەسەن [٦٠ : ١٨٨].

٦- وشەی سادەو ناسادەی سەروا :

ئەو وشانەی دەبن بەسەروا، چۆن نابێ هەمان وشە بێ و دووبارە کرابێتەوە، ئاواش نابێ یەکێکیان سادە بێ و ئەوەی تر ناسادە بێ وشە سادەکە بەشی دواوەی ناسادەکە بێ. وەکو (مل) و

(هاوملی) ، (شان) و (هاوشان)، (چرا) و (چوارچرا)، (مێرد) و (هەزار مێرد). (مالێرب رێی نەداوە سەروای وا بەکار بێ کە هیچ ماندوو بوونی تەویێ بۆ دۆزینەوەی وشەی سەروا. ئەمەیان ئەو سەروایانە دەگرێتەوە کە لە وشەیەکی سادەو وشەیەکی لێکدراو دروست بووبن - وشە سادەکە بەشی کۆتایی لێکدراوەکە بێ وەکو combattre / battre یان ئەو وشانەی لە ئاوازو ماناوە زۆر لێك نزیکن وەکو compagne / montagne ..) [٣٣٠ : ٧٥] ...(وشەی سادە مەکە بەسەروا لەگەڵ وشەی لێکدراوی وا کە لەهەمان وشەوە دروست کرابێ) [٥٠٥ : ١٢٥] پیرەمێرد دەڵێ :

بولبول لە عیشقی گوڵدا بەسۆزە

سۆزەی ئێمە بۆ دایکی دڵسۆزە [٤٢ : ٢١٦]

(سۆز) ، (دڵ + سۆز) بوونەتە هاو سەروا کە پارچەی کۆتایی دوەمیان هەمان وشەی یەکەمە و وەك دوبارە بوونەوەی هەمان شت بێ، وای لێ دێ. یان وەکو :

خۆ ئەحمەد شەوقی و محەمەد عەبدە

شوعەرای عەرەب لە لایان عەبدە [٤٣: ٢٣٢]

حەمدی دەڵێ :

هەر بڕشتی زڵفی یارە ناروویی بیمار مار

هەر بەمەی دەکرێ دیارە چارەی ژەهری خومار [٦ : ٢٣١]

حەمدی لەلەتی یەکەم (مار)ی هێناوە بۆ سەرواو لە دوو دێری کۆتاییش (ژەهرەمار) و (سووسەمار)ی هێناوە، (مار) لەهەر سێکیان دایە کە لەیەکەم ناوێکی سادەیە لە دووەم و سێیەمدا بەشی دووەمی ناوی لێکدراوە، بەڵام هەر بەمانای ماری پێشووە، ئەم جۆرە سەروایە پەسند نییە.

# ئەنجام

لەم لێکۆڵینەوە شیکاری و بەراوردەی سەروای شیعری کوردی دەگەینە چەند ئەنجامێك، گرنگترینیان ئەمانەن :

- سەروا، ڕەگەزێکی بنیادی شیعرە. نەك هەر لە کوردیدا، بگرە نزیکەی لەهەموو زمانێکدا هەبوە وهەیە، بەڵام شوێنی هاتن و چۆنیەتی بەکارهێنان و ڕادەی بایەخ پێدانی بەپێی زمان و سەردەم و شاعیر دەگۆڕێ. هەر نەتەوەیەك بەپێی خەسیەتی تایبەتیی فۆنۆلۆجی زمانی خۆی و قۆناغی پێشکەوتنی ئەدەب و ڕۆشنبیری گشتی و بەپەیوەندە ڕانستییەکانی تر جۆرە سەروایەکی تایبەتی بەرهەوکردوە، وەکو هاوبزوێنی و هاونەبزوێنی و کۆنسۆنانس و دەنگە لاسکە و... نیمچە سەرواو سەروای مونەناویب و مونەعانیق و... و بڵاوکردنەوەی کۆمەڵەی دەنگی (التجمعات الصوتیە) بە سەراپای دێرو هۆنراوەدا.

- سەروا هەر لەگەڵ گەلاڵە بوونی شیعر چەکەرەی کردوە، لای هیندی کۆنی و یۆنانی کۆن و بابلییەکان سەروا هەبوە بەڵام بەجۆرێکی سەرەتایی و تایبەتی بەخۆیان.

- سەروا وەکو دیاردەیەکی دەنگی و مۆسیقی، خۆی لە دووبارە بوونەوە دەنوێنێتەوە ولەگەڵ کۆمەڵێ ڕەگەزی تر دەکەوێتە کارلێك و بەهەموویان ئاوازی شیعرەکە تێرتر و سفت و خەستتر دەکەن.

- سەروا (بەتایبەتی دەنگی کۆتایی) بۆتە هۆیەك بۆ پۆلێن کردن و ڕێکخستنی شیعری کلاسیکی، کە یەکێتی سەروای تێدایە، لە دیوانەکاندا، ئەمە یارمەتی ساغ کردنەوەو بەراوردکردنی شیعری شاعیرەکان دەداو ڕێگا خۆش دەکا بۆ چوونەوە سەر شیعرەکان.

- سەروا لەگەڵ ڕەگەزی تری وەکو کورت و درێژی کێشی لەت و دێرەکان، شکڵێکی هەندەسی بە هۆنراوە دەدا و نەخشەی تۆپۆگرافی هۆنراوەکە لەسەر لاپەڕەدا دەکێشێ.

- سەروا، لای هەندێ وەکو کۆت وابوە ڕێگای لەدەربڕینی سەربەستانەی شاعیر گرتوە، بۆیە داوای نەهێشتنی ئەو کۆتەیان کردوە. ئەم داوایە زیاتر لەسەدەی ڕابردووەوە دەستی پێکرد ولەم سەدەیەدا گەیشتە پۆپە، لە کوردیدا ئەم بۆچوونە زیاتر لە بیستەکانی ئەم سەدەیە و بەدواوە کەوتە ئاراوە.

- سەروا بەپێی بەکارهاتن و گەشەسەندنی زۆر جۆری جیاجیای لێ کەوتۆتەوە و دەکرێ لەچەند ئاست و ڕوانگەی جۆراو جۆرەوە پۆلێن و دابەش بکرێ وەکو ئاستی دەنگو وشەو ڕوانگەی ئاسۆیی وستوونی.

- وادەبێ شاعیرێك دەوری سەرەکی بووبێ لە داهێنان یان چەسپاندنی جۆرە سەروایەکی

تایبەتی، ئیتر ئەو جۆرە سەروایە بەناوی ئەوەوە بڵاو بۆتەوە وەکو سەروای پترارکی و لیۆنی و شەکسپیری و سپنسەری و خەیامی و....

- سنووری سەروا لەهەموو زمانێکدا وەکو یەک نییە. لەکوردیدا سەروا لە ئاستی وشەدا سێ خانەدا دەگرێ (وشەی سەروا، پاش سەروا، پێش سەروا)، لەئاستی دەنگیشدا سێ بوار دەگرێتەوە (ڕەوی، پێش ڕەوی، پاش ڕەوی).

- سەروا بەبێ وشەی سەروا نابێ، بەڵام مەرج نییە پاش سەرواو پێش سەروای لەگەڵدا بێ کە زۆر جار تەنیا بۆ قووڵ کردنەوەی مۆسیقای سەروا دێن.

- گرنگی وشەی سەروا لەوەدایە کە دەنگەکانی سەروای لە کۆتاییەوە دێ، هەروەکو لە شوێنەکەیشیدایە کە کۆتایی دێرە، ئەگەرچی دەشێ لەناوەڕاست و سەرەتایی دێریش بێت بەڵام شوێنی سەرەکی و ئاسایی خۆی کۆتاییە.

- وشەی سەروا لە ڕووی ئاوازو پەیوەندی تەعبیرییەوە لە هەموو ئاستەکانی زمان کار دەکات و لەگەڵ وشەکانی تری هەمان دێر و هەموو هۆنراوەکە دەکەوێتە پەیوەندی دەلالی و جوانکاری و ئیحائییەوە.

- پاش سەروا لە کوردیدا زۆر چالاکانە دووبارە دەبێتەوە. ڕێژەیەکی زۆری شیعری کلاسیکی کە یەکێتی سەروای تێدا پەیڕەو کراوە (٢٢.٥٪) پاش سەروای هەیە.

- پاش سەروا لەگەڵ هەموو جۆرە هۆنراوەیەکدا دێ، لەکوێ سەروا هەبێ دەشێ پاش سەروا بۆ خۆی ڕابکێشێ.

- پاش سەروا دەشێ وشەیەک یان دەستەواژەیەک یان ڕستەیەک و بگرە ڕستەیەکیش زیاتر بێ. دەشێ هەربەشێکی ئاخاوتن بێ : ناو، کار....

- هەندێ جار وشەی سەروا و پاش سەروا سنووری نێوانیان هەڵدەگیرێ. وادەبێ لەسەراپای هۆنراوەیەک یەک دێر بێ پاش سەروابێ، هەروەکو دەبێ تەنیا یەک یا چەند دێرێک پاش سەروایان هەبێ...

- پێش سەروا ئەگەرچی لەکوردیدا هەیە بەڵام بەقەد پاش سەروا چالاک نییە. بەزۆری لەمەسنەویدا دەردەکەوێ کە مەودای کورتە، لە غەزەل و قەسیدەدا نەکەوتۆتە بەرچاو.

- جاری وا هەیە (وشەی سەرواو پاش سەروا و پێش سەروا) سەراپای لەت یان دێرە شیعر دەگرنەوە و یەک پارچە ئاوازی تێکچڕژاوی لە هاو دەنگیی جۆراو جۆرەوە لێ دروست دەکەن و هەموو وشەکان بەسەر ئەم سێ خانەدا بڵاو دەبنەوە.

- لە دەنگەکانی سەروا، ڕەوی لە هەموویان گرنگتر و سەرەکی ترە. ڕەوی دەشێ دەنگێکی بزوێن

بێ یان نەبزوێن. ئەگەر بزوێن بێ دەبێ بزوێن درێژ بێ و ئەگەر نەبزوێن بێ دەبێ لە پێشەوە بزوێنێکی (کورت یان درێژ) لەگەڵدا دووبارە بێتەوە.

- دەنگەکانی زمان ڕادەی دووبارە بوونەوەیان وەك ڕەوی، وەکو یەك نییە. هەیە زۆر بەکاردێ و هەیە کەم. لە کوردیدا، (ن، ڕ، ا) لە هەموویان زیاتر بەکاردێن، (چ، ڤ، پ) کەم بەکاردێن. ڕێژەی سەدی بەکارهاتن و ڕیزی دووبارە بوونەوەی هەموو دەنگەکان لە شوێنی خۆی پێشان دراوە.

- زۆر جار قەسیدە و غەزەل بەناوی ڕەوییەوە ناو دەبرێ وەکو قەسیدەی لامی یان میمی یان نوونی ...

- پێش ڕەوی، وا دەبێ یەك دەنگ یان زیاتر بێ و بەپێی دەستووری سەروا لەگەڵ ڕەوی دووبارە بێتەوە، وەکو ڕیدف بە هەموو جۆرەکانییەوە، قەید، تەئسیس، جگە لە بزوێنی کورتی پێش ڕەوی کەیان توجیهە یان دەخیلە.

- پاش ڕەوی مەرج نییە هەمیشە هەر هەبێ، بەڵام ئەگەر لەسەرەتاوە هەبوو دەبێ تا کۆتایی بەبڕەو بکرێ. پاش ڕەوی بۆی هەیە یەك مۆرفیم بێ یان زیاتر.

- سنووری نێوان ڕەوی و پاش ڕەوی بەئاستی مۆرفۆلۆجی و سینتاکسی دیار دەکرێ. ڕەوی لە ئەسلی وشەی سەروادایە کەچی پاش ڕەوی زیادەیەکە داڕشتنی سنتاکس بە کۆتایی وشەی سەروای دەلکێنێ.

- وا دەبێ پاش ڕەوی بە جۆرێ بەسەر هەست و نەستی شاعیردا زاڵ دەبێ، شاعیرەکە ئاگای لەبەبڕەوکردنی ڕەوی نامێنێ. ڕەوی و پاش ڕەوی تێکەڵ دەکا و بەرامبەر یەکیان دەکا. ئەمە لە سەرواناسیدا بە شایگان ناسراوە.

- شاعیرانی کلاسیکی کورد، زۆرجار لە بەکارهێنانی ڕەوی و هەڵبژاردنی وشەی سەرواو هێنانەوەی پاش سەروا لاسای یەکتریان کردۆتەوە.

- دابەشبوونی سەروا لە هۆنراوەدا، بەپێی زمان و چێژی ئەدەبی و داهێنانی شاعیرانەوە دەگۆڕێ. لە کوردیدا دابەشبوونی سەروا بەپێی جۆری شیعر و پارچەی گشتی و تایبەتی دەگۆڕێ کە هەریەکە چەند قالبە سەروایەکی تایبەتی خۆی هەیە.

- پارچە شیعرەکان بە پلە یەك بە ژمارەی لەت و دابەشبوونی سەروا لەیەك جیا دەکرێنەوە. پارچەی هاوسەروا و پارچە فرە سەروا هەیە ...

- پارچە گشتییەکان بە پێی ژمارەی لەتەکان ناو دەبرێن و هەر پارچەیە کێش لەوان چەند قالبە سەروایەکی جیا جیای هەیە. پارچەی گشتی لە کوردیدا، لە دوو لەتییەوە تا یازدە لەتی بەرچاو دەکەوێ، دەشێ لەیازدە لەتیش زیاتر هەبێ بەڵام کەم و دەگمەنە. پارچەکان و ژمارەی

قالبەکانیان بەم جۆرەیە : (تاك : ٢/ سێینە : ٦ / چوارینە : ١٠/ پێنجینە : ١٣/ شەشینە : ١٣/ حەوتینە : ٥/ هەشتینە : ٩/ نۆیینە :٢/ دەیینە : ٢/ یازدە لەتی : ١/). ژمارەی قالبی ئەم پارچانە، لە زۆرییەوە بۆکەمی بەم چەشنەیە : (پێنجینە و شەشینە) ، (چوارینە)، (هەشتینە)، (سێینە)، (حەوتینە)، (تاك، نۆیینە، دەیینە)، (یازدە لەتی). کەچی لەبارەی باوی و زۆر بەکارهاتنەوە، چوارینە بەپلە یەك دێ ئینجا پێنجینە و شەشینە و پاشان ئەوانی تر لە لایەکی تریشەوە، مەسنەوی -تاك- مەودای درێژ بوونەوەی لە هەموو جۆرە پارچەکانی تر زیاترە چونکە دێر بە دێر سەروای دەگۆڕێ و شاعیر بەدەست سەروا هێنانەوە دانامێنێ، بۆیە بۆ چیرۆك و پەندو ئامۆژگاری و کاری دیداکتیکی بەکاردێ.

- لەپارچە گشتییەکان، هەندێکیان قالبی وایان هەیە زیاتر لەیەك شاعیر بەشداری تێدا کردوە وەکو چوار خشتەکی (تربیع) و پێنج خشتەکی (تخمیس) و شەش خشتەکی (تسدیس) و هەشت خستەکی (تثمین). لەمانە پێنج خشتەکی لەئەدەبی کوردیدا زۆر باوە. ئەوانەی تر یەکەو یەك دوو نموونەیان لەئەدەبی کوردیدا هەیە و بەس. لەم جۆرە قالبانەدا ئەرکی هێنان و دابەشکردنی سەروا دەکەوێتە سەرشانی هەردوو شاعیر.

- لەو پارچە گشتیانەدا، تا ژمارەی سەرواکان زیاتر و بەناویەکچوودا تر بێ پارچەکە پتەوتر دەبێ. تا سەرواکان کەمتر و لێك دابڕاوتر بن پتر دەبن بەهۆی وەڕسی خوێنەر و زیاتر ماوەی لێك پچڕانیان دەبێ.

- لە پارچە تایبەتییەکان، غەزەل و قەسیدە، لە کوردیدا ، لە هەموویان باوترە. ئەمانە یەکێتی سەروایان تێدا پەیڕەو دەکرێ.

- غەزەل لە کوردیدا دوو جۆرە : غەزەلی ئیسلامی و غەزەلی ڕەسەنیی خۆماڵی، هەریەکە لەمانەش سیستەمی سەروای خۆی هەیە، چ لە چوارچێوەی گشتی بێت و چ لە وردەکاری ناوەوە.

- تەسمیت و تەرجیع بەند و تەرکیب بەند کە دابەشبوونی تایبەتی سەروا هەریەکەیان دیار دەکات و لێکیان جودا دەکاتەوە، زیاتر هونەری فارسین و لە کوردیدا گەشەیان پێدراوە. زۆر جار ئەم سێیانە لێك دەدرێن و جۆری تریان لێ موتوربە دەکرێ وەکو (تەسمیت - تەرجیع) و (تەسمیت - تەرکیب) و (تەرجیع - تەرکیب) و (تەسمیت - تەرجیع - تەرکیب). سەرواو جۆری دووبارە بوونەوەی ناوبەند دەوری سەرەکی لە دروست کردنی ئەم هونەرانەدا هەیە.

- موستەزاد کە هونەرێکی سەربەخۆیە، جگە لە کێش، سەروا دەوری سەرەکی لە ڕۆنان و لێك جیاکردنەوەی قالبەکانی هەیە. موستەزاد لە کوردیدا، دە قالبە سەروای هەیە.

- سۆنێتە کە لە بنچینەدا هونەرێکی ئەوروپییە، لە سەرەتای ئەم سەدەیە کەوتۆتە ڕۆژهەڵات. لە کوردیدا یەك نموونەی لای گۆران هەیە. جگە لەمەش گۆران و شاعیرانی تریش سوودیان لە

دابەشبوونی سەرەوای چوارینەو سێینەی سۆنێتە وەرگرتوە بۆ نووسینی چوارینە و سێینە و شەشینە...

- موەششەح لە ئەدەبی کوردیدا، لە ژێر کاریگەری شیعری عەرەبی پەیدا بوە. دابەشبوونی پارچەکانی بە پێی سیستەمی سەرەوای تایبەتییەوە لێك دادەبڕێن و بەیەکەوە دەبەسرێنەوە. لە کوردیدا، موەششەح قالبی زۆرە گرنگترینیان (٧) قالبە سەروایە.

- لە شیعری ئازاددا، سەروا بە پێی هیچ دەستوورێکی تایبەتی کارناکات. بنیادی هۆنراوەکەو هەست و سۆزی شاعیر و مۆسیقای گشتی دێرەکان سەروا ڕادەکێشێ نەك هیچ یاسایەکی دەرەکی پێشتر دیاریکراو.

- سەروا وەکو ڕەگەزێکی جوانکاری و ئیستاتیکی دەوری لەبەرز کردنەوەی بەهای شیعردا هەیە. جوانکاری سەروا لە زۆر هونەردا دەردەکەوێ وەکو ڕەگەزدۆزی و (رد القافیە) و (ئیعنات) و تەشتیر و تەرسیع و تەکریر و سەروای ئەڵقەبەند و وشەبڕ و بە تیپ و سەروای چوار گۆشەیی و جینە کردنی ڕەوی و وشەی سەروا.

- سەروا قالب و دەستووری خۆی وەرگرتوە، هەر لادانێك لەو دەستوورانە سەرواکە دەشێوێنێ و بەکەم و کورتی بەسەر شاعیردا دەشکێتەوە. ئەو کەم و کورتییانەی لەسەروای شیعری کوردی دەرکەوتوون هەیە پەیوەندی بە دەنگو ئاوازی سەرواوە هەیە، وەکو جیاوازی ڕەوی و تەوجیە و ڕیدف و قەید و تەئسیس و ئیشباع، هەیە پەیوەندی بە لایەنی زمان و فەرهەنگی وشەی سەرواوە هەیە وەکو ئیتا و تەزمین و تەحرید و ....

- شاعیرانی کورد لە مامەڵەکردنیا لەگەڵ سەروا هەریەکە مۆرکی خۆی هەیە و تایبەتێتی خۆی لە پەیڕەوکردنی لایەنێکی هونەری سەروادا هەیە، هەر بۆ نموونە : جزیری لە هونەری تەشتیر و سەروای ناوەوە و بەکارهێنانی سەروای وشەبڕ، خانی لە پەیڕەوکردنی هونەری تەرسیع و لێك گرێدانی وشەولەت و دێر بە دەنگی تایبەتییەوە، مەولەوی بە سەروای دەوڵەمەند و زێدەبار و بڵاوکردنەوەی پەیوەندی هاوەنگی و دەنگەلاسکە لە دێرە شیعردا، حەمدی و زێوەر لە ڕەگەزدۆزی سەراپای وشەکانی سەروای چەند هۆنراوەیەك، سالم لە هونەری (تکریر) و دووبارە کردنەوەی وشەی سەرواو پەیڕەوکردنی هونەری (ذوقافیتین)، نالی لە داڕشتنی سەروای کراوە و لێك تێپەڕاندنی وشەی سەرواو پاش سەرواو ڕەوی و پاش ڕەوی، جگە لە پەیڕەوکردنی تەسریعی سەراپای هەندێ هۆنراوە و لاکردنەوە لە تەسمیت، گۆران لە شیعری پارچەدار و داڕشتنی سۆنێتەو نووسینی چوارینی پترارکی و سپنسەری و وەستاکاری لە کردنەوە و داخستنی پارچە شیعر... شێخ نووری لە داهێنانی قالبی تایبەتی موستەزاد و پارچەی جۆراو جۆر و نۆیەرێت.. بەختیار زێوەر لە داڕشتنی پارچەی فرە سەروای تۆکمەو پتەو، دیلان و دلدار و دلزار و هەردی لە داهێنانی هەندێ قالبی موەششەح و موستەزاد ...

# بیبلیۆگرافیا


**یەکەم : بەکوردی :**

**أ- کتێبی کوردی :**

[١]- ئازاد دڵزار، خونچەی سەهۆڵ، چاپخانەی (الرشاد)، بەغدا، ١٩٧٥.

[٢]- ئازاد عەبدولواحید، ئەختەر - شاعیری جوانی و دڵداری، پێداچوونەوەی کەریم شارەزا، چاپخانەی شارەوانی هەولێر، هەولێر، ١٩٧٦.

[٣]- ئەحمەدی خانی، مەم و زین، ئامادەکردن و پەراوێز نووسینی هەژار، ئەنستیتوی کورد، پاریس، ١٩٨٩.

[٤]- ئەحمەدی خانی، ژ هەڵبەستێن ئەحمەدی خانی، کۆمکرن و ڤەژاندن ئیسماعیل بادی، چاپخانا هاوار، دهۆک، ١٩٩٦.

[٥]- ئەحمەد هەردی، رازی تەنیایی، چاپی دووەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٤.

[٦]- ئەحمەد حەمدی بەگ ساحێبقڕان (دیوان)، چاپی یەکەم، پێشەکی بە پێنووسی مەعرووف خەزنەدار، چاپخانەی ئەسعەد، بەغدا، ١٩٥٧.

[٧]- ئەحمەد شوکری، پێنجینەی شۆڕش، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٧٠.

[٨]- ئەحمەد شوکری، دڵداری، بەرگی یەکەم، (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٧٨.

[٩]- ئەحمەدی کۆر (دیوان)، کتێبفرۆشی سەیدیان، مەهاباد، ١٣٤٤.

[١٠]- ئەحمەد موختار جاف (دیوان)، ئامادەکردن و پێشەکی دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، (شركة مطبعة الاديب البغدادية المحدودة)، بەغدا، ١٩٨٦.

[١١]- ئەحمەدی نالبەند (دیوان)، بەرهەڤکرنا خالید حوسێن یەعقووب، (شركة سومر للطباعة المحدودة)، بەغدا، ١٩٨٩.

[١٢]- ئەحمەدی تەقیب (دیوان)، ئامادەکردنی مەحموود ئەحمەد محەمەد، (مطبعة الارشاد)، بەغدا، ١٩٨٥.

[١٣]- ئەختۆل (دیوان)، چاپی یەکەم، (مطبعة الاديب البغدادية)، بەغدا، ١٩٨٤.

[١٤]- ئەدەب (دیوان)، چاپی سێیەمین، چاپخانەی هەولێر، هەولێر، ١٩٦٦.

[١٥]- ئەدیب (دیوان)، گردو کۆکەرەوە گیوی موکریانی، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٦.

[١٦]- ئەسعەد مەحوی (دیوان)، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی، ١٩٧٠.

[١٧]- ئەسیری (دیوان)، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی کەریم شارەزا و جەبار جەباری، چاپخانەی شارەوانی هەولێر، هەولێر، ١٩٧٤.

[١٨]- ئەسیری (دیوان)، مستەفا عەسکەری کۆی کردۆتەوەو لەسەری نووسیوە، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی (الرشاد)، بەغدا، ١٩٨٧.

[١٩]- ئەمین فەیزی، ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد، تۆژینەوەی لیژنەی وێژەو کەلەپور، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨٣.

[٢٠]- ئەنوەر قادر محەمەد، لیریکاری شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ستۆکهۆلم، ١٩٩٠.

[٢١]- ئەنوەر قادر محەمەد، زرپان، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.

[٢٢]- ئەنوەر قادر محەمەد، زاپەلە، لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی فەرهەنگی سوید، کوردستان، ١٩٨٨.

[٢٣]- ئەنوەر ئەحمەد بەرزنجی، مەولوود نامەی ڕەسوولی نازدار، چاپخانەی (الرشاد)، بەغدا، ١٩٩٠.

[٢٤]- ئەنوەر مەسیفی، چل و بەرگ و جمکەکان، چاپخانەی (الرشاد)، بەغدا، ١٩٩٠.

[٢٥]- ئەوڕەحمان بەگی بابان (دیوان)، ئامادەکردنی مەحموود ئەحمەد محەمەد، (مطبعة الزمان)، بەغدا، ١٩٨٩.

[٢٦]- ئیبراهیم ئەفخەمی، دیاری نوێ، ١٣٦١.

[٢٧]- ئیبنولحاج، مەهدی نامە، لێکۆڵینەوەو پێشکەش کردنی محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥.

[٢٨]- ئیسماعیل ئامەو ناگەهان و باغەبان و بیاباود و نان و ماست و سەنگراش، (دار ئاسى للطباعة و النشر)، بەغدا، ١٩٨٢.

[٢٩]- ئۆردیخانی جەلیل، ستڕانێ زار گۆتنا کوردا یە تاریقیێ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧.

[٣٠]- بابا تاهیر ترانەها، ئامادەکردنی وەحید دەستگردی، چاپ و انتشارات جاویدان، (؟).

[٣١]- باتەیی، مەولوودا مەلایێ باتەیی، خرڤەکردن و ڤەژاندنا سادق بەهائەدین ئامێدی، چاپی یەکەم، (مطبعة سيراميس)، بەغدا، ١٩٨٢.

[٣٢]- بەختیار زێوەر (دیوان)، کۆکردنەوەی مەحموود زێوەر، (مطبعة الزمان)، بەغدا، ١٩٨٩.

[٣٣]- بەکر بەگی ئەرزی (دیوان)، کۆمکرن و تویژاندنا عەبدولکەریم فندی دۆسکی، چاپخانەی (دمرت)، بەغدا، ١٩٨٢.
[٣٤]- بەهائەدین شمس قورەیشی، مەنزوومەی کوردیی مەولوودنامەی حەزرەتی رەسوول، (المطبعة العربیه)، ١٣٢٦.
[٣٥]- بورهان ئاغای هەولێری (دیوان)، چاپخانەی تەرەقی، کەرکووك، ١٩٥٧.
[٣٦]- بێخود (دیوان)، کۆکردنەوەو رێکخستن و لەسەر نووسینی محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی (سلمان الاعظمی)، بەغدا، ١٩٧٠.
[٣٧]- بێسارانی (دیوان)، بەرگی یەکەم، ئامادەکردنی کیومەرث نیك رەفتار، (مطبعة الادیب البغدادیه)، بەغدا، ١٩٨٢.
[٣٨]- بێکەس (دیوان)، ئامادەکردنی محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی (شەفیق)، بەغدا، ١٩٧٠.
[٣٩]- بێوەی، بەرهەمی ژیان، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ١٩٨٠.
[٤٠]- پەرتویێ هەکاری (دیوان)، بەرهەفکرن و تویژاندنا سادق بەهائەدین ئامێدی، (دار الحریه للطباعة)، بەغدا، ١٩٧٦.
[٤١]- پەژار گزنگی ئازار، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ١٩٧٠.
[٤٢]- پشکۆ سەرجەمی بەرهەمەکانی، کۆکردنەوەو رێکخستنی سامان مارف بەرزنجی و عومەر مەعرووف بەرزنجی، هەولێر ١٩٩٣.
[٤٣]- پیرەمێرد (دیوان)، کۆکردنـەوەو ساغ کردنەوەی فائیق هوشیارو هی تر، (مطبعة الزمان)، بەغدا، ١٩٩٠.
[٤٤]- پیرەمێردی نەمر ئامادەکردنی محەمەد رەسوول هاوار چاپخانەی (المعانی)، بەغدا، ١٩٧٠.
[٤٥]- پیربال مەحموود، بەهەشتی دڵداری، چاپخانەی شارەوانی، کەرکووك، ١٩٥٨.
[٤٦]- پیربال مەحموود، بزەی سروشت، چاپخانەی عەلاء، بەغدا، ١٩٨٥.
[٤٧]- تایەر تۆفیق، گوڵی سەربەستی، بەشی یەکەم، (دار آفاق عربیه للطباعة والنشر)، بەغدا، ١٩٨٣.
[٤٨]- تاهیر بەگی جاف (دیوان)، چاپی سێیەمین، چاپخانەی هەولێر، هەولێر ١٩٦٦.
[٤٩]- تاهیر فوئاد (دیوان)، چاپی یەکەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٧٠.
[٥٠]- تاهیر مەلا عەبدوللا، مەرکانەی کوردی بۆ گوڵی بردی، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر ١٩٨٦.
[٥١]- تەحسین ئیبراهیم دۆسکی و موحسین ئیبراهیم دۆسکی، مەلایێ باتەیی و بەرهەمێ وی، چاپخانەی هاوار دهۆك، ١٩٩٦.
[٥٢]- جەباری (دیوان)، ئامادەکردنی عەبدوجەبار محەمەد جەباری، چاپی یەکەم، چاپخانەی شارەوانی، کەرکووك، ١٩٦٨.
[٥٣]- جەعفەر قولی زەنگلی ملك الشعراء کرمانج (دیوان عرفانی)، مەشهەد، ١٣٦٩ (١٩٩١).
[٥٤]- جەفایی (دیوان)، کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ١٩٨٠.
[٥٥]- جەلال مەحمەت خۆشناو کاروانی بار، چاپخانەی شارەوانی، هەولێر ١٩٧٥.
[٥٦]- جەلال میرزا کەریم، رێگا دوورەکانی چاومان، سلێمانی، ١٩٩٢.
[٥٧]- جەمال شاربازێری، ملوانگەی هەزار دەنکەی شاربازێڕ، چاپخانەی عەلاء، بەغدا، ١٩٨٥.
[٥٨]- جزیری (دیوان)، هەژار شەرحی لێ کردوە، چاپی یەکەم، سروش، تەهران، ١٣٦١.
[٥٨آ]- جزیری (دیوان)، تویژاندنا سادق بەهائەدین، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧.
[٥٩]- چروستانی (دیوان)، ئامادەکردن و لێکدانەوەی عەبدورەحیم عەبدوللا چروستانی و سالح عەبدوللا چروستانی، چاپخانەی نەورەس، سلێمانی، ١٩٨٥.
[٦٠]- حاجی قادری کۆیی (دیوان)، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا، بەغدا، ١٩٨٦.
[٦١]- حاریسی تبلیس، لەیلێ و مەجنوون، ئامادەکردن و گۆڕینی بۆ رووسی و پێشەکی مارگرێت رودێنکۆ، مۆسکۆ ١٩٦٥.
[٦٢]- حەجی جەعفەر، سترانێت داوەت و گۆڤەندێت کوردان، چاپخانەی (دمرت)، بەغدا، ١٩٨٦.
[٦٣]- حەریق (دیوان)، چاپی دووەم، چاپخانەی (الجمهوریه)، کەرکووك، ١٩٦٩.
[٦٤]- حەسەن زیرەك، گەوهەرێ، کۆکردنەوەو لەسەر نووسینی عوسمان شاربازێری، (مطبعة السعدون)، بەغدا، ١٩٨١.
[٦٥]- حەسەن سەریەتی، دیلان، چاپی یەکەم، چاپخانەی (دمرت)، بەغدا، ١٩٨٥.
[٦٦]- حەسەن عەولانی، چەمی رەزانی قارەمان، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٧٢.
[٦٧]- حەسیب قەرەداغی، فەرهەنگی خەم، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کاکەی فەلاح، سلێمانی، ١٩٧٩.
[٦٨]- حەسیب قەرەداغی، فەرهەنگی خەم، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، (دار الحریه للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٩.

[٦٩]- حەقیقی (دیوان)، بڵاوکراوەکانی سەلاحەدینی ئەییوبی، چاپی یەکەم، ١٣٦٧.
[٧٠]- حەمە سەعید حەمە کەریم، دیاری شیعری کلاسیکی کوردی، (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٦.
[٧١]- حەمە عەلی مەدهۆش، یانەی دڵان، ئامادەکردنی محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی عەلاء، بەغدا، ١٩٨٢.
[٧٢]- حوسێن شێخ سەعدی، قەسیدەی بوردییە، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر ١٩٨٥.
[٧٣]- حوسێن شێخانی، مەولوودنامە لە پەسەندی حەزرەتی ڕەسوولی ئەکرەم، چاپی یەکەم، تەهران، ١٣٦١.
[٧٤]- حیلمی (دیوان)، ئامادەکردنی ئومێد کاکە ڕەش، چاپخانەی (الارشاد)، بەغدا، ١٩٨٥.
[٧٥]- خانیم (دیـوان)، بەرگی یەکەم، ئامادەکردنی جەمال محەمەد ئەمین، (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٠.
[٧٦]- خانیم (دیـوان)، بەرگی دووەم، ئامادەکردنی جەمال محەمەد ئەمین، (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٨١.
[٧٧]- خانای قوبادی، شیرین و خوسرەو، محەمەدی مەلا کەریم ساغی کردۆتەوەو فەرهەنگی بۆ ڕێکخستووەو پێشەکی بۆ نووسیوە، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥.
[٧٨]- خانای قوبادی، شیرین و فەرهاد، چاپی سێیەمین، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٧٣.
[٧٨ أ]- خەلیل موخلیس، مەولوودنامەی کوردی، چاپخانەی هەولێر، هەولێر ١٩٦٨.
[٧٩]- خەیام، چوارینەکانی خەیام، گۆڕینی سەلام، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، ١٩٦٧.
[٨٠]- خەیام، خەیامی هەژار، چاپخانەی عیتانی، بیروت، ١٩٦٨.
[٨١]- خەیام، چارینەنێت خەیامی، خەلیل سلێمان مشەختی، چاپخانەی هاوار، دهۆك، ١٩٩٦.
[٨٢]- خەیام، چوارینەکانی خەیام، عەبدو سەلام نەبی، بەغدا، ١٩٨٨.
[٨٣]- خدر ئەحمەد عەبدوللا، مەولوودنامەو بروانامەی دەشتی، محەمەد دەشتی ڕێکی داوەتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان، هەولێر ١٩٨٨.
[٨٤]- خدر مەحموود مەندەلاوی، پەروەخولێن (دیـوان)، بەشی یەکەم، چاپخانەی شیمال، کەرکووك، ١٩٧١.
[٨٥]- خورشیدی خاوەر، چاپخانەی تیجارییە، کەرکووك، ١٩٧٣.
[٨٦]- دامـاو (حوسێن حوزنی موکریانی)، خۆشی و ترشی، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٤.
[٨٧]- دڵزار (دیوان)، چاپی یەکەم، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢.
[٨٧ أ]- دڵزار، خەبات و ژیان، چاپخانەی (الوفاء)، بەغدا، ١٩٦٠.
[٨٨]- ڕازی، ئازار و ئەوین، چاپخانەی نەورەس، سلێمانی، ١٩٨٣.
[٨٩]- ڕازی، داستانی سورمەخان، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی، ١٩٨٣.
[٩٠]- ڕەئووف عوسمان، شاعیرێتی مەولەوی، کتێبی (میهرەجانی مەولەوی)، چاپخانەی (الزمان)، بەغدا، ١٩٨٩.
[٩١]- ڕەسوول بێزار گەردی، شیلان و شلێر، چاپخانەی (شفیق)، بەغدا، ١٩٦٧.
[٩٢]- ڕەسوول بێزار گەردی، گوڵە مێلاقەی کوردستان، چاپخانەی (النجاح)، بەغدا، ١٩٦٠.
[٩٣]- ڕەزای تاڵەبانی (دیوان)، کۆکردنەوەو چاپ کردنی عەلی تاڵەبانی، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٤٦.
[٩٤]- ڕەفیق حیلمی، پاش تەموون پێشەکی مەعرووف خەزنەدار (مطبعة الرأي العام)، بەغدا، ١٩٦٠.
[٩٥]- ڕەفیق حیلمی، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپی دووەم، چاپخانەی خوێندنی باڵا، هەولێر ١٩٨٨.
[٩٦]- ڕەنجووری (دیـوان)، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی یەکەم، چاپخانەی (آفاق عربية)، بەغدا، ١٩٨٣.
[٩٧]- زێوەر سۆزی نیشتمان، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٨.
[٩٨]- سابری (دیوان)، چاپی یەکەم، کۆکردنەوەی شێخ عەبدوڕەحمان شێخ نەجمەدین سابری، چاپخانەی شارەوانی، کەرکووك، ١٩٦٩.
[٩٩]- سادق بەهائەدین، نوبهارا ئەحمەدێ خانی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.
[١٠٠]- سافی (دیوان)، چاپی سێیەمین، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٧٣.
[١٠١]- سالم (دیوان)، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ١٩٧٢.
[١٠٢]- سامی عەبدال (چەپکێك لە شیعرەکانی)، چاپخانەی (دار آفاق عربية)، بەغدا، ١٩٨٣.
[١٠٣]- سەدیق حامید، گزنگەندو بەهی، (دار الحرية للطباعة)، بەغدا، ١٩٨٠.
[١٠٤]- سەدیق بۆرەکەیی، مێژووی وێژەی کوردی، بەرگی یەکەم، بانە، ١٩٧٠.
[١٠٥]- سەدیق بۆرەکەیی، مێژووی وێژەی کوردی، بەرگی دووەم، بانە، ١٩٧٠.
[١٠٦]- سەدیق بۆرەکەیی، تەلای دەستەوشار چاپخانەی حەیدەری، ١٣٦٩.

